# کوردستان

## لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا



نووسینی
حەسەن مەحموود حەمەکەریم

چاپی پێنجەم
٢٠١٣

# کوردستان

## لـــه بەردەم

# فتووحاتی ئیسلامییدا

حەسەن مەحمود حەمە کەریم

چاپی پێنجەم
پاککراوەتەوەو بۆی زیادکراوە

٢٠١٢ زایینی

له بڵاوکراوەکانی پرۆژەی تیشك ژمارە ( ٩ )

* ناوی کتێب: کوردستان له بەردەم فتووحاتی ئیسلامییدا
* نووسەر: حەسەن مەحمود حەمە کەریم
* شوێنی چاپ: چاپخانەی نوێ. سلێمانی
* تیراژ: ٢٠٠٠ دانه
* نۆرەی چاپ: چاپی پێنجەم (٢٠١٣) پاککراوەتەوەو بۆی زیادکراوە.
* ژمارەی سپاردن: (١٠٦) ی ساڵی ٢٠٠٧

ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت :

www.tishkbooks.com

E-mail : tishkbooks@yahoo.com

# بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

## پێشەکی

گەلی کورد، یەکێکە لە میللەتە زیندوەکانی سەر زەوی، مێژووەکەی وا نیشان دەدات کە لە کۆنترین گەلانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بێت، سەرچاوەکان چالاکی و روداوی زۆری ئەم میللەتەیان گێڕاوەتەوە، خاوەنی مێژوویەکی دەوڵەمەندە، لەگەڵ ئەوەدا هێشتا هەر زۆر لای ونە و، پێویست بە هەوڵی دڵسۆزان دەکات، بە تایبەتی ئەگەر لە لاپەڕەکانی مێژووی دراوسێکانی دا، یان لە کون و کەلەبەری مۆزەخانە و عەنتیکەخانە و فۆلکلۆری گەلانی دەوروبەردا بگەڕێین!

مێژووی کورد، رۆژهەڵات ناس و داگیرکەران، بە زەینی دوژمنکارانەی خۆیان نووسیویانە، شێواندویانە، کەم و زیاد کراوە، لایەنە بەهێزەکانیان شاردۆتەوە، لاوازەکانیشیان بە زەقی دەر خستوەو، بەو جۆرەیان بە جیهان ناساندوە کە کورد دڕندە، نەزان، بێ سودە، کاری لەسەر ناکرێ، مێشکیان پوتە، کەللەیان رەقە، بۆ هیچ هاوکێشەیەك ناشێت. ئەوە ستەمە، لە کوردمان، لە مێژوومان، لە بوونمان، لە چارەنووسمان کراوە، دەبێ رون بکرێتەوە، ئەو دەرخستنە، ماوە، کات، رەنجی شەو و رۆژی دەوێ، هەروا کارێکی ئاسان و سەرپێی نیە، بە بابەتێك، دوو بابەت ناڕەوێتەوە، راست نابێتەوە.

مێژوو زەخیرەیەکی گرنگە، گەلانی تر زۆر گوێیان پێداوە، لە ئەوروپا (٣٥٠) دەزگای نووسینەوەو لێکۆڵینەوە لەسەر مێژوو هەیە، بەردەوام لە نووسینەوەو گەڕان و کنەو پشکنین و خوێندنەوەی شوێنەوارو لێکۆڵینەوەدان، بەڵام کورد شەو و رۆژ بە هەر چوار لادا شوێنەوارەکانی ئاودیو دەکرێ!

هەر کەس مێژووی نەبێ، کەسێتی نیە، ناتوانێ خۆی بناسێنێ. ئێمە هەر تەنها بە سەلاحەددین چەند گەورەبوین، چەند ناسراوین، میللەت نیە لە

ئاوێنەی ئەوەوە ناوی نەبردبێن و بەردەوام باسمان نەکات، ئەگەر دەیانی وامان هەبوایە، ئێمەش شتێ تر دەبووین.

هەر کەسە لە کۆن و نوێ دا بە جۆرێك باسی مێژووی کردوە، هێرۆدۆت باوکی مێژوو، پێش دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر لە یۆنان وتی: (مێژوو و گەڕان و پشکنینە بە دوای کرۆکی رووداو و کارەساتە کۆنەکاندا.) ئیبن خەلدون عەرەب دەڵێت: (مێژوو گەڕان و تێڕوانین و وردبونەوەو هەڵگێڕ و داگێڕکردنی رووداوەکانە.) شەرەفخانی بدلیسی لەمەڕ خۆشمان قسەی هەیەو دەڵێت: (مێژوو لە سەروی هەموو هونەرەکانەوەیە.) سەخاوی لە (الاعلان بالتونیخ) دا دەڵێت:(مێژوو هونەری گەڕانە بە شوێن رووداوەکانی زەمانەدا.). مەسعودی لە (مروج الذهب) دا دەڵێت: (مێژوو زانستێکە لە دەنگ و باسان) تەبەری لە مێژووە گرنگەکەیدا دەڵێت: (مێژوو هونەرێکە لە رووداوەکانی زەمانە دەکۆڵێتەوە.)

مامۆستا کەمال مەزهەر دەڵێت: مێژوو زانستێکی گەورە و بە کەڵکە، بەڵکو(زانستی زانستەکانە)، هیچ زانیاریەکی گرنگ نیە مێژووی تایبەتی خۆی نەبێت، لە هەموان گرنگتر مێژووی ژیانە، کە گشت زانست و رووداوەکانی رۆژانە و ئاڵوگۆڕەکانی کۆمەڵ دەگرێتەوە، بۆ هەر کەسێك بیەوێت، وانەکانی مێژوو زۆر گەورەن. نەمری راستەقینەی لای مێژووە.). لە پێناسەی مێژوودا هاتووە: (مێژوو زانستێکە لە رووداوەکانی کۆن و رابردوو دەکۆڵێتەوە.).

مامۆستا کەمال مەزهەر دووپاتی دەکاتەوە: مێژوو وەك زانستێکی تر تەنها بەرەو پێش ناچێت.! بەڵکو لە هەمان کاتدا رووداوەکانی لەگەڵ یەکتردا تەفاعول دەکەن، تەفاعولی رووداوی مێژوویی دوو جۆرە: ستوونی و ئاسۆیی، ستونی ئەوەیانە کە لە ناو خودی کۆمەڵ خۆیدا روو دەدات، ئاسۆییش ئەوەیانە کە لە نێوان رووداوی مێژوویی کۆمەڵی جیاوازدا روو دەدات. رەوڕەوەی مێژوو یەکجار گەورەیە، بەرەوپێش بردنی هەرگیز لە وێزەی تاکە کەسێکدا نیە و نەبوە، خاوەنی مێژوو گەلە، بە چاك و بە خراپ

ئەرکی گەورەی هەموو بەسەرهات و رووداوێك دەکەوێتە ئەستۆی کۆمەڵانی خەڵك.)

ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە تاك دەوری لە مێژوودا نییە، سەردارو سەرۆکی داناو چاونەترس و دووربین دەتوانێت رۆڵی زۆر گەورە ببینێت، ئەو سەردارەی بزانێت چی پێویستە و مەرجی سەرکەوتن لە چیدایە، هەڵبەت دەتوانێت رۆڵی چاك ببینێت، ئەگەر میللەت نەبێت داروبەرد سەرداریی بۆ چییە.؟ (جەمالەدینی ئەفغانی) نامەیەکی بۆ (ناسرەدین شا) نارد کە تیایدا هاتبوو (گەر جوتیاریی و شوانکارەیی نەبونایە، تەخشان و پەخشان و رابواردنی دەوڵەمەندان نەدەبوون، جێگەی جوتیارو سەنعەتکار لە شارستانیدا لە جێگەی میران بەکەڵکترە، دیومانە گەلێك بێ پاشا بژی، بەڵام نەمان دیوە پاشایەك بێ گەل بژی.) گەر تێڕوانین هەبێت، مێژوو نەوەیەکی ژیری وا دێنێتە گۆڕێ کە هەڵەکانی کۆن وەك ئاوێنەیەك لەبەرچاو بگرێت و دووبارەیان نەکاتەوە، شارەزای ژیان و کردار و گوفتاری رابوردومان دەکات، میللەتی چاك دێنێتە مەیدان، کورد خاوەنی مێژووی دەوڵەمەندی خاوەن رووداوو داستانە و پڕیەتی لە ئەزموون، چەندەها هاوکێشەی تەواو و ناتەواوی لەسەر خاکەکەی بینیوە، بوەتە تاقیگایەکی گەورە و پڕ لە (وانە)، دەتوانێت نەخشەی نوێ و پرۆژەی چاك و سەرکەوتوانەی لێ بەرهەم بهێنێت، ئەگەر وای کرد، ئەوا ئومێدی دواڕۆژی روونی لێدەکرێت و دەتوانێت پاشەڕۆژی خۆی دیاری بکات. بەڵام نازانم بۆچی کورد لە مێژووی خۆی دوورە و لە ریشاڵی خۆی نەکۆڵیوەتەوە؟ کێشە سەرەکیەکانی دیاری نەکردوە؟ پەی بە هۆی گرفت و ئازارەکانی نەبردووە.؟

مەخابن. ئەگەر سەیری بارودۆخ و ژیانی دوێنێی کۆن و ئەمڕۆی نوێمان بکەین، پێوەی دیار نیە کە کورد مێژووی خۆی تاوتوێ کردبێت. یاخود بەو چاوەوە سەیری کردبێت کە خۆی تێدا بدۆزێتەوە، نابینی سوود لە ئەزموونەپێشوەکان وەرگیرابێت، هەڵەکان نەك جارێك دەیان جار دووبارە بوونەتەوە، هەموو جارێکیش دەرئەنجامی پێشوو دەست کورد کەوتووە،

مەخابن. کورد مێژووی پڕ ئەزموونی بە دەرمانخانەیەك نەزانیوە، تاوەکو چاری نەخۆشییەکانی تیا کردبێت و، دانایانە تیماری دەردەکانی کردبێت. ئەمە لە لایەك. لە لایەکی ترەوە، نووسەرانی مێژووی کورد، لە بری ئەوەی دەستنیشانی خاڵی لاواز و بەهێزی ژیانی کۆنی کورد بکەن، هاتوون مێژووەکەیان وەك چیرۆك خوێنەکانی ناو دیوەخانی شەوانی زستان و بەرئاگردان گێڕاوەتەوە، تەنانەت خۆیشیان لەگەڵیدا هەڵچوون و داچوون و ئەوەندەی تر بابەتەکەیان ئاڵۆز کردووە.! ئەو هەموو رەنجەی بەگزادە و بەچکە میر و شێخ و ئاغاکانی کورد لە شەڕی خۆخۆری و کورد بەزێن و براکوژیدا بە فیڕۆیان داوە، بۆ قڕکردنی یەکتر، تەنها ئاواتی کەسێتی خۆیان و بەرژەوەندی تایبەتیان پێ هێناوەتەدی، نەك بەرژەوەندی میللەت، ئەو بەگ و میرانەی کە لەسەر کورسی و ئارەزووی ژن و ژنخوازی و خێڵایەتیی و تەماع کوردیان پێداوە بە کوشت و میللەتیان پێ ڕەش و ڕەجاڵ کردووە، بە داخەوە زۆر لە نووسەرە مێژووییەکانمان، ئەو باسانەیان لێ کردووینەتە ماڵ و لە باتی رەخنەلێگرتنیان، بە پاڵەوانیی بۆ کوردیان لە قەڵەم داوە.!

نووسەرانی مێژووی کورد لە سەدەی بیستەمدا وەك پێویست سوودیان لە مێژوو وەرنەگرتووە، هەرچەند لە نووسراوەکانیاندا زۆر بە لاوازانە تەفسیری مادییان بۆ هەندێ لایەنی کردووە و لە واقعی رووداوەکان دوور کەوتونەتەوەو ناوەرۆکیان لەبەرچاو ون بووە.! باسیان لەو هەموو قەڵا خەیاڵی و کۆشکە رزیوو روخسار و تاریکستانەی ناو ناخی کورد نەکردووە، کە بە درێژایی مێژوو کۆسپ بوون لەبەردەم پرۆسە تازەکاندا، ئەوەی عەقڵیەتی کوردی ئیفلیج کردووە ئەوەیە کە ناخی خودی کورد ناخوێنینەوەو هەموو هۆکارەکان دەدەینە پاڵ فاکتەرە (دەرەکییەکان)، چەند لاوازە کە خۆمان قوتاردەکەین و هەموو دەستە چەورەکە بسڕین بەسەر ئیمپریالیزمدا و شکستیەکانمان بدەینە پاڵ ئەوان.

ئەو عەقڵیەتە میلیتاریە کە بۆ کورد دروست بووەو لە هەموو هێزێکی تر بە گەورەتری دەزانێت، ئەمڕۆ زاڵە بەسەر تەواوی بیروبۆچوونەکانیدا و بە

هیچ پرنسیپێکی تری ناگۆڕێتەوە، بەڵکو هەموو جار پرنسیپەکان بە گوێرەی ویستە شەڕخوازیەکە دەگۆڕێت.! ئەم عەقڵیەتەی ئەمڕۆ وا لە ئاستی عەقڵیەتی سێ هەزار ساڵ لەمەوبەرماندا، لە ئاستی سەردەمی (ماد)ەکان. ئێستەش کورد بە هەمان هاوکێشەوە بیردەکاتەوە، هەمان عەقڵ و رووداو و شوێن. تەنها جیاوازیمان لە زەمەندا هەیە ئەگەر - خوانەخواستە - ئەم جەنگە ناوخۆییە خۆکوژییەی ئەمڕۆ بەردەوام بێت. ئەوا هەمان ئامانجمان چنگ دەکەوێت. وەك لەوێ دەوڵەتی (ماد) رووخا. لێرەش راپەڕینەکەمان دەبێتە جێی ئاخ و پەرلەمان و حکومەتی هەرێمان بەبێ گیرسان لەبار دەچێت*.

ئەوسا بۆمان دەسەلمێت کە عەقڵی کوردی تەنها یەك هاوکێشە و نەخشە دەناسێت و هەتا ئێستە گۆڕانی بابەتیانەی بەسەردا نەهاتووە، ئەوسا زەمەن وەستاوەو رەورەوەی مێژوو هەر دەخولێتەوە، نەوە دوای نەوە ئەو عەقڵیەتە میلیتاریەیان بۆ جێ‌دەهێڵن، ئەمەیە وای لە کورد کردووە لە بۆشاییدا دەجولێتەوە، وەك کۆلارەیەکی پەت پچڕاو وایە، کە با بۆ کوێ بیەوێت بە کەیفی خۆی دەیبات، داهاتووی روون نییە کە لە کوێ دەکەوێتە خوارەوەو دەگیرسێتەوە، ئایا دەکەوێتە نێو ئاگرێك و هەڵدەپرووزێت، یان دەکەوێتە دەریایەك و کازەکەی دەخوسێت.! کورد نرخی زەمەن نازانێت، هیچ سوودێکی لە زەمەنی رابوردوو نەبینیوە، بۆ داهاتوویش هیچی دیار نیە، بە داخەوەم کە کورد هێزی (بازوو) لە هێزی(زەین) و (ژیریی) و (بیرکردنەوە) لە باشتر دەزانێت، کۆسپەکانمان تەنها لە دەلاقەی بازوەوە چارە دەکەین و گرێی دەست دەخەینە دان. دوو نموونەی دوور دەهێنمەوە، بەراوردی بکە لەگەڵ ئەمڕۆدا، بزانە چەندمان جیاوازە:

(زەینەفۆن) سەرکردەی یۆنانی کە خۆی مێژوونووس بووەو قوتابی (سوقرات) بووە لە ساڵی (٤٠١)ی پێش زایینددا بە لەشکرێکی (١٣٠٠٠)

---

* ئەم پێشەکییە لە کاتێکدا نووسراوە کە جەنگی ناوخۆ لە نێوان پارتی‌و یەکێتی لە گەرمەیدا بوو.

سیانزه هەزار کەسیەوە، دێتە وڵاتی فارس بۆ یارمەتی (کۆرش)، کە لە جەنگدا دەبێت لەگەڵ (ئەردەشیر)ی برایدا، لە نزیک (بەغداد)ی ئێستا، لەشکری یۆنانی سەری لێ تێك چوو، نەیزانی چی بکات و چۆن بگاتەوە یۆنان، چونکە ئەو هێزەی (کۆرش) کە ئەو هاتبوو بۆ یارمەتی، شکاو ئەمان بێکەس و بێ چاوساغ مانەوە ، زەینەفۆن ئەم گەڕانەوەیە لە کتێبێکدا باس دەکات بە ناوی (انا باسیس)، ئەو جەنگ و پەیوەندیانە باس دەکات کە لەو گەڕانەوەیەدا بەناو ئەو وڵاتانەدا دەگەڕێتەوە، هەندێك وڵات لەگەڵیدا ڕێك دەکەون و هەندێکیشیان جەنگی لەگەڵ دەکەن، زۆر وڵات سوودی لێ دەبینن و لە ئەنجامی وت وویـژدا ڕێك دەکەون بەڵام کورد بێ بەخێرهاتن و پێشوازیی، سەر لوتکەی شاخە بەرزەکانیان لێ دەگرن. تاشە بەردیان بەسەردا خلۆر دەکەنەوەو هەرا بە لەشکرەکە دەکەن، لە پێشەوە و لە پاشەوە پەلاماریان دەدەن، بۆسەیان بۆ دەنێنەوە، ئەوانیش لە ڕقدا هەرچی دێهات و شارو بەستی ئاو و کشتوکاڵێك کە دێتە ڕێگایان، کاولیدەکەن و کچەکانیان دەبەن، بەڵام میللەتەکانی تر لەگەڵیدا ڕێك دەکەون و خواردنیان پێدەفرۆشن، ڕێکەوتن مۆر دەکەن، بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بەکاریان دەهێنن، هەندێکیان دوژمنەکانی خۆیانی پێ لەناو دەبەن.

بۆ دەبێت کورد هەڵوێستی وا بنوێنێت کە زەینەفۆن بە شەڕانی و ڕێگرمان لە قەڵەم بدات و بۆ میللەتانیش بسەلمێت کە کورد شەڕفرۆشە، بۆچی لایەنێکی شارستانی ئەو کاتەی خۆیان نیشانی ئەو سەرکردە مێژوونووسە نەدەن هەتا لاپەڕەیەکی ترمان لەسەر تۆماربکات؟ دووبارەش بە داخەوەم کە مێژوونووسەکانمان ئەوەمان بۆ دەکەنە ئازایەتیی و فەخر، زیاتر لە پێنج مێژوونووسی گەورەمان کە دێنە سەر باسی زەینەفۆن شانازیی بەو پاڵەوانیەتەوە دەکەن. تاکە کەسێکم نەخوێندۆتەوە زەمی ئەو هەڵوێستە بکات.!

لەسەردەمی میرنشینی سۆران دا، سەردەمی (میر محمد) پاشا کۆرە (١٧٨٤-١٨٣٨)ی زایینی، دوو سەد ساڵ لەمەوبەر نموونەیەکی زۆر نزیکە و

دەسەڵاتێکی فراوانی لە کوردستاندا هەبوە، کە کوردەکانی عێراق و بەشێك لە ئێران و تورکیای لەژێر فەرماندەدا بوە، ئەم پیاوە وڵاتێکی گەورە و میللەتێکی بێشوماری رەش و روتی ماندووی لەبەردەستدا بووە، وەکو مامۆستا هەژار باسی دەکات (نەرم و شلی و خاوە خاوی نەزانیوە، هەر کەس سەری بزاوتبا، بزوتی دەچاو رادەکرد، تەیمورخان و یەحیا بەگی مامی گرتن و هەڵیواسین، ئەوسا پەلی هاویشت و کەوتە بیری (ناودەرکردن)، پەلاماری هەولێری داو هەتا سەر زێی گچکە گرتی و کردیە کەوشەنی نێوان وڵاتی سۆران و بابان، پردێ و کۆیە و رانیەشی گرت، لەشکرێکی یەکجار زۆری بردە سەر ئاکرێ و ئامێدی و سەعید پاشای میری بادینانی بە دیل گرت و هەڵی کوتایە سەر باعشیقا و میری یەزیدیانی گرت و لە رەواندز بەندی کرد و لە پاش دوو ساڵ کوشتی، بەرەو جزیرەش ئاژوت و ماردین و نوسەیبینی داگیر کرد.) ئەمانە هەموو خاکی کورد بوون و بۆ خۆیان دانیشتبوون و ژیانی ژێر فەرمانڕەوا کوردەکانیان بەسەر دەبرد، بەڵام میر محمد هەر بۆ تەماعی دەسەڵات و فراوانکردنی سنووری هێرشی کردە سەر هەموو میر و میرنشینە کوردەکان. هەتا وا لە خۆی دەکات (عوسمانیی زۆر ترسیان لێ نیشت و لە دژی دەستیان بەکار کرد ئەگەر دەستیان نەگرتایە هێرشەکەی هەتا (ئەستەنبوڵ)ی پایتەختی عوسمانیی نەدەوەستا. ئەم کارەی عاقڵانە نەبوو، هەر بە زۆرداریی بوو، میللەتی بۆ ئامادە نەکردبوو، دۆستی پەیدانەکردبوو، دژی فارس و بەغدا و موسڵ و عوسمانی و بابان سنووری هەموویان دەوریان دابوو لە یەك کاتدا دەجەنگا. پاش ئەم شێت گیرییە، بە هەر هەموویانەوە لەگەڵ بریتانیا و رووسدا نەخشەیەکیان بۆ داڕێژا و زۆر سووك گرتیان و کوشتیان و خەونەکەیان کوژاندەوە. ئەمە ئەوە دەردەخات کە کورد سوودی لە رابردووی خۆی نەبینیوە، بارودۆخی ئەمڕۆی کورد چۆن دەبینی لە کوردستانی عێراقدا، دوو سەد ساڵ لەمەوبەر هەمان لەشکرکێشی (میر محمد) لە دەشتی هەولێر و شاخەکانی باتاس و حەریر و شەقڵاوە و سەلاحەددین هەبوەو کوڕی کوردی قڕ کردووە،

ئەوەندەی مێژووم خوێندۆتەوە، بە هەمیشەیی کوردم لە سێ بارودۆخدا بینیوە، یان خەریکی شەڕی براکوژیی و خۆخۆری بوون، یان لە خۆئامادەکردن و لەشکرسازیی و قایمکاری قەڵاو شورە دروستکردندا بوون بۆ شەڕ و کاتی ئاسایشیان پێوە بەخت کردووە، یاخود لایەکیان یان هەموویان بە دەستی وڵاتێکی دوژمنەوە بوون، دژ بە وڵاتێکی یا میرنشینێکی دی کورد بەکارهێنراون.

کاتێک کە پاشاکۆرە لە کاتی ئاسایشدا (٢٠) پردی گەورەی دروستکردووە، ئەوە بۆ گواستنەوەی کەلوپەلی بازرگانیی و ئاسانکردنی هاموشۆی خەڵکی نەبووە، بەڵکو بۆ ئەوە بووە کە خێراتر هێزەکانی بگەیەنێتە ناوچە کوردیەکانی تر بۆ شەڕ، لە باتی ئەوەی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتیی و ئابوریی و زانستیی بەرپا بکات و پێشەکی میللەتەکەی وریا بکاتەوە، کەچی پسپۆڕی جەنگیی لە ئازربایجان و ئێرانەوە دەهێنا بۆ دروستکردنی تۆپ و قەڵا و شورا و پیلانی جەنگیی، میللەتی روتاندەوە و هەموو سەروەت و ماڵیانی دا بە چەك و جبەخانە و، بە دەیان قات و زۆر بە گران چەکی دەکڕی، ئەو هەموو چەکە ئەو پەنجا هەزار سەربازە، کە بۆ خەیاڵێکی گەورەی پێکەوە نابوو، زۆر زوو تەفروتونا بوو ئاسەواری نەما. ئەگەر بە دەست سەرکردەیەکی ژیرەوە بوایە، کیانێکی کوردیی پێ دروست دەکرد و پەیوەندی لەگەڵ هەموو دراوسێکاندا دروست دەکرد، چەندین پرۆتۆکۆلیان بۆ سەربەرزیی میللەت مۆر دەکرد، ئاسەواریشی لەسەر سیاسەتی ئەمڕۆی کورد دەبوو.

بۆ ئەم بابەتە سودم لە هەموو سەرچاوە سەرەکیەکانی فتوحاتی ئیسلامی وەرگرت، گرنگترین و وردترین و بەسودترین زانیاریم نقل کردوە، هەتا ناوەرۆکەکەی بە کاکڵە و دەوڵەمەند بێت، تەبەری و ئیبن ئەسیرو ئیبن ئەعسەم و ئیبن مەسکویەو بەلازەری و خزری بەگ و بروکلمان و ئەرنۆڵد و ول دیورانتم لەبەر دەستدا بوە و قسەکانیانم لەیەك داوە و، نووسیومە. کە تەواو بوو، داخلی کۆمپیوتەرم کرد، هەندێ سەرچاوەی گرنگی تریشم دەست

کەوت، زانیاری چاکم لێ دەرهێناون، من نالێم ئەمەی کردومە ساغ و سەلامەتە و بێ عەیبە. بەڵام دەڵێم لە کتێبخانەی کوردیدا و ئەگەر نەشڵێم لە عەرەبیدا وێنەی نیە. یەکەم: لە کوردیدا هەتا ئێستا باسی فتوحاتی ئیسلامی نەنووسراوە، کتێبخانەی کوردی لێ بێ بەشە، هیوام وایە جێی خۆی بگرێ و ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە، دووەم: لە عەرەبیدا – ئەوەندەی من ئاگادارێم – مێژوویەك نیە بەم جۆرە نووسرابێ و سودی لەو هەموو سەرچاوانە وەرگرتبێ و باس لە فەترەیەکی (دە) ساڵەی سەردەمی حەزرەتی عومەر و فتوحاتی ئیسلامی ماوەی ئەو دە ساڵە بکات بەم درێژیە.

لە گێرانەوە مێژووییەکاندا باس هەیە راست و دروست و، هەیە درۆ و هەڵبەستراو، مێژوونووسان نەیان وتوە هەرچیمان نووسیوە (سەد دەر سەد) تەواوە، بەڵکو هیچ گێرانەوەیەك نیە هەمووی راست دەرچێت، رووداوی پێش سەعاتێك بە جۆرەها شێوە زیاد و کەمی بۆ دەکرێت، مێژووی فتوحاتی ئیسلامی سەردەمی خولەفا دوای حەفتا ساڵ نووسراوەتەوە، لەبیرچوون و زیاد و کەم و مبالەغەی پێوە کراوە، بە تایبەت لایەنە باشەکان زۆر نووسراوە و سلبییەکان وەلا نراون، کە دەکرا سود لە هەردوو رووەکە وەربگیرێ. مەیلی نووسەرەکە و سروشتی، زیاد و کەمی بۆ کردوە، بەڵام ئەگەر هەر هەموو سەرچاوەکان لە یەك بدەی، راستی زۆر وەدەر دەکەوێ و، هەڵبەسراوی زۆر دەوەرن.

لەم باسەدا وەڵامی هەندێ نووسەرم داوەتەوە، کە بوختان و هەڵبەستراوو و نەپێکرانی لێ روو دابێ. بە تایبەت وەڵامێکی تێروتەسەلم بۆ بوختان و هەڵبەسراوەکەی مەلا رۆوف حوێزی نووسیوە کە کتێبی (کوردستان و ئاینی ئیسلام)ی هەڵبەستوەو بەناوی خۆیەوە بڵاوی کردوەتەوە، یەك بەشی تەواوم بۆ ئەوە داناوە. هەندێکی تر هەیە لە بەشەکانی داهاتودا لە شوێنی خۆی دا وەڵامم داونەتەوەو رونم کردونەتەوە.

لەم هەوڵەمدا چەندم پێکا بێ سوپاسی خوای لەسەر دەکەم و هیوام وایە ببێتە پێشەکیەك بۆ داهاتوو. وە ئەگەر هەڵەیەکیش، یان

نـەپێکرانێك رووی دا بێـت – هـەموو مـرۆڤێن – خـۆم لێـی بەرپرسـیارم و هیـوادارم بـە رەخنـەی زانـستی و دوور لـە رق و قـین راسـت بکرێتـەوە، کە یاریدەی باسەکە بدات و، سوود بە مێژووی کورد بگەیەنێت.

### بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

## پێشەکی چاپی پێنجەم

کتێبی تەفسیر و سیرەو سوننە و شەریعەت و فقە و مێژووی ئیسلام، لە مەزنترین سەرچاوەکانی ئیسلامن، بریا دەزگایەکی گەورە و بە توانا و، خەڵکانێکی بە ئەزموون و شارەزا و زمانزان لە زمانی عەرەبی و کوردیدا، پێکەوە ئەوانەیان دەنووسی یان وەردەگێڕا، ئەوسا خەڵکی نەیدەتوانی بە کەیفی خۆی شت لەسەر ئیسلام دروست بکات و هەڵبەستن و بوختان بنووسێ!.

ئەم بازاڕ هەژارییەی کتێبخانەی کوردی، وایکردووە کە هەرکەس چۆنی بووێ، ئاوا دەقە ئیسلامییەکان شێدەکاتەوە و لێی لادەبات و پێوەی دەنێ و چەواشەکاری دەکات، خەڵکیش، چونکە سەرچاوە ڕەسەنە ئیسلامییەکانیان بە زمانی پەتی کوردی و، بە شێوازی هاوچەرخانە لەبەردەستدا نییە، هەتا تەحقیق لەو دەستکاریکردنانەدا بکەن و ڕاستیی بزانن، ڕەنگە هەر بەو شێوازە هەڵەیە لە ئیسلام حاڵی ببن، ئەوسا بە هەڵە لە ئایینەکەیان دەگەن و دڵکرمێ دەمێننەوە، ئیتر لەوێوە لاوازیی ئایین لە کۆمەڵگادا دروست دەبێت.

نوسەرە کۆنەکانی سەردەمی یەکەمی ئیسلامی هەرچیان بیستووە بێ کێشان و پێوان و بەراورد، هەموویان وەك فەرمانێکی ئاینی و ئەمانەتێك کۆکردۆتەوە و بڵاویانکردووەتەوە و باش و خراپێکی زۆریان مەکۆکردووە، ئەمە وایکردووە ڕۆشنبیر و گەنجەکان لەو خەرمانە تێکەڵە بێتاقەت ببن و بە ئاینی بزانن، هەربۆیە لە قوتابخانە ئیسلامییەکان کۆچیان کردو لە مێرگی ڕۆژهەڵاتناس و ئەورووپییەکان دەواریان هەڵدا، زانست و زانیاریان

لـەوان وەرگـرت، وایانـدەزانی ئـەوەی ئـەوان وەحییـە و زانـستی تـەواوە و تـەعبیر لـە راسـتەقینەی پوخـت دەکـات، هەربۆیـە جیلێـك لـە گـەنجانی موسـوڵمان لــە جیهانــدا بەزایەچــون و کەوتنــە لاسـایی کردنــەوەی ڕۆژئاوا.

چــاك وایــە نووســەری کــورد ئــەو ئەرکــە قورســە گرانــە هەســتپێبکات، بخوێنێتــەوەو بەعــەقڵی خــۆی بیربکاتــەوە و هەڵبسەنگێنێ، هەڵــەی ڕۆژهەڵاتناسـان دووبـارە نەکەنـەوە، ئـەوان بـە نـەزانی تێیکـەوتبوون، بـاس لـە ئەستێرەیەك دەکـەن کـە نـە دیویانـە و نـە باوەڕیــان پێیــەتی، هەرچــەند هەنــدێ ڕۆژهــەڵاتناس لێکۆڵینــەوەی دڵـسۆزانەی کــردووە، بــەڵام لەبــەر نــەبوونی سەرچــاوەی تــەواو لەبەردەسـتیدا و کـەم وردبـینی لـە باسـەکانیانداو هەسـت نـەکردن بـە نهێنییـەکانی زمـانی عـەرەبی و بەلاغـە، ئـەو هەڵانـەیان بـۆ دروسـت بـوە، لەلایــەکی تــرەوە هەنــدێکیان بڕیــاری پێــشوەختیان بــووە و مەبەســیان بــووە دەگــە لــە هەنــدێ لایــەنی بنــچینەکانی ئیــسلام بــدەن، زیادەڕەویــشیان تێــداکردووە، هەقوایــە لێکۆڵــەرە کوردەکــان لــەو باســە شـێواوانە دووربکەونـەوەو بـە زەینـی خۆیـان بیربکەنـەوە، ئـەوان نـەك لـە بــارەی موحەممــەدەوە ﷺ شــتی زۆر ناڕەوایــان وتــووە، بــەڵکو نووسـیویانە عیـسا لـە مێـژوودا نـەبووە، هەنـدێکی تریـان عیـسایان بـە شـێت نـاوزەد کـردووە، ئـەو نووسـینانە بەرهـەمی شـەڕی نێـوان کەنیـسە و دەوڵـەت بـوو لـە ئـەورووپادا، نووسـەرانی ئـەو کاتـە لـە دژی کەنیـسە قسەیان، نـەك بـە عیـسا و مەسـیح، بـەڵکو بـە ئیـسلام و موحەممـەدیش وتــوە، دەتــوانم بڵــێم ئــەوان لــەو کاتــەدا بەرامبــەر ئــایینی مەســیحی شـێوێندراوو هـەژارو خەڵەتێنـەرو تێکـدراو، ناهـەقیان نـەبووە و چـاکیان کـردووە، بـەڵام خـەتاکار تووتییـەکانی لای خۆمانـە لـە کوردسـتان، کـە نـازانن سـەردەمی ڕێنـسانس و شـەڕی نێـوان کەنیـسە و زانـست چـی بــووە؟!، دێــن لــەم ســەردەم و زەمینــە دوورەوە هەڵــەکانی ئــەوان

دەڵێنــەوەو بەبێــسود بــۆ ئێمــەی دەگوازنــەوە، ڕۆژهەڵاتناســان کــە نووســیویانە عیــسا ناوێــك لــە مێــژوودا نــەبووە، وتووشــیانە موحەممــەد نــاوێکی نــوێترەو ئــەو ســەرەتا نــاوی محەمــەد نــەبووە، دکتــۆر جــەمال ڕەشــید کــە لێکۆڵەرەوەیــەکی نــاوداری مێــژووی کــوردە، بێلێکۆڵینــەوە ئــەو وشــەیەی ئــەوانی نــەقڵ کــردووە، ئــەم شەســت ســاڵی تەمــەنی هــەر نــاوی محەمــەدی بیــستوەو باســکردوە، کــە پاشــتر لــە ئەوروپیــەکان ئــەم وشــە نوێیــە وەردەگرێــت، وایزانیــوە یەکــەم کەســە ئــەم قــسە نوێیــە بێنێتــە کوردســتان، خوێنــەری کــورد ئــەم نەقڵکردنــە راســتەوخۆ بــێ لێکدانــەوە نــاو دەنــێ چــی..؟ کــەم کــەس هەیــە وەك دکتــۆر جــەمال توانــای دەرهێنــانی مــەغزای ڕووداوو نــاوو ئاســەوارو لێکۆڵینــەوەی زانــستی هــەبێ، نــازانم ئــەم هەڵانــە چــۆن کەوتنــە نــاو زانیارییــەکانی دکتــۆر جــەمال و لەبــەر چــی و بــۆ کــێ ئەمــەی کــرد..!! بــە ڕاســتی ئــەم نەقڵکردنــە ســاکارانە زانیاریــەکانی تــری دکتــۆر جــەمال دەخاتــە ژێــر پرسیارو دەبــێ پیــا بچینەوە، ئــەو باســانە لــە بــەرەنجامی شــەڕی نێــوان کەنیــسە و دەوڵــەت و ڕۆشــنبیران، لــە نێــوان پیــاوانی زانــست و پیــاوانی ئاینیــدا ڕوویــدا، ئیــسلام لــەو شــەڕو ناکۆکییــە بــە دوورەو بــە هــیچ کلۆجێــك دەســتی تێیــدا نــەبوە، کــە چــەند ســەدەیەکی خایانــد، کەنیــسەی ملــهوڕ و ســتەمکار، ســەدان زانــای مــەزنی ئــەوروپی لــەو شــەڕەدا کوشــت و سووتاندو ونکرد..

لــە هــیچ کتێبێکــدا نەمــدیوە نووســەرێکی عــەرەب یــان کــورد بتــوانێ خۆیــان شــتێك لەســەر ئیــسلام و قورئــان بــە تێفکــرینی خۆیــان بڵــێن، هەرچــیان وتــووە کتومــت لــە ڕۆژهــەڵاتناس و مــژدەدەرە گاورەکانــەوە گواســتوویانەتەوە و تــەنها زیادەیــەك کــە هــەبووبێ زانــستەکەی ئــەوانیان بــە ڕقێکــی زیــاترەوەو بــە نــاوی خۆیانــەوە نــەقڵ کــردووە، واتــە ئەمان ڕق و بوغزیان زیاترە نەك زانستەکە.

کۆکردنـــەوەی مێـــژووی ئیـــسلام دوای سەدســـاڵ زیـــاتر لەقـــسەی دەمـــاودەم وەرگـــیراون و نوســـراون نـــەك لـــەدەقی نوســـراوی ســـەرەتای ئیـسلام، ئەوەتـە تەبـەری دەڵـێ من هەرچیم بیستوە نوسیومە ڕاست بـێ یـان هەڵـە مـن لێـی بەرپرسیار نـیم، ئەگـەر دەقێکـی ترتـان دەست کـەوت پێچەوانەی ئـەوەی مـن بـوو، ئـەوەی مـن بدەن بـە دیـوارداو فڕێـی بـدەن، تێبینـی مێـژووی مردنـی ئـەم مێژوونووسـانە بکـە بزانـە چـەندە دوای سـەرەتای ئیـسلام مـردون: ئـیبن ئیـسحاق سـاڵی ٨٥ی کۆچـی مـرد، ئـیبن هەیـسەم سـاڵی٢٠٧ك مـرد، ئـیبن خـەیات سـاڵی٢٤٠ك مـرد، ئیمـامی تەبـەری سـاڵی ٣٠٢ك لـە نوسـینی تـاریخ رسـل والملـوك بویـەوەو سـاڵی ٣١٠ ك مـرد، مەسـعودی ٣٤٦ك مـرد، ئـیبن حوقـل سـاڵی٣٥٠ك مـرد، ئـیبن نـەدیم سـاڵی ٣٧٨ك مـرد، ئـیبن مـسکەویە سـاڵی٤٢١ك مـرد، موحـسین ئەلـصابی سـاڵی ٤٤٨ك مـرد، یـاقوتی حەمـەوی سـاڵی ٦٢٦ك مـرد، خـەتیبی بەغـدادی ٤٦٣ك مـرد، ئـیبن ئەسـیر ٦٣٠ك مـرد، ئـیبن خەلـەکان ٦٨١ك مـرد، ئـیبن خەلـدون ٨٠٢ك مـرد، ئیمـامی سـەخاوی ٩٠٢ك مـرد، بزانـە نێـوانی سـەرەتای ئیـسلام و مردنـی مێژوونوسـانی ئیـــسلام چـــەند زۆرە، والـــەوێ ڕوداوەکـــانی ئـــەمڕۆ چـــەندە ئـــاڵۆزو نـەزانراوە، نـازانین بنـەڕەتی گرفتـی هەنـدێ کێـشەی گـەرمی ئـەمڕۆ چـییە..؟ شـەرت نیـە هەرچـی مێـژوونووس وتبێتـی ڕاسـت بێـت، مەسـعودی کـە لـە تەبـەری وردتـرە دەڵـێ کـورد لەئەسـڵدا لەجنۆکەیـەك کـە لەگـەڵ شـاخیەك نزیـك دەبنـەوە پەیـدا دەبـن و ئەسـڵی کـورد شـەیتان و جنۆکـەی شـاخیە، ئەمـە هـەرگیز لەقـسەی مەسـعودی زانـا ناچـێت، چـونکە مەسـعودی دەزانێـت کەپێکهاتـەی جنۆکـە و مـرۆڤ جیـاوازە، وەسـفی کـورد زۆر دەکـات، ئـەی دەبـێ لەبـەرکێ ئـەوەی نوسـیبێت..؟ مـن دەڵـێم ئـەوە بـۆ کتێبەکـەی مەسـعودی زیـادکراوە کاتێـك کـە کتێبەکـە ماوەیـەکی زۆر بـە دەستنوسـی لـە ئـەورووپا بـوو، ئایـا دەبێـت ئێمـە ئـەم قسەیە وەربگرین و بە گوێی بکەین و بڵێن ڕاستە..؟

لە گێڕانەوە مێژوییەکاندا باس هەیە ڕاست و دروست و هەیە درۆو هەڵبەستراو، مێژوونووسان نەیانوتوە هەرچیمان نوسیوە سەد دەرسەد تەواوە..!!

کتێبی سیرە و سوننەت و صیحاح و مێژووی ئیسلام سەد ساڵ زیاتر دوای پێغەمبەر نووسراون، دوای ئەوەی کە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا پڕوپاگەندەی سیاسیی و فیتنە دروستبوو، ئیتر گێڕانەوەکان جۆراوجۆری لێهات، هەر یەکە بە گوێرەی خۆی، بە دڵی خۆی، بە لای خۆیدا کێشی دەکرد، بۆ پاڵپشتی کۆمەڵی خۆی قسەیان دروست دەکرد، ئەمە لە سەردەمی (عەلی و موعاویە) و سەردەمی فیتنەی گەورەی نێوان موسڵمانان، کە هێشتا سەحابەیەکی زۆر لە ژیاندا مابوون، ئەی چی دەکەی لە سەردەمی دوای ئەوان، سەردەمی دوودڵیی و توندوتیژیی و شەڕ و ئاشووبی نێوان برا ئایینییەکان، تەنانەت ناکۆکییە سیاسییەکان هۆ بوون بۆ کۆکردنەوەی فەرموودە، ئەوان هەوڵیاندا فەرمودە دروستکراوەکان لابەرن، زۆر گەڕان و ماندووبوون، سوور بوون لەسەر نووسین و کۆکردنەوە، کێ هەیە هەوڵەکانی ئیمامی (بوخاری) نەبیستبێ، ماندووبوون و برسێتی چەشت هەتا ٦٠٠ هەزار فەرموودەی کۆکردەوە، کە لە زەین و دەمی خەڵکییدا بوون، دواتریش دەرکەوت کە ئەو ئەرکە پیرۆزەی بوخاری کە بە ماندوبوون و زەحمەت و دڵسۆزی دەستیکەوت، زۆر وردەکاری بەکارهێنا هەتا خۆی لە فەرموودەی لاواز و هەڵبەستراو بپارێزێ، دەرکەوت کە تەنها (٤) هەزار فەرمودەی صەحیحە، واتە لە (١٥٠) فەرموودە یەك دانەی تەواو راستە، بەڵام (ئەبوداود) کە (٥٠٠) هەزار فەرموودەی کۆکردووەتەوە، (٤٨٠٠) فەرموودەی راستە، هەموو کۆکراوەکانی فەرموودە ئاوا دەرچوون، ئەو فەرموودانەی کە بەو هەموو ماندوبوون و شەوو رۆژە کۆکرایەوە، دوای شەن و کەوکردنیان لای زانایانی

فەرمووده لە سەدا پێنجی راست دەرنەچوو، بەڵکو جێی رەخنەو گازندەو قسە لەسەرکردن و گومان و بەدواداچوونی زانایان بوو، لە کۆتاییدا سەدان چیرۆکی هەڵبەستراوی وەك چیرۆکی (غرانیق) بە درۆ و هەڵبەستراو دەرچوون، ئەگەر ئەوە حاڵی فەرموودەکانی پێغەمبەر بێت کە زۆر وردەکاری تیاکراوە و خەڵکی خۆیان پاراستووە لە گێڕانەوەی هەڵە هەتا بەر هەڕەشەکانی فەرمووده نەکەون، ئەی دەڵێی چی بۆ ئەوانەی دواتر نووسراون لە کتێبی سیرە و مێژووی ئیسلام کە خەڵکی گوێی لە ترس و وردەکاری نەداوە، هەرچی بیستوەو چۆنی بیستووە وا گێڕاویەتییەوە.

لە راستییدا ناکۆکییە سیاسییەکانی نێوان موسڵمانان کە دوای سەردەمی یەکەم و سەرەتای ئیسلام هاتە ئاراوە، بووە هۆی ناکۆکیی لەسەر زۆر فەرمووده کە پاڵپشت بوو بۆ کەسێك، یان دەستەیەك، یان دژ بووە بە دەستە و گرۆهێك، بەکار دەهێنرا و رەواجی پێدەدرا، فەرمووده دوای ئەو رووداوانە نووسرایەوە لە سەردەمی ئومەوییەکاندا، دوای ئەوە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بڕیاریدا کۆی بکاتەوە، بەلاّم کۆنەکرایەوە تا سەردەمی مەئمون ( ١٩٨ــ٢١٨ك)، لە دوای ئەوەی کە فەرموودەی راست لە ناو فەرمووده هەڵبەستراوەکاندا بووە تاڵە موویەکی سپی لە پێستی گایەکی پێست و موو رەشدا، بە وتەی (دار قطني)، هەر بۆیە لە سەرەتای ئیسلامدا فەرمووده کۆنەکرایەوە، چونکە پێغەمبەر فەرمووبووی: (لا تَكتُبوا عَنّي شَيئاً غير القرآن، و مَن كَتَبَ شيئاً غير القرآن فليمحوه)، لەو رۆژەوە فەرموودەکان هەر بە سەر زمانەوە دەوترا و دەگێڕرانەوە، هەر بۆیە زیادو کەمیان بۆ کراوە، گێڕانەوەکان جیاواز بوون و لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر گۆڕاون، عومەری کوڕی خەتاب لە سەردەمی خەلیفایەتی خۆیدا هەستی کردبوو کە دەبێ فەرمووده بنووسرێ، پرسی بە هاوڕێکانی پێغەمبەر کرد، ئەوان رازی بوون، عومەر بۆ ماوەی یەك

مـانگ نوێـژی ئیـستیخارەی کـرد، بەیانییـەك هەسـتا و عـەزمی جـەزم کـرد و وتـی: (مـن دەمـەوێ سـوننەتەکان . فـەرموودەکان . بنووسمـەوە، بـەڵام بـە خـوا مـن هـەرگیز قورئـان بـە هـیچ شـتێك ناگۆڕمـەوە) ئـیتر وازی لـە نووسـینەوەکە هێنـا، بـۆ ناوچەکانیـشی نووسـی: (هـەر کـەس شـتێکی لایـە بـا بیکوژێنێتـەوە)، دوای ئـەوە فـەرموودەی نـوێ و هەڵبەسـتراو لـە دایـك دەبـوو، دەم بـە دەم دەکـرا، هـەتا لـە سـەردەمی مەئمونـدا هەرچـی بە پاك و راست زانرا کۆکرایەوە.

لەگـەڵ ئـەوەی کۆکـەرەوانی فـەرموودە زۆر سـوربوون و کۆشـاون و وردەکارییـــان بـــەکارهێناوە، زاناکـــان زۆر هەوڵیانـــدا راســـتییەکان نـاوبنێن، پێـشەوا نـەوەوی لـە شـەرحی موسـلیمدا دەڵـێ: (اسـتدرك جماعـة علـى البخـاري و مسلم أحاديـث أخَـلاَّ بِشرطهم فيهـا و نزلـت عـن درجـة مـا التزمـاه) ئەوانـەی فـەرموودە کۆدەکەنـەوە میقیاسـی فەرموودەکـە و سـیقەکردن بـەوەی کـە فەرموودەکـە دەگێڕێتـەوە، دەکەنـە بناغـەی وەرگـرتن و قبـوڵکردنی فەرموودەکـە، یـان وەلانـانی، ئـەوە پێوانەیەکـە نرخـی خـۆی هەیـە، بـەڵام هـەر ئـەوە بـەس نییـە، ئـەمڕۆ لای ئێمـە چـاکترین پێوانـە کـە فـەرموودەی پـێ بپێـورێ، یـان هەواڵـەکانی ژیاننامـەی پێغەمبـەری پـێ بپێـورێ هـەر ئەوەیـە کـە لـە پێغەمبـەرەوە دەگێڕنـــەوە کـــە فەرموویـــەتی: (ئێـــوە دوای مـــن نـــاجۆری و رای جیاوازتـان بـۆ دروسـت دەبێـت، هـەر چییان لـە بـارەی منـەوە بـۆ هێنـان بیدەنـە بـەر قورئـان، هەرچـی لەگـەڵ قورئانـدا تـەواو دەرچـوو ئـەوە هـی منـە، هەرچـی نـاجۆر دەرچـوو، ئـەوە هـی مـن نییـە)، ئـەوە پێوانەیـەکی وردە، لـە کۆنـەوە پێـشەوایانی موسـڵمانان کـاری پێدەکـەن، هـەتا ئـەمڕۆش، ئـیبن خەلـدون دەڵـێ: (مـن بـڕوا ناکـەم بـە گێڕانـەوەی فەرموودەیـەك، یـان وتـەی سـەحابییەك کـە پێـچەوانەی ئاشکرای قورئـان بێـت، تەنانـەت ئەگـەر گێڕەرەوەکەشـی بڕوامـان پێـی هـەبێت)، پاشـان دەڵـێ: (نیـشانەی فـەرموودەی دروسـتکراو بـە زمـانی پێغەمبـەرەوە

ئەوەیە کە پێچەوانەی قورئان بێت، یان بنەماکانی شەریعەت و عەقڵ قبوڵی نەکات)، هەروەها بنەماکانی رەخنەی زانستیش لە بارەی فەرموودەوە هەر وا دەڵێ.

ناجۆریی و ناکۆکیی نێوان موسڵمانان دوای وەفاتی پێغەمبەر گەیشتە پلەیەك کە زاناکان کەوتنە گومان لە زۆر فەرموودەو کەسە گێرەوەکەش، کە ئەبو لوئلوئی فەیروزی، غولامی موغەیرە خەلیفە عومەری شەهید کرد، دوای ئەوە عوسمان بووە خەلیفە، دوژمنایەتی نێوان بەنی هاشم و بەنی ئومەییە کە پێش ئیسلامیش هەیانبوو، سەرلەنوێ سەری هەڵدایەوە، کە خەلیفە عوسمان شەهید بوو، جەنگی ناوخۆ لە نێوان موسڵماناندا سەریهەڵدا، عائیشەی خێزانی پێغەمبەر دژایەتی عەلی کرد، زۆریش هەبوو پشتی دەگرت و شەڕی خوێناوی لە نێوانیاندا روویدا، پاشان شەڕەکانی ئیمامی عەلی و موعاویە لە باکوری عێراق کە دەیان هەزار کوشتاری لێکەوتەوە، دواتر پەیدابوونی خەواریج و ناکۆکیی و دووبەرەکیی زۆری تر، وای لێهات هەر یەکە بە کەیفی خۆی فەرموودەی دەهێنا و کاری پێدەکرد، بەرامبەری پێ تاوانبار دەکرد، خۆی پێ بەهێز و پاك رادەگرت، گەیشتە ئاستێك ئیمامی عەلی ئینکاریی دەکردو بڕوای بە هیچی تر نەبوو جگە قورئان، هەتا لێوەی دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: (کتێبێکمان لا نییە بۆتانی بخوێنمەوە جگە ئەوەی لە قورئاندا هەیە، هەرچیش لەم کتێبەدا هەبێ لە پێغەمبەرم وەرگرتووە).

خەڵکی هەر لەوەدا نەدەوەستا کە فەرموودە دروست بکات لەبەر ویست و ئارەزوویەکی خۆی کە حەزی دەکرد خەڵکی بۆ بانگ بکات، یان رەفتارێکی بەرز کە خەڵکی بیکەن و خێریان بگات فەرموودەیەکیان بۆ دروست دەکرد، ئەوانەیان دەدایە پاڵ پێغەمبەر، کە دەسەڵات کەوتە دەست بەنی ئومەییە، ئەو فەرموودە دروستکەرانەی کە پەیوەندییان کرد بە بەنی ئومەییەوە، ئەو

فەرموودانـەیان بـە لاواز دادەنـا کـە لـە بـارەی گـەورەیی و چـاکەی عـەلی کـوڕی ئـەبو تالیبـەوە هـاتبوو، لەولاشـەوە هـەوادارانی عـەلی و ئەهلوبـەیتی پێغەمبـەر لـەو فەرمووادانـەیان زیـاد دەکـرد کـە وەسـفی خۆیـانی دەکـرد، بـە جۆرەهـا شـێواز هـەوڵی بڵاوبوونـەوەیان دەدا، تەنانـەت دژایـەتیی ئەوانەشیان دەکـرد کـە عائیـشە لـە پێغەمبـەرەوە دەیگێڕایـەوە، شـتێکی خـۆش لـەو گێڕانەوانـەی (ئـیبن عەسـاکر) کـە لـە ئـیبن سـەعد ئیـسماعیل کـوڕی موسـەنناى ئیـستراباديیەوە دەگێڕێتـەوە و دەڵـێ: کـە ئـەو لـە دیمەشـق ئامۆژگـاریی خـەڵکی دەکـرد، پیاوێـك هەسـتا پرسـیاری لـە فەرموودەیـەکی پێغەمبـەر کـرد کـە دەفـەرمووێ: (انـا مدینـة العلـم و علـي بابهـا) ئیـسماعیل کـە هـەواداری موعاویـە بـوو وتـی: (بـەڵێ، کـەس لـەو فەرموودەیـە نـازانێ مەگـەر کەسـێك لـە سـەرەتای ئیـسلامدا بووبێـت، بـەڵکو پێغەمبـەر دەفـەرمووێ: (انـا مدینـة العلـم، و ابـوبكر أساسـها و عمـر حیطانهـا، و عثمـان سـقفها، و علـي بابهـا) بـەو هەڵبەسـتن و بـۆ زیادکردنـە دانیـشتووانی دڵخۆشـکرد، هـەر بۆیـە داوای سـەنەدەکەیان لێکـرد، بـەڵام نـەیتوانی بیڵـێ، هـەر بـەو جـۆرە فـەرموودە دروسـت دەکـرا بـۆ کـاری سیاسـی و بـۆ ئـارەزوو خێـراو ساتەوەخت، هـەر وەکـو شـیعر بۆیـان دەهـات، ئەوەنـد فـەرموودەی هەڵبەسـتراو دروسـتکرا کـە موسـڵمانانی شـپرز کردبـوو، زۆری دژایـەتی بـوو لەگـەڵ نـاوەڕۆکی قورئانـدا، لـە سـەردەمی ئومەوییەکانـدا هـەوڵی زۆر لـە کـاردا بـوو بـۆ وەسـتاندنی ئەو پیشە خراپـە، بـەڵام بـێ سـوود بـوو سـەرکەوتوو نـەبون، کـە دەوڵـەتی عەباسـی هـات، مـەئمون دوای دووسـەد سـاڵ بەسـەر وەفـاتی پێغەمبـەردا، دوای ئـەوەی کـە سـەدان هـەزار فـەرموودە دروسـتکرابوون، یـان تێکـدرابوون و بـە نـاوی پێغەمبـەرەوە هەڵبەسـترابوون، لـەو بارودۆخـە ئـاڵۆزەدا کۆکـەرەوانی فـەرموودە دەسـتیانکرد بـە نووسـینەوەی فـەرموودە، نووسـەرانی سـیرەی پێغەمبـەر کتـێبی خۆیـان نووسـی و مێـژووی ئیـسلام و فتوحـات و

خەلیفـــەکان و ئەمـــەوی نووســـرایەوە، واقیـــدی و ئـــیبن هیـــشام و مـــەدائینی و خـــەڵکی تـــر لـــە ســـەردەمی مەئمونـــدا باســـەکانی خۆیـــان نووســـی، نـــە ئـــەوان وَ نـــە غـــەیری ئـــەوان نەیانـــدەتوانی پێـچەوانەی رای خەلیفـــەی عەبباســـی بنووســـن، کـــە دژبـــوون لەگـــەڵ دەوڵـــەتی ئەمـــەوی و بـــەنی ئومەییـــەدا، خۆیـــان بـــە بـــەنی هاشـــم و ئالوبـــەیت دادەنـــا، لەبـــەر ئـــەوە نووســـەران نەیانـــدەتوانی وردەکـــاریی بـــەکاربهێنن و پێوانـــە بـــۆ نووســـینەوەی کارەکانیـــان جێبـــەجێ بکـــەن کـــە پێغەمبـــەر دایـنـــابوو، پێغەمبـــەر ﷺ فـــەرمووبووی: (هـــەرچ وتەیـــەکی مـــن لـــە گـــەڵ قورئـــان نـــاجۆر بـــوو، هـــی مـــن نییـــە)، گـــەر ئـــەو پێوانەیەشـیان بـەکار ببردایـە ئـەوا ئـــــەم هـــــەموو چـــــیرۆك و فـــــەرمووده لاواز و رووداوه نەشـــــیاوانە نەدەگەیـــشتە ئـــەمڕۆی ئێمـــە، رەخنـــەی زانـــستییانەی ئـــەمڕۆ زۆر لـــەو قیـاس و پێوانەیـەی کـە پێغەمبـەر دایـنـابوو جیـاوازتر نییـە، زۆر ئاسـان دەیـــانتوانی ئـــەو پێوانـــە و شـــایانەی پێغەمبـــەر دایـنـــابوو بەســـەر نووســـینەوەی فـــەرمووده و ژیـــانی پێغەمبـــەردا بیکـــەن، بـــەڵام نـــەیانکرد، ئـــەوەش لەبـــەر هـــەر هۆیـــەکی ســـەردەمەکەیان بـــوە نـــازانم، یـــان دەیـــانتوانی شـــتێك کـــە یـــەقین و بڕوایـــان پێـــی نەبوایـــە، یـــان عـــەقڵیان نەیگرتایـــە، نەیانکردایـــە، ئـــەوەش هـــەر دەکـــراو باشـــتر دەبـــوو، قورئـــان بەڵگـــەی بڕاوەیـــە (الحجـــة القطعیـــة) لەســـەر بـــوونی پێغەمبـــەر، بـــەڵام پێغەمبـــەر بەڵگـــە نییـــە لەســـەر ئیـــسپاتی قورئـــان، بڕوابـــوون بـــە خـــوا لـــە پـــێش بڕوابوونەوەیـــە بـــە پێغەمبـــەران، نـــاتوانین بـــڕوا بهێـنین بـــە پێغەمبـــەر هـــەتا بڕوامـــان بـــە خـــوا نـــەبێت، نـــابێ تـــەنها لـــە قـــسەی پێغەمبەرانـــەوە بـــاوەڕ بـــە خوا بهێنین.

بـــەڵام ئەوانـــەی ســـیرەی پێغەمبـــەریان نووســـیوە، رایـــان وابـــووە کـــە خـــەڵکی بـــە موعجیزەکـــانی پێغەمبـــەردا خوایـــان ناســـیوە، کەچـــی لـــە ئـــەمڕۆدا هەنـــدێ لـــەو موعجیزانـــە دڵ کرمـــێ دەکـــەن و ئیمـــان زیـــاد ناکـــەن، بـــەڵکو دژانـــی ئیـــسلام ئەوانـــەیان بـــەکارهێناوە بـــۆ ناشـــیرینکردنی

ئیسلام، گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانەی کە عەقڵ قبوڵی ناکات ئەستەمە، وا چاکە ئەوەی خەریکی ئەم کارانەیە زۆر وردبێت، وردەکاری زانستیی لەبەرچاو بگرێ بۆ خزمەتی هەق و ئیسلام و مێژووی ژیانی پێغەمبەر، سەردەمی پێغەمبەر قورەیشییەکان داوایان دەکرد کە خوا موعجیزەیان بۆ بنێرێ لەسەر دەستی پێغەمبەردا، هەتا ببێتە بەڵگە، چەندین ئایەت لەسەر ئەوە هەیە، بڕوانە ئایەتەکانی (سورەتی ئیسرا ۹۰-۹۳) و (ئەنعام ۱۰۹-۱۱۱) .. قورئان گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەرە، نەك ئاودەرهێنان لە بەرد، یان دار ببێ بە مار، خوێن بارین، ئێستا عەقڵ و زانست لەوە ترازاوە، خەرافیاتی زۆر لە سەردەمی ئومەوییەکاندا بە ناوی پێغەمبەرەوە دروستکراوە، دوژمنان ئەم لاواز و هەڵبەستراوانە دێنن و دەڵێن: "عەقڵ نایگرێت"، یان لە ڕۆژهەڵاتناسە گاور و فەلەکانەوە زانیاریی هەڵە دێنن و بەسەر ئیسلامدا ساغی دەکەنەوە!.

موعجیزەی پێغەمبەر ﷺ ( قورئان)ە، عەقڵیی و ئینسانییە، ئینس و جن ناتوانن نموونە لەوە بهێنن، ئەگەر هەموویان بۆی کۆببنەوەو یاریدەی یەکتریش بدەن، وەك خوا دەفەرموێ، موعجیزەی موحەممەد قورئانە، کە گەورەترین موعجیزەیەکە کە خوا دایبارانْدوە و ڕێی بە پێغەمبەر داوە بەکاری بهێنێ، موعجیزەیەکە کە عەقڵکارانە حوجەو بەڵگەکانی دیاریکراوە و قەناعەت دروست دەکات، موعجیزەی ماددیی نییە، ئەمڕۆ خەڵکی بڕوایان بە شتێك هەیە کە عەقڵ بیسەلمێنێ و قەناعەت بە عەقڵ و دڵ بکات، ئەوەش هەر قورئانە کە موعجیزەی پێغەمبەری نەخوێندەوارە، بەوە دینەکەی سەرکەوت و بڕوای خەڵکی زیادکرد، بوو بە هێزی ئیمانیان بۆ گشت سەردەم و هەموو گەل و هۆزو زمانێك، بڕوا بە خوا پێویستی بە موعجیزەی لاواز نیە، کە لای زەین و بیر و دڵ قورس بێت، هەر بە سەیرکردن و تێڕامان لە بوونەوەرو دەوروپشتمان، بوونی خوا

دەسەلمێ، تەنانەت لە سەردەمی پێغەمبەریشدا دەنگوباس نییە کە کەسێك بە هۆی موعجیزەیەکەوە ئیمانی هێنابێت، تەنانەت باس هەیە کە ئەوانەی بڕوایان هێنابوو بە هۆی موعجیزەی ئیسرا و میعراجەوە، پاشتر بێباوەڕبوون و لە دین هەڵگەڕانەوە، وتیان چۆن بە بەشێك لە شەو ئەو هەموو سەفەر و گەشتە بۆ قودس و ئاسمانەکان و لای خوا و بەهەشت و دۆزەخ و پێغەمبەران دەکرێت، لە مزگەوتی حەرامەوە بۆ مزگەوتی ئەقسا و ئاسمانەکان بە چی ڕۆشت..؟ هیچ بتپەرستێ بڕوای بەو موعجیزەیە نەهێناو بۆیان نەسەلما، بەلام ساحیرەکانی فیرعەون کە زانا و لێزانبوون لە کارەکەیاندا، کاتێك دارەکەی موسایان بینی بوو بە مار، وتیان ئەمە سیحر نییە و هونەرکاری و فێڵ نییە، بەڵکو هێزێکی ترەو لە فێڵی سیحر بە دورەو لەلایەنی خواوەیە.

سنگ لەتکردنەکە، کە هەموو سیرە نوسەکانی کۆن و نوێ باسی دەکەن، خیلافی لەسەرە، موحەممەد شەش ساڵان بووە، بەشی شەیتان چی دەکات لەو منداڵە پاکە بێ گوناهە مەعسومەدا، کە ئەگەر لە پاشدا نەشبێتە پێغەمبەر، تەنانەت موعجیزەکەی پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی (تەبوك)دا لەسەر ئاوەکە کە بەشی تێرخواردنەوەی نەدەکردن، بەلام کە پێغەمبەر ﷺ دەم و چاوی تێدا شۆرد، کانییەکە تەقی و فوارەی کرد و بەشی هەزاران سەربازو ولاخی کرد، زۆر لە ریوایەتەکان ئەو موعجیزەیە باس ناکەن لەو جەنگەدا، پاکترین سیرە ئیبن هیشامە، باسی ناکات، کە پێش موسلیم و بوخاری نووسراوە، موسلیم باسی دەکات، رەنگە باسی ئەو کانیاوە دروستکراو بێت، ئەوەو زۆری تر پێویستی بە لێکۆڵینەوەی وردو ژیرانە هەیە، (ئیبن ئیسحاق) دەگێڕێتەوە کە کانی نەتەقی، بەڵکو باران باری، ئەم جۆرەها گێڕانەوانە باسەکە گومانلاویی تر دەکات لە رووی

لێکۆڵینەوەی زانستییەوە، دەتوانی وەری بگری، یان وەرینەگریت، باوەڕت لەق نابێت!.

هەندێك لە ڕۆژهەلاتناسان لە کاتی توێژینەوەکانیاندا بە شێوەیەکی زانستیی باسەکانیان تاوتوێ دەکرد، هەروەك هەندێ نووسەری ئیسلامییش زانستییانە کارەکانیان دەکرد، بەلام نووسەری تر هەبوو لە ڕۆژهەلاتناسان و ئیسلامییەکانیش بە گوێی هەوا و ئارەزووی خۆیان کردووە، هیچ وردەکارییەکی لێکۆڵینەوەییان بە خەرج نەداوە، گەر دەروونی خۆیان خاڵی بکردایەتەوە و بە ئارەزووی خۆیانیان نەکردایە و شتێکی جوانیان پێشکەش بکردایە، ڕەنگە لەسەر خۆیان و خوێنەر کاریگەری هەبوایەو، شتێکی دروستیان پێشکەش دەکرد.

ئاسان نییە ڕۆژهەلاتناسان لە توێژینەوەی بابەتە ئیسلامییەکاندا ئەو هەموو وردەکارییەبکەن و تێکەڵی ئەوهەموو زیادەنووسین و هەڵبەستنە بکەن، هەرچەند بە لای خۆیانەوە توێژەر بوون، کاری لێکۆڵینەوەی ڕەخنەییان کردووەو زانستییانە بۆی چوون، زۆرجار ئەوان کەوتوونەتە هەڵەی زمانەوانییەوە، چونکە هەموو نهێنی و ڕێزمان و بەلاغەتی زمانی عەرەبییان نەزانیوە، پاشان ئەوان کاریگەرن بە ئایینی فەلەی ئەورووپاوە، زۆربەیان بە گومانەوە سەیری ئایینەکانی تر دەکەن، ئەوان کەمتر دەتوانن لە حوکمی ژینگەی شوێن و کات دەرچن، لەبەر ئەوە هەم بە ڕق و قین دەنووسن، هەم گومان و دەستێوەردان و شتی خراپی تێدەکەن، هەم ناتوانن حەقیقەتێك هەستپێبکەن و بنوسن کە زۆر دووربێت لە عەقڵ و ئاین و ژینگەی ئەوانەوە، هەر بۆیە لەسەر زانایان و نووسەرانی ئیسلامیی و دەزگاکان پێویستە، بە دەستە جەمعی و ڕاگۆڕینەوە ئەو بارە قورسە بخەنە ئەستۆی خۆیان، بەمەبەستەوە هەڵسن بە توێژینەوە لەسەر ئیسلام و سیرە و مێژوو و فەرموودە، بە ڕێگەی

لێکۆڵینەوەی پاك و پوخت، خوێندنەوەی رەخنەیی زانستیی لەسەر ئەو بابەتانە بکەن، کە گومانی لەسەرەو پێویستیان بە روونکردنەوە و زانیاریی و وەڵامی زیاتر هەیە، چونکە ئەو رۆژهەڵاتناسانە هەم گاورن و دژ بە ئایینی ئیسلامن، هەم لە نهێنییەکانی زمان و بەلاغەت و رێزمانی عەرەبی نازانن و، شارەزای ئیسلام و بنەماکان و تەواوی رووداوەکان نین، چۆن ئارەزوو بکەن وادەنووسن!.

بەم کارە هەم هەڵەی رۆژهەڵاتناسان راست دەبێتەوەو، لارو چەوتییان دەردەخرێت و گومانەکانیان دەڕەوێتەوە، لە لایەکی تریشەوە رەنگە بەو زیادە زانیاریی و روونکردنەوانە، ڕاو بۆچوونی بەرامبەر بە ئیسلام بگۆڕێ و ئەنجامی چاکی لێبکەوێتەوە.

گەیشتن بەو کارە ئاسان نییە، خۆگریی و ماندووبوون و کاتی دەوێت، توێژینەوە و رێکنووسین و راستکردنەوەو، ئازادانە بیرکردنەوە کارێکی ترسناك و سەختە، بەڵام ئازایانەو هەقانیەتە ئەگەر سەرکەوتووبن، کاریگەریی باشی دەبێت.

ئێمە لە نووسین و لێکۆڵینەوە و وەڵامدانەوەدا دەبێت شارەزا و پسپۆڕبین، زۆر بخوێنینەوە، شارەزای هەموو لایەنەکان بین، دەبێ دوو سەردەم و کات جوێ بکەینەوە، ئێمە لە نووسیندا دەبێ سەردەمی یەکەمی ئیسلام هەتا کوژرانی خەلیفە عوسمان بە قۆناغێك دابنێین، لە دوای کوژرانی خەلیفە عوسمان هەتا ئەو کاتەی کە دەرگای ئیجتهاد داخرا قۆناغێکی تر بێت.

لە سەرەتای ئیسلامەوە، تا کوشتنی عوسمان، هیچ جیاوازیی و گۆڕانکارییەك لە بیروڕای موسڵماناندا نەبوە، ناکۆك نەبوون لە باسکردن و گێڕانەوەی رووداوو خەلافەت و جەنگی هەڵگەڕاوەکان و وڵاتگیری و فتوحاتدا، بەڵام دوای عوسمان ناکۆکیی و زۆر راو بۆچوون و دژایەتیی رژایە ناو هەموو ماڵ و بازاڕ و کوچەو کۆڵانێك، جەنگی ناوخۆیی روویدا، سەحابە خوێنی سەحابەی دەڕشت، لە

نێوان عەلی و موعاویەدا هەزاران سەحابە و تابیعین کوژران، بە ئاشکرا و بە نهێنی دژایەتیی یەکتریان دەکرد، لە نێوان عەلی و عائیشەدا شەڕی قورس روویدا، ئارەزوو و هەوای سیاسیی رۆڵی خراپ و خەتەرناکی بینی لە ژیانی ئایینی خەڵکدا و بە گوێرەی مرۆڤەکان دەگۆڕا، بە ئاشکرا و لە مەیدانی واقیعدا ئەوانەت دەدی، لە وتاری خەلیفەکاندا جیاوازیی ئەو دوو سەردەمە دەبینی، خۆت وتاری بەیعەی ئەبوبەکر ساڵی (١١)ك بخوێنەرەوە، بزانە باسی چی دەکات، پاشان وتاری بەیعەی ئەبو جەعفەری مەنسور لە ساڵی (١٣٦ك) بخوێنەرەوە بزانە چۆن دەدوێ و لە چ وەتەرێك دەدات، جیاوازیی مەزن و فراوان هەیە، لە کەمتر لە دوو سەدەدا هەموو شت گۆڕا، شووورای نێوان موسڵمانان بوو بە حوکمی رەها، ئەو شۆڕش و کودەتایانە کە بەسەر دەسەڵاتی ئیسلامییدا هات، زەرەری زۆری لە بنەمای ئیسلام و دەوڵەت و بڕیارەکان و سیاسەتی ئیسلامیی دا، زەرەری لە شارستانیەتی ئیسلامییدا، لەو دوو سەدەیەی دوای کوژرانی عوسماندا و هێرشی مەغۆل و سەلاجقە و بوەیهی و مەمالیك زۆر شت گۆڕا، فەترەی یەکەم کە بە کوژرانی عوسمان کۆتایی هات، بنەماو بناغەی راست و دروست لەو سەردەمەدا دروستبوو بۆ ژیانی موسڵمانان بە گشتیی، بەڵام دوای ئەوە و دوای سەردەمی یەکەم، لەگەڵ ئەوەی کە پێشکەوتنێکی زانستیی دیاربوو لە سەردەمی ئەمەوییەکان و بە تایبەتی رۆژانی عەباسییەکان، بەڵام دەستی تێکدان لە بناغە ڕاستەکە دروست بوو، لە جێگەیاندا شتی وا هاتەگۆڕێ کە لەگەڵ پایە و بناغە راستەکە و رۆحە پاکەکەی سەرەتای ئیسلامدا یەکی نەدەگرتەوە، ئەوانەی کە هاتبوونە ناو ئایینەکە و بە رووکەش موسڵمان بووبوون، لە جولەکە و فەلەو شتی تر، ئەوانەی رەواجیان دەدا بەو داهێنانە نوێیانە، خۆیان نەدەپاراست لەوەی فەرموودەی خراپ و نەشیاو و نوێ دانەهێنن، لە

کەس نەدەترسان کە بە ناوی پێغەمبەرەوە شتانێك بڵێن کە نەبووە، شتی وایان دەوت بە ناوو بە کردەوەی خەلیفە سەرەتاییەکان، کە ئەوان نەیان وتبوو و نەیان کردبوو، لەگەڵ رەوشتیشیاندا نەدەگونجا و بەوانی نەدەخوارد.

ئێمە ئەمڕۆ ناتوانین پشت بەم ماوەیەی دوایی ببەستین، بەبێ بەراوردکردن و رەخنەگرتن و بەدواداچوونی رووداوەکان.. شتی زۆر نووسراوە کە کاریگەری هەوا و هەوەس و ئارەزووی تیابووە، بە گوێرەی میزاج و کەسێتیی نووسەرەکە نووسراوە، بەلام دەتوانین پشت ببەستین بەو رووداوانەی سەردەمی پێش خەلیفەی سێیەم، دەتوانین وێنە و نەخشەی ئیسلامی پاك و جێبەجێکردنی تەواویان لێوەرگرین.

ئەو سەردەمە گیانێکی هێندە پاك بووە، کە پاڵی بە خەڵکی نیوەدوورگەوە نا، هەتا لە ماوەیەکی چاوەڕواننەکراوو ئەفسوناوییدا عێراق و شام و میسر لە فارس و رۆم بسەنن، فارسی ساسانی بە تەواوی لەناوبرا و مەدائینی پایتەختیان گیرا و یەزدگوردی دوا پاشایان کوژرا، شام و میسر تا مەغریب لە دەسەلاتی رۆم پاککرایەوە و هەتا ماوەیەکی دوور دوورخرایەوە.

ساسانی و رۆم سەدان ساڵ بوو حوکمی عێراق و شام و میسر و ولاتی مەغریبیان دەکرد، بەلام لە ماوەی (١٠) ساڵی ئەبوبەکر و عومەردا هەمووی رزگارکرا، سەربازانی ئیسلام بەو یەك دڵی و یەك راو گیانە پاکەوە دەرچوون و دەکۆشان و ئایینە پاکەکەیان بە عێراق و ئێران و شام و باکووری ئەفریقادا گەیاند.

دەبێ موسڵمانان وریابن، ئاین و مێژوو پێغەمبەری خۆیان خۆشبووێت، خۆشەویستیەکی وەهانا کە هەر لە یادی مەولود و ئیسرا و میعراج و بەدرو ئەوانی تردا بیرمان بکەوێتەوە، یان لە کاتی

کاردانەوەیەکی خراپکاران و ڕۆژنامەکانی دانیمارک و ئەڵمانیا، کە هەوڵی ناشیرینکردنی پێغەمبەر دەدەن.

واتە با کاردانەوەی کاتی و وەرزیمان نەبێت، کە لەلایەن چەند داخ لە دڵێکەوە بسەپێت بەسەرماندا، چاکترین بەرگرییەک لە پێغەمبەرمان پابەندبوونە بە ئایین و پەیامەکەیەوە، ئەوەیە گوێڕایەڵیی خوا و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و سوننەتەکانی پێغەمبەر کە بۆی جێهێشتووین.

# بەشی یەکــەم

* سوپای ئیسلام تەقە لە سنووری کوردستان دەدات
* ســــــەرەتــای رووداوەکــان
* جەنگی جەلـــــــەولا
* هەڵوێستی سوپای ئیسلام
* رزگارکردنی خانەقین و حەلوان و قەسری شیرین لە دەست فارس

## سوپای ئیسلام تەقە لە سنووری کوردستان دەدات

**سەرەتای ڕووداوەکان:**

کە سوپای ئیسلام تەقە لە دەرگای سنووری هەرێمی چیا (کوردستان) دەدات، ئەوەی کە بە دەم دەرگاوە دێت کورد نیە. هەرچەند کورد لە ماڵەوەیە. بەڵکو ئەوەی دەرگا دەکاتەوە سوپای فارسە، کە بە زۆر و زۆرداری و، بەبێ پرس و مۆڵەت ماڵی کوردی داگیر کردوە.

مێژوو لە نێوان کورد و ئیسلام دا هیچ ڕووبەڕووبونەوەیەکی تۆمار نەکردوە، کە سوپای ئیسلام دەگەنە جەلەولا (گولاڵە) و، لەو جەنگەدا سەردەکەون، نوێنەری خەڵکی شارەزوور دەگەنە جەلەولا و ڕێکەوتنێك مۆر دەکەن. ئەو کاتە کوردستان خاڵی کرا بوو لە سەربازی فارسی و، هەموو کێش کرابویەوە بۆ بەرەی جەنگی جەلەولا و حلوان و خانەقین، کورد ئەو فرسەتە دەقۆسنەوە، بە نهێنی لەگەڵ سوپای ئازادی بەخشی ئیسلامیدا ڕێك کەوتن.

پێشتر بینیمان – لە کتێبی پێش فتوحات–دا کە چۆن عەرەبی باشوری عێراق دەچن بەگژ ئیسلامدا و جاسوسی بۆ فارس دەکەن و یارمەتیان دەدەن، ئەوە بوو بە خەسارەتێکی گەورە بۆ خۆیان و فارس و موسوڵمانان. بەڵام دواتر دەبینی کە کورد لە یەك جێدا فارس بانگ ناکەن و، جاسوسیان بۆ ناکەن و، هانیان نادەن لە دژی ئیسلام، بەڵکو بە پێچەوانەوە، سێ کاری گرنگ دەکەن کە هیچ میللەتێکی تر لەسەر زەوی وای نەکردوە.

## جەنگی جەلەولا (گولاڵە)

لە بەشەکانی پێشوی ئەم کتێبە باسی کەوتنەڕێی سوپای ئیسلام لە مەدینەی پایتەختی ئیسلام بۆ (مەدائن) پایتەختی ئیمپراتۆریەتی فارسی ساسانی کرا. دوای گیرانی(مەدائن) ئەوە بوو (یەزدگورد) پاشای فارس، (کۆشکی سپی) ناو مەدائنی جێهێشت و، خۆی گەیاندە (حەلوان) لەناو هەرێمی چیا (کوردستان)دا، شاری حەلوانی کردە پایتەخت کە دووسەد کیلۆمەتر لە باکوری مەدائنەوە دوور بوو، ئەلسەعالیبی دەڵێت:

(یەزد گورد هەزاران چێشتکەر و گۆرانی بێژوو مۆسیقاژەن و نوکتەباز و وڵاخ داری نارد بۆ حەلوان، بە سواری چوار هەزار ئەسپ و عەرەبانەی شاهەنشاهی.)[1].

شیت خەتاب دەڵێت: (گەنجینە و سامان و ژن و دەستە و دائیرە و ماقولانی گواستەوە بۆ حەلوان[2])[3]. دەسکەوتی موسوڵمانەکان لە مەدائن (١٢)

---

[1]. غرر سير ملوك الفرس – ابومنصور الثعاليبي – باريس /١٩٠٠.

[2]. حەلوان: ناوچەیەکی ستراتیجیە دەڕوانێ بەسەر هەموو دەشتی عێراق دا، دەکەوێتە نێوان هەرێمی عەرەبی عێراق و، هەرێمی چیا (کوردستان)ەوە. شاری حلوان سێ هەزار ساڵ پێش زاین لە سەردەمی کاسیەکاندا هەبوە، دەکەوێتە داوێنی چیای زاگرۆس، لە لای سەروی روباری سیروان (دیالە)وە. حەلوان ناوەکەی کوردی پەتیە و لە بنەڕەتا (هەڵمان) بووە، کە لەگەڵ (هەڵاوان) هەر یەك ولتایان هەیە و لەوێوە پەیدا بوە، ئەم شوێنە لە چاو چیای سەربەرزی زاگرۆس دا گەرمیانە و کانیاوە گەرماوە گۆگردیەکانی زستانان هەڵم و هاڵاویان لێ هەڵ دەستێ، شوێنەواری کۆنی شارەکە نزیك سەرپێلی زەهاوی ئێستەیە و (ابن حوقل و یاقوتی حەمەوی) ئەم رایە پشتیوانی دەکەن و نووسیویانە: (حەلەوان شارێکە بە لاپاڵی چیاوە، بەسەر عێراق دا دەڕوانێ و لە نەخشەدا سەر بە عێراقە، لە کۆندا کە ئەوترا (الجبل) مەبەست لە چیای زاگرۆس بوو بە هەموو لق و پەلەکانیەوە، هەر لە ئەسفەهانەوە هەتا هەکاری و هەر لە دەماوەند و ئەلبورزەوە هەتا زنجیرە چیاکانی بەمۆ و سەگرمە و قەرەداغ و پیرەمەگرون. حەلوان بەر لە ئیسلام ناوەندی ئوستانی شاد فەیروز هەرێمی چیا (الجبل) بوە، کە لەم ناوچە و شارانە پێك هاتبوو (حەلوان – فەیرو قوباد – کوهستان – تامەڕا – ئاریل – خانەقین). ساڵی ١٦ی کۆچی کە یەزدگورد لە مدائن رای کرد حەلوانی کردە پایتەخت، پاشان بەرەو هەرێمی سپاهان (ئەسفەهان) رای کرد.

هەزار ماین و، ئەمبارێکی زۆر لە ئاڵتون و مجەوهەرات و چەك و تفاقێکی زۆر بوو. هەتا گیرانی مەدائن موسوڵمانەکان ئەو هەموو ساڵە نوێژی سەفەریان دەکرد – قەسرو جەمع – (سەعد کوڕی ئەبی وەقاس) سەرکردەی سوپای ئیسلام لە عێراق، نیەتی ئیقامە و نیشتەجێ بوونی لە مەدائن هێنا و، یەکەم نوێژی جومعەی بۆ کردن لە مانگی سەفەری ساڵی ١٦ی کۆچی دا. عومەر نامەی نووسی کە ئیتر مەڕۆن ئەوەندەمان بەسە، دەقی نامەکە (ان قف مکانك ولا تطلبوا غیر ذلك.)[4] هەر بۆیە سەعد نیەتی ئیقامەی هێنا بەڵام یەزگورد نەیهێشت و خۆی ساز دەدایەوە.

گیرانی مەدائن هەموو هیوایەکی یەزدگوردی بڕی. پەیوەندی بە هەرێمەکانی ترەوە بڕا. خۆی لە حەلوان نیشتەجێ بوو، داوای لە هەموو هێزەکانی کرد لە شاری جەلەولا کۆببنەوە، چونکە جەلەولا چوارڕیانی ڕێگەی هاتوچۆ بوو بۆ بۆ هەرێمەکان. ئەلکوفی دەڵێت: (هەشتا هەزار لە فارسەکان لە جەلەولا کۆبونەوە، نیەتیان هێنا بچن بەرەو سەعد کوڕی ئەبی وەقاس لە مدائن – واتە بۆ گرتنەوەی مدائن – ئەم هەواڵە گەیەنرا بە سەعد، سەعد سەرکردەکانی کۆکردەوەو راوێژی پێ کردن، هەندێ وتیان با بچین بۆیان. سەعد وتی منیش حەز دەکەم، بەڵام سەربازم کەمە، ئەوان زۆرن و من لە ئێوە دەترسێم. یەکیان وتی: ئەی سەعد مەترسە. ئەوەی دوێنێ سەری خستین بەسەریاندا هەر ئەوە ئەمڕۆش سەرمان دەخات. ئێمە دەزانین ئەگەر خوا کوژرانی لەسەر یەکێك نووسی بێ هەر دەبێ ببێ. وە ئەگەر مردنی (سەرجێگە)ی لەسەر کەسێك نووسی بێ هەر وا ئەڕوات. ئێمەش گومانمان لەوە نیە کە کوژران لە پێناو خوادا باشترە لە مردنی سەرجێگە، کەواتە مژدە

---

[3]. الفتوح – للعلامة ابن محمد احمد بن اعثم الكوفي – المتوفى سنة ٣١٤هـ، ج٢. ص٢٧٢ – بیروت ١٩٦٨.

[4]. رسائل الفاروق، عمر بن الخطاب: عبداللطيف اسماعيل الجبوري– ص٧٩، رسالة رقم (١٠٦)، بغداد ١٩٨٩.

بۆ ئەوانەی کە لە پێناوی خوادا دەکوژرێن، تەنها پاداشتی خوایشیان بەسە.)[5].

موسڵمانەکان هێشتا لە مەدائن نەحەوابونەوە، کە هەواڵ هات، سوپایەکی زۆری فارس لە جەلەولا کۆبونەتەوە بە سەرکردایەتی (مەهرانی رازی) (مەهران داد) (مەهرانی کوڕی یەزد گورد).

(یەزدگورد)، حەلوانی شاری کوردی کردە پایتەخت و شەڕی ئاڵاندە (جەلەولا) شارێکی تری کورد. یەزدگورد دەیویست لە حەلوانەوە دیفاع لە خۆی و پاشماوەی وڵاتەکەی بکات. نەخشەی شەڕ لە وڵاتی کوردانەوە لەبەر دوو هۆ بوو:

یەکەم: چونکە کوردستان (هەرێمی چیا) قەڵایەکی شاخاوی سەخت و چڕو قایم و پەناگەیەکی بەهێز بوو خۆی تیا حەشار بدات. هەروەکو (دارا) پاشای کۆنی ئێران کە لە ساڵی(٣٣٢)ی پێش زاییندا لەبەردەم (ئەسکەندەری مەکدۆنی) پاشای رۆم دا شکا، خۆی ئاڵاندە کوردستان.[6]

دووەم: یەزدگورد دەیویست کورد ناچار بکات پشتی بگرن و داکۆکی لە خاکی داگیرکراویان بکەن و، بە گژی موسوڵمانانندا بچن. یەزدگورد دەیزانی ئەگەر کورد لەسەر رایەك یەك بگرن و کۆببنەوە، هیچ هێزێك نیە بەریان بگرێت. عومەریش ئەوەی دەزانی، هەر بۆیە بە سەعدی وت لە حەلوانەوە نەچێتە ناو هەرێمی چیا. یەزدگورد بەو کارە دەیویست سوپای ئیسلام رابکێشێتە ناو کوردستان و گیانی دیفاع لە خاك و لە کوردیان تیا ببزوێنێ و خوێن بۆ خاکیان برێژن. یەزدگورد دەیزانی کوردەکان زۆر بە دڵ پشتی ئیمپراتۆریەتی ساسانی ناگرن، دەیویست لەو رێگەیەوە بیان جولێنێ. یەزدگورد دەیویست وەك عەرەبی لە دەست چوو، کوردی لە دەست نەچێت! بەڵام لەوە دەچێت کورد لە پێش یەزدگوردەوە لەو هاوکێشەیە حاڵی بوو بن!

---

[5]. الفتوح: للعلامة ابن محمد احمد بن اعثم الكوفي – المتوفى سنة ٣١٤هـ، ج٢. ص٢٧٢ – بيروت ١٩٦٨.

[6]. شەڕەکانی ئەسکەندەری مەکدۆنی: پلوتارك. ل٣٢، راپەڕین/ ١٩٧٣ سلێمانی.

دۆست و دوژمنی خۆیان جوێ کردبێتەوە! خاکی کوردان زۆر و فراوانە، خۆشیان گەلێکی کۆن و قەرەباڵغن، هەزار ساڵ بوو دەکرانە فارس و رۆم و ئەرمەن و تورك، دەگوازرانەوە و راپێچیان دەکردن. بە زۆر مەجوسی و ئاگرپەرستی و ئاینی گاوریان بەسەردا دەسەپاندن. لە شەڕی هەزار ساڵەی فارس و رۆم دا پسا بوون، خەسارەتێکی قورسیان دا بوو. مەیدانی جەنگەکە کوردستان بوو، کورد هەمیشە چاوی لە پەیدابوونی هێزی سێیەم بووە، کە پەیدا ببێ و ئەو دوو زلهێزە بێ وێنە جیهانیەیان لەسەر لا بەرێ، ئەوەتا سێهەمێکی ئازا و پاك و دادپەروەر پەیدا بوە، هەڵیان سەنگاندوە، دەرکەوتوە کە دەتوانێ ریش سپێتی بکات و، لە گۆڕی فارس و رۆم بێت. کورد شتی بینی بوو، بۆیە نیەتی هێنا پەیوەندی بە ئیسلامەوە بکات، فارس و رۆمی بینی بوو، ئیسلامیشی هەڵسەنگاند بوو! یەزدگورد دەیەوێت شەڕەکە بناڵێنێتە کوردستان، قوڵایی هەرێمی فارس و ئیمپراتۆریەتە شپرزەبوەکەی پێ بپارێزێ. دەیەوێ شەڕ لە ماڵی کەسێکی تردا بکات. بەم کارە چەند مەبەستێکی پێ دەپێکێت، دەیەوێ وەك پشیلەی سوتاو (کلکە نەوتینە)، خۆی لە وڵاتی کوردان و، هەرێمی چیا بناڵێنێت. نوێنەرانی فارس و رۆم بە بەردەوامی لە هات وچۆدا بوون لە نێوان قوستەنتنیەو مەدائنی کۆن، قوستەنتنیەو حلوانی تازەدا، بۆ راگۆڕینەوە و پرس وڕا لەسەر رووداوەکانی ناو عێراق. پێشتر لە جەنگی(ئەلفیران)دا [7]، بینیمان کە چۆن فارس و رۆم و عەرەبە لادەرەکان لە یەك بەرەی جەنگیدا بەرامبەر بە موسوڵمانەکان شکستیان خوارد، لە رێکەوتنێکی نێوان فارس و رۆم دا بڕیاردرا کە فارسەکان هەموو هێزەکانیان لەسەر سنووری رۆم بکێشننەوە بۆ بەرەی جەنگی جەلەولا و خانەقین. لەسەر ئەو رێکەوتنە فارسەکان کوردستان و ئەرمینیایان لە هێزەکان خاڵی کردەوە بۆ بەردەم بەرەی جەنگی موسوڵمانەکان[8] .

---

[7]. لە مەدینەوە بۆ مدائن: حسن محمود حمه کریم. ل٤٢. سلێمانی. ١٩٩٧/٤.

[8]. شەڕەکانی ئەسکەندەری مەکدۆنی — ل٤٤.

جێی سەیرە. ئەو فارس و ڕۆمەی کە زیاتر لە هەزار ساڵ بوو لە جەنگدا بوون، وازیان هێنا و بەرامبەر ئیسلام بوون بە یەك.

یەزدگورد دەیویست بە پەلە هێزێکی زۆر کۆ بکاتەوە و بەری موسوڵمانەکانی پێ بگرێت، بۆ ئەو مەبەستە بڕیاری ڕەشبگیر (نەفیری عام)ی دەرکرد. لە گۆڤاری (العربي) دا هاتووە: (. یەزدگورد نەفیری عامی دەرکرد بۆ هەموو ناوچەکان، کە هەرچی دەستی چەك دەگرێ لە – جەلەولا – ئامادە بێ)[9] (ڕۆژبەیانی) دەڵێت: (یەزدگورد دەستوری بە هێزەکانی هەرێمی چیا کوردستان و ئازربایجان و شیروان – کەلار و گەرمیان و بەدرە و جەسان – دا کە بچنە کۆمەك و یارمەتی مەهران)[10]

یەزدگورد پاشای فارس (مەهرانی کوڕی) کە بە (مەهران رازی) یان (مەهران داد) ناسرا بوو، کرد بە سەرکردەی هێزێك و ناردنی بۆ شاری جەلەولا و، داوای لێ کردن کە خەندەقێکی گەورە هەڵکەنن و خۆیان لە ناویدا قایم بکەن.

ئیبن ئەسیر دەڵێت: (پاشای فارس نامەی نووسی بۆ خەڵکی ئازربایجان و باب[11] و هەرێمی چیا کوردستان[12] و هەرێمی فارس[13]، داوای لێ کردن کە دەمەودەست بێن بەدەم بانگەوازەوە و لەبەردەم لەشکری عەرەبەکان بوەستن.

---

[9]. مجلة (العربي) الكويتي: العدد ٢٦٤ – يزدجرد الثالث – احمد عادل كمال. ص١٤٩. ١٩٨٠.

[10]. مێژووی حەسەنوەیهی و عەیاری: محمد جمیل ڕۆژبەیانی. ل١٥٤ – دارالحرية ١٩٩٦.

[11]. باب: مەبەست وڵاتی تورکمنستانە لە پشتی (باب الابواب)ەوە کە ناسراوە بە(دەربەند).

[12]. هەرێمی چیا لە سەردەمی پێش ئیسلامدا لە سێ هەرێم پێك هاتبوو کە ئەمانەن: (هەرێمی چیا، هەرێمی جزیرە، هەرێمی شارەزوور)

[13]. هەرێمی فارس: ئەوسا هەرێمی فارس کەمترین ڕوبەری هەبوو لە حەوت هەرێمەکەی کە ئیمپراتۆریەتی ساسانی لێ دروست بووو بوو، دەکەوتە بەشی خوارووی لە لێوارەکانی کەنداوی عومان. بەڵام لە ماوەی هەزار ساڵ حوکمڕانی ساسانی دا توانیان هەرێمەکە فراوان بکەن و زۆر لە خاکی هەرێمی چیا(کوردستان) بە زۆر دابڕن و بیخەنەسەر هەرێمی فارس، دەنا سنوری کوردستان پێش ساسانی هەتا تاران و خوار ئەصفەهان درێژ بووبویەوە!.

ئەگەر ناکۆك بن و خۆتان بە جیا بزانن و گوێ رایەڵ نەبن، ئیتر ئاوا کۆنابنەوە، ئێستە ئەو کاتەیە کە دەیانەوێت جیامان بکەنەوە و لە یەکمان بپچڕن، خێرا کەن، هەر هەموتان کۆ ببنەوە بۆ دژایەتی عەرەب، ئەگەر سەرکەوتین، ئەوە ئەوەیە کە دڵمان پێی خۆشە و هەوڵمان بۆ داوە، ئەگەر واش نەبوو، ئەوا کاری سەرشانمان ئەنجام داوە، نکوڵیمان نەکردوە، عوزرمان لەسەر نامێنێ).

پاشایەك، کاتێ خۆی گوێی بۆ رۆستەمی سەرکردەی نەدەگرت، ئەمڕۆ لەبەردەم میللەتدا دەپارێتەوە کە بێن بە دەمیەوەو، بە تەنها جێی نەهێڵن. ئەوە لە نامە و بڕیاری کەسێك دەچێت کە لە ناخدا رووخاو و لەسەر زەوی واقعدا شکاو بێت.

هەر کەس بە دەمیەوە دێت، رەوانەی جەلەولای دەکات. سەد هەزار سەربازی جۆراوجۆر لەو خەندەقەدا کۆبویەوە. وەك لە نامەکەیدا بۆ (مەهران)ی سەرکردەی بەرەی جەلەولا هاتووە: (چاڵێك لێ بدەن و هەر هەموتانی تیا کۆ ببنەوە بە سەرکردایەتی مەهران رازی.) تەنانەت زۆر لە کوڕ و کوڕەزا و کچانی کسراکان بەشداری ئەو شەڕەیان کرد، بۆ بەرزکردنەوەی ورەی جەنگاوەران و پاراستنی وڵاتی لە دەست چویان. داوا دەکات کە زریسکی دڕکاوی ئاسن و تەل لە تەختە ببەستن و دەوری خۆیانی پێ بگرن و لە رێگەی عەرەبەکاندا بڵاوی بکەنەوە. تەنها یەك رێگەی هاتووچۆیان لە پشتەوە بۆ خۆیان هێشتبویەوە. ژمارەیان لە سەد هەزار گوزەراند، یەزدگورد بە بەردەوام لە حەلوانەوە پارە و خواردن و سەرباز و زریسك و چەکی دەنارد بۆ بەرەی جەلەولا. لە کوردستانەوە دەنگێکی یاریدەدەر هەبوو بۆ هەڵهاتنی کوردەکان لە سوپای فارس، لە شاخە سەختەکانی کوردستاندا راکردوویەکی زۆر کۆبووبویەوە.

کارل بروکلمان دەڵێت: (کە مەدائن گیرا فارسەکان خۆیان کێشایەوە بۆ حەلوان و، لاپاڵی زنجیرە چیای شاهۆ. یەزدگورد پارچە پارچەی سوپاکەی کۆکردەوەو گوڕی تێخستنەوە و لەشکری تازەی بۆ هێنان. وردە وردە پێشی

خستن بۆ دۆڵی روباری جەلەولا کە دەڕژێتە ناو روباری دجلە لە باکوری مەدائن. ئەم سوپایە خۆی دامەزراند لە لێواری لای راستی روباری دیالە، لە لای رۆژهەڵاتی ئەو گەروەی کە شاخی حەمرین دەبڕێت، لەسەرە رێی کاروانی کۆنی نێوان عێراق و ئێران.)[14]، بڕوانە نەخشەی ژمارە (١)

یەزدگورد جەلەولای زۆر قایم کرد، چونکە سنوور بوو لە نێوان ناوچەی کورد و عەرەب دا، لە نێوان هەرێمی چیا و سەواد دا، ئەگەر لە جەلەولا بشکێن، ئەوا خانەقین و حەلوان هەر زوو چۆڵ بوەو، عەرەبی لە دەست چوە، ئیتر سنوریان نامێنێ بە ناوچەی عەرەبەوە بۆ یارمەتی. بە پێچەوانەشەوە عومەر دەیویست لە جەلەولاش راویان بنێن، هەتا دەستیان لە عەرەبەکانی ناوچەی سەواد (رەشەخاك)ی باشوری عێراق ببڕێ و کوردیشیان لێ بسێنن، ئەم دوو میللەتە(کورد و عەرەب) لە بەهێزترین پاڵپشتی ساسانیەکان بوون.

خزری بەگ دەڵێت: (کۆتایی فارسەکان بە جەلەولا هات، جەلەولا چواڕیانە بۆ ئازربایجان و باب و شاخ و فارس، تیامان و دۆش دامان، وتیان ئەگەر ناجۆر بین، جارێکی تر ناتوانین لە دەوری یەك کۆببینەوە، جەلەولا جێیەکە، جێی جیاوازیمانە، با لێرەدا یەکبگرین بۆ عەرەب، خەندەقەکەیان دەوردا بە دڕکی حسك کە لە تەختەیان بەستبوو، وەك تەلی‌دڕکاوی)[15]، (یەزدگورد دەستوری بە هێزەکانی دا بگەنە مەهران.)[16] (هێشتا موسوڵمانەکان لە مەدائن دانەمەزرا بوون، هەواڵ هات کە سوپای فارس لە جەلەولا سەنگەریان گرتوە، جەلەولا جێیەکە لە سەر روباری دیالە لە نێوان خانەقین و بەعقوبەدا[17].) خەتاب دەڵێت: (جەلەولا شارێکە لەسەر رێگەی خۆراسان لە باکوری مەدائن.)[18]

---

[14]. تأریخ الشعوب الاسلامیة: کارل بروکلمان – ج١ ص١١٦. بیروت ١٩٤٨ ط١.

[15]. تأریخ الامم الاسلامیة: محمد خضری بەگ – ج١-٢. ص٢١٥. ١٩٦٩ مصر.

[16]. فتوح البلدان: البلاذری – ص٦٣-٦٥.

[17]. معجم البلدان: ج٣. ص١٢٩.

[18]. قادة فتح العراق والجزیرة: ص٣٢٥.

(یەزدگورد پاش ئەوەی ماڵ و خێزانی خۆی و هەموو گەنجینەی وڵاتی و سوکباری بەڕێخست، سواری تەختەڕەوانێکی زەمبیل ئاسا بوو، کۆشکی سپی جێ هێشت، بە سوارە و پیاو ماقوڵانەوە روی کردە حەلوان، یەکێ لە فەرماندەکانی کەناوی مهران کوڕی بەهرام بوو، بە سوپایێکی پڕ چەکەوە لە جەلەولای بەجێ هێشت و دەستوری بە هێزەکانی چیاو ئازەربایجان و شیروان دا، بچنە کۆمەك و یاریدەی مەهران. سوپای ئیسلام زوو بەرەو نەهرەوان جوڵا، لەو ناوەدا سوکە بەرەنگارییی روی داوە، فارسەکان لە جەلەولا بنەوبار و ماڵ و منداڵەکانیشیان بەرەو خانەقین خستەڕێ)[19].

---

[19]. مێژووی حەسەنوەیهی و عەیاری: محمد جمیل رۆژبەیانی، ل١٥٥.

## هەڵوێستی سوپای ئیسلام

سەعد سەرکردەی سوپای عێراق، لە مەدائنەوە نامەی نووسی بۆ عومەر کە سوپایەکی زۆری فارس لە جەلەولا کۆبونەتەوە. عومەر ترسا ئەوە خۆئامادەکردن بێت بۆ گرتنەوەی مەدائن. بۆیە نامەیەکی خێرای بۆ سەعد نووسی کە بە پەلە ( هاشم کوڕی عوتبە کوڕی ئەبی وەقاسی برازای بە ١٢هەزار چەکدارەوە بۆ جەلەولا رەوانە بکات)[20]، ئەلکوفی دەڵێت: (لە جەلەولا موسوڵمانەکان ژمارەیان بوو بە ٢٤ هەزار کەس)[21]. عومەر لە نامەکەدا نەخشەی هێرشەکەی ئاوا داڕێژا بوو، (لە پێشەوە قەعقاع دابنێ، لە لای راستەوە موسەعید کوڕی مالیك، لای چەپ بدە بە عەمری کوڕی مالیك کوڕی عوتبە، لە پاشەوە عەمری کوڕی مورەی جەهنی)[22].

---

[20]. الاصابة في تميز الصحابة: ج٦، ص٢٧٥، القاهرة، ١٣٢٥هـ.

(هاشم) ناوی (ئەبو عەمرو هاشم کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبی وقاص)ە لە بەنی زەهریە، کوڕی برای سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصە، رۆژی فەتحی مەککە موسوڵمان بوو، لە غەزای (حنين) و (هەڵگەڕاوەکان)دا بەشداری کرد، لەگەڵ خالید چوو بۆ عێراق و شام و لە هەموو جەنگەکاندا بەشداری کرد، یەکێك بوو لەوانەی کە خالید هەڵی بژارد لەگەڵی بچێت بۆ شام، یەکێك بوو لەو (سەد) فیدائیەی کە خالید بۆ کارێکی گرنگ و تایبەت هەڵی بژارد بۆ جەنگی(یەرموك)، هەر لەو جەنگەدا چاوێکی لە دەست دا و بوو بە سەرکردەی هێزی پیادە، پاشان گەڕایەوە عێراق و لە جەنگی قادسیەدا بەشدار بوو، دوای جەنگی جەلەولاو حلوان هاشم گەڕایەوە بۆ (کوفە) و لەگەڵ مامی مایەوە و لە بەڕێوەبردنی ئیش و کارو سەربازیدا یارمەتی دەدا، عومەر سەعدی لابرد ساڵی (٢٠)ی کۆچی، دوای عومەر (عوسمان) لە ساڵی(٢٤)ی کۆچی دا سەعدی گێڕایەوە بۆ ئەمیری کاروباری کوفە، دوبارە هاشم یارمەتی دایەوە هەتا عوسمان ساڵی(٢٦)ی کۆچی لای برد. هاشم دەستی نەبوو لە جەنگ و فیتنەکانی سەردەمی عوسمان و عەلی دا. بەڵام کە عوسمان شەهید بوو هاشم بوو بە سەرکردەی هێزی پیادەی (عەلی) لە جەنگی (صفين) دا. هەتا(هاشم و عەماری کوڕی یاسر) بە یەك رۆژ لە جەنگی صفين دا شەهیدبوون، ساڵی ٢٧ی کۆچی. الاستعاب، ج٤ ص١٥٤٧.

[21]. الفتوح — ابن اعثم، ج٢ص٢٧٢. بيروت ١٩٦٨.

[22]. رسائل الفاروق عمر: عبدالطيف اسماعيل الجبوري، ص٩١، رسالة عدد١٤٣/١٩٩٠ " کتێبێکە ٤٣٥ نامەی تیایە.

سوپای ئیسلام بەرەو جەلەولا کەوتەڕێ لە مانگی سەفەری ساڵی ١٦ی کۆچی، بەرامبەر مانگی مارسی ساڵی ٦٣٧زایینی. لەناو سوپاکەدا ناودارانی مهاجر و ئەنصار و پیاوماقوڵانی عەرەبی تیا بوو. لە ڕێگە لەگەڵ هەندێ خێڵ و عەشیرەتی ناوچەکەدا ڕێکەوتنیان مۆر کرد (ڕەنگە وەفد و نوێنەری کوردەکان کە (ئەمین زەکی) باسی دەکات لەم کاتەدا بە موسوڵمانەکان گەیشتبن و ڕێك کەوتبن!، بەردەوام سەعد یارمەتی بۆ دەناردن. سوپای ئیسلام بەرەو (نەهرەوان) جوڵا، لەو ناوەدا سوکە بەرەنگاریەك روی داوە، پاشان هێزێکی تریشی بۆ ناردن بە فەرماندەیی (جریری کوڕی عەبدوڵلای بەجلی). سەعد سێ هەزار کەسی تریشی لە هێزەکانی خۆی بۆ نارد.[23]

هاشم بە ڕێی (بابل مهرون) دا ڕۆیشت، کوێخای (مەهرون) پێشوازی لێ کرد، بە ئاشتی و ڕێکەوتن کە لە یەك نەدەن[24].

یەزدگورد هێزی زۆری لە جەلەولا کۆکردەوە، مەبەستی ئەوە بوو، روگەی سوپای ئیسلام لەسەر حەلوان و ناوچە فارسیەکان لا بدەن و، رویان بکەنە ناوچە کوردیەکان. سوپای ئیسلام گەیشتە جەلەولا، هەشتا ڕۆژ گەمارۆیان دا، فارسەکان هەر کات بیان ویستایە دەهاتنەدەرەوە بۆ موسوڵمانەکان و گاڵتەیان دەکرد و ئاهەنگی بێزارکردنیان دەگێڕا. هەندێ جار پەلاماریان دەدا و دەگەڕانەوە خەنەقەکانیان. لە هێرشێکی کتوپڕدا فارسەکان لە چاڵ هاتنە دەرەوەو ڕژانە ناو موسوڵمانەکان و، شەڕێکی سەخت روی دا، بەردەوام لە حەلوان و مەدائنەوە یارمەتی بۆ هەردوولا دەهات. هاشم چوە جێیەکی بەرزو وتارێکی ئاگرینی دا. دەیگوت: (ابلوا في الله بلاءً حسناً يتم عليكم الاجر والمغنم، واعملوا لله.)[25] جەنگێکی وا کرا مەگەر شەوی (هەریر) شتی وا کرا بێت، کە توندترین کاتەکانی جەنگی قادسیە بوو! موسوڵمانەکان خۆیان لەو

---

[23]. مێژووی حەسەنەوەیهی و عەیاری: محمد جمیل ڕۆژبەیانی، ل١٥٥.

[24]. تأريخ الامم والملوك (تأريخ الطبري): الامام الطبري، ج٣، ص١٢٢.

[25]. قادة فتح العراق والجزيرة، ص٢٢٥.

تێك هەڵپرژانە رزگار کرد و دوو هێرشی توندیان کردە سەر فارسەکان. قەعقاع خۆی جویێ کردەوەو لە دوی فیێڵێکی جەنگی دەگەرا. فارسەکان شپرزە بوون و لە هەردولا زیانی گەورە کەوت، لەم نرکەو ناڵەیەدا قەعقاع توانی بەهێزە تایبەتیەکەیەوە لە پشتەوە دزە بکاتە ناو ئەو رێگەیەی کە دەچووە ناو خەنەقەکە لە ماوەیەکی کەمدا دەستی بەسەر لایەکی خەندەقەکەدا گرت. پاشان هاواری کرد (یا معشر المسلمین هذا امیرکم قد دخل الخندق و اخذ به، فأقبلوا الیه، ولا یمنعکم من بینکم و بینه من دخوله.) مەبەست گیرانی(هاشم) بوو، کە بەو جۆرەش نەبوو، ئەمە هەر بۆ تاودانی موسوڵمانەکان بوو بۆ تۆڵەسەندنەوە. جەنگ تەواو گەرم بوو، هەموو ناو خەندەقەکە گیرا و فارسێکی یەکجار زۆر کوژرا. لاشە ناوچە و خەنەق و شوراکانی داپۆشی بوو، لەبەرئەوە ناونرا جەلەولا. زۆربەی مێژوونووسان لەسەر ئەوەن کە جگە لە کەمێك، کەسیان دەرنەچوو. ئەوانیش بەرەو خانەقین رایان کرد. ئەو فێڵەی قەعقاع نەبوایە (الحرب خدعة) خەریك بوو موسوڵمانەکان ورە بەر بدەن و وەك جەنگی (جسر)یان بەسەر بێت، هاشم داوای لە قەعقاع کرد دوایان بکەوێت. ئەویش راوی نان و خانەقینیشی پێوە ئازاد کرد[26].

خزری بەگ دەڵێت: کە فارسەکان زانیان توانای خۆاگرییان نیە و لەسەریان توند بوە، راست و چەپیان دروست کردو بە فێڵێك جەلەولایان جێهێشت و بە پەلە پرزە و شکاویەوە کشانەوە[27]. تەواوی میحوەری دۆڵی دیالە پاك کرایەوە.

لەو جەنگەدا (مەهران)ی سەرکردە کوژرا، کە پشت و پەنای یەزدگورد بوو[28]، زۆر لە دەست و پێوەندی پاشا و خزمانی کسراکان کوژرابوون. کچی

---

26. تأریخ الامم الاسلامیة: محمد خضری بەگ. ص٢١٤.

27. مجلة العربي الکویتي: العدد٢٦٤. ص١٥٠، احمد عادل کمال.

28. تأریخ الاسلام: حسن ابراهیم حسن، ج١، ص٢٢١.

**یەکێك لە کسراکان (شابانوی کچی یەزدگورد) بە دیل گیرا[29]. ئەم سەرکەوتنە لە مانگی (زیلقەعدە)ی ساڵی ١٦ی کۆچی بوو.**

**دوای گرتنی جەلەولا (هاشم) سوپایەکی سوارەی خستە تەك (جریر)[30] کە لە نێوان سوپای ئیسلام و فارسەکان دا بوەستێ و ماوەی هەڵمەتی دوژمن نەدات. دوای جەلەولاش سەعد جریری کوڕی عەبدوڵلا ی بەجلی نارد بۆ یاریدەی و دەستوری پێدا کە هێڵێك دروست بکات لە نێوان سوپای ئیسلام و فارسەکان دا بوەستێ و وەك شورای پۆڵا بێخ و ریشە داکوتێ. لە نامەیەکی عومەر بۆ سەعد دەفەرموێ: (ان فتح الله علیکم جلولاء، فسرح القعقاع بن عمروا فی اثار القوم حتی ینزل بحلوان فیکون رداً للمسلمین و لیحرز الله لکم سوادکم)[31].**

---

[29].فتوح الشام: الواقيدي، ج١ ص١٢٠.

[30]. (جریر کوڕی عەبدوڵلا کوڕی جابر) لە (بەنی ئەنماری بەجلی) ساڵی (١٠)ی کۆچی موسوڵمان بوو واتە ساڵی(الوفود)، پێغەمبەر زۆری خۆش دەویست، ناردی بۆ ڕوخاندنی بتی (ذي الخلصة) لە نێوان مەککە و یەمەندا، بە (١٥٠)کەسەوە چوون و بتەکەیان شکاند و خانوەکەیان سوتاند، لە سەردەمی ئەبوبەکردا بەشداری جەنگی هەڵگەڕاوەکانی کرد، پاشان لەگەڵ خالید چوو بۆ عێراق، پاشان بۆ شام. بەشداری جەنگی حیرە و الجسر و البویب و ساباط و ذیقار و قادسیەو مدائن و جەلەولا و حلوان و ئەسفەهان و قرمسین خوزستان و نەهاوەند و هەمەدانی کرد. پاشان لە کوفە نیشتە جێ بوو، عوسمان کردی بە والی (قرقیسیا) هەتا عوسمان مرد.عەلی بە وەفد ناردی بۆ لای معاویە کە گوێ ڕایەڵی عەلی بکات، معاویە گوێی بۆ گرت بەڵام بە گوێی نەکرد، بەڵام ئیمامی عەلی و کۆمەڵەکەی سەفیریەکەی جریریان بە دڵ نەبوو، عاجزیان کرد، ئەویش چویەوە بۆ (قرقیسیا)و اعتزالی کرد، بەڵام خێڵی بەجلی هەموویان لەگەڵ عەلی بوون، هەتا ساڵی (٥١)ی کۆچی (٦٧١)ی زاینی وەفاتی کرد. جارێك جریر هات بۆ لای عومەر بە وانەی دەوری وت: (اذا اتاکم کریم قوم فاکرموه) اسد الغابة، ج١ ص٢٧٩ یان لە جێیەکی تردا پێی وت: (ما زلت شریفا في الجاهلیة والاسلام) شذرات الذهب، ج١ ص٥٨.

[31]. طبري، ج٤ ص١٨٥. رسائل الفاروق، عبداللطيف الجبوري، ص٨٧.

## رزگارکردنی خانەقین و حەلوان و قەسری شیرین لە دەست فارس

نێوانی جەلەولا و حەلوان نزیکەی سەد کیلۆمەتر دەبوو، هەر کە هەواڵی شکانی فارس و کوژرانی مەهران گەیشتە یەزدگورد، بێ ئەوەی بە دیار هێزە شکاوەکەیەوە بوەستێ تا دەگاتە لای، هەڵهات، نەی توانی بە ڕێگەی تەختانیدا بڕوات کەچی هەڵزنا بە شاخی کوردستاندا. تەبەری دەڵێت: (خۆی خزانە شاخ). بەڵام ئیبن ئەعسەم دەڵێت: (هەڵهات بەرەو نەهاوەند)[32] .ئیبن ئەسیر دەڵێت: (یەزدگورد لە حەلوانەوە هەڵهات بەرەو شاری ڕەی .[33]

پێغەمبەر دەفەرموێ: (خوا پێنج شتی داوە بە من و میللەتەکەم کە بە هیچ پێغەمبەرێکی تری نەداوە هەموو زەویم بۆ کراوەتە مزگەوت. خوا بەوە سەری خستوم کە مانگێك ڕێگە لە دوژمنەوە دوربم، ئەو دەترسێ و دەتۆقێ.[34]

(ئارسەر کرستنسن) دەڵێت: (فارس ڕاهێنانی زۆریان دەکرد لەسەر تیر هاویشتن لە کاتی هەڵهاتن دا، چونکە فارسەکان لە کاتی شەڕدا چەند سەعاتێك زیاتر خۆیان نەدەگرت)[35]

وتەی مێژوونووسەکان ڕاستە، ئەگەر سەیری نەخشەی پێشوو بکەیت (یەزدگورد)، ڕای کردووە بەرەو شاخ، پاشان چوەتە (ڕەی))، لەوێوە بۆ هەمەدان و نەهاوەند و ئەصفهان. بۆ کۆکردنەوەی هێزو سەربازە هەڵاتووەکان و دامەزراندنیان لە نەهاوەند. بە شاخدا ڕای کرد، هەر بۆیە زۆربەی شتی بۆ نەڕۆیشت و لە حلوان جێما و کەوتە دەست سوپای ئیسلام. هەروەك پێشتر لە مەدائینیش جێیهێشت.

هەر مێژوونوسێك ڕایەکی هەیە لەسەر بەرە و کوێ ڕاکردنی یەزگورد، بەڵام هەموویان لە کۆتایدا لە جەنگی نەهاوەندا یەك دەگرنەوەو هەموویان ڕاست دەکەن، چونکە بە شارەکاندا گەڕاوە بۆ کۆکردنەوەی سوپا و ڕاکێشانی

---

[32]. الفتوح: ابن الاعثم، ج١، ص٢٧٩.

[33]. الكامل في التأريخ: ابن الاثير، ج٢، ص١٤٥ – بيروت ١٩٨٩، حققه علي شيري، ماجستير في التأريخ الاسلامي.

[34]. حديث نبوي:

[35].ايران في عهد الساسانيين: آرثر كرستنسن، ترجمة: يحى خشاب، ص٩٠ – بيروت ١٩٨٢.

بیروڕای خەڵکی بەلای خۆی دا. یەکێك لە فەرماندەکانی تری سوپای عەجەم لە جەلەولا (خوڕەزادی) برای رۆستەمی وەزیری جەنگی پێشووی فارسی بوو کە لە جەنگی قادسیە کوژرا. هاشم (جریری کوڕی عەبدوڵلای بەجلی) بەهێزێکی زۆرەوە لە جەلەولا بەجێ هێشت کە ببێتە پارێزەری سنوور لە نێوان خۆیان و سوپای عەجەم دا، قەعقاعی کوڕی عەمریش لەولاوە کەوتە دوای دوژمن تا گەیشتنە خانەقین، هەرچی هێزێکی پەرتەوازەی فارس هەبوو لەو ناوەدا لەناوی بردن و خانەقینی بە ئاشتی گرت. پاشان هاشم، (جریری) لە جەلەولا بانگ کردو کردی بە سەرداری خانەقین. خۆیان کەوتنەڕێ بۆ حەلوان، ئەوێشی بەبێ شەڕ گرت[36].

ئیبن ئەعسەم دەڵێت: (ئەنجا موسوڵمانەکان کەوتنەڕێ بەرەو خانەقین. کە فارسەکان بەمەیان زانی بەرەو دوا کشانەوەو شاریان جێ هێشت و چونە قەسری شیرین. لەوێش نەوەستان هەتا حەلوان. یەزدگورد حەلوانی بەجێ هێشتبوو، (مەنوچەر کوڕی هورمزان)ی لە جێی خۆی دانا بوو، یەزدگورد خۆی گەیاندە شاری (رەی). بەلام هەندێ لە ولاخ و بار و کەل وپەل و خەزێنەکانی ناردە هەمەدان. هەر ئەو رۆژە موسوڵمانەکان چونە خانەقین بەبێ شەڕ، پاشان چونە قەسری شیرین بەبێ شەڕ، ئەنجا داوایان لە سەعد کرد رێگەیان بدات بچنە حەلوان و بیکەنە بنکەی جێنشین و بارەگای گشتییان، ئەو کاتە کە نامەکە هات سەعد نەخۆش بوو، درەنگ وەلامی دانەوە، سەربازەکان بێ تاقەت بوون، چونکە گەرم بوو بوون لە شەڕ و سەرکەوتن، پاشان داوای لێ کردن بچنە حەلوان. موسڵمانەکان رەخنەیان گرت لە سەعد بۆ دواخستنی وەلامەکە، یەکێکیان شیعرێکی پیا هەڵداوە کە ئەمە دوو بەیتێتی:

أما بال سعد خام عن نصر جيشه    قد جئت يا سعد ابن زهرة منكراً

وأقسم بالله العلى مكـــــــانه    لــو ان المثنى كان حيا لا حمـــرا

---

[36]. بروانە: خانەقین لە مێژوودا: گۆڤاری کوڕی زانیاری کورد، ژمارە ۱۸–۱۹، ل۳٤۱، بغداد.

ئەو شیعرە گەیشتەوە بە سەعد، بەو نەخۆشیەوە هەڵساو کەوتەڕێ گەیشتە قەسری شیرین کە موسوڵمانەکان خۆیان ئامادە دەکرد بۆ حەلوان. کە ئەم هەواڵە گەیشتە (مەنوچەر)، خۆی نەگرت حەلوانی چۆڵکردو گەڕایەوە هەتا گەیشتە لای یەزدگورد، سوپای ئیسلام بێ شەڕ چووە حەلوان[37]

قەعقاع پەلەی کرد گەیشتە حەلوان، خۆی تیا دامەزراند، چونکە ناوچەیەکی ستراتیژی گرنگی سەربازی بوو، حەلوان گەرویەك بوو کەوتبوە نێوانی ناوچەی شاخ و رەشەخاك، نێوانی چیاکانی کوردستان و دەشتەکانی عەرەبستان، نێوان کورد وعەرەب. قەڵاکانی حەلوانی کردە بنکە و خێرا مزگەوتێکی تێدا دروست کرد، کە مەبەست مانەوەو دامەزراندن و بەردەوامی دانە بە هێرش[38] ، حەلوان نزیکی (سەرپێلی زەهاو)ە بە لاپاڵی چیاوە بەسەر عێراق دا دەڕوانێت.[39]

حەلوان واتە پارێزگەری پێدەشت. (رۆژبەیانی) دەڵێت: (حەلوان پارێزەری سنووری پێ دەشت بوو.)[40] قەعقاع لە حەلوان مایەوە هەتا سەعد بە داوای عومەر چوو بۆ کوفە، قەعقاع ناوچەکەی دامەزراند و دەسکەوتە زۆرەکانی کۆکردەوە، پاشان قەعقاع چوو بۆ لای سەعد بۆ کوفە و کەسێکی تری بەسەر حەلوانەوە دانا.

لە حەلوان ئاڵتون و زێڕ و ماین و کەلوپەلێکی زۆر جێما بوو کۆیان کردەوە، (خمس)یان لێ نارد بۆ مدینە، کە عومەر ئەوەی بینی گریا، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف وتی: بۆچی دەگریت، ئەمە سوپاس گوزاری خوای دەوێت. عومەر وتی ئەوە نامگرێنێت، بەڵکو غەمی ئەوەمە هەر کات خوا لەمەی دابێ بە هەر گەلێك، تووشی دوژمنایەتی و حەسەد و رق و کینە بوون. ماوەیەك ئەو شتانەی بەند کرد دابەشی نەکرد و نەیخستنە بەیتولمال.

---

37. کتاب الفتوح: للعلامة ابي محمد احمد بن اعثم الكوفي، ج١، ص٢٨٠. بيروت ١٩٦٨.

38. تأريخ الشعوب الاسلامية: كارل بروكلمان، ط٧،ص٩٨. بيروت ١٩٧٧.

39. معجم البلدان: ج٥، ص٢٩٠.

40. مێژووی حەسنەویە و عەیاری: محمد جمیل رۆژبەیانی، ل١٤٩.

رازی نەبوو کەس پارچەیەك زەوی سەواد بفرۆشێ، (جریر) پارچەیەك زەوی قەراغ فوراتی کڕی، عومەر رازی نەبوو.[41]

ئەنجا سەعد نامەی سەرکەوتنی (جەلەولا و خانقین و قەسری شیرین و حەلوان) ی نارد بۆ عومەر. داوای لە عومەر کرد کە رازی ببێت سوپای ئیسلام بنێرنە ناوەوەی وڵاتی فارس.(لە نامەکەدا هاتبوو کە جەلەولا گیراوە، قەعقاع لە حلوان دابەزیوە، ڕێگەمان بدە با دوایان بکەوین)[42].

کە فارس لە جەلەولا دەشکێن، یەزدگورد لە حەلوانەوە دەتۆقێ و بە شاخدا بەرەو شاری (رەی) هەڵدێت، کەژاوەیەکی لەسەر پشتی حوشتر کە پێشتر بۆی ئامادە کرابوو سواری بوو، هێندە پەلەی راکردن و دوورکەوتنەوەی دەبێت، نایەڵێ لە هیچ جێیەك لابدەن و لە رێگا هەر دەخەوێت، گەیشتنە جۆگەیەك، دەبوو حوشترەکە باز بدات، ترسان یەزدگورد راچڵەکێ و بتۆقێ، خەبەریان کردەوە، ئەویش پیایاندا هەڵشاخاو تووڕە بوو، وتی: خراپتان کرد هەڵتان ساندم، ئەگەر لێم بگەڕانایە دەمزانی موسوڵمانەکان چەند ساڵ لە وڵاتمان دا دەمێننەوە. لە خەودا بینیم من و محمد لە خودا دەپاڕاینەوە، خودا بە محمدی فەرموو: موڵکداری سەد ساڵی ئەمانە بکە، محمد وتی: کەمە بۆم زیاد بکە. بۆی کرد بە سەدو بیست ساڵ، محمد وتی: کەمە و خەبەرتان کردمەوە، ئەگەر هەڵتان نەساندمایە، دەمزانی ماوەی مانەوەی ئەمانە لە وڵاتی ئێمە چەندە دەبێ؟ یەزدگورد لە چنگیسوپای ئیسلام رای دەکرد، حەلوانی جێهێشت و (خوسرەو شنوم)ی خستە جێی خۆی و، سەرکردەی سەربازی ناوچەی حەلوانی دایە.[43]

بەلازەری دەڵێت: (هاشم هەڵی کوتایە سەر حەلوان و بە ئاشتی گرتی. یەزدگورد لە نەهاوەند نەشاوەر یش خۆی نەگرت و هەڵهات بۆ ئەسفەهان.

---

[41]. قادة العراق والجزيرة: ص٢٤١.

[42]. رسائل الفاروق عمر: ص٨٢، نامەی ژمارە (١١٤).

[43]. مجلة العربي الكويتي: العدد٢٦٤، ص١٥٣، (البائس يزدجورد)، احمد عادل كمال، سنة١٩٨٠.

هاشم جرير و عزره ی له جێ ی خۆی دانا له حەلوان، خۆی شاڵاوی بردەسەر دینەوەر و لەوێوە چوو بۆ قرماسین – کرماشان و بە ئاشتی رێك کەوتن[44] .

جەریریش چوو بۆ شەڕی ئەهواز و ئەسفەهان  و عوزرەی لە جێ ی خۆی دانا لە حەلوان). رۆژبەیانی دەڵێت: (وا دیارە کوردەکان کە لە ستەمی ساسانی بە تەنگ هاتبوون، ئەوان بوون بە رێ نومای سوپای ئیسلام و، شەڕیان بۆ شاهەنشاهی نەکردوە، هەموو شارەکانیان هەر بەبێ شەڕ و بە ئاشتی داوە بە دەستەوە).

لە جێیەکی تردا دەڵێت: (لێرەدا دەبێ ئەوە دیاری بکەین، یەکەم: سوپای ساسانی بە بێ یارمەتی هێزی کورد هەرگیز توانای شەڕیان نەبووە و، لە هەر کوێ کوردەکان بە ئاشتی لەگەڵ هێزە موسوڵمانەکان رێك کەوتون، فارسەکان خۆیان بۆی دەرچوون)، وەکو دەبینی کە زەینەبی کوژراوە  خوسرەو شنومی فارسی بە سوپاکەیەوە هەڵهاتوە، وا دیارە هەندێ لە کوردەکان هاوکاریان لەگەڵ سوپای ئیسلام کردووە، ئەوەتا سەعد کوردێکی قوباد ناو دائەنێ بە سەرداری حەلوان لە باتی قەعقاع، هەروەها کە دلێری کوردی حەلوان زەینەبی کوژراوە، شوێنەکەی بوەتە زیارەت گاه و ناوەکەی گۆڕاوە بە زەینەڵە کۆسە " لەم داوییەدا بەعسیەکان ئەویشیان تەعریب کرد و ناویان نا(زەین لقەوس)[45] .

یەزدگورد لە حەلوان رای کرد، فەرماندەیەکی فارسی لە جێ ی خۆی دانا بە ناوی (خوسرەو شنوم) بۆ بەرەنگاری سوپای ئیسلام، ئەویش راوەستا هەتا یەزدگورد دوورکەوتەوە، پاشان نوخشەجار (زەینەبی) کوێخای حەلوانی بە سوپاوە ناردە دەرەوەی شاری حەلوان، بۆ پێش گرتنی موسوڵمانان، خۆیشی لە پشتی شارەوە لە شاخەکان چاودێری سوپای ئیسلامی دەکرد. زەینەبی ئەم جەنگەی بە دڵ نەبوو، فارس خۆیان ڕا بکەن و کورد بچێتە

---

[44]. فتوح البلدان: بلاذری، ص١١١.

[45]. مێژووی حەسەنوەیهی و عەیاری، ل١٥٦–١٥٧.

بەردەم شەڕەوە، زەینەبی مەیلی لەگەڵ موسوڵمانەکان و ئەو کوردانەدا هەبوو کە لەگەڵ سوپای ئیسلام دا بوون. لەولاشەوە لە ترسی خوسرەوشنوم نەیدەویرا بڕیارێکی ئازایانە بدات و بگەڕێتەوە دواوە، بە تایبەت خوسرەوشنوم خەڵکەکەی بە زۆر و بە خۆشی هان دا بوو شار چۆڵ بکەن و ماڵ و منداڵەکانیان لە شاخەکان بشارنەوە، چونکە هەستی بەوە کردبوو کە زەینەبی دڵی لەگەڵ موسوڵمان و کوردەکانی پاڵ موسوڵمانانن، خوسرەو شنوم بەوە ترساندبونی کە سوپای ئیسلام دڕندەیە و چەکدار و بێ چەك ناناسێ!، زەینەبیش ترسی خێزانی خۆی و کەسوکاری کوردەکانی شاری بوو، ناچار بووە بچێتە ئەو شەڕە نا بە دڵەوە، لە کەمترین بەرەنگاریدا خۆی و سوپاکەی تیا چوون و سوپای ئیسلام هاتنە حەلوان. کوردەکانی ناوچەکە و موسوڵمانەکانیش بەو ڕووداوە دڵگیر بوون، شەڕەکە کۆتایی نەهاتبوو کە خوسرەوشنوم هەڵهات و هەتا لای یەزدگورد نەوەستا. قەعقاع لە حەلوان مایەوە هەتا سەعد گەیشت، سەعد کوردێکی بەناوی (قوباد) بەسەر حەلوانەوە دانا و لەگەڵ خەڵکە هەڵهاتووەکەی ڕێك کەوتن کە سەروماڵیان پارێزراوە و ناردیان بە شوێن هەڵهاتووەکانیان دا و هەر هەموویان گەڕانەوە، کە خوسرەو شنوم ترساندبوونی. کوردەکان زانیان فارس بە کوشتیان دەدەن بۆ خۆیان، ئەوەندەی تر دڵیان لە فارس کرمێ بوو، دەبوایە زەینەڵ کۆسە وای بە خۆی و هاوڕێکانی نەکردایە و لە هەلێك دا بیدایەتە پاڵ موسوڵمانەکان، هەرچەندە ترسی خاو وخێزانی بووبێت.

ئەم خۆپەرستیەی فارس کاری زۆری لە کوردەکان کرد، کە زیاتر بچن بە دەم داوای زانایانی زەردەشتی (پیر)یەوە، ئەوەتا زانایەکی زەردەشتی لە نووسراوێکی کۆندا دەڵێت: (هۆشت لە فەرموودەکانی پیرشالیار بێ و، گوێشت لە نێرراوی خوا محمد بێت، کە دوای زەردەشت دێ و ئاینی ئیسلام دەهێنێ)[46] ، زەردەشت دەڵێت: (موڵکی ساسان لەناو دەچێت بە دەست

---

[46]. ئاینی کورد: حسن محمود کریم، چاپی سێیەم، ل٣١، ١٩٩٨ زنجیرەی ژمارە دوو.

هاوڕێکانی پێغەمبەری عەرەبی.) لە جێیە تردا دەڵێت: (دوای وەسیەتەکانم بکەون و گوێڕایەڵی بن هەتا خاوەنی وشترەسوورەکە دێت .لە وڵاتی عەرەبەوە).[47]

پیرشالیار کە زانایەکی زەردەشتی بووە لە کتێبەکەیدا (ماریفەت)، ۱۵۰سالٚ پێش ئیسلام وتوویەتی: (وەروێ وارۆنە وەروە وەرێنە) واتە بەفرێك دەبارێ و هەموو بەفرەکانی تر دادەپۆشێ، واتە ئیسلام دێت و هەموو ئاینەکانی تر پوچەڵ دەکاتەوە).[48]

جریر بێ شەڕ هەر بە ئاشتی چووە حەلوان و بە خەڵکەکەی ڕاگەیاند کە (سەروماڵتان ئازادە). قەعقاع لە حەلوان مایەوە تا سەعد گەیشت و کابرایەکی کورد بەناوی (قوباد) لەجێی قەعقاع دانا. ئەنجا نامەی مژدەی حەلوانی بۆ حەزرەتی عومەر نارد، داوای لێ کرد ڕێی بدات سوپای ئیسلام لەسەر وڵاتگیری (فتوحات) بڕوات بەڵام عومەر ڕازی نەبوو لە وەڵامی نامەکەیدا نووسی: (حەزم ئەکرد لە نێوانی ڕەشە خاکی عێراق - سەواد- و هەرێمی چیا - اقلیم الجبال-دا شورەیەکی ئەستوور ببوایە یا شورەیەکی ئاگر، نە ئەوان ڕێیان ببوایە بەرەو لای ئێمە، نە ئێمە ڕێمان ببوایە بەرەو لای ئەوان بڕۆین، ئێمە دێهاتەکانی ڕەشە خاکی عێراق مان بەسە و من سەر سەلامەتی سوپای موسوڵمانم پێ باشترە لە غەنیمەو دەسکەوت)[49] ناڵێ لە نێوان ئێمە وفارس دا، دەفەرموێ لە نێوان ئێمە و چیادا، واتە (هەرێمی چیا) کە کوردستان دەگرێتەوە، چونکە ئازایەتی کوردەکانی بۆ دەرکەوتبوو، حەزی نەدەکرد بە شەڕ بڕواتە ناو کوردەکان چونکە دەبووە زەرەری زۆر بۆ سوپای ئیسلام. نەخشەیان بۆ کوردەکان گۆڕی و سەریش کەوتن. کوردستان و شارەکانی بە ئاشتی ڕزگاربون و کەس شەڕی بۆ فارس نەدەکرد.

---

[47]. صلح الحديبية. عبدالحميد جودة السمار، ص١٥٢. فجر الاسلام، احمد امين، ج١ ص١٣٠

[48]. ڕۆژنامەی یەکگرتوو: ژمارە٨٣، مایسی ١٩٩٦.

[49]. مێژووی حەسەنەوەیهی و عەیاری: محمد جمیل ڕۆژبەیانی، ل١٥٢-١٥٩.

# بەشی دووەم

* وەستانی جەنگ، دەستپێکردنی دایەلۆگی میللەتان
* هەڵوێستی کورد و رای مێژوونووسان
* راپەڕینی خەڵکی شارەزوور
* دروستکردنی شاری کوفە
* پێکهێنانی سێ بنکەی سەربازی
* فارس و رۆم خۆیان ساز دەکەنەوە

## وەستاندنی جەنگ، دەستپێکردنی دایەلۆگی میللەتـــــان

وەستان لە حەلوان دا بە داوای عومەر، بڕیارێکی گرنگ بوو، دەیویست عێراق بکاتە بنکەیەکی ئەمین و ئەمان کە پشتی پێ ببەسترێ بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام بە ئاشتی و دوور لە شەڕ، عومەر دەیویست ئیتر شەڕ بەس بێت، مەگەر دوژمن رازی نەبێت، دەیویست بە رێیەکی تر خەڵکی لە ئیسلام حاڵی بکات، ئەم نامەیەی عومەر موسوڵمانانی خستە دۆخێکی تر، بیریان بۆ دامەزراندن و خۆ دروستکردنەوە دەچووەوە.

عومەر لە زۆر نامەدا راسپاردەی کردوە کە موسوڵمانان لەو ئاستەدا بوەستن و نەچنە نەك کوردستان و هەرێمی چیا، بەڵکو هیچ بەشێکی وڵاتی فارس. ئەمە سێیەم جارە عومەر بڕیاری وا دەردەکات، حەزی دەکرد لەگەڵ فارس رێك بکەوێت. جاری یەکەم پێش گیرانی (مەدائن) داوای رێکەوتنی کرد لەگەڵ فارس. ماوەیەك شەڕ وەستا، بەڵام فارسەکانی ناوچەی ئەهواز هەر کات هەلیان دەست بکەوتایە، پەلاماری سوپای ئیسلامیان دەداو دەستی خۆیان دەوەشاند و رێکەوتنەکەیان دەشکاند. جاری دووەم لە گیرانی مەدائین دا ئەوەبوو وازیان لە نوێژی قەسرو جەمع هێنا واتە سەفەر نەما! بەڵام کە فارسەکان لە جەلەولا کۆبوبونەوە بۆ خۆئامادەکردن بۆ هێرش بۆ سەر مەدائین، ئەو وەستانەش شکا. سێیەم جار دوای گرتنی حەلوان، عومەر هەمان داوای سێبارە کردەوە، بەڵام فارسەکان ئەو زەینەیان نەبوو ئەو هەلانە بقۆسنەوە و پارێزگاری لە خۆیان و دەسەڵات و پاشماوەی خاکەکەیان بکەن و خۆیان دروست بکەنەوە!

خەلیفە عومەر خوا لێی رازی بێت لە جێیەکی تردا دەفەرموێت: (لو ان بيننا و بين فارس جبلا من نار.) لە جێیە تردا دەفەرموێ بە سەعد: (ان قف مكانك ولا تطلبوا غير ذالك)[50].

---

[50]. رسائل الفاروق. ص٧٩، رسالة رقم (١٠٦).

عومەر حەزی نەدەکرد یەك موسوڵمان زەرەر بهێنێ، لە جێیەکدا دەیگوت: (اِن رجلاً من المسلمین احبُ اليَّ من مائة الف دینار).

عومەر مەبەستی نەبوو لەوە زیاتر بڕۆن، نامەی نارد کە بە هیچ شێوەیەك نابێ شاخ ببڕن، دەیویست خەڵکانی ئەو ناوچانەی گیراوە لە خواو لە ئاین تێبگەن. ئەوی تریش بۆ قۆناغەکانی داهاتوو بۆ شێوازێکی تر جگە شەڕ![51]. عومەر زانی کە مەدائینی پایتەخت گیرا مانای گیرانی دڵی ئیمپراتۆرە و ئەوەی ماوە لاشەی نەخۆش و لاواز و بێ دڵە و ئاسان لەبەریەك هەڵدەوەشێتەوە. دەیویست وازی لێبهێنرێ تا بۆ خۆی دەمرێ، ئەوە قازانج ترو سەلامەت ترە.

---

[51]. مختصر تأريخ العرب: سيد امير علي، ص٣٧.

## هەڵوێستی کوردو رای مێژوونووسان

ئەم بڕیارو وەستانە هەرچەندە لە ساڵ تێپەڕی و ماوەی کەم بوو، بەڵام بەرهەمی هەبوو، خێڵ و عەشیرەت و میللەتەکان بە خۆیاندا چوونەوە و، هەواڵی گەرم و گوڕی موسوڵمانەکان و دادپەروەری و راستی عەقیدەکەیانیان دەگەیشتێ، بە گەرم بە دوای باس و خواسیان دا دەگەڕان. لە مێژووی هەموو فتوحاتەکانی گەلانی جیهاندا وێنەیەك نییە شان بدات لە شانی هەڵوێستی گەلی کورد لە کاتی پرۆسەی بە ئیسلامبوونیدا، لە مێژووی هیچ میللەتێکی سەر گۆی زەویدا هەڵوێستێکی وەك کورد نابینرێ. کە بەرامبەر ئیسلام و سوپاکەی نواندبێتیان، بە عەرەبەکانی سەرەتای ئیسلامیشەوە:

١- هێشتا بانگەواز لە قۆناغی مەککەدا دەبێ کە کورد جابانی کوردی (کابانی کوردی) بە نوێنەر دەنێرێ بۆ مەککە و مدینە و هەواڵی کورد دەگەیەنێ بە ئیسلام و هەواڵی پێغەمبەر و ئیسلام بۆ کورد دەهێننەوە، ئەمە جگە لە نوێنەری ناوچەی جزیرەو بازرگانەکانی هۆزی باجن[52].

٢- کە سوپای ئیسلام دەگاتە جەلەولا پێش دەست پێکردنی شەڕ، وەفدی کورد لە شارەزوورەوە دەگاتە لای سوپای ئیسلام و پێش ئەوەی قاچ بخەنە ناو کوردستان چەند خاڵێك مۆر دەکەن بە نهێنی فارسەکانەوە وەك مامۆستا ئەمین زەکی باسی دەکات:(لە دەرکەوتنی ئیسلامەتیدا و هەر لە یەکەم پەیوەندیان لەگەڵ ئیسلامەکاندا تێفکرین و دییان کە ئەم ئایینە تازەیە بە تەواوی موافقی طبع و ویژدانیانە، لەبەرئەمە وەکو سێرمارك سایکس دەڵێت: بە ئاسانی و بەرەبەرە وەریان گرت بە پلەیەك کە مەگەر بەربەرەکانی ئەفریقا و تورکەکانی تورکستان بەو جۆرە بە دڵ و بە شەوق وەریان گرتبێ. گەلی کورد هەروەکو مێژوونووسە باوەڕپێکراوەکانی عەرەب دەڵێن لە شانزەهەمین ساڵی کۆچی دا و لە دوای فەتحی حلوان و تکریت دا لەگەڵ

---

[52]. کابان کوردی: حسن محمود کریم: چاپی یەکەم ١٩٩٧، ل١٠و١٢، زنجیرەی سێیەم.

ئوردوی ئیسلامدا پەیوەندیان کردوە. قعقاع حەلوانی زەوت کرد، بەم جۆرە یەکەم پەیوەندی کورد و گەلی کورد لەگەڵ سوپای ئیسلامدا رویدا.)[53]

٣- ئەو ریکەوتنە بوو بە هۆی بەرپاکردنی شۆرشێك لە شارەزوور، کە زۆر لە مێژوونووسان چاویان لێ قوچاندوەو باسی ناکەن، چونکە جێی فەخرو شانازی کوردە: بە نزیك بوونەوەی سوپای ئیسلام بۆ کوردستان لەسەر ریکەوتنی پێشوو، لە شارەزوور و هەورامان و شاربازێر، راپەرینێکی جەماوەری لە دژی دام و دەزگا و مەخفەر و سەربازگەکانی فارس روو دەدات و ناوچەکە پاك دەکەنەوە. ئەوکاتە کوردستان لە سێ هەرێم پێك هاتبوو، هەرێمی چیا - هەرێمی جزیرە - هەرێمی شارەزوور. ئەمین زەکی و رۆژبەیانی ئەو ریکەوتنەیان بە تەواوی تۆمار کردووە و مەردۆخی و رۆژبەیانیش باسی راپەرینەکەیان کردوە، رۆژبەیانی دەڵێت: (وا دیارە هەندێ لە کوردەکان هاوکاریان لەگەڵ سوپای ئیسلام دا کردووە)[54]، لە جێیەکی تردا دەڵێت: (وا دیارە کوردەکان کە لە ستەمی ساسانی بە تەنگ هاتبون، ئەوان بوون بە رێنومای سوپای ئیسلام و شەریان بۆ شاهەنشاه نەکردووەو هەموو شارەکانیان هەر بەبێ شەر و بە ئاشتی داوەتە دەستەوە)[55]. مسعود محمد دەڵێت: (کورد خۆش حاڵ بووە بە هاتنی ئیسلام، هەتا فارس و رۆمیان لە کۆڵ بکاتەوە.). سێر مارك سایکس دەڵێت: (کورد بە ئیسلامەوە چەسپان و پەیوەست بوون کە هیچ میللەتێکی تر وا بە ئاسانی و سەربەست قبوڵیان نەکرد.) محمد مەردۆخی دەڵێت: (کورد بە رەزامەندی خۆی ئاینی ئیسلامیان پەسەند کرد و موسوڵمان بوون.)[56]. ئەمین زەکی دەڵێت: (کوردەکان بینیان و تێفکرین کە ئەم ئاینە تازەیە بە تەواوی موافقی طبع و وجدانیانە، لەبەرئەوە

---

[53]. کوردوکوردستان: محمد امین زەکی، ج١-٢-٣، ل١٢٢-١٢٤.

[54]. مێژووی حەسنەوەیهی و عەیاری: ل١٥٢-١٥٧.

[55]. مێژووی حەسنەوەیهی و عەیاری: ل١٥٦.

[56] پێشەکی کوردوکوردستان: محمد مەردۆخی، ل٧.

به ئاسانی و بەرەبەرە قبوڵیان کرد.)[57]. مامۆستا هەژار دەڵێت: (ئاینی پاك و بێ گەردی ئیسلامەتی کە لە سەرەتاوە پەیدابوە، تیشکی برایەتی و یەکسانی وە چیاکانی کوردستانیش کەوتوە، تاریکایی و ئاگرپەرستی لەسەر رەواندوین و چاکان و پاکانی ئیسلامی پێشوو تێیان گەیاندوین کە موسوڵمانان هەموو پێکەوە بران و رەش و بۆر و سپی و مۆر و زەرد و کەوەیەك لە ئارادا نیە. ئەگەر جاران کەمێکی بێکەس بوون، وا ئێستە لە سایەی ئاینی تازەوە بونەتە زۆر و کەس زۆریان لێ ناکات.[58]) (زۆرجار کوردە موسوڵمانەکان لەشکری گەورەیان ساز دەدا و دژ بە فارس و رۆم و عەرەبە لادەرەکان جەنگاون بۆ تەمێکردنیان. چەندین دەوڵەت و ئەمارەتی سەربەخۆیان دروست کردووەو شەرعی خوایان تیا بەرپا کردوەو سەر بە دەوڵەتی گەورەی ئیسلامی بوون.)[59]

[57]. کوردوکوردستان: محمد زەکی، ل١٢٣

[58]. شەرەفنامەی شەرەفخانی بتلیسی: وەرگێڕانی مامۆستا هەژار، پێشەکی، ل٣١

[59]. کۆمەڵناسی کوردەواری: د.حسین خەلیقی، بەرگی٢ ل٢١٢-٢١٤

## راپەڕینی خەڵكی شارەزوور

با بزانین چیرۆكی راپەڕینی شارەزوور چۆنە. دوای ئەوەی تەقوتۆقی شیرو قەڵغانی ناوچەی حەلوان هێوردەبێتەوە، عومەر رێگە بە سەعد نادات بەرەو پێشەوە بچن و دەڵێت ئەوەندەمان بەسە. پەیوەندی لەگەڵ كورد و گەل و خێڵەكانی تردا دروست دەكەن، هەتا ئەوەی كە ماوە، بە ئاشتی بە ئەنجامی بگەیەنن، نزیكترین ناوچە لە حەلوان و خانەقین و جەلەولاوە شارەزوور دەبێت و سنووریان بەیەكەوەیە، مەیلی خەڵكی زەردەشتی شارەزوور بەلای موسوڵمانەكاندایە و بە تایبەتی كە لە ئاوێستای زەردەشت[60] و ماریفەتی پیرشالیاردا[61] هێمای بۆ ئیسلام و محمد و دوا ئاینی خودا لەسەر زەوی كردوەو هەموو سیفەتەكانیان ناسیوە، وە لە كاتی خۆی دا لە قۆناغی بانگەوازی مەككەدا نوێنەری ئەم ناوچەیە لە حەلوان و جوانڕۆ و شارەزوورەوە بە ناوی (كابانی كوردی)[62] گەیشتوەتە حیجاز و هەواڵی راست و دروستی محمد و ئاینەكەی بۆ خەڵكەكە هێناوەتەوە، وە (ئەبو یەحیا) مەهدی كوڕی مەیمونی كوڕی جابان، یەكێك بوە لە زانا و پارێزەرانی وتەكانی پەیامبەر گەڕاوەتەوە كوردستان ولە ساڵی ١٧٢ی كۆچی وەفاتی كردوە.[63] ئێستا حەقدە فەرموودە دیاری كراوە كە لە جابانەوە گێردراوەتەوە.

ئەمانە هەموویان كاریان لەسەر ئەوە هەبوو كە راپەڕینێكی جەماوەری لە كوردستاندا بە گشتی و لە شارەزوور بە تایبەتی بەرپا ببێ. ئەم هەواڵە گەیشتە یەزدگورد، یەزدگورد پاشاش ئەمەی لە هێرشی سوپای ئیسلام پێ ناڕەحەت تر بوو، شۆڕشی جەماوەر لە هێرشی دەرەوەی سەر سنوورەكان خەتەرترە، چونكە دەسەڵات لەسەر میللەت دادەمەزرێ، ئەگەر میللەت شۆڕش بكات پاشا بۆ كوێ رابكات، پشت بە كێ ببەستێ.؟، بۆیە دنیای لێ هاتەوە یەك بە پەلە سەركردەیەكی

---

60. ئاینی كورد: حسن محمود حمه كریم، چاپی یەكەم، ل١٧.
61. ئاینی كورد: حسن محمود حمه كریم، چاپی یەكەم، ل٢٩.
62. كابانی كوردی: حسن محمود حمه كریم، چاپی یەكەم، ل١٢، ١٩٩٧.
63. هەمان سەرچاوە، چاپی یەكەم، ل١٦، ١٩٩٧. كۆمەڵناسی كوردەواری، د.الخلیقی، ل٢٨٣، ج٢.

نزیك و ئازای بە دوو هەزار سەربازی تایبەتی خۆی بەرێ دەخاو، دەیان نێرێ بۆ سەرکوت کردنی راپەڕینی شارەزوور، بۆ گێڕانەوەیان بۆ سەر ئاینی زەردەشتی و مەجوسی، یەزدگورد کە ئەو کاتە لە حەلوانەوە رای کردبوو لە پشتی کرماشانەوە کە (نەهاوەند) دەگرێتەوە چاوەڕوانی ئەنجامی هەردوو بەرە جیاوازەکەی جەنگ دەکات، بەرەی جەنگی حەلوان لەگەڵ سوپای ئیسلام و، بەرەی جەنگی شارەزوور کە راپەڕینی خەڵکی ناوچەکەیە، ئەوەتە خەریکە سوپا لە نەهاوەند کۆ دەکاتەوە بۆ سوپای ئیسلام و نەفیری عامی راگەیاندووە، زۆر پێویستی هەیە بۆ ناوچەی خانەقین! لەولاشەوە سەرکردەیەکی فارس، بە دوو هەزار چەکدارەوە بە هەموو کەلوپەلێکی جەنگیەوە روەو شارەزوور بەرێ ئەکات لەژێر چاودێری (پاو)دا کە کوڕی شاپوور کوڕی کیوس برای ئەوشیروان کوڕی قوباد پاشای ئێران بوە. ئەم سەرکردە دڵسۆزە لە پاشازادەکانی کسراکان بوو، دەیویست خەڵکی ناوچەی شارەزوور بگێڕێتەوە ژێر چاودێری فەرمانڕەوایەتی یەزدگورد، (پاو) کە لە رێگەی جوانڕۆوە هاتبوو گەیشتبوە (پاوە)ی ئەمڕۆ و، بە نیاز بوو بەرەو دەشتی شارەزوور شۆڕبێتەوە، ماوەیەك لە شوێنی پاوەی ئەمڕۆ دەمێنێتەوە، لەو کاتەدا هەواڵی پەلاماری سوپای ئیسلام دێت، کە دەستی پێ کردووە بۆ ناوچەی کرماشان و، راکردنی یەزدگوردی پاشا بەرەو (ئەسفەهان و رەی)، (پاو) زۆر دڵ گران دەبێت، ناچار دەبێت بگەڕێتەوە و نیازەکەی بۆ نەهاتەدی، لەبەر خەتەری بارودۆخ نەیوێرا بێتە خوارەوە بۆ شارەزوور بۆیە نامەیەك بۆ خەڵکی شارەزوور دەنێرێ‌و هەڵهاتنی پاشایان بۆ بپۆشێ بەم شێوەیە: (لەبەر ئەوەی شەهریار یەزدگورد فەرمانڕەوای ئێران لەسەر داخوازی و دۆستایەتی خاکانی چین روەو وڵاتی رۆژهەڵات رۆیشتوە، بۆ چاك کردنی سنووری خۆراسان (ماهوی سوور) لەبەر ئەوە ئێوەش لە شوێن و جێگای خۆتان بمێننەوە تاوەکو خاوەن شکۆ روەو نیشتمان دەگەڕێتەوە، ئەو کاتە لە فەرمانەکانی خاوەن شکۆ ئاگادارتان ئەکەمەوە.

ئیمزا.......... پاو شاپوورزاد.

پاش ناردنی نامەکەی (پاو) بۆ خەڵکی شارەزوور لەوبەری (رووباری سیروان)ەوە مەنزڵ و کۆچ بار ئەخەن لە داوێنی چیایەك نزیکی دێیەکی گەورە چادر هەڵ دەدەن، بارگەوبنە ئەخەن، خەڵکی دێ کە لە ترسان دێن بە

پیریانەوە و پێشوازی گەرمیان لێ دەکەن، (پاو) ئەم میوانداریە گەرمە بە هەل دەزانێ، سوودی لێ وەردەگرێ، دەکەوێتە گفتوگۆکردن لە گەڵیاندا و پەیمانیان لێ وەردەگرێ کە سەر بە فەرمانڕەوایی ئێران و ئاینی زەردەشتی بن، لە داوێنی ئەو چیایەدا پەرستگایەکی گەورەیان بۆ دروست دەکات و کورەیەکی ئاگرپەرستیان بۆ ئەکاتەوە، ئێستە ئەو چیایە ناوی (ئاتەشگایە) و دێیەکەش ناو دەنێن (پاوە)، بەناوی ئەو سەرکردەیەوە، کە ئێستە شارێکی گەورەیە لەسەر سنوور، پاو دوو مانگ لەم ناوە دەمێنێتەوە، بۆ خۆخڵەفاندن و دوورکەوتنەوە لە شەڕی ناوچەی حەلوان و موسوڵمانەکان. بەڵام کە دەبیستێ فارسەکان شکاون و یەزدگورد بەرەو ناوەڕاستی ئێران هەڵهاتووە، ئەویش بەرەو کرماشان و هەمەدان و ئەسفەهان دەکەوێتە رێگا. بەهەر شوێنێکدا تێدەپەڕێ دەیان گێڕێتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی ئێران (بەمەدا دیارە راپەڕینەکە زۆر جێی گرتوەتەوە.) بەڵام مێژوو چونکە شێوێنراوە، بە تایبەتی مێژووی کورد! ئەو راپەڕینە مێژووییە کوژێنراوەتەوە، تەنانەت لە هەندێ جێدا کردویانە بە راپەڕینی بوون بە مەسیحی، کە بە مەرجێ کە حەلوان دەگیرێ، لەولاشەوە شام قودس و بیروت و دمشق و حومص و حەڵەب گیراوەو یەک سەربازی رۆمی و مەسیحی لە شام دا نەماوە هەر هەموو شام چونەتە ژێر دەسەڵاتی موسوڵمانەکان، بەڵکو کوردەکان تەواو لە دەسەڵاتی فارس و رۆم بێزار بون و بە تەمای سێهەمێك بوون ئەوا ئیسلام پەیدا بوە و لە گەشە و بڵاوبونەوەدایە، گاورەکان کتێبێکیان نووسیوە بە ناوی (مێژووی کڵێسای کۆن) زۆر دەسکاری کراوەو هەموو میللەتەکانیان بە گاور لە قەڵەم داوە و مێژووی میللەتەکانیان بەلای خۆیاندا شێواندوە، ئێرە جێگەی ئەوە نیە هەندێ نمونە بهێنمەوە!

(پاو) لە نزیك (ئەسفەهان و رەی) لەگەڵ یەزدگورد دەگەنە یەك، پاو لەبەرئەوەی لەگەڵ ماهوی سوردا لە خۆراسان ناکۆکیان هەبوە بە یەزدگورد دەڵێت: با نەچینە خۆراسان، بەڵام یەزدگورد لەسەر ئەو قسەیەی عاجز دەبێ و کینەی لێدەکێشێ، کە هەواڵی نزیك بوونەوەی سوپای ئیسلام دەبیستێ،

یەزدگورد بەرەو خۆراسان را دەکات و شاری ئەسفەهان جێدەهێڵێ، پاویش سەرپێچی لە فەرمانی یەزدگورد دەکات و بەرەو مازندەران و وڵاتی خۆی ئەکەوێتە ڕێگا.[64]

ڕۆژبەیانیش بە کورتەیەك باسی ئەو ڕاپەڕین و شۆڕشە جەماوەریە دەکات: (ئەم جمانەی سوپای ئیسلام بۆ وڵاتێکی شاخاوی سەخت، ئەوەمان بۆ دەردەخات کە نەتەوەی کوردی ژێردەستی ساسانی چەوساوە بە هەلی زانیوە، شۆڕشی بەرپاکردوە و سوپای ئیسلامی هان داوە بۆ پێشکەوتن و هاوکاری لەگەڵ کردوون و ڕێ بە ڕێی کردون بەرەو ئەو هەرێمە هەزار بە هەزارانە کە هەرگیز لە گرتنی نەدەهاتن.)[65]

خەلیفە عومەر بڕیاری دابوو لە حەلواندا بوەستێ و، هێزەکانی بەرەو پێش نەبات، نیازی بوو ئەوەندەی کە بە دەستی هێناوە و ڕزگاری کردوە، لە ئیسلامیان حاڵی بکات و سنوری حەڵاڵ و حەرام و عەقیدەو بیروباوەڕیان تیا دا بچەزرێنێ. ئەوەی تری کە ماوە لە خاکی میللەتان، بە شێوازێکی تر و ڕێگەی حیوار و گفتوگۆو ڕاگۆڕینەوەو قەناعەت، حاڵیان بکات، عومەر نیازی بوو لە وەندەی کە بە دەستی هێناوە، حکومەتێکی نموونەیی دروست بکات و بیخاتە پێش چاوی گەلانی دنیا.

نیازی بوو بڵاوکردنەوەی ئیسلام بۆ پارچەکانی تری جیهان، بە جۆرێ تر بکات و شێوازی شەڕ بگۆڕێت. چونکە دەیزانی کە جەنگ ئاسەواری خراپ لە ناو میللەتاندا بەجێ دەهێڵێ، ڕەنگە ئەو شەڕە بەر چاویان بگرێ لەوەی حەقیقەتی ئیسلام و مەبەستی دین تێ بگەن. ئەگەر هەموو شت بە زۆر بێت، عقیدە و بیروباوەڕ بە زۆر وەرناگیرێ، ڕەنگە بە سەرزارەکی و لە ترسان بڕوا بهێنن، بەڵام ئەوەیە کە نیفاق دروست دەکات و ڕەواج بە فتنە دەدات و ناو کرۆکی میللەتان دەخوات! فەتحی دڵەکان لە فەتحی وڵاتان گرنگترە. عومەر

---

[64] . مێژووی کوردستان و کورد: مەردۆخی، ل١٨٢-١٨٦.

[65] . خانەقین لە مێژوودا: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ژمارە ١٨-١٩، ل٢٤١، بغداد ١٩٨٨.

دەیزانی کە ئیسلام کاڵایەکی جوان و دروستە، ئەگەر بە ڕێگەی غەیری جەنگ نیشان بدرێ چاکتر وەردەگیرێ، هەر گەلێك بیناسێ، ناتوانێ خۆی لێ بێ بەش بکاو دەست بەرداری ببێت. بە تایبەت لەو کاتەدا کە زوڵم و زۆر وستەم سەراپای زەوی داگیر کردبوو، میللەتە چەوساوەکان لە دوی هێزێکی سێیەم دەگەران بەڵای فارس و ڕۆمیان لە کۆڵ بکاتەوە.

ئەمە هەر ڕای عومەر نەبوو بە تەنها. پێشتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)لە ڕێکەوتنی حودەیبیەدا ویستی دەعوە لە چەك جیا بکاتەوە، نامە و نێنەری زۆری نارد و حیواری میللەتان بەبێ چەك دەستی پێ کرد. بەرهەمی چاکیشی هەبووە، بەڵام عەقلیەتی عەرەب نەگەیشتبوە ئەو ئاستەی بڕوای تەواو بەو شێوازە بهێنن، هەر بۆیە جەنگ روی دایەوە. ئەوە بوو یارانی پێغەمبەر دروودی خوایان لەسەر بێ هەموو ماڵ و گەڕەك و باخ و باخات و دەشت و شاخ و لادێیەکیان پڕکردبوو خەریکی دەعوە و حاڵی کردنیان لە حەڵاڵ و حەرام و بیرو باوەڕ بوون، لە ماوەکی کەم دا موسوڵمانان بونە چەند قات. بەڵام مەخابن جەنگ زاڵ بوو بەسەر حیواردا. دواتریش ئەبوبەکر کە خالید و سەرکردەکانیان نارد، پێیان وتن کە قسەی یەکەمتان حاڵی کردنی ئیسلامە و پاشان جزیە، ئەگەر هیچیان قبوڵ نەکرد، ئەوسا مۆڵەتیان دەدەن و پاشتر کە هیچ چارێك سودی نەبوو جەنگ دەکەن، بۆ لابردنی دڕك و داڵ لە ڕێی گەیاندنی دینی خوادا. ئەوە بوو وایان کرد. پاشتر عومەر کە (مەدائینی) گرت جەنگی وەستاند و ویستی دەرگای حیوار بکاتەوە، لە سەرەتادا هورمزان و یەزگورد رازی بوون، بەڵام فێڵ بوو، بۆ خۆسازدانەوەبوو، سەد هەزار سەربازیان لە (جەلەولا) کۆکردەوە و ویستیان بچنەسەر (مەدائین) بەڵام عومەر خێراتر بوو، جەلەولای کردە گۆڕستان و خانەقین و حەلوانیشی‌لێ پاك کردنەوە، لە حلوانیش هەمان بڕیاری جەنگ ڕاگرتنی دەرکردەوە. هەرچەندە سەعد داوای کرد ڕێگەیان بدات بچنە ناوەوەی وڵاتی فارس بەڵام عومەر کۆمەڵێك نامەو بڕیاری دەرکرد بۆ سەعد بەم جۆرە:

(ان قف مكانك ولاتطلبوا غير ذلك)[66].

(ان قف مكانك ولاتتبعهم، واتخذ للمسلمين دار هجرة و منزل جهاد، ولا تجعل بيني وبين المسلمين بحراً.)[67]، يان له وه‌ڵامی نامه‌یه‌كدا كه سه‌عد داوا ده‌كات ڕێگه‌مان بده با دوایان بكه‌وین ده‌فه‌رموێ (وددت ان بين السواد وبين الجبل سداً لايخلصون الينا ولانخلص اليهم و حسبنا من الريف، اني اثرت سلامة المسلمين على الانفال).[68] ئه‌مه بوو بڕیاری یه‌كه‌می سه‌ركرده ئیسلامیه‌كان، به‌ڵام هێزی شه‌ڕ له به‌رژه‌وه‌ندیان نه‌بوو جگه شه‌ڕ، كه به مه‌رجێ كوفر به شه‌ڕ زوتر ده‌فه‌وتێ!

---

66. رسائل الفاروق. ص٧٩، رساله رقم (١٠٦).

67. رسائل الفاروق، رسالة (١٠٧). تأريخ الطبري، ج٤ ص١٤١.

68. رسائل الفاروق، ص٨٢، رسالة (١١٤).

## دروستکردنی شاری کوفه

عومەر بیری کردەوە، ئەگەر سوپای ئیسلامی هەروا لە پێشڕەوی دا بێت، گەلان و میللەتانی زۆر دێنە ناو (دار الاسلام) ەوە، ئەمەش بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارییان گران دەکەوێ، جگە لەوەی گرفت و کۆسپ و تەگەرەیان زیاد دەبێت، سەرەڕای ئەوەی کە بەرەی جەنگی رۆژهەڵات (فارس) زۆر فراوان بوە و ئەگەر چار نەکرێت شپرزەیی لە ئیدارە کردن دا رودەدات. واتە یەك بنکە کە (مەدائین) ەو یەك سەرکردە کە (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس)ە بەو هەموو ئیش و کارانە و، بەو بەرە جەنگیە فراوانەدا راناگات لە لایەکی ترەوە ئەو سەرباز و فەرماندانەی کە لە عێراقەوە دەگەڕانەوە مەککە و مەدینە، دەم و چاو و شێوەیان گۆڕابوو، عومەر بەوە نارەحەت دەبوو یارانی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت، ئاوایان بەسەر بێت ئەو زەحمەتە بچێژن. بۆیە جارێك وتی: (سوێند بە خوا ئەمە ئەو دەم و چاو و شێوانە نیە کە من ناردمن.) ئەوانیش وتیان: (ئەوە هاڵاو و بۆقە و گەرماوی هۆڕ و زەلکاوەکانی باشوری عێراق گۆڕیونی). جارێکی تر(سەعد) نامەیەکی بۆ خەلیفە عومەر نووسی: (ان العرب خددهم و کفی الوانهم و خومة المدائن و دجلة) ئەمە لە وەڵامی نامەیەکی عەمەر دا بوو، بۆی نووسی: (انبئني ما الذی غیر الوان العرب و لحومهم.)[69] لە جێیەکی تر نووسی (انه لاتصلح العرب، الا حیث یصلح البعیر والشاة في منابت العشب، فأنظر فلات في جنب البحر، فأرتد للمسلمین بها منزلاً.)[70] عومەر لە نامەیەکدا فەرموی چار هەر ئەوەیە (اجمع للناس موضعاً واحداً ولاتفرقهم.)[71] یان (قف مکانك ولا تتبعهم، واقنع بهذا، واتخذ للمسلمین دار هجرة و مدینة یسکنونها ولا تجعل بینی و بینکم بحراً)[4]

---

[69]. رسائل الفاروق، ص٩١، رسالة (١٤٥).

[70]. رسائل الفاروق، رسالة (١٠٨).

[71]. طبري، ج٤ ص١٤٩، رسائل الفاروق، رسالة رقم (١١٣).

[4] فتوح البلدان، بلاذري، ص٢٦١.

جارێکی تر عومەر نووسیەوە: (ان العرب لا یوافقها الا ما وافقت ابلها من البلدان، فابعث سلمان و حذیفة فیرتادا منزلاً بریاً وبحریاً، لیس بینی و بینکم فیه بحر ولا جسر.)[72] عومەر داوای کرد لە سەعد وەفدێك دروست بکات بە سەرکردایەتی (سەلمان و حزیفە) و بچن جێیەکی چاك بدۆزنەوە وە بیکەنە شار و سەربازگە، شوێنێك بێت کە حوشتر بتوانن بە تەواوی گوزەرانی تیا بکات، جێیەك بێت کە لە نێوان عومەر و سەعد و سوپادا ئاو و پرد نەبێت. بە گەیشتنی نامەکە (سەلمان و حزیفە) بنێرە بۆ جێیەکی گونجاو دوور لە گۆم و زەلکاو. کە هەموو سیفەتێکی شاری تیا بێت، وەفدە کە دروست کراو نێردران بەرەو خواروی عێراق جێیەکی زۆر چاکیان دۆزیەوە لە پشتی فوراتەوە. لە لێوارە لمەکانی فورات و هەموو مەرجەکانی عومەری تیا بوو. نوێژیان تیا کرد کە شوێنی (کوفە)ی ئەمڕۆیە. پاشان نامەیان بۆ سەعد نووسی. سەعدیش نامەی بۆ هەموو سەرکردەکان نووسی: (هەریەکەتان جێگرێك بۆ خۆی دابنێ و بگەنە شاری (مەدائن). هەر هەموو ئامادە بوون. لە نێوان گیرانی (مەدائن) و دابەزین لە (کوفە) دا ساڵێك و دوو مانگ بوو. واتە گیرانی (مەدائن و جەلەولا و خانەقین و حلوان) لەو ماوەیە دا بوو، سەعد هەر هەموو سەرکردەکانی دوای خۆی خست و لە موحەرەمی ساڵی ١٧ی کۆچی، بەرامبەر ینایر ٦٢٨ی زاینی شاری کوفەیان دەست پێ کرد. عومەر داوای لێ کردن هەر لە قامیش و زەلی هۆرەکان خانوەکان دروست بکەن. زۆر بە ئاسانی وخێرا شار تەواو دروست کرا، بەڵام رۆژێك لە ئاگرێکی خێرادا لە کەمترین ماوەدا. هەموو شار ئاگری گرت و کەف و کۆڵی دامرایەوە. پاشان نامەی بۆ نووسینەوە کە لە خشتی قوڕ دروستی بکەن. ئەمجارە نەخشەیەکی تریان بۆ شار داڕێژا و زەویەکەیان بە رێك وپێکی دابەش کردو لە ماوەیەکدا هەموو شاریان هەڵساندەوە. لە ناوەڕاستدا مزگەوتێکیان دروست کرد، پاشان مەیدانێکی فراوانیان بۆ راهێنانی سەربازی دروست کرد، لەو مەیدانەوە بە هەر چوار

---

72. رسائل الفاروق، رسالة رقم (١١٢)

دەوردا رمیان هەڵدا، لە کوێیا کەوتن لە پشتی ئەوانەوەیان کردە خانوو، پاشان ماڵی سەعد و بازاڕ دروست کرا. ناوچەکە ئاوەدان و قەرەباڵغ بویەوە، ئەوەندە شارێکی ناوەزە و جوان بوو، لە سەر هەمان نەخشە شاری بەسرەشیان دروست کردەوە، سەعد سەربازگەیەکی لە (مەدائین) جێ هێشت بۆ ئەوانەی کە خۆیان رازی بوون لەوێ بمێننەوە، عومەر داوای کرد لە کوفەدا دوو سەربازگە هەبێت، بەڵام لە خەیمە دابن[73]. مەدائن هەوایەکی شێداری هەبوو بڵقی گەرما و هاڵاوی ئاو دەم و چاوی سەحابەکانی برژاندبوو لە رووبڕابوون، هەر بۆیە بە داوای عومەر گەڕان بۆ بنیادنانی شارێکی تر کە هەوای پاك و دوور لە هەوای شێدار بێ و، کوفەیان هەڵبژارد، سەعد بە چل هەزار سەربازەوە هات لەوێ لە خێمەدا هەڵیان دا، جادە و شەقامیان لێ داڕشت مزگەوتیان خستە ناوەڕاست، پاشان خانو لە روخام دروست کرا کۆڵان و جادەکان دەرکەوتن، لە کۆتایی یەکێك لە شەقامەکاندا ماڵی سەعد دروست کرا، دوو سەد باڵ لە مزگەوتەوە دوور بوو، ئەنجا (بیت المال و دارالامارة) دروست کران، وەستایان لە فارسەوە هێنا، لەسەر شێوەی فارسی دروستیان کرد جادەی فراوان بوو هەتا هەوای بادیەیان لێ نەگرێت.[74]

---

73. تأريخ الامم الاسلامية. محمد خضری بەگ، ص٢١٧.

74. تأريخ الاسلام. حسن ابراهيم حسن، ج٤ ص١٤٨.

## پێکهێنانی سێ بنکەی سەربازیی

سەردەمی خەلیفە عومەر (ڕەزای خوای لە سەر بێت)، سەردەمی زێڕین بوو لە هەموو ڕوویەکەوە، گورگ و مەڕ پێکەوە ئاویان دەخواردەوە، سەرکەوتنی زۆری بە دەست هێنا، لە هەموو سەردەمەکان زیاتر وڵاتی فراوان کرد، ئەو سەرکەوتن و فەتحانەی عومەر لە دوو سیفەتیەوە بوو:

١- توانایەکی بە هێزی هەبوو لە هەڵبژاردنی فەرماندە و سەرکردەکانی دا، سەر ناس بوو، کەسی دەخستە جێگەی مناسب و پڕ بە پێستی.

٢- توانایەکی گەورەی هەبوو لە سەرکردایەتی کردنی میللەت دا، ئەو توانایە بە ژیری خۆی بە دەستی هێنابوو چی بویستایە دەیکرد، چەندی سەرباز بویستایە بە نامەیەکی بچوك لە کەمترین ماوەدا، بۆ دورترین جێگە دەینارد، کەس نەیدەتوانی سەرپێچی بکات، بەبێ ئەوەی عقوبەش بدات هەموو کەس وای دەزانی عومەر لە گەڵیایە و لەماڵیایە.

خەلیفە عومەر وای بە باش زانی بەرەی جەنگی عێراق بکات بە سێ بنکەی سەربازیەوە، بەرەی جەنگی باکور و ڕۆژهەڵاتی عێراقی دابەش کرد، زانی کە سنوور فراوان بوە و، یەك بنکە ناتوانێ بەو هەموو بەرە جەنگیە جۆراوجۆرە دا بگات، بۆ ئەوەی هەڵە ڕونەدات و تێکەڵبونی کار نەبێت، هەموو کەس سنوری کاری خۆی بزانێت و، منافەسەیەکیش دروست بکات و کارەکان بە سەر زۆرترین فەرماندە دا دابەش ببێ، ئەوەك ختورەی دڵ و بۆڵە و گلەیی لە نهێنی دا پەیدا ببێ. بەو کارە ئیدارە کردنی ئەو بەرە جەنگیە ئاسانتر دەبێت، بەر چاو ڕۆشن دەبێ. ئەو سێ بنکەیەی دروست کرد، بەرەی جەنگی بەسەردا دابەش کردن، بۆ هەریەکەیان سەرکردە و فەرماندە و سوپا و بەرەی تایبەتی دیاری کرد بەم جۆرە:

١- بنکەی سەربازی کوفە: شاری کوفە کە تازە بە تازە دروست کرا بوو کرا بە بنکەی یەکەم. (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس) لە مەدائینەوە گوێزرایەوە کوفە و کرایە (ئەمیری کوفە). لێپرسراو بوو لە بەرەکانی جەنگی حلوان –

ماسبزان (كرمانشاه) – مووسڵ – هەرێمی چیا – ڕەی ئازربایجان – ئەرمینیا –تەبەرستان – جرجان – هەرێمی جزیرە.[75]

٢- بنکەی سەربازی بەسرە: سەرەتا (بەسرە) لادێیەك بوو، کە رزگار کرا مزگەوتێکی گەورەیان تیا دروست کرد لە خشتی قوڕو سەرەکەی لە قامیش وزەل، دوای کوفە ئەویش بە هەمان شێوە فراوان کراو بینایەك دروست کرا بۆ (ئەمارەت)، سەرەتا ئەم خانوانە لە قامیش و حەسیر و پەل و پۆپی دار خورما دەکرا، بەڵام چونکە عەمەلی نەبوو، روداوی ئاگر زۆر روی دەدا، گۆڕا بە خشت و قوڕ و بەرد. پاشتر بو بە گەورەترین شاری بازرگانی ناوچەکە، لە نێوان هیندو چین و ئەوپەڕی بیابانی گەورە بۆ رۆژهەلأت و رۆژئاوا، بازرگانی تیا ئاڵ و گۆڕ دەکرا، بەندەرێکی گرنگ بوو. سەرەتا خێڵی رەبیعەو موزر لە بەسرە دابەزین، دواتر خەڵکی لە چین و هیند و سەندەوە بۆی هاتن و قەرەباڵغیان کرد.

خەلیفە عومەر (ئەبوموسای ئەشعەری) کردە (ئەمیری بەسرە) و لێپرسراو بوو لە بەرەکانی جەنگی ئەهواز و خوزستان و تستر و رامهرمز و سوس و جندیسابور و خۆراسان.[76]، یەکەم کەس نامەی بۆ عومەر نووسی و ووشەی ئەمیرولموئمنینی داهێنا ئەبو مووسا بوو! نووسی: (بۆ عەبدوڵڵا ئەمیری مؤمنین، لە ئەبوموسای ئەشعەرییەوە.) کە عومەر نامەکەی خوێندەوە وتی بەڵێ من عەبدوڵلام، من عومەرم، من ئەمیری مؤمنینم. سوپاس بۆ خوا. دوای ئەو نامەیە وشەی ئەمیرولموئمنین داهات.[77]

٣- بنکەی سەربازی بەحرەین لەسەر کەنداوی عەرەب: خەلیفە عومەر (عەلای کوڕی حەزرەمی) کردە ئەمیری بەحرەین و سەرکردەی سوپای ئەو ناوچەیە. ئەم بنکەیە لێپرسراو بوو لە کەنارەکانی ئەوبەری کەنداوی عەرەب

---

[75]. فتوح البلدان. بلاذري، ص ٣١٧.

[76]. هەمان سەرچاوە، ص٢٧٨.

[77]. رسائل الفاروق، ص١٥٥، رسالة رقم (٢٧٩).

و، هەرێمی فارس و ئەستەخر و، سجستان.[78] (عەلا) ناوی لە جەنگی (ڕەدە) هەڵگەڕاوەکاندا زڕا. بۆیە فەرماندەی سوپا و ئازایانە کاری خۆی دەکرد. بەڵام کە بوو بە ئەمیری بەحرین. دەیویست منافەسەی (سەعد) ئەمیری کوفە بکات! ئەو کاتە سەعد ناوی زۆر زڕا بوو، باس هەر باسی سەعد بوو، سەرکەوتنی زۆری بەدەست هێنا، زۆر ناوچەی ئازاد کرد، بە تایبەت سەرکەوتنی بەسەر ڕۆستەم دا کە گەورەترین سەرکردەی فارس و وەزیری جەنگی بوو، لە جەنگی قادسیەدا، ڕۆستەمی کوشت. ئێستەش حلوان و جەلەولای تەواو کردوەو بەرەو هەرێمی چیا لە پێشڕەوی دایە، (عەلا) هات بە دڵی دا ئەویش کارێك بکات بێ ئەوەی پرس بە عومەر بکات. ویستی دوای ئەوەی سەرکەوتنی گەورەی بە دەست هێنا ئەوسا عالەم سەرسام بکات و نامە بۆ عومەر بنوسێ. بەڵام گەورەیی سەعد لەوەدا بوو کە دەستی نەئەکرد بە ئاودا بەبێ مۆڵەت وەرگرتن لە عومەر، هەر کارێکی دەکرد، پرسی دەکرد، نامەی دەنووسی، هەتا بەشی ئاخ و دەروونی خۆی تێکەڵ نەکات. بەڵام (عەلا) ویستی بێ مۆڵەت هێرشێك ساز بکات و، لە پڕ خەڵکی بیبیستن و سەریان سوڕ بمێنێ، نیازی بوو دوای سەرکەوتن، نامە بنووسێ. سوپای لە بنکەی بەحرین کۆکردەوە و ئامادەی کردن و بە ئاوی کەنداوی عەرەبدا پەڕینەوە ئەوبەر، بە مەرجێ عومەر نامەی نووسی بوو بۆ هەموو لایەك کە نابێ لە ئاوو رووبار و دەریا بدەن و بپەڕنەوە، مەهێڵن لە نێوانی من و ئێوەدا ئاو و دەریا هەبێت – وەك پێشتر باس کرا –.

(عەلا) چووە ئەوبەری کەنداوی عەرەب، خۆی گەیاندە شاری (ئەستەخر) کە بنکەیەکی گەورەی سوپای فارس لەوێ بوو، کە فارسەکان لە پڕ پێیان زانی شڵەژان، خۆیان کۆکردەوەو بڕیاریان دا پێشەکی کەشتیەکانیان بسوتێنن و دەستیان لە هەموولا ببڕن، ئەوسا چارێك بۆ ئەمان بدۆزنەوە. کەشتیەکان لەناو بران، پاشان گەڕانەوە بۆ موسوڵمانە گەمارۆدراوەکان

---

[78]. طبقات ابن سعد. ج٤ ص٧٨٢.

شپرزەیان کردن، موسوڵمانەکانیش پارچە دابڕاوەکانیان کۆکردەوەو بڕیاریان دا شەڕی مان و نەمان بکەن. لە یەك هێرش دا، دایان لەو سوپا زۆرەی کە لە نێوان ئەمان و کەشتیەکاندا هەبوو، زۆربەیان لەناوبرد، کە نزیك بوونەوە دەبینن کەشتیەکان نەماوە. بە پەلە بەرەو ژوور بەرەو بەسرە هاتن، دووبارە لە نزیك (شەهرەك) گەمارۆیان دانەوەو لێیان دان، هەواڵ گەیشتە (خەلیفە عومەر). زۆر توڕە بوو، بڕیاری دا سزایەکی خراپی (عەلا) بدات. عومەر نامەی بۆ ئەمیری بەسرە کە ئەو کاتە (عوتبەی کوڕی غوزوان) بوو نووسی، کە هەر خێرا سوپایەك رێك بخاو بچێت بۆ رزگارکردنی سوپاکەی (عەلا)، (عوتبە) (١٢) هەزاری کۆکردەوە بە فەرماندەیی (ئەبوسبرە کوڕی ئەبی ڕهەم) ناردی، لە رێگەیەکی نهێنیەوە. گەیشتنە (شەهرەك)، لەپڕ پەلاماری سوپای فارسیان دا و (عەلا)یان رزگار کرد و هێنایانەوە بۆ بەسرە و لەوێوە رۆیشتنەوە بۆ (بەحرین). بەم جۆرە ناوی شکستیەکەی زڕا! سزاکەی عومەر ئەوە بوو، بنکەی (بەحرین)ی هەڵوەشاندەوەو داوای لە (عەلا) کرد کە بچێتە سوپاکەی (سەعد) و لەژێر فەرمانی ئەودا بێ، چونکە ئەو بە خیلی بە سەعد برد بوو.[79]

هەر یەکە لەم بنکە سەربازیانە سەربەخۆیی خۆی بوە، ئەمیر و سەربازی تایبەتی خۆی بووە، سنوری جەنگی و کارتیاکردنی جیاواز بوە، بەڵام بە هەموویانەوە یەك مەبەستیان پێکاوە و لەیەك نەپچڕاون، پەیوەندی توند وتۆڵ و هاوبەشیان هەبوە، یارمەتی سەربازیو سیاسیو تەکتیکی یەکیان داوە، ئەگەر خەلیفە عومەر مۆڵەتی بدانایە بنکەی بەسرە یارمەتی کوفە و بەحرەینی دەداو بە پێچەوانەشەوە. عێراق بە هەردوو مەڵبەندە سەربازیەکەیەوە، بەسرە و کوفە، بوو بوونە بنکەی فکری و سەربازی و دەعەوی بۆ وڵاتی فارس و خێڵەکانی ناو عێراق، چونە ناوەوە بۆ وڵاتی فارس کارێکی ئاسان نەبوو، موسڵمانەکان کە لە عێراق شەڕیان دەکرد، لە وڵاتێکدا بوون کە بە خاك و زمانیان شارەزا بوون و زۆر لەوەی نیوە دوورگەی عەرەبی دەکرد، لە یەك حاڵی دەبوون، ئەمە کار ئاسانی بۆ کردبوون، بەڵام کە چوونە ناوەوەی وڵاتی فارس، توشی زمان و عادات و تەقالید و جل و بەرگی جیاواز بوون، خاك و شاخ و

---

[79]. تأريخ الامم الاسلامية. محمد خضری بەگ، ص٢٢٠.

داخ و ئاووهەوای سارد و شیرین، کە نەیان دیبوو پێی ڕانەهاتبوون، چونە ناوەوە بۆیان، قورس و گران بوو، وڵات و خاك و خەڵکێکی نامۆ بەمان. زۆرجار بەفر دەباری و زوقم و کڕێوە و ڕەشەباو لافاو دای دەکرد و ئەمان نەیان دیبوو، خۆیان بۆ ئامادە نەکردبوو، فارس ئاری بوون، عەرەب سامی بوون، فارس مەجوسی و ئاگر و بت پەرست بوون، عەرەب خوا پەرست و موسوڵمان بوون، چوونە ناوەوە ئاستەنگ بوو، لەگەڵ ئەوەدا توانیان بیابان و شاخ، سارد و گەرم، عەرەب و عەجەم، سامی و ئاری پێکەوە گرێ بدەن و بیروباوەڕ و عەقیدەیان پێ بگۆڕن.

## فارس و رۆم خۆیان ساز دەکەنەوە

شاری حەلوان کەوتبوە نێوان (سەواد) و (هەرێمی چیا)، کەوتبوە نێوان دەشتی عەرەب و شاخی کورد، کەوتبوە نێوان عەرەب و عەجەم. عومەر دەیویست لەو نێوانەدا بوەستێ، نامەی بۆ سەعد نووسی: لەویا بوەستن. خۆزگە لە نێوانی ئێمەو چیادا شاخێك یان شورەیەك هەبوایە لە ئاگر. نە ئەوان بیانتوانیایە بێنە سەر ئێمە، نە ئێمە بچینە سەر ئەوان!

بەلام یەزدگورد پاشای فارس، هەروەکو لە (مەدائین) پەیمانی شکاند. ئەم بۆچونەی خەلیفە عومەریشی بە هیچ زانی و لە چەند لایەکەوە سوپای کۆکردەوە. نامەیشی بۆ هەموو هەرێمە کان نووسی کە خۆیان کۆبکەنەوە و سوپای بۆ بنێرن.

موسوڵمانەکان ماوەیەکی باش حەوانەوە، ئیش وکاریان جێبەجێ دەکرد، شاری (کوفە)یان دروست کرد و شاری بەسرەیان فراوان کرد. سێ بنکەی سەربازیان دروست کردوو، سنوری کاریان بۆ دیاری کردن. تەشکیلاتی تازەیان کرد و سوپای نوێی زۆریان دروست کرد، عومەر بڕیاری دابوو کاروباری ئیداری و کۆمەڵایەتی رێك بخات، بۆ ئەو مەبەستە زۆر بڕیاری دەرکرد. نامەی بۆ هەموو کارگێڕەکانی نووسی: (ئەوەی زەویەکی مردو زیندو بکاتەوە بۆ خۆی دەبێ. ئەوەی زەویەکی بەجێ هێشتووە و رای کردوەو سێ ساڵی بەسەردا چووە نەگەڕاوەتەوە. مافی بەسەریەوە نامێنێ.)[80]

بەم جۆرە خاك و ئاوی بە پیتی هەموو ئەمیر و ئاغا فارسە هەڵهاتووەکان دابەش کرا بەسەر جوتیارانی ناوچەکاندا. لە نامەیەکی تردا دەڵێت: (هەر کەسێك پارچە زەویەکی هەیە و، سێ ساڵە جێی هێشتوەو ئاوەدانی نەکردۆتەوە و، خەڵکانێکی تر کێڵاویانە و ئاوەدانیان کردوەتەوە، مافی ئەمانەیە.) لە نامەیەکی تردا لەبارەی ئەو زەویانەوە دەڵێت: (ئەو زەویە بەجێهێڵراوانە مافی خەڵکی ترە، ئەگەر هی من یان ئەبوبەکریش بێت.)[81]

---

80. رسائل الفاروق. رسالة رقم (٢٨٠).

81. رسائل الفاروق. ص١٥٦.

عومەر نیازی نەبوو زیاتر لەمە بڕوات، سنوری خۆی دامەزراند، فەرماندەکانی گێڕایەوە بۆ کوفە و بەسرە و بحرین، نەیهێشت لە نێوان خۆی و مەدینەدا و، یارەکانی پێغەمبەردا روبار و پرد هەبێت، نیەتی هێنا، کاروباری حکومەتداری لەو هەرێمە رزگارکراوانەدا دابمەزرێنێ و مزگەوت و بانگەوازی ئیسلامی بگەیەنێتە شارو دێهات و دورترین خەڵکانی سەر سنورەکان، ئەوانە لە خواو پێغەمبەر و قورئان و ئیسلام حاڵی بکات. بەردەوام نامەی دەنارد کە لەگەڵ جوتیاراندا باش بن، ئەرکیان لەسەر سوك بکەن، کاریان بۆ ئاسان بکەن، هانیان بدەن هەموو خاکە مردوەکان زیندوو بکەنەوە. یاسای (الارض لمن یزرعها)ی داهێنا، زەوی و زاری زۆر و بە پیت و بەراو و باخ و باخاتی ئەمیر و ئاغا و دەرەبەگە فارسەکانی دابەش کرد بەسەر هەژاران و جوتیاران و بێکاراندا، سەربەستی کردن لە کێڵان و بەرهەم هێنان. جوتیارەکانی عێراق زۆر شانازیان بە عومەرەوە دەکرد، بە باوکی هەژارو نەدار و جوتیارانیان دەزانی. بەردەوام نامەی دەنارد کە لەگەڵ (ئەهلی زیممە) دا نەرم و نیان بن و ستەمیان لێ مەکەن، بیان پارێزن، ئەو پەیمانەی کەپێتان داون مەیشکێنن. گاورەکان پێیان خۆش بوو موسوڵمانەکان حوکمیان بکەن، هەتا رۆمە گاورەکانی براو هاودینیان. بە بەردەوامی لێیان موسوڵمان دەبوو، جزیەیان لەسەر خۆیان هەڵدەگرت.

ئەمە زیاتر لە ساڵی خایاند.چاکسازی زۆر کرا. عومەر نامەی بۆ سەعد نووسی: ئاگاداری جوتیارەکان بکە. ماڵیان لێ تێك مەدە، چیت بۆ جوتیارەکانی پێشوو کردوە، بۆ ئەمانیشی بکە.) بەڵام لە پڕ هەواڵ هات بۆ(سەعد) کە فارس و رۆم هەردوکیان قەرەباڵغێکی زۆریان لە (ماسبزان) و (تکریت) کۆکردۆتەوەو بە تەمای هێرشن. سەعد نامەی بۆ خەلیفە عومەر نووسی. خەلیفە عومەریش ناچار بوو رای پێشووی بگۆڕێ و خۆی کۆ بکاتەوە لەبەر ئەم هۆیانە:

١- لەبەر پاراستنی ئەو دەستکەوتانەی کە بەدەست هاتووە.

٢- بۆ پاراستنی هێمنی و ئاسایشی وڵاتی ئیسلامیی.

٣- پاراستنی گیانی سەرباز و خەڵکی شارەکان لە هێرشی دوژمن.

٤- لێدانی ئەو هێزە پەرتەوازە کۆکراوەیە، هەتا جارێکی تر زاتی ئەوە نەکات خۆی بە پێوە بگرێت.[82]

---

[82]. تأريخ ايران، د.فاروق عمر، ص٢٣، بغداد ١٩٨٩.

# بەشی سـێیـەم

* دەستپێکردنەوەی جـــەنگ
* جەنگی ماسـبزان
* جەنگی تکریـت
* رزگارکردنی موسـڵ و نەینەوا
* جەنگی هیـت و قرقیسـیا

## دەستپێکرنەوەی جـەنـگ

### جەنگی ماسبزان

که (هاشم) گەیشتە کوفە بە سەعدی وت کە فارسەکان سوپایەکی زۆریان لە ماسبزان[83] کۆکردۆتەوە[84]، هەواڵ گەیشتە سەعد کە (هورمزان) سەرکردەی فارس و ئەمیری ناوچەی ئەهواز، هێزێکی لە دەشتی (ماهیشت) کۆکردۆتەوە، ئەویش خەلیفە عومەری لێ ئاگادار کرد، عومەر نامەی بۆ سەعد نووسی: هێزێکی بە فەرماندەی (زرار کوڕی خەتاب) بۆ بنێرن، با لە پێشەوەی (هەزیل ئەسەدی) بێ و، لای راست و چەپی بدە بە (عەبدوڵلا کوڕی وەهب) و (مەزاری کوڕی فلاناس عەجلی)[85].

فارسەکان خەڵکیان تۆقاندبوو، شاریان چۆڵ کردبوو. زرار بەو نەخشەیەوە کەوتەڕێ، هەر کە گەیشتەجێ دەستی کردە جەنگ، لە پلانێکدا (هورمزان) گیراو ئەوەی مابوو لە سوپاکە رایان کرد بۆ شاخەکانی کوردستان. زرار خەڵکی شاری ماسبزان و سوپای هەڵهاتوی بانگ کردەوە لەگەڵیاندا رێکەوتن، زرار پەیمانی دانێ کە لەگەڵیان چاك بێ و هەموو یارمەتیەکیان بدات، پاش ماوەیەك دیسان سوپایەکی زۆری فارس لە ناوچەکەدا کۆبونەوەو بە تەمای هێرش بوون.(سەعد) عومەری لێ ئاگادار کرد، ئەویش (زرار)ی بۆ ناردن لە نزیك ماسبزان و ئەریوجان بە شەڕ هاتن، سەرکردەی فارسەکان (ئازین کوڕی هورمزان) بوو، ئازین قاچی شکا و گیرا. زرار لەگەڵ خەڵکی ئەو ناوچەیەش رێکەوت.[86] بەم جۆرە هەموو دەشتی (ماهیشت) کە دەکەوێتە نێوان دەشتی شارەزوور و کرماشان و حەلوانەوە بە ئاسانی گیرا.

---

[83]. ماسبزان: دەشتێکە چەند شارێکی تیایە، دەکەوێتە لای راستی شاری (حەلوان) لە رێگەی هەمەدان.

[84]. معجم البلدان، ج٧ ص٣٦٣.

[85]. قادة فتح العراق والجزيرة، ص٩١. اللواء الركن محمود شيت خطاب.

[86]. تأريخ الامم الاسلامية. محمد خضری بەگ، ص٢١٦. ابن اثير. ج٢ ص١٤٩.

جارێکی تر سوپایەکی زۆری فارس بەرەو دوو جێگە کەوتنەڕێ. یەکیان چوە نزیك (ماسبزان) و ئەوی تریان بەرەو دەشتی شارەزوور کشا. (سەعد) دوو سوپای بۆ ناردن (مەکشوح ئەلموورادی) بە (١٠) هەزارەوە نارد بۆ(ماسبزان) و (عروە کوڕی زەید)یشی بە (١٠) هەزارەوە نارد بۆ شارەزوور، هەردوو سوپاکەی فارسیان راونا.[87]

جارێکی تریش فارسەکان بەرەو شارەزوور هاتنەوە بۆ سەرکوت کردنی ئەو کوردە راپەڕیوانەی کە دژی دام و دەزگای فارس جەنگا بون و مەیلیان بۆ سوپای ئیسلام هەبوو، فارسەکان یەکجار زۆر بوون. خەلیفە عومەر (عزرە کوڕی قەیسی) بۆ ناردن لە حەلوانەوە، بەڵام شکان و گەڕانەوە، پاشان سوپایەکی یارمەتی نارد بۆیان بە فەرماندەیی (عوتبە کوڕی فەرقەد) ئەمانە گەیشتنە شارەزوور و بە هەموویانەوە فارسەکانیان راونا. کوردەکان یارمەتی زۆری موسوڵمانەکانیان دا و بە یەکجاری دەستی فارسیان لە سنووری شارەزوور کۆتا کرد.[88]

---

[87]. كتاب الفتوح. ابن اعثم الكوفي، ج٢ ص٢٨١.

[88]. تأريخ الامم الاسلامية. خضری بەگ، ج١. امین زەکی: کوردو کوردستان، ل١٢٥.

## جەنگی تکریت

هەواڵ گەیشتە سەعد کە سوپایەکی زۆری رۆم، بە یارمەتی عەرەبەکانی (ئیاد و تەغلب و نەمر) کە لە جزیرەی ئیبن عومەری کوردستان دادەنیشن. لە تکریت کۆبونەتەوە، سەعد ئەم هەواڵەی گەیاند بە خەلیفە عومەر. ئەویش نامەیەکی وەڵامی بۆ نووسیەوە، کە سوپایەك رێك بخات بە سەرکردایەتی (عەبدوڵلا کوڕی موعتەم). لە پێشەوە هێزێك بنێرێ بە فەرماندەیی (روبعی کوڕی ئەکفەل) و راست بداتە (حارس کوڕی حسانی زوهلی) و چەپ بداتە (فورات کوڕی حەییانی عجلی) با (عرفجە کوڕی هەرتمە فەرماندەی سوارەکان بێت لە پێشەوە.)[89]

ئەم کۆبوونەوەیەی سوپای رۆم لە (تکریت) هاو زەمان بوو لەگەڵ کۆبوونەوەی سوپای فارس لە (ماسبزان) هەروەك بڵێی بڕیار و رێکەوتنێکی دولایەنی هەردوو ئیمپراتۆریەت بوە لە دژی ئیسلام، کە لەیەك کاتدا هێرش بکەنەسەر ناوچەی حەلوان و جەلولا، بەڵام سەرکردایەتی ئیسلامی دەست رۆیشتوتر و خێراتر و بە تواناتر هاتەدەست. ئەوە هەموو هێرشی فارسەکان بوو کە جار دوای جار شکان بەشیان بوو! با ئێستە بزانین سوپای رۆم لە تکریت چی بەسەر دێت.؟

تکریت لە بنەڕەتدا شارێکی کوردنشین بوو، خۆی خۆی تەیار و چەکدار نەکردبوو، بەڵکو سوپای رۆم بە عەرەبەکانی جزیرەوە لە باکورەوە بۆی هاتبون و شەڕیان تێ ئاڵاند بوو!

کە سوپای ئیسلام گەیشت دەبینێ رۆم و ئەنتاق و عەرەبەکان خەنەقێکی گەورەیان بە چوار دەوری شاردا لێ داوە و خۆیان لە پشتیەوە دامەزراندووە. موسوڵمانەکان چل رۆژ گەمارۆی شاریان داو، بیست و چوار هێرشیان کرد، بەڵام هیچی وایان نەکرد.

بە راستی ئەو عەرەبانە سەیرن. هیچیان بە فارس و رۆم ناخوات کەچی بە دڵ و بە گیان یارمەتیان دەدەن لە دژی برا عەرەبەکانیان. بە مەرجێ کە فارس

---

[89]. الكامل في التأريخ. ابن اثير، ج٢ ص١٤٩.

و رۆم زۆر بە نزم سەیریان دەکردن و، تەنها بە شەڕیان دەدان، وە چەندین حکومەتیان رووخاندوون. بەلام موسولمانەکان خێریان بۆ هێناون، دەیانتوانی سودی زۆریان لێ ببینن، چونکە هاوزمان و هاوڕەگەز و هاو خاکن، کەچی شەیتانیان ئەوەندە زالە، چونەتە پال فارس و رۆم، کە هیچیان بە وان ناخوات.

نامەکەی عومەر بۆ سەعد بەم جۆرە بوو: (ان سرح الی الانطاق، عەبدوللا بن المعتم و استعمل علی مقدمته، ربعي بن الاكفل العنزي، وعلی میمنته الحارث بن حسان الذهلي، وعلی میسرته فرات بن حيان العجلي، و علی ساقته هاني بن قیس، وعلی الخیل عرفجة بن هرثمة)[90] کە سەعد بیستی سوپای رۆم خەلکێکی زۆری عەرەبی بە زۆر هێناوە بۆ تکریت و سەنگەریان لێ داوەو خۆیان قایم کردوە بە یارمەتی خێلە عەرەبەکانی (ئیاد و تغلب و نەمر)، سەعد (عەبدوللا)ی بۆ ناردن بە (٥) هەزار کەسەوە، کە بە چوار قۆناغ، واتە چوار رۆژ[91] گەیشتنە تکریت. چل شەو و رۆژ ئەو خەندەقەیان گەمارۆ داو، دەیان هێرشی گەورە و بچوکیان کرد بۆیان نەگیرا. (عەبدوللا) ویستی فێلێك بکات، تاکتیکێك بەکاربهێنێ (الحرب خدعة). بە نهێنی کەسێکی نارد بۆلای عەرەبە بەگیرهاتووەکانی ناو قەلاکە بۆ رێکەوتن. ئەوانیش رازی بوون، بە نهێنی نوێنەریان ناردە دەرەوەی خەنەقەکە، دوای وتووێژێك و عەهدوپەیمان مۆر کردن، موسولمان بوون. عەبدوللا پێی وتن: شایەتومان بهێنن، شایەتی بدەن کە هیچ پەرستشێك نیە جگە الله، وە محمد پێغەمبەری خوایە. بڕوا بکەن بەوەی کە لە لای خواوە هاتووەو ئەنجا رای خۆتان بلێن.، عەرەبی ناو خەندەقەکە رازی بوون. ئەنجا نەخشەیەکیان داڕێژا و پێیان وتن: ئێمە لە دەرگای پشتەوە نزیك دەبینەوە، هەول دەدەین بچینە ژوورەوە، ئەگەر چوین و گوێتان لە (الله اکبر)مان بوو، ئەوا بزانن سەرکەوتوین و چوینەتە ناو شوراکە، ئەوسا ئێوەش دەرگای لای روباری دجلە بگرن و هەتا ئەتوانن لێیان بدەن).

---

[90]. تأريخ الطبري. الامام الطبري، ج٤ ص١٨٦. رسالة رقم (١٢٠) في كتاب رسائل الفاروق.

[91]. قادة فتح العراق والجزيرة. اللواء الركن محمود شيت خطاب، ص٢٧٧.

موسوڵمانەکان لە هەڵمەتێکدا چوونە ناو شووراو شاری تکریت و (الله اکبر) یان دەست پێ کرد، عەرەبەکانی ناو شووراکەش وەڵامیان دانەوە. ڕۆژ شپرزە بوو، هەوڵیان دا لە دەرگای دیجلەوە ڕابکەن. بەڵام شمشێری هەڵکێشراوی پێش و پاشیان گەمارۆی دان و کەسیان لێ دەرنەچوو![92] هەموو شار ئازاد بوو.

---

[92]. الکامل في التأريخ. ابن اثير، ج٢ ص٢٠٣.

## رزگارکردنی موســڵ و نەینــــەوا

ئایا عەبدوڵڵا بەوەندە رازی بوو.؟ نەخێر. عومەر دەیزانی کە لە کاتی شکستی بەرامبەردا، چەندەت سەرکەوتن بوێت دەتوانی بەدەستی بهێنی. بەڵام ئەوەمان لەبیر نەچێت کە سەرکەوتنی ئاوا ئیدامە و ئیدارەکردن و بەخێوکردنی دەوێت!

عومەر نامەیەکی بۆ سەعد نووسی بەم جۆرە: بۆ سەعد. دوای رزگارکردنی (تکریت)، با (عەبدوڵڵا کوڕی موعتەم)[93] و روبعی کوڕی ئەکفەلی عەنزی بە هێزێکی سوارەوە بنێری بۆ سەر دوو قەڵاکە.[94] واتە قەڵای موسڵ و نەینەوا.

پاشان کە تکریت گیرا.(عەبدوڵڵا) ئەم بڕیارەی بۆ (ربعی) دەرکرد: (پێش هەواڵ بکەوەو بە نهێنی شەودا بڕۆ و، رۆژ ئیسراحەت،بکە هەتا دوای نیوەڕۆ. پاشان هەندێکی تر بڕۆ هەتا دەگەیتە قەڵاکان. لەوێ خۆتان ئاشکرا بکەن.)، پاشان پێی وت: بگەرە ئەو دوو قەڵایە پێش ئەوەی هەواڵی هاتنی ئێمە و روداوی تکریتیان پێ بگات. لەگەڵ خۆت پیاوانی هەرسێ هۆزی (ئیاد و تغلب و نەمر) کە تازە موسوڵمان بوو بوون. ببە بۆ چاوساغی و یارمەتی.

(روبعی) لە جەنگی تکریت دا فەرماندەی پێشەنگ و هێزی سوارە بوو، بۆ موسڵیش هەر سوارە پێویستە، چونکە ئەو خێراییە دوورە بە هێزی پیادە نابڕێ.

عەبدوڵڵا هێزێکی سوارەی خێرای بۆ (روبعی کوڕی ئەکفەل) پێك هێنا، ناردی بۆ ئەو دوو قەڵایەی کە هێزی رۆم و عەرەبی ناو تکریتی لێوە هێنرابوو

---

[93]. عەبدوڵڵا کوڕی معتەمی عەبەسی: ڕزگارکەری محوەری دجلە لە مدائنەوە هەتا موسڵ. لە سەردەمی پێغەمبەردا موسوڵمان بوو، یەکێك بوو لەو (نۆ) کەسەی کە بوو بوونە نوێنەری هۆزی (عەبەسی) بۆ لای پێغەمبەر و موسوڵمان بوون. دلوای دوعای خێریان کرد، پێغەمبەر ئەم نۆ کەسەی کردە سریەیەك و ئاڵایەکی سپی دانێ و ناردنیە رێی کاروانێکی قورەیش. بەشداری جەنگەکانی سەعدی کرد لە عێراق، بەشداری جلولا و تکریت و موسڵی کرد و هەتا مرد هەر لە جیهاددا بوو بۆ خوا.

[94]. الكامل في التأريخ. ابن اثير، ج١ ص٢٠٢.

بۆ تەمێ کردنیان! موسڵ و نەینەوا دوو شارن لە لێواری ئەمبەر و ئەوبەری ڕوباری دیجلە لە باکوری تکریت، نەینەوا مەرقەدی (نەبی یونس) و کەلاوەکانی ئاشوریەکانی لێ بوو، سەردەمێك پایتەختی دەوڵەتی ئاشوری بوو، (٩٠٠) ساڵ پێش زاین.[95]

ڕوبعی پێش هەواڵ کەوت. هەر لە ڕێ‌ی ڕاستەوە کەوتنەڕێ، ئەوەندە خێرا ڕۆیشتن، گەیشتنە مەبەست پێش ئەوەی هەواڵی تکریت و لەناوچوونی سوپاکەیان زانیبێ. هەر ئەوەندەیان زانی چوار دەوری قەڵاکەیان گیرا. بەرگری کەرانی ئەو دوو قەڵایە، سەرەتا سەنگەریان گرت و خۆیان ڕاگرت. بەڵام کە زانیان تکریت گیراوەو، سوپاکەیان تیاچووە، ورەیان بەرداو زۆربەیان داوای ڕێکەوتنیان کرد. ئەوانەی ڕازی بوون لە شار مانەوە، ئەوانی تریش شاریان جێ هێشت، کە (عەبدوڵڵا) گەیشتە موسڵ، داوای لە هەڵهاتوان کرد بگەڕێنەوە، پەیمانی دانێ کە مافیان دەپارێزێ و هەموو سەربەست و ئازادن لە ژیان و بیروباوەڕیاندا. ئەوانیش گەڕانەوە و ڕێکەوتنیان مۆر کرد.[96]

(ڕوبعی کوڕی ئەکفەلی عەنزی)[97] وشە بە وشەی بڕیارەکانی سەرکردەکەی جێبەجی کرد، چونکە سەربازی چاك دەبێ پەیوەست بێ بە بڕیارەکانی سەرکردایەتیەوە دەنا وەکو (عەلا)ی لێ بەسەر دێ کە پێشتر باسمان کرد، سەرباز نابێ سەرکردایەتی نەبێت، نابێ پەیوەست نەبێ بە غورفەی عەمەلیاتی خۆیەوە، دەنا ئەوەی ڕوو دەدات، وەك خۆی لێ نایەتەوە، سەرکردایەتیش دەبێ ڕقبتی خوارەوە بکات و، سەرکردایەتی عومەر چاکترین

---

[95]. معجم البلدان: ج٨ ص٢٦٨.

[96]. اسد الغابة، ج٣ ص٢٦٤.

[97]. ربعی کوڕی ئەکفەلی عەنزی: لە سەردەمی پێغەمبەردا موسوڵمان بوو، بەشداری جەنگی ڕەدەو هەڵگەڕاوەکانی کرد، پاشان چووە عێراق بەشداری جەنگەکانی کرد، دوای فەتحی مدائن ناوی دەرکرد، بو بە فەرماندەی پێشەنگی سوپای (عبدالله) بۆ گرتنی (تکریت). پاش ئەوە بوو بە سەرکردە بۆ گرتنی دوو قەڵای نەینەوا و موسڵ، پاشان خەلیفە عومەر دایناە بەسەر حوکمڕانی موسڵەوە، کاری ئاسان کرد بۆ فەتح کردنی هەرێمی جزیرەی ابن عمر (بۆتان).

ئیدارەو ڕێکخستن و بڕیاری بوە. کە دەکرێ بکرێتە قوتابخانەی جەنگی و زانیاری بەڵێ، روبعی بە یارمەتی عەرەبەکانی ئەو خێڵە تازە موسوڵمان بوانە هەدەفەکەیان پڕ پڕ پێکا، بەبێ شەڕو ناو زڕان و هاڵە و گاڵە گەیشتنە دەرگای هەردوو قەڵاکە، بە بێ ئەوەی پێیان بزانن، پێش هەواڵ کەوتن.

روبعی هێزەکەی سوارە بوو، خۆی پێشەنگ بوو، تا دەرگای مەبەستی دیاری کراو. عومەر هیچ کەسی لێوەربگرێ.

لەبیر نەدەکرد، سودی لە توانای هەر هەموو وەردەگرت، لە کات وسات و شوێنی خۆی دا بەکاری دەهێنان.

جێبەجێکردنی هونەری (مباغتە) یەکێکە لە جەنگە خێرا سەرکەوتوەکان. کە پێش هەواڵ بگەیتە مەبەست. یەکێکە لە هۆیە گرنگەکانی سەرکەوتن و ورە بەردان و تۆقاندنی دوژمن، موسوڵمانەکان پێش هەواڵ کەوتن، سەرکەوتن، ماوەی نێوان تکریت و موسڵیان لە کەمترین کاتدا بڕی. بەڵام سوپای (حولەفا) ئەو ماوەیەی بە (یەك ساڵ و نیو) بڕی لە جەنگی جیهانی یەکەم دا.[98] هاوپەیمانان دوو جار لەبەردەم موسڵ شکانو گەڕانەوە کەرکووك، هەرچەندە بەهێزترینو نوێترین چەکیان پێبوو، ئەوەش سوپای ئیسلام بوو بە سادەترین چەكو بەهێزترین باوەڕەوە. کات و شوێن، سەرکردەی لێزان دەیگونجێنێ. تاکتیك و لێدانی موسوڵمانەکان، لەو هێزە لێدەرەی (قوة ضاربة)ی موسڵ کە لە خەندەقی تکریت دا خۆیان دامەزراند بوو، بە جۆرێك لێیان دان یەك کەسیان دەرنەچوو هەواڵ بباتەوە بۆ موسڵ، موسڵیش هێزێکی وای تیا نەما بوو بیپارێزێ. زەرەری رۆمەکان لەو جەنگە دا زۆر بوو، هەموو هێزەکانیان فەوتا، تکریت و موسڵ گیرا، عەرەبەکانیان لە دەست چوو و دایانە پاڵ موسوڵمانەکان. خۆسازدانەوەی سوپای رۆم لە موسڵ کات و هەواڵی تکریتی دەویست، بەڵام (روبعی) پێش کات و هەواڵ

---

[98] قادة فتح العراق والجزيرة. اللواء الركن محمود شيت خطاب، ص٢٨٤.

**کەوت. شەووڕۆژی نایە سەر یەك هەتا نەخشەی عومەر لە مەدینەوە و لە دوری (١٥٠٠) کیلومەترەوە جێبەجێ بکات و نکوڵی نەکات!**

**ئەوەیە بیرباوەڕ و ئەوەیە گوێ رایەڵی سەرکردە و بەجێهێنانی بڕیاری سەرەوە، سەرکردە ئیسلامییەکان بە ئاگابوون لەوەی سوپای موسڵ گەیشتوەتە تکریت و نەخشەکەیان لە سەر ئەوە داڕێژا بوو. عومەر نامەی نووسی کە (روبعی) بەسەر موسڵەوە دابنی و، (عرفچەی کوڕی هەرسومە)[99] بەسەر نەینەواوە دابنێ. (عرفچە) لە موسڵ مزگەوتێکی دروست کرد، هەتا سەردەمی خەلیفە عوسمان والی موسڵ بوو.**

**عەبدوڵڵای سەرکردە لە موسڵ مایەوە هەتا (سەعد)ی سەرکردەی بانگی کردەوە کە بە هێزەکەیەوە بگاتەوە مدائن و پێکەوە چوون بۆ شاری کوفە.[100]**

**لەم باسانەدا بۆمان دەردەکەوێت، کە عومەر ئاگاداری نەخشەی هەموو ناوچەکان بوە، شار و قەڵاو شاخ و چەم و دۆڵ و سەربازگە و فەرماندە و سەرکردەکانی فارس و رۆمی لەبەر دەستدا بووە، دەیزانی چی دەکا و بۆ کوێ دەچێت. ئەم زانیاریانە چۆنی دەست کەوتوە، مێژوو بۆمانی باس ناکات، (یان هێشتا من رێم لێی نەکەوتوە. نووسەر)، عومەر سوپایەك دەنێرێ. دەزانێ کێ لە فەرماندەکانی بۆ ئەو ناوچەیە و سروشتی خەڵکی ئەو ناوە و سروشتی پێك هاتوویی خاکی ئەو ناوچەیە چاکە. هیچ کارێکی بە هەڕەمەکی نەکردووە و لە خۆیەوە ملی نەناوە. هەموو ئیحتیاتێکی ئەو جێگە و ئەو جەنگ و هێرشانەی دەزانی و زەخیرەی بۆ ئامادە دەکرد، شوێنەکەشی بە نەخشەی پێشوو زانیوە. بڕوانە نەخشەی ژمارە (٢)**

---

[99]. عرفچە کوڕی هەرسومەی بارقی: یەکەم فەرماندەی ئیسلام بوو سواری دەریا بوو لە بحرین پەڕیەوە، وە یەکەم کەس بووە چوە موسڵ، لە سەردەمی پێغەمبەردا موسوڵمان بوو لە ساڵی نۆی کۆچی دا، ابوبکر عرفچەی نارد بە فەرماندە بۆ سەر هەلگەڕاوەکانی (مهرة) لە یەمەن، پاشان ئەهاتە عێراق و لە جەنگی جسر و بویب و قادسیە و مدائن و ئەهواز و تستر و تکریت و رامهرمزدا بەشداری کرد، هەتا بوو بو والی موسڵ، پاشان عوسمان لای برد و کردی بە مجاهد و ناردی بۆ وڵاتی فارس.

[100]. تأریخ الطبري. الامام الطبري، ج٣ ص١٤٧.

## جەنگی هیت و قرقیسیا

زۆر بەسەر جەنگی تکریت و موسڵدا نەڕۆیشتبوو، کە ڕۆم ویستی تۆڵەی ئەو زیانە گەورەیەی بکاتەوە کە بەسەری هاتبوو لەو ناوچانەدا. بە یارمەتی خێڵە عەرەبەکانی ناوچەکە سوپایەکی زۆری کۆکردەوە، هەواڵ گەیشتە (سەعد) لە (کوفە) کە عەرەبەکانی هەرێمی جزیرەی ئیبن عومەر (کوردستان) یارمەتی هەرقلیان داوە بە دوو سوپا. یەکێکیان ناردوە بۆ شاری (هیت) لە نزیك (رومادی). بە تەمان هێزیدوەم بنێرن بۆ گرتنەوەی شاری (حومص) کە زۆر نیە سوپای ئیسلامی شام رزگاریان کردوە، هەتا ئێرەش عومەر نیەتی نەهێناوە بە تایبەت سنووری کوردستان ببەزێنی. بەڵام ئەم یارمەتیانەی خێڵە عەرەبەکانی (نەمر و ئیاد و بەنی تەغلوب و.) وای کرد کە عومەر داوا بکات مشوری کپ کردنی سەرچاوەی ئەم هێزانە بخورێت. دەنا هەتا ئێستا هەر بە لێواری سەر سنوری کوردستاندا هاتوە، لە جلولاوە بۆ تکریت و موسڵ یان بۆ خانەقین و حەلوان. هێزێکی عەرەبەکانی ناو خاکی کوردستان کە روون نەبووەتەوە ئەو عەرەبانە چۆن لە خاکی جزیرەی کوردستاندا جێگیر بوون، بەرەو خوار هاتووە بۆ (هیت و قرقیسیا)، عاریان نەناوە لەوەی بەسەریان هات لە تکریت و موسڵ و نەینەوا.

(سەعد) نامەی بۆ عومەر نووسی کە خەڵکی جزیرە هێزیان ناردووە بۆ شاری هیت بۆ یارمەتی سوپای ڕۆم، عومەر وەڵامی نامەی نووسیەوە:

(ان ابعث اليهم عمر بن مالك بن عتبة بن نوفل بن عبد مناف، في جند، و ابعث على مقدمته الحارث بن يزيد العامري، وعلى مجنبته ربعي بن عامر و مالك ابن حبيب)[101]

(عومەر کوڕی مالك) بەرەو (هیت) جوڵا، (حارسی کوڕی یەزید)ی لە پێشەوە نارد هەتا نزیك بوونەوە، دەبینێ خەنەقێکی قوڵ و گەورەیان بە دەوری خۆیان و شاردا لێ داوە، کە عومەر گەیشت و ئەوەی بینی، زانی زۆر

[101] . رسائل الفاروق. عبداللطيف اسماعيل، رسالة رقم (١٢١).

**بەهێزە و گەمارۆی درێژە دەکێشێ " سوپاکەی کردە دوو بەشەوە، بەشێکی دانا بۆ بەردەوامی گەمارۆکە، نیوەکەی تر خۆی بردی بۆ سەر شاری (قرقیسیا)[102] ، تەنانەت خێمەکانی خۆی تێك نەدا وتی با خەڵکی هیت نەزانن کە نیوەی سوپاکەمان بردوە. زۆر بە ئاسان (قرقیسیا)ی تەواو کرد، لەگەڵ خەڵکەکەی ڕێکەوتن کە جزیە بدەن و لەسەر ئاینی خۆیان بمێننەوە، بەڵام هیت هەر سوور بوون لەسەر خۆ قایم کردن.**

**سوپایەك خۆی بە شت بزانێ و لەو دوورەوە بێت، هەق وایە لە مەیداندا بەرامبەر دوژمنەکەی سنگ دەرپەڕێنێ. نەك خەنەقێك بکەنە قەبر و بچنە ناوی، ئەم ترس و لەرزە ئازایەتی نیە، خۆ بە کوشت دانە و ورە ڕوخانە.**

**عومەر[103] زانی خەڵکی هیت سوورن لەسەر خۆ حەشاردان. لە قرقیسیاوە نامەیەکی بۆ (حارس) نووسی: (ئەگەر خەڵکی هیت وەڵامیان دایەوە، ئەوا وازیان لێ بێنە با ئازاد بن و دەرچنە دەرەوە. دەنا خەنەقێك لێ بدە بە دەوری خەنەقەکەی ئەواندا و، با دەرگاکەی لای خۆتەوە بێت، هەتا بزانە چی دەکەن.)[104] حارس نوێنەری نارد بۆ لای خەڵکی هیت و پێی وتن: (نیازمان وایە کە هەتا مردن نەمێڵین دەربچن. ئەگەر واز نەهێنن و هەر سوور بن لەسەر خۆ حەشاردان، ئەوا فرسەتێکی چاکتان لە کیس دەچێت کە ڕزگار بون و نەکوژران و ئەسیر نەبوونە.) لە نامەیەکی تردا حارس دەڵێت: (خەنەقێك بە دەوری خەنەقەکەتاندا هەڵدەکەنم و نامێڵم بجوڵێن هەتا هەموو دەمرن و هیت تەسلیم دەبێت. ئەوەشی دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ لای کەس و**

---

[102] . قرقیسیا: شارێکە لەویا کە سێگۆشەی ئاوی خابور دەڕژێتە ڕوباری فورات.

[103] . عومەری کوڕی مالکی زوهدی: خێڵی زوهدی زۆر دوژمنی ئیسلام بوون، بەڵام ئەم پیاوەشیان تیا هەلکەوت،(الاصابة [illegible]ییز الصحابة، ج٤ ص٢٨٢). لەگەڵ خالید دا لە جەنگی هەلکەڕلوەکاندا بەشدار بوە، پاشان لەگەڵیدا چوو بۆ عێراق و شام و لە هەموو جەنگەکاندا بەشدار بوە، پاشان لەژێر سەرکردایەتی (هاشم)دا چوو بۆ جەنگی جلولا، هاشم گەڕلیەوە مدائن " بەڵام ئەم هەر خۆی دا بە دەم شالاوی جهادی دژی کافرلنەوە.(اسد الغابة،ج٤ ص٨١).

[104] . حارس کوڕی یەزیدی عامری.

کاری له چەکداران، دەتوانن به سەلامەتی برۆن.) که چەکدارەکان زانیان ئەمە گەمارۆی مردنه، خێڵە عەرەبەکان وەڵامیان دانەوەو شاریان چۆڵ کرد و گەڕانەوە بۆ جزیرە.[105] ، حارس‌و سوپاکەی بێ شەڕ چونە ناو شاری (هیت).

خەلیفە عومەر له خۆیەوە ئەم فەرماندە سوپاییانەی دەستنیشان نەکردووە، ئەو فەرماندەیەش هەر بۆ گاڵتە و له تەمەڵیدا نیه خێمەکانی جێ دەهێڵێ. ئەمە بیرۆکەی سەرکردەیە که به نامەیەك یان هەڕەشەیەك شارێك تەسلیم دەبێت، ئەوە هونەری جەنگیيە.

لەم جەنگە بێ هودانەی خێڵە عەرەبەکاندا ئەوە روون دەبێتەوە، که ئەم خێڵە عەرەبانەی که له خاکی کوردا دەژین هار و دڕندەن و رۆمەکان هەڵیان دەنێن، خاکی بیابانی خۆیانیان پێ جێهێشتوون و به زۆر خاکی به پیت و بەراوی هەرێمی جزیرەی بەسەردا دابەش کردون و ئەوانیش دیفاع له رۆم دەکەن. خاڵێکی تریش ئەوەیە که لەوە دەچێت کوردەکان نەهاتبن به دەم رۆمەکانەوەو یارمەتیان نەدابن. رۆمیش عەرەبی خێڵەکی بەسەردا فەرز کردون. جگە لەوە له جێیەکی تردا باسم کرد که ئەم خێڵە عەرەبانە پێشتر له ناوچەی بەسرە دەژیان و هەمان کاریان بۆ فارسەکان دەکرد. ئەمانە لەوە دەچێت کرێگرتە بن‌و سیخوڕو شەڕانی بن‌و کاریان تەنها جاشایەتی بووبێت.

سەرکردایەتی عومەر وەها بوو، هیچ فەرماندە و جابی و سەربازێکی له بیر نەدەکرد، ناوی هەموویانی له تۆمارگەیەکدا نووسیبوو. هەر ئەوە بوو وای کردبوو که لای هەموان گەورە و بەرز و رەمز دەبینرا و، زۆر به ئاسانی داواکاریەکانی جێبەجێ دەبوو!.

---

[105] . قادة فتح العراق والجزيرة. اللواء الركن محمود شيت خطاب، ص٤٠٥.

# بەشی چـــوارەم

* هەرێمی جزیره و کلکـه نەوتینەی خێڵـه عەرەبەکان
* بۆچی سوپای ئیسلام رویکردە هەرێمی جزیـــره
* رزگارکردنی هەموو شارە کوردییەکان بە ئاشتی
* شاری رقــه
* شاری رەها و حەڕان
* شاری رەئس عیون
* شاری قرقیسیا
* شاری نوسێبین
* ئە نجامی رووداوەکان
* بارودۆخی شام دوای رووداوەکانی جزیره
* خولی دەرچوونی ئەفسەر و فەرماندەی سەربازی
* حاکمی شاری رەی پێشوازی لە یەزدگورد دەکات

## هەرێمی جزیرە

**کوردستانی گەورە لە پێش ئیسلامدا کرابوو بە سێ بەشەوە:**

**١- هەرێمی چیـــا**

**٢- هەرێمی شارەزور**

**٣- هەرێمی جزیرە**

هەرێمی جزیرە کەوتبوە باکوری رۆژئاوای کوردستانەوە، دییار (خزر) و دییاری (رەبیعە) و، دییاری (ئیاد) و، دییار بکر و، (بەنی تەغلوب) و شارەکانی ئورفە و نوسێبین و رەهاو رقە و ماردین و ئامێدی و میافارقین و رەئس عیون و جزیرەی (ئیبن عومەر)ی دەگرتەوە.[106]

ئەم ناوچەیە بۆیە پێیان دەگوت (هەرێمی جزیرە)، چونکە دەکەوێتە نێوان سەرەتای دەستپێکردنیهەردوو رووباری دجلە و فوراتەوە[107]. ئەم ناوچەیە ئەمڕۆ بە جزیرەی (ئیبن عومەر) و جزیرەی (بۆتان) ناودارە، هەوای پاک و ژیان و گوزەرانی خۆش و پڕ خێراتە، شارو قەڵاو شورای زۆری تێدایە، ناوچەیەکی شاخاوی و چڕە، کەشتیەکەی نوح لە سەر شاخی (جودی) لەم هەرێمەدا نیشتۆتەوە، لەبەرئەوە ناوچەکە بوەتە (لانکی دووەمی مرۆڤایەتی) واتە قوناغی دووەمی ژیانی سەر زەوی دوای تۆفان، لێرە وە دەستی پێ کردوە و بە هەموو جیهاندا بڵاوەیان کردووە.[108]

مێژوونوسان دەڵێن: حەوت هەزار ساڵ پێش زایین، یەکەم جموجۆڵی ژیان و چاندنی گەنم و، ئاسەواری کێڵان و هاڕین لەم ناوچەیەدا هەبوە.[109]

لە سەرەتای ئیسلامەوە، کە هێشتا سنوری ئیسلامەتی لە شاری مەککە و مەدینە تێنەپەڕی بوو، خەڵکی ئەم ناوچەیە کە لە زوەوە چاوەڕوانی هاتنی

---

[106] . معجم البلدان، یاقوت الحموي. ج٢ ص١٣٨.

[107] . العقد الفرید، ابن عبد ربه. ج٧ ص٢٤٣.

[108] . ئاینی کورد، حسن محمود حمه کریم. ل٧. ١٩٩٧.

[109] . گۆڤاری (هەزارمێرد). ژ/٢. ل١٨٨. سلێمانی ١٩٩٨.

پێغەمبەری چاوەڕوان کراویان دەکرد، هەر کە هەواڵی دەرکەوتنیان پێ گەیشت، دەم ودەست وەفدێکی دوانزە کەسی پێك دەهێنن و بە نهێنی و بە ناوی بازرگانیەوە دەینێرن بۆ مەدینە، بۆ زانینی هەواڵ و، ناسینی پێغەمبەر و، راگەیاندنی پشتگیری خۆیان بۆ ئاینە نوێیەکە، ئەو وەفدە ناونرا (بازرگانانی هۆزی باجن)، بەم نمونەیەدا دەردەکەوێت کە کورد پێش هاتنی سوپای ئیسلام بۆ کوردستان، بەپێی خۆیان چوون و ئیسلام بونی خۆیان راگەیاندوە، کە هێشتا ئیسلامەتی لە سنوری تەسکی مەککە و مدینە و نیوە دورگەی عەرەب تێنەپەڕی بوو.[110]

ئەمین زەکی ئەمە دەسەلمێنێ و دەڵێ: (گەلی کورد وەکو مێژوونوسانی بڕوا پێ کراو دەڵێن، لە شانزەهەمین ساڵی هجرەتدا لە دوای فەتحی (حلوان و تکریت) لەگەڵ سوپای ئیسلامدا پەیوەندیان کردوە، بەڵام پێویستە بزانین کە لە پێش ئەم مێژوەش دا، هەندێ تەماس و ئهتدای تری کورد بوە، کە (روح المعاني ئالوسی) و(الاصابة في تميز الصحابەی ئیبن حجر) باسیان کردوە.[111]
هەرێمی جزیرە کوردنشینە و وڵاتی کۆنی کوردە، بەڵام چەند خێڵێکی عەرەبیش، لەگەڵ کوردەکان دا دەژین، کە لە نیوە دورگەی عەرەب و شامەوە کۆچیان کردوە، هۆی کۆچ کردنەکەیان رون نیە وەك خێڵی (ربیعە) و (ئیاد) و (بکر) و (بني تغلب). ئەم عەرەبانە چونکە خاکی خۆیان نەبوو بۆ پشتگیری لە خۆیان و، مانەوەیان بە گوێرەی رۆژگار، دەیاندایە پاڵ (فارس) یان (رۆم).

ئەم عەرەبانە پێشتر لەگەڵ فارس بوون و، بە یارمەتی ئەوان دەژیان، بەڵام دوای گیرانی (مەدائن) پایتەختی فارس، لەلایەن سوپای ئیسلامەوە و، دوور کەوتنەوەی فارس لە سنووری ئەمان، دایانە پاڵ ڕۆم و سەربازیان دەدایە سوپای ڕۆم وەك کرێ گرتە.

---

[110]. کابانی کوردی، حسن محمود حمە کریم. ل١٠٠ بازرگانانی هۆزی باجن)

[111]. کوردو کوردستان، محمد امین زکی. ل١٢٣. مهاباد، چاپخانەی سیدیان.

(کارل بروکلمان) دەڵێ: (خەڵکی ئەسڵی جزیرە کە کوردن سەرشۆڕو چەوساوەبوون لەلایەن کەنیسەی ئەرسوزۆکس  کە بە زۆر لەو ناوچەیەدا بڵاوەیان بە ئاینەکەیان کردبوو، دەیانوسیت یەك سروشت بۆ مەسیح دابنێن.)[112]

(ئەمین زەکی) بۆ هاتنی ئاینی عیسەوی بۆ کوردستان دەڵێ: ئاینی عیسەوی ساڵێ (۳۳)زاینی هاتە ئەرمەنستان بەڵام ڕەغبەتی نەبوو، هەتا سەرەتای سەدەی چوارەمی زاینی، کە بە یارمەتی و زۆری حکومەتی رۆما، لە سوریەوە گاورێتی هێنرایە ئەرمینیە و کوردستان، قراڵی ئەرمەنیە قبوڵی کرد، بەڵام کوردەکانی کوردستان گوێ یان نەدایە، لەسەر ئاینی زەردەشتی مانەوە، هەوڵ و هاندانی قەشەکان کاری لێ نەکردن.)[113]

بەڵام مامۆستا ئەمین زەکی بۆ هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان دەڵێ: (هەر لە دەرکەوتنی ئیسلامەتیدا و هەر لە یەکەم پەیوەندی لەگەڵ ئیسلامەکاندا کوردەکان، تێفکرین و دیان، ئەم ئاینە نوێیە بە تەواوی موافقی تەبع و وجدانیانە، لەبەر ئەوە وەکو (سور مارك سایکس) دەڵێ: بەئاسانی و بەرەبەرە قبوڵیان کرد بە شێوەیەك کە (بەربەر)ە کانی ئەفریقا و (تورك)ە کانی تورکستان بەو جۆرە بەدڵ و شەوق قبوڵیان نەکرد....[114]

---

[112]. تأريخ الشعوب الاسلامية، كارل بروكلمان، ص٩٨، الطبعة السابعة، بيروت ١٩٧٧.

[113]. کوردو کوردستان، محمد امين زکی. ج٢،١،٢. ل١٢٢. مهابات.

[114]. هەمان سەرچاوە، ل١٢٣.

## بۆچی ســـوپـــای ئیسلام رووی کردە هەرێمی جزیرە؟

بنکەی سەربازگەی عێراق بە سەرکردایەتی (سەعد)، جلولاو خانەقین و حەلوانیان رزگار کرد لە چنگی فارس.

بنکەی سەربازی شام بەسەرکردایەتی (ئەبو عوبەیدە) زۆربەی فەلەستین لوبنان و سوریەیان رزگار کرد لە چنگی رۆم و کەوتنە رێ بەرەو شاری (حومس). کە(هەرقل) ئەو هەواڵەی زانی، شاری (حومس) یان چۆڵ کردو کشانەوە بۆ شاری (ئەنتاکیە)، پاشان چوو بۆ شاری (ڕەها) لە جزیرە، بۆ هاندانی هۆزە عەرەبەکانی ناو عێراق بۆ جەنگ و کۆکردنەوەیان بۆ چونە سەر (حومس) و گێڕانەوەی ئەو شارە لە چنگی موسوڵمانان.

ئێستە هێزی (رۆم)[115] لە سوریە و شام نەماوە. هەموویان بەرەو ژوور هەڵهاتوون. جگە کەمێك لە خێڵە عەرەبەکان، هەموو شام بە حوکمی موسوڵمانان رازی بوون، هەندێ لە خێڵە عەرەبەکانی جزیرە لەناو عێراقەوە، نامەیان بۆ پاشای رۆم نووسی، داوایان لێ کردن خۆیان کۆ بکەنەوە و، بگەرێنەوە بۆ دوژمنایەتی موسوڵمانان، بەتایبەتی هۆزی (بەنی تەغلوب) کە لە ساڵی (١٣) ی کۆچیەوە بەردەوام فارس و رۆم هانی دەدان لە دژی ئیسلام.

---

[115] . حکومەتی رۆم: دووەم ئیمپراتۆریەتی گەورەی سەر زەوی بوو کە فارس و رۆم زەویان لە نێوان خۆیاندا بەش کردبوو، پایتەختی رۆم شاری (رومیە) بوو، کە دەسەڵاتی بە سەر هەموو ئەوروپا و بە شێك لە ئاسیا و باکوری ئەفریقا دا دەڕۆیشت. بەو فراوانیە مایەوە هەتا سەردەمی قەیسەر (تیود قیوس). ئەم پاشایە لە ساڵی ٣٩٥ ی زایینی دا بیری کردەوە کە ئەم حکومەتە فراوانە ناڕوات بەڕێوە، وای بە چاك زانی لە نێوان دوو کوڕەکەی دا بیکات بە دوو بەشەوە، بەشی ئەوروپا کە پایتەختی (رومیە) بوو دای بە کوڕە بچووکەکەی. بەشی رۆژهەڵات و خوارووکە بەشی ئاسیاو باکوری ئەفریقا و ئەوروپای رۆژهەڵات بوو دای بە کوڕە گەورەکەی کە ناوی (رقادیوس) بوو، وە شاری (قسطنطینیة)ی بۆ کردە پایتەخت، ئەم پاشایە هەتا ساڵی (٤٠٨)ی زایینی حوکمی کرد. ئەم دوو کەرت کردنە لە بەرژەوەندی ئەو ئیسلامە بوو کە (٢٥٠) ساڵی تر دێت و رۆم دەبێتە رێگر لە بەردەم بڵاوبوونەوەی ئیسلامدا. پاشا دوای پاشا هاتن، هەتا سەرەهاتەسەر (هەرقل) کە ئەمڕۆ دەیەوێت بە یارمەتی عەرەبەکانی هەرێمی جزیرە (حومس) بگرێتەوە لە شام.

ئەم عەرەبانە پێشتر لەگەڵ فارس بوون، بەڵام دوای گیرانی (مەدائن) پایتەختی فارس لە لایەن سوپای ئیسلامەوە و دورکەوتنەوەی سوپای فارس، چونە پاڵ رۆمەکان.!

ئەم خێڵە عەرەبانە زۆر دەجوڵێن، بەڵام لە هیچ مێژویەکدا نابینی، کوردەکانی ئەم هەرێمە رێکەوتنێك لەگەڵ فارس و رۆم مۆر بکەن و دژایەتی سوپای ئیسلام بکەن.[116]

خێڵ و هۆزە عەرەبەکانی جزیرە، نامەیان نووسی بۆ هەرقل و ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ دوژمنایەتی ئیسلام، بەردەوام نامەیان دەگۆڕیەوە و دڵسۆزی خۆیان رادەگەیاند بۆ رۆم. کارێکی وایان کرد کە هەرقل رای بگۆڕێ و نیەت بهێنێ و هەوڵ بدات کە جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ شام. دەنا دەستی لە شام شۆرد بوو. هەرقل چووە سەر ئەقڵی ئەوان، نامەی نووسی بۆ خێڵە عێراقی و شامیەکان و هانی دان، یارمەتی و پارەی بۆ ناردن، بۆی نووسین کە کەشتیە دەریاییەکانی سەلامەتن، سوپای بێشوماری ئامادەیە کە سواری دەریا بن و لە وشکانیەکانی سوریا دابەزن. بۆی نووسین کە لەسەر خێڵە عەرەبەکان پێویستە خۆیان ئامادە بکەن و بگەنە شاری حومس. خێڵە عەرەبەکانی جزیرەش بە تەنها ئامادەیی خۆیان دەربڕی و وەڵامی هەرقلیان دایەوە کە (هەر هەموومان لە ماڵەکانمانەوە ئامادەین و لە جوڵەداین بەرەوحومس بە هێزێکەوە کە ٣٠ هەزار کەس دەبین) پاشان هەرقل نامەو نوێنەری نهێنی نارد بۆ خەڵکی سوریە و هانی دان پەیمان لەگەڵ موسوڵمانەکان بشکێنن و راپەڕن لە دژی موسوڵمانەکان. نامەی نهێنی گەیشتە (حومس)، کە (هەرقل) بەڕێوەیە بەرەو لاتان و نیازیەتی حومس و سوریە پاك بکاتەوە لە سوپای ئیسلام.![117]

---

[116]. بروانە القرآن الكريم – سورة (التوبة) – الاية (٩٧)

[117]. يرموك وتحرير ديار الشام، اللواء الركن المتقاعد شاكر محمود راضي، ص١٨٢ بغداد ١٩٨٦.

شارەکانی(ئەنتاکیە) و (حەڵەب) و (قلنسرین) وەڵامی نامەکەی هەرقلیان دایەوە و لای خۆیانەوە پەیمان شکێنیان کرد، بەڵام خەڵکی (حومس) وەڵامیان نەدایەوە و پەیمانیان لەگەڵ موسوڵمانەکان نەشکاند، بڕوایان بەو جموجۆڵە و سەرکەوتنی رۆم نەبوو، بە ئاشکرا لە نامەکەدا بۆ هەرقلیان نووسی (ئێمە حوکمی رۆممان ناوێ و رازین بە حوکمی ئیسلام.) (لیوا شاکر) دەڵێت: (زۆربەی خەڵکی شام داواکەی هەرقلیان رەت کردەوە، تەنانەت کەمێك لەو سێ شارەی کە ناومان بردن، پەیمانیان شکاند. هەر زوو پەشیمان بوونەوە).

هەواڵ گەیشتە (سەعد کوڕی ئەبی وقاس) سەرکردەی بنکەی سەربازی عێراق و ئەمیری کوفە. کە سوپایەکی زۆری رۆم لە سوارەو پیادە لە (هەرێمی جزیرە) کۆبونەتەوە و چەك و جبەخانەیەکی زۆریان پێیە. (سەعد) نامەی بۆ (خەلیفە عومەر) نووسی و هەموو شتی تیا باس کرد، لەوانە: (ئەگەر جزیرە نەگیرێ، وڵاتی شام هەر لە خەتەر دا دەبێ، مادام جزیرەمان بە دەستەوە نیە، وڵاتی شام ئارام نابێت و هیچمان بۆ ناکرێت، رۆمەکان شەڕی (هیت و تکریت و موسڵ) یان بە عەرەبەکانی جزیرە کرد.)[118]

هەمان هەواڵ گەیشتە (ئەبو عوبەیدە کوڕی جەراح) سەرکردەی سوپا و ئەمیری شام کە سوپایەکی زۆری (رۆم) لە جزیرە کۆبونەتەوە، دەیانەوێت هێرش بکەنە سەر شاری (حومس) و لە موسوڵمانەکانی بسێننەوە، ئەبو عوبەیدەش لای خۆیەوە نامەی بۆ خەلیفە (عومەر) نووسی!

عومەر لە شاری (مەدینە) وە هەردوو نامەکەی هەڵسەنگاند و بۆ موسوڵمانەکانی خوێندەوە. لە بیری ئەوە دابوو نەخشەیەك دابڕێژێ، بۆ ئەو مەبەستە چەند دانیشتن و راگۆڕینەوەیەکی کرد.

رۆمەکان نیەتیان هێنابوو، کە خاکی شام بگێڕنەوە، بە چەند قۆناغێك، قۆناغی یەکەم شاری (حومس) بوو، بەڵام رۆم هیچ هێزێکی لە بەرەی

---

118. کتاب الفتوح، ابن اعثم الکوفي. ج١ ص٢٢٥. دار الندوة. بیروت ١٩٢٦

پێشەوەی جەنگی حومس نەبوو، چەند هێزێکی کەمی لە نزیک شارەکانی (قلنسرین و حەڵەب و ئەنتاکیە) هەبوو بەشی پارێزگاری ئەو شارانەشی نەدەکرد، هیچ هێزێکی ئامادە و لێدەر (قوة ضاربة)ی نەبوو، لەبەرئەوە کاتێکی زۆری دەویست هەتا سوپایەکی باش کۆبکاتەوە.

عومەر پێشەکی نامەیەکی خۆ ئامادە کردنی بەم جۆرە بۆ (سەعد) نووسی لە(کوفە):

(بۆ سەعد لەلایەن خۆتەوە هێزێك بنێرە بۆ جزیرە و یەکێك لەم سیانە بکە بە فەرماندەیان. خالید کوڕی عرفتە، یان هاشم کوڕی عوتبە، یان عیاز کوڕی غەنەم.)[119]

بارودۆخ لە ئەردەن و فەلەستین زۆر باش بوو، دەتوانرا هێزێکی ئحتیاتی لێوە بهێنرێ بۆ ناوچەی (حومس). بارودۆخی عێراقیش زۆر باش بوو، تازە بە تازە سەرکەوتنی گەورەیان بە دەست هێنا بوو لە (حەلوان و جەلەولا)، دەیان توانی یارمەتی بنێرن بۆ شام، هیچ نەبێت خێڵە عەرەبەکانی جزیرە لە کۆڵ شام بکەنەوە، بەرەی جەنگی عێراق بڕیاریدا چەند خۆدەرخستنێکی سەربازی، بەرەو باکور بکات هەتا عەرەبە خێڵەکیەکانی جزیرە بترسێنێ و بیان وەستێنێ و نەجوڵێن بەرەو سوریە. پەیوەندی کرا لەگەڵ سوپای شام، بۆ تەنسیق کردن و ڕێکخستنی جموجۆڵەکان، هەر بۆ ئەو مەبەستە هەردوولایان نامەیان بۆ خەلیفە نووسی، ئەویش ڕەزامەندی لەسەر بوو، کاتیش ئەوەی دەخواست.بەرەی جەنگی عێراق، جگە نەخشەو نامەکەی عومەر سێ ڕەتڵی تریشی ئامادە کرد، لە ناوچەی جۆراوجۆرەوە و، بەرەو شوێنی جیاواز، بۆ جزیرە و سنوری سوریا ناردنی کە تەنها هەر بۆ خۆنیشان دان و سەرلێشێوان بوون کە ئەمانەن:

١- عەبدوڵڵا کوڕی موعتەم....... لە موسڵەوە بکەونە ڕێ.

٢- عەمرو کوڕی مالك.......... لە کوفەوە بەرەو باکور بۆ قرقیسیا.

---

[119]. رسائل الفاروق، عبداللطيف اسماعيل جبوري. ص٩١. رسالة رقم (١٤٤) – بغداد ١٩٩٠

٣- وەلید کوڕی عوقبە.......... بەرەو جزیرە بڕوات.

وا ڕێك خرابوون، کە هەرسێکیان بە شێوەیەکی سێ گۆشە بڕۆن، دوو ڕەتڵ لە پێشەوە، ڕەتڵی سێهەم لە پشتیانەوە، بە ناوەڕاستیاندا، وەکو ئیحتیات.

هەواڵی ئەم سوپایە گەیشتە جزیرە. عەرەبەکانی ئەو ناوە نەیان وێرا بجوڵێن و بەرەو سوریە بکەونەڕێ هەتا بزانن ڕوی ئەو سێ سوپایە لە کوێیە.؟

ئەم جموجۆڵە و ئامانەی عومەر، هەر بۆ ترساندنی عەرەبەکانی جزیرە بوو، هەتا بیان وەستێنێ و، هێرش نەکەنە سەر (حومس)، هەتا لە نیازی تەواوی هەرقل تێ بگا، ئەوسا بڕیار بدات. ئەوەی تا ئێستە عومەر کردویەتی بۆ مشاغەلەی ڕۆم و عەرەبەکانی جزیرە بووە.

## گواستنەوەی سوپای میسر بۆ سوریە

هەرقل داوای کرد، کەشتیەکان ئامادە بکەن، فەرماندەی کەشتیەکانی دایە (قەستەنتین)ی کوڕی نامەی نوسی بۆ (میسر)، هەرچی سوپای ڕۆم هەیە لە (ئەسکەندەریە) ئامادەی بکەن بۆ گواستنەوەیان بۆ سوریە. کەشتیەکان کەوتنە ڕێ واتە گەیشتنە ئەسکندریە لە میسر، و باریان کردن، کەوتنەڕێ بەرەو هەردوو بەندەری (ئەنتاکیا) و (قلنسرین) لە سوریە، لەسەر کەناری دەریای ناوەڕاست. نەخشەی ڕۆم هەتا ئێستا گواستنەوەی دوو سوپایە، یەکیان لە وشکانیەوە لە جزیرەوە بۆ حومس، ئەویان لە دەریاوە لە ئەسکندریەی میسرەوە، بۆ لێوارەکانی سوریا. دەست پێکردن بەم دوو کارە، بوو بە هۆی هەڵگیرساندنی هەندێ شۆڕش و ڕاپەڕین لە شارەکانی سوریا وە، لە دژی سوپای ئیسلام. ئەم کارە سوپای ئیسلامی مەشغوڵ کرد بە وازهێنان لە ڕۆم و کپ کردنەوەی شۆڕشەکان.

لەم کاتەدا سوپای ڕۆم دابەزینە وشکانیەکانی دەریای سوریا، کەمێك بەرەو ناوەوەی سوریا پێش کەوتن، لەگەڵ هەندێك لە خێڵە عەرەبیەکاندا

یەکیان گرتەوە و لە هەندێ شوێندا سەرکەوتنیان بە دەست هێنا. هەرقل گومانی کردبوو کە دەتوانێ زیاتر بڕوات و سەرکەوتنی زیاتر بە دەست بهێنێ و سوریا بگرێتەوە. ئەم سوپا زۆرە دابەزێنرایە ناو خاکی سوریاوە، بەڵام سوپایەکی قورسی وا پێویست بە پشت بەستن بە هێزێکی بەهێزی دامەزراوی سەزەمین دەکات لە وشکانی دا، گەیشتن بە هێزی خێڵە عەرەبەکانی عێراقیش، بڕینی مەسافەیەکی زۆری دەوێت، کە ئەستەمە بیان گاتێ و روباری فورات ببڕێت. لەولاوە سوپای ئیسلامی لە عێراق دەتوانێ بگاتە جزیرە و ئەو خێڵە عەرەبانە لە سوپای رۆم بکاو ئەو پاڵ پشتەیان بشکێنێ، چونکە نزیکە لێ یانەوە. ئەمە جگە لەوەی کە رۆم ناتوانێ بەو نێوانە دورەدا یارمەتی بگەیەنێتە خێڵە عەرەبەکانی جزیرە، تەنانەت شۆڕشەکان وانەبوون، زۆر بۆ سوپای ئیسلام بهێنن، چونکە زۆربەی ناوچەکان مەیلیان بۆ ئیسلام بوو تا رۆم، هەرقل لەویدا بۆی دەرکەوت وا دەرنەچوو، سوپایەکی غەریب بێ پشت و پەنا هیچی پێ ناکرێ، چونکە زەمینەیان بۆ ساز نەکردوە، رۆم دەترسا ئەگەر سوپا هەموی دابەزێنێ گەمارۆ بدرێ و لەناو بچێ.

## بـــڕیـــاری عـــومەر

نێستە کاتی ئەوە هاتوە عومەر بڕیاری تەواو بدات و، نەخشەی رێك و پێك دابڕێژێ و وەڵامی تەواوی نامەکان بداتەوە. بێ گومان وەك پێغەمبەر دەفەرموێ (اتقوا فراسة المؤمن فانه ينظر بنور الله)[120] سەرکردە ئیسلامیەکان هەر لەوانەی مەدینەوە، هەتا ئەوانەی بەرەی جەنگیەکان، یەك کوتلەی رۆحین و ئیمان و بڕواو و عقیدە دەیان جوڵێنێ، عومەر بە نوری خوا دەڕوانێ زۆر وردو دوور دەبینێ، پێش و پاشی روداوەکانی لەبەرچاوە، هەر شام نابینێ وەکو (ئەبو عوبەیدە) وای بۆ دەچوو، ئەوەندەی شام بیر ناکاتەوە، هەموو بەرە جەنگیەکان لای عومەر یەك پارچەن، یەك لاشەن، بۆ یەك مەبەست دەیان جوڵێنن، عومەر دەیەوێ بە کەمترین زیان لەو تەڵەیە دەربچێ. شەڕەکە لە شام

---

120. حديث النبوي.

بوو، بەڵام عومەر لە عێراقەوە دەستی پێ کرد، یەکەم هەنگاوی عومەر لێدانی خێڵە عەرەبەکانی جزیرە بوو لە عێراق، پاشان چووە سەر سوپای رۆم لە شام.

عومەر نامەیەکی بە پەلەی بۆ (سەعد) نووسی، وای نووسی کە تەنها سەعد بەرپرسیارە لە پەلە نەکردن و جێبەجێ نەکردنی بەم جۆرە.

(بۆ سەعد کوڕی ئەبی وەقاس. ئەبا عوبەیدە چوار دەوری گیراوە، پەنای بردۆتەبەر قەڵاکان. تۆش موسوڵمانەکان بنێرە و بڵاویان بکەرەوە لە جزیرە، خێڵە عەرەبەکان مەشغوڵ بکە با نەچنە سەرحومس بۆ یارمەتی سوپای رۆم) نامەکە زۆر کورت بوو.

بڕیارێکی خێرای ئاوا کاری خێرای دەوێت و هەموو مەبەستێکی تیا بوو. نامەکە تەنها (سەعد)ی سەرکردەی دەدواند، بەتەنها ناوی سەعدی بردبوو، مانای وایە هەر خۆی بەر پرسە لە هەر نکوڵیەك و دواکەوتنێك کە روبدات. پاشان وەسیەتی بە جوڵانەکە کرد، کەبە گەیشتنی نامە ئەم سوپایە رێك دەخەیت و دەینێری.

عومەر نەحشەیەکی سەربازی گرنگی دانا تەنانەت لە بیری سەرکردەکانی شامیشدا نەبوو بەم جۆرە: بۆ سەعدی کوری ئەبی وەقاس.

١. رەتڵی یەکەم: یارمەتی بۆ وڵاتی شام. خەڵکێك رێك بخە و لەگەڵ (قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی) و هەر لەو رۆژەی کە نامەکەت پێ دەگات، بینێرە بۆ(حومس) چونکە ئەبوعوبەیدە گەمارۆ دراوە.

٢. رەتڵی دووەم: (سوهەیلی کوڕی عودەی) بنێرە بۆ شاری (ڕقە)، چونکە خەڵکی جزیرە بوون رۆمیان هاندا کە بچنە سەر (حومس).

٣. رەتڵی سێیەم: (عەبدوڵڵا کوڕی عوتبان) بنێرە بۆ شاری (نوسێبین) دوای ئەو بۆ (حەڕان) و (رەها – ئورفە).

٤. رەتڵی چوارەم: (وەلیدی کوڕی عوقبە) بنێرە سەر خێڵی (رەبیعە و تنوخ) لەعەرەبی جزیرە.

٥.	سەرکردایەتی ڕەتڵەکان: (عیاز کوڕی غەنەم) بنێرە لەگەڵیان هەتا دەگەنە شەڕ، ئەوسا با (عیان) سەرپەرشتیان بکات و سەرکردە بێت.[121]

ئەم سوپا (٥) هەزار کەسیەی (عیان)، لە مانگی شەعبان ساڵی ١٨ کۆچی دا کەوتە ڕێ (واقیدی) مێژوونووس لێرەدا وەکو زۆر جێی تری کەوتۆتە هەڵەوە، وای نووسیوە کە (ئەبو عوبەیدە) لە شاری تەبەریەی فەلەستینەوە (عیان) ی نارد بۆ جزیرە، ئەگەر تەواوی باسەکەی واقدی بخوێنیتەوە یەك پارچە هەموی هەڵەیە.[122] بەڵکو ڕاستیەکەی ئەوەیە کە سەعد لە عێراقەوە ناردی! بڕوانە نەخشەی ژمارە (٣)

## نەخشەی هەرێمی جزیرە و ڕێڕەوی ڕەتڵەکان

سەعد سودی وەرگرت لەو (٤) هەزار ماینەی کە عومەر لە (بەسرە و کوفە) دainابون بۆ کاتی تەنگانە و خێرا. ڕەتڵەکان کەوتنەڕێ ڕوەو مەبەستی دیاری کراوی خۆیان بە جۆرێك کە لە ماوەیەکی کەمدا چوار دەوری هەموو هەرێمی جزیرەیان دا. هەموو ڕێگا سەرەکیەکانیان بەست، کە جزیرەی دەبەستەوە بە دەرەوەی هەرێم. (٥) هەزاری بە تەرتیب و بە باوەڕ سەر دەکەوێ بەسەر (٣٠) هەزار کاسە لێسی بێ باوەڕی خێڵەکی‌دا، کەمی چاك و مرەتەب چاکتر و بەهێزترە لە زۆری بۆری شەخەڵ.

لە کاتێکدا (٣٠) هەزار چەکدار لە خێڵە عەرەبەکانی جزیرە، خۆیان ئامادە کردوە، نیازیانە ڕۆم لە (حومس) نزیك بێتەوە، ئەوانیش لە جزیرە وە هێرش بهێنن. روباری فورات ببڕن، بچنە کۆمەکیان، پێش ئەوەی لە روباری فورات بپەڕنەوە بڵاوەیان لێ کرد و گەڕابوونەوە ناو خێڵ و ماڵ و منداڵی خۆیان و چەکەکانیان شاردبویەوە، دەرگایان لەسەر خۆیان داخستبوو. بەم کارە بەڵایەکی گەورە لە کۆڵ سوپای ئیسلامی ناو شاری حومس کەوت. جگە لەوە

---

[121] . یرموك، لیوا شاکر، ص١٨٦.

[122] . فتوح الشام. محمد بن عمر الواقدي، ج٢ ص٦٣.

یارمەتیدەرێکی گەورەی لە سوپای ڕۆم کرد، بوو بە هۆی هەڵوەشانەوەی نەخشەکەی هەرقل، کە دەیوست سوریە بگرێتەوە و حومس داگیر بکات!

عومەر بڕیاری بۆ ئەبوعوبەیدە دەرکرد کە لە (حومس) بمێنێتەوە و نەجوڵێ، داوای کرد کە داوا لە خێڵەکانی شام بکات بێن بە دەمیەوە، ئەو زستانە ئەبوعوبەیدە لە حومس مایەوە هەتا ناوەڕاستی بەهاری ١٨ کۆچی، لەو کاتەدا عومەر لە (قودس) بوو چوو بوو بۆ مۆرکردنی ڕێکەوتنی موسوڵمانان لەگەڵ گاورەکاندا.

ئەبوعوبەیدە بەردەوام کۆبونەوەی دەکرد بۆ وەرگرتنی ڕاو هەواڵ و هەڵوێست زانینی روداوەکانی جزیرە و ناو عێراق.

سوپای ئیسلام چووە ناو جزیرە، ئەوەی بەرامبەری سوپای ئیسلام وەستا سوپای ڕۆم بوو، کە ساڵەهایە ئەو بەشەی کوردستانیان لە ژێر چنگدا بوو، لە هیچ شوێنێکی مێژووە نووسراوەکاندا نیە کە کورد بەرەنگاری سوپای ئیسلامیان کرد بێ، هەروەکو چۆن لە بەرەی جەنگی فارسەکاندا، لە جلولاو خانەقین و حلوان، کە سوپای ئیسلام هاتە باشوری کوردستان، سوپای فارس بەرەنگاری وەستا نەك کورد. لە جزیرەش خێڵە عەرەبەکان ناردیان بە شوێن سوپای ڕۆمدا و یارمەتیان دان، کورد لە هیچ جێیەك دا نیە یارمەتی ڕۆمی دابێ، بەڵکو کوردەکان لە شارەکانیاندا نەك هەر بە (جزیە) دان رازی نەبوون، بەڵکو موسوڵمان دەبوون، چونکە وەکو لە پێشتر[123] روونم کردوەتەوە کە لە سەرەتای ئیسلامەوە .وەفدی کوردی ناوچەی جزیرە لە (هۆزی باجن) بە نهێنی بە ناوی بازرگانیەوە (دوانزە) کەس دەنێرنە مەدینەو، لە پێغەمبەری نوێ و ئیسلام ورد دەبنەوە و، ئیسلام بوونی خۆیان رادەگەیەنن، وە بە دیاریش ئاینی ئیسلام بۆ گەلەکەیان دەهێننەوە و، لەو رۆژەوە چاوەڕوان دەکەن، کەی بێت ئیسلام نزیك بێتەوە و، پڕ بە دڵیان ئەوەی نهێنیە لایان ئاشکرای بکەن، ئەو رێگەیە بەخێو دەکەن، ها کەی بێت

---

[123]. کابانی کوردی: حسن محمود حمە کریم – ل١٠، ١٩٩٧.

سوپای ئیسلام سەرکەویٚ و ئەو کابوسە رەشەی رۆم لەسەر گەلی کوردی باکور لابەریٚ.

ئەو کاتە عیاز لە بەشی باکوری کوردستان (هەریٚمی جزیرە) نزیک دەبیٚتەوە، کورد ژیٚردەستەیە، نە خاوەنی خۆی و میللەتیەتی، نە خاوەنی خاك و ئاو و نیشتمانیەتی، بەڵکو کوردستان داگیر کراوە، رۆمەکان گەنجە کوردەکانیان دەکردە سەرباز و، دەیان دان بە کوشت لە پیٚناوی بەرژەوەندی خۆیان دا، سەرانە و باج و خەرجیان دانا بوو لەسەر خەڵك و زەوی وزار و مەڕومالاٚتی کورد، کورد کرا بوو بە کۆیلە وەك کالاٚیەك بازرگانی پیٚوە دەکرا، شەڕیان پیٚ گەرم دەکردن، یەك هەزار ساڵە ئەوە حاڵی کوردە، فارس و رۆم لە شەڕی هەزار ساڵەی خۆیاندا دەیان هاڕن، بەلاٚم لە جەنگی (فارس و ئیسلام) و (رۆم و ئیسلام) دا، لە هەردوو بەرەی جەنگیدا، کورد خۆی حەشاردا، لە خزمەتی سەربازی هەڵهاتن، چاوەڕوانی نزیك بونەوەی سوپای ئیسلامیان دەکرد، هەتا پەیمانە نهیٚنییەکانیان بهیٚننە دی. وەکو لە باشوری کوردستان خەڵکی شارەزوور بەنزیك بونەوەی سوپای ئیسلام، راپەڕینیان لە دژی دام و دەزگای فارس کرد و، ئیسلام بونی خۆیان راگەیاند. ئیٚستە دەبینی کە گەلی کورد لە باکوری کوردستان و هەریٚمی جزیرە، هەر بە ویٚنەی باشوری کوردستان و هونەریٚکی تر وەلاٚمی سوپای ئیسلام دەدەنەوە!

**که (عیان)[124] و سوپای ئیسلام تەقەیان لە دەرگای سەرەوەی ئەو بەشەی هەرێمی کوردستان دا، ئەوەی هات بە دەم دەرگاوە، سوپای رۆم بوو، نەك کورد، کورد لە ماڵ بوو، بەڵام بۆی نەبوو بە دەم تەقەی دەرگای ماڵی خۆشییەوە بچێت، هیچ مێژوونوسێکی کۆن و نوێ باسی ئەوەیان نەکردوە، کە کورد هاتبن بە دەم تەقەی دەرگایانەوە. دڵیان لای ئەو کەسە بوە کە تەقەی لە دەرگایان دەدا، بەڵام لە پەنجەرەشەوە نەیان دەهێشت بیان بینن و مەرحەباییان بکەن. بەڵام کە رۆم شکا، ئیتر وردە وردە کورد تەعبیری لە نیازەکانی ناو دڵیان کرد بەچاکی وەڵامی سوپای ئیسلام دەدەنەوە.**

---

[124]. عیاز کوڕی غەنەمی فەهری: پێش (حودەیبیە) موسوڵمان بوو، بەشداری حودەیبیەی کرد، ئەبوبەکر خالیدی نارد بۆ عێراق لە باشورەوە (عیاض)یشی نارد لە لای سەرەوە بە سوپایەکەوە، فەرموی هەر کەس زوتر گەیشتە (حیرە) ئەوەتان دەکەمە ئەمیری (عێراق)، خالید زوتر گەیشت، پاشان لەگەڵ خالید چوو بۆ شام، لە جەنگی (یەرموك) بەشداری کرد، عیاض هاتەوە عێراق و لە جەنگی مدائن و جلولادا بەشداری کرد، پاشان عومەر لەبەرئەوەی سوارچاکێکی خاوەن ئیختیار و خواپەرستە کردیە سەرکردەی پێنج سوپا و ناردیە سەر جزیرە و باکوری عێراق و رزگاری کرد، دەرب و ئازەربایجان و ئەرمینیای رزگار کرد، پاشان بوو بە ئەمیری شام و حومس، دوای ئەبوعبیدە، (ام حکم)ی کچی ئەبوسفیان خێزانی بوو، لە تەمەنی (٦٠)ساڵیدا مرد و لە شام بە خاك سپێردرا. الاستعاب، القرطبي. ج٣ ص٣٠٤، بیروت ١٩٩٥.

## رزگارکردنی هەموو شارە کوردییەکان بە ئاشتی

### شاری رقـــە

(سوهەیلی کوڕی عودەی) کە رەتڵی دووەم بوو، بە فەرمانی (عیاز) کە سەرکردەی سوپا بوو، وە (عومەر) لە نامەکەیدا (سوهەیلی) بۆ شاری (ڕقە) دانا بوو، کەوتەڕێ.

کە سوپای ئیسلام لەو شارە کوردە نزیك بویەوە دەبینن رۆمەکان دەوری شاریان داوە، سەنگەریان گرتوە و ئامادەی شەڕن. هەندێ وردە شەڕیان لەگەڵ کردن، (عیاز) و سێ سەد سوار چونە بەر دەرگای شورای (جردان) ی شاری (ڕقە)، لەگەڵ حەرەسەکاندا شەڕێکی کورت قەوما و دەرگاکەیان گرت. زانا گەورەکانی ناو شار داوایان لە سوپای رۆم کرد، (خۆیان لادەن با ئێمە لەگەڵیان رێك بکەوین.) هەر ئەو شەرە بوو، (بەتریارکی شاری ڕقە) نوێنەری نارد بۆ لای (سوهەیل و عیاز) وتبوی: (ئەگەر حەز بکەن و، رێگە بدەن، دەمەوێ چەند وتوێژێك پێکەوە بکەین.) عیاز وەڵامی بۆ ناردبویەوە (تۆ سەلامەت دەبیت، هەتا دەگەڕێیتەوە جێی ئەمینی خۆت.)

بەتریارك نوێنەری ناردەوە وتبوی: دەترسم هەتا دەگەڕێمەوە بمکوژن. ئەمانێك بنووسن بۆ خۆم و (دە) کەس کە لەگەڵمدا دێن. عیاز لاپەرەیەکی بۆ نووسی و بۆی مۆرکرد و بۆی نارد.، بەتریارکی(ڕقە) لەگەڵ (دە) کەس لە بطریقانی تر، دابەزینە خوارەوە بۆ بارەگای فەرماندەیی سوپای ئیسلام. حریر و دیباجیان لە بەردا بوو، بە ئاڵتون و مجوهرات ڕازابویەوە. هەتا نزیك بونەوە عیاز هەر لێیان ورد دەبویەوە، لە گەورەکەیانی پرسی: ناوت چیە؟ وتی: (بنتس). بەڵام (واقیدی) لە (فتوح الشام) دا دەڵێت ناوی (یوحنا)یە[125] رەنگە هەردوکیان راست بێ و ناوی (یوحنا بنتس) بوو بێ!

عیاز وتی: فەرموو چیت دەوێ.؟ بە کەیفی خۆت قسە بکە؟

بەتریارك وتی: ئەی ئەمیر تۆ ناوت چیە؟

---

[125]. فتوح الشام — الواقدي، ج٢ ص٦٣.

وتی: عیاز. وتی کوڕی کێیت؟ وتی: (غەنەم)

بەتریارك سەری راوەشاند و سەیری هاوڕێكانی كرد و بزە گرتی، وتی: ئەی تۆ چیت هێناوە بۆمان.؟

عیاز وتی: ووشەی – لااله الا الله وحده لا شریك له، وان محمداً عبده و رسوله – ئەگەر ئەوەتان وت و، بڕواتان پێ ی بوو، نوێژتان كرد، رۆژوتان گرت، زەكاتی پارەتان دا، ئەوەی خوا حەڵاڵی كردوە كردتان و، لە حەرامەكان خۆتان لادا، ئەوا سەروماڵتان لە ئێمە حەرامە و سەلامەت دەبن، وەك ئێمەتان لێ دێت!

بنتس وتی: ئەی ئەگەر نەمان وت.؟

عیاز وتی: جزیە بدەن، لێتان وەردەگرین ئەوسا لە ذمەی ئێمەدا دەبن و، ئەمانەت دەبن لامان و، ئەوسا سەروماڵتان دەپارێزین و لە ماڵەكانتان دا بمێننەوە، لە سەر ئاینی خۆتان بن، ئێمەش لە دوژمن دەتان پارێزین.

بنتس وتی: ئەی ئەمیر لە سەر ئاینی خۆم دەمێنمەوە و، چۆنت دەوێ ئاوا لەگەڵتا رێك دەكەوم.

عیاز لەگەڵ ی‌دا رێك كەوت لەسەر (٢٠) هەزار دینار، كە هەر ئێستە بیدەن، هەموو سەرێكی باڵقیش ساڵانە چوار دینار بدات، بەوە سەر و ماڵیان پارێزراوە و ئاینی خۆیان جێ‌بەجێ بكەن، ئەمەیان مۆر كرد.

پاشان عیاز بە (بنتس)ی وت: پرسیارێكم هەیە.

وتی: فەرموو.

عیاز وتی: كە پرسیاری ناوت لێ كردم بۆچی لات كردەوە بەلای هاوڕێكانتدا و پێكەنیت.؟

بنتس وتی: راستی لە هەموو شتێكی تر خۆشترە، پاشان وتی: ئەی ئەمیر، من بەتریاركی ئەم شارەم، باوك وباپیرم لە زۆر كۆنەوە بەتریاركی ئەم شارەبوون، بەڵام فارسەكان لە شەڕێكدا زاڵ بوون بەسەرماندا، شاریان داگیر كردین، شار بەدەریان كردین، لەسەر ئەمە هەرقل لێمان زویر بوو، قیبتیەكانی بۆ ناردین. خراپیان پێ كردین، سزایان داین، ئێمە دەزانین خاك و ئاو

وولاتمان، هەروەك چۆن كتێب و ئاینەكەمان بۆی داناوین، هەروا دەبێت. خەڵكی ئەم شارە گوێ رایەڵی بۆ كەس ناكەن، جگە پیاوێكی عەرەبی ناوی (غەنەم)ە یان (كوڕی غەنەم)ە كە پرسیارم لێ كردی زانیم ئەو كەسە تۆی، هەر بۆیە ئیشارەتم بۆ هاورێكانم كرد.

عیاز وتی: بەخوا داماو دیارن ئێوەی خاوەن كتاب و پەیامی خوایی، لە كتێبەكەتاندا باسی پێغەمبەری كردوە، ئەی بۆچی دوای ناكەون.؟

بنتس وتی: سوێند بە مەسیحی كوڕی مریەم، لە ئنجیلدا مژدەی هاتنی محمدی تیایە، دەڵێت عەرەبیە و لە چاكترین پێغەمبەرانە، میللەتەكەی لە چاكترین میللەتانە، رۆژێ سواری كەر دەبێ، و داوای چاكە دەكات، ئێمە وامان دەزانی لە نەوەی بەنی ئیسرائیل پەیدا دەبێ.

عیاز وتی: ئەی تۆ ناڵێی لە كتێبەكەماندا هاتووە عەرەبیە.

بنتس وتی: وامان زانیوە عەرەبی قسە دەكات و خۆی عەرەب نیە. چاك بزانە ئەی ئەمیر، من بە خەڵكی رۆمم وتوە: با هەمووومان موسوڵمان بین. رۆمەكانی ناو شاری (رقە) نەیان هێشت. توڕە بوون، وتیان شتی وا بڵێی ئەت كوژین، منیش لە خۆم ترسام.

عیاز سەری سوڕما لە راستی ئەم بەتریاركە. چەند رۆژێك لە شاری (رقە) مانەوە پاشان رۆیشتن.[126]

---

[126]. كتاب الفتوح: ابن اعثم، ج١ ص٣٢٧-٣٢٩، للعلاقة ابي محمد بن اعثم الكوفي – المتوفى سنة ٩٢٦ الميلادي.

واقیدی دەڵێ: پاشان عیاز (سوهەیل کوڕی عودەی)[127] نارد بۆ (ڕقە) کە بەتریارکێك فەرمانڕەوایی دەکردن. کوردەکان لە خەڵکی شار کۆبونەوە، پێیان وت: ئێوەی گاور و ڕۆم لە نێوان عێراق و شام دا چیتان پێ دەکرێ، هەر ئێوە ماون نەچوبنە ژێر دەسەلاتی موسوڵمانانەوە، جێتان نابێتەوە لەم بەینەدا. هەر بۆیە وەفدێکیان نارد بۆ لای عیاز و زۆر بە ئاسانی ڕێك کەوتن.[128] موسوڵمانەکان و خەڵکی شاری (ڕقە) بە ئاشتی ڕێك کەوتن بەم جۆرە هەرێمی جزیرە ئاسانترین وڵات بووە کە بە ئاشتی فەتح بووە.[129]

بەلازەری دەڵێت: سوپاکەی سوهەیل بۆ شاری ڕقە بەم شێوەیە دروست بوو بوو، لای پێشەوە (میسرە کوڕی مسروق)، لای ڕاست (سەعید کوڕی عامر)، لای چەپ (عەبدوڵڵا کوڕی سەعید) بوو، چوون هەتا گەیشتنە شاری ڕقە.[130]

مەحمود شیت خەتاب دەڵێت: (عیاز سوپایەکی بەرەو جزیرە جوڵان، هەر ئەمیرێك بەرەو ئەو شارەی بۆی دیاری کرابوو کەوتەڕێ، سوهەیلی کوڕی عودەی بەرەو شاری رقە کەوتەڕێ و گەمارۆی داو، خەڵکی شار داوای ئاشتیان کرد، سوهەیل لەگەڵیان ڕێك کەوتن. لە جێیەکی تردا دەڵێت: (عیاز لەگەڵ فەرماندەکانیدا کەوتەڕێ، لە ڕێگای ئەلقیرازەوە سەهلی نارد بۆ رقە، کە سوپای ڕۆم و عەرەبەکان زانیان لە کوفەوە سوپای ئیسلام بەرەو ئەوان

---

127. سوهەیل کوڕی عدی خەزرەجی: لە جەنگی بدر و ئوحد و فەتحی مەککە و عێراق و شام دا بەشداری کرد، حارسی برای لە جەنگی (جسر) دا شەهید بوو، هەنگا و بە هەنگاو لەگەڵ (سەعد) بوو، لە فەتحی هەرێمی جزیرەدا شاری (رقە) ی رزگار کرد و بەشداری (رەها) و (حران) ی کرد، کە فەتحی جزیرە تەواو بوو، گەڕلیەوە کوفە، عومەر ناردی بۆ رزگارکردنی کرمان و خەریکی مەشغوڵ کردنی سوپای فارس بوو لە ئەهواز هەتا نەچن بۆ (نەهاوەند) و پاشان کرمانی فەتح کرد، (قادة فتح العراق – محمود شیت خطاب –ص٤٨٢)

128. فتوح الشام: الواقدي، ج٢ ص٦٥.

129. الکامل في التأریخ: ابن اثیر، ج٢ ص ١٥٣ حققه علی شیري، بیروت، دار التراث العربي.

130. معجم البلدان: ج٤ ص٢٧٤.

کەوتوەتە ڕێ، ناچار بوون بکشێنەوە شارەکانیان، سەهل ڕقەی گەمارۆدا، پاشان بە ئاشتی لە گەڵیان ڕێکەوت.[131]

## شاری ڕەهـــا و حـــەڕان

تەبەری‌و ئیبن ئەسیر دەگێڕنەوە کە (سوهەیل) ڕقەی ڕزگار کرد، کاری ڕێکخستن و ڕێکەوتنی ناوچەکەی تەواو کرد، چوو بۆ لای (عیان) پێکەوە چون بۆ شاری (حران) و لەگەڵ خەڵکەکەی ڕێکەوتن. پاشان عیاز (سوهەیل) و (عەبدوڵلا کوری عوتبە)ی نارد بۆ شاری (رەها) لەوێش بە ئاشتی ڕێك کەوتن، بەم جۆرە جزیرە ئاسانترین وڵات بوو فەتح کرا[132]، بەلام (خزری بەگ) دەڵێت: (عیان) چوو بۆ (رەها) بە ئاشتی ر ێك کەوتن، پاشان چون بۆ (حەران) بەبێ شەر ڕێك کەوتن.[133]

ئیبن ئەعسەم دەگێڕێتەوە: (کە سوپای رۆم لە شاری رەها وە هەواڵی ڕێکەوتنەکەی عیاز و شاری ڕقە{یان بیست، ترسان. خواردن و خواردنەوە و مەڕوماڵاتیان کۆکردەوە و دەرگای شوراکانیان داخست، عەرادات و مەنجەنیقیان لە سەر بورجەکانەوە دامەزراند، بەردێکی زۆریان کۆکردەوە بۆ هەڵدان، وایان گومان دەبرد موسوڵمانەکان دوور بن، بەلام لە پڕێکدا دەنگی (الله اکبر) رایچڵەکاندن و چواردەوری شار گیرا، پێشەنگی ولاخی موسوڵمانان نزیکی شار بویەوە، ئالاو لیواکان ڕێك خران، سوپای رۆم لە سەر شوراکانەوە لە سوپای ئیسلام ورد دەبونەوە، بە (٢٠) هەزار کەس مەزەنەیان دەکردن، خەڵکی شار بە سەرکردەی سوپاییەکانی خۆیان گوت: (ئێمە توانای ئەم هەموەمان نیە)، داوایان لە باترپارکی شار (میتولس) کرد کە هەوڵ بدات وەك شاری (ڕقە) لەگەڵیان ڕێك بکەوێت، کە بەتریارك زانی میللەتەکە ئاوا ورەیان روخاوە، ئەویش داوای لە سوپا کرد خۆیان نەفەوتێنن و، نوێنەری

---

131. قادة فتح العراق والجزيرة: محمود شيت خطاب، ص٤٧٣-٤٨١.

132. تأريخ الطبري: ج٣ ص١٥٧، الكامل في التأريخ: ابن اثير، ج٢ ص١٥٣، بيروت ١٩٨٩.

133. محاضرات تأريخ الامم الاسلامية: الشيخ محمد خضري بەگ، ص٢١٨ ج١-٢، مصر ١٩٦٩.

نارد بۆ لای (عیاز) بەم جۆرە: (ئەگەر وەک خەڵکی رقە پێمان رازی دەبن، ئەوا ئێمە ئامادەی رێکەوتنین.) عیاز بە رەزامەندی وەڵامی دانەوە. عیاز داوای لە سوپا کرد: (خەڵکی شاری رەها لە زمە و عەهدی ئێمەدان، ئەزیەتیان مەدەن، مەچنە ماڵیان بەبێ مۆڵەت) موسوڵمانەکان سەریان سوڕما لە خۆشی ئەو شارە کوردیە، چەند رۆژێك تیا مانەوە. (میتولس) لە خوار شارەوە خواردنێکی زۆری ئامادە کرد، پاشان هێنایە کەنیسەو بە عیازی وت: (خواردنێکی زۆرم ئامادە کردوە بۆ خۆت و کۆمەڵەکەت، حەز دەکەم بە هاتنتان رێزم لێ بنێن و، وەڵامم بدەنەوە.)

عیاز وتی: (ئەگەر بۆ هەر کەسی ترمان بکردایە بۆ جەنابتانمان دەکرد. بەڵام من خەلیفە عومەرم بینی، کە بەتریارکی قودس دەعوەتی کرد بۆ ناو کەنیسە. نەچوو! هەر بۆیە منیش حەز ناکەم رێچکەی خەلیفەم بشکێنم.)

(میتولس) وتی: (ئەی ئەمیر داوا بکە، هاورێکانت بێن)

عیاز وتی: (ئەوە خۆیان دەزانن) میتولس واقی وڕما.

عیاز وتی: (وا ئەزانم تۆ لە ترسان ئەمە دەکەیت، چاك وایە ئەمە بۆ ئەوانە بکەیت کە دوای ئێمە دێن، ئێمە ئەوەتە وەفامان هەیە بۆ عەهدو پەیمانمان. لە ئێمە ئەمین بەو هیچ ترست نەبێت. چاك بزانە داوایەکیشت لێ ناکەین، کە توانات بە سەریدا نەشکێت.)

بەتریارك گەڕایەوە لای هاورێکانی وتی: (سوێند بە خوا ئەمە گەورەترین پیاوە کە هەتا ئێستا من رێم لێی کەوتبێ)[134]

هەواڵ گەیشتە عیاز کە رۆمەکان لە (حەڕان) بە بیست هەزار سەربازەوە کۆبونەتەوە. سوپای ئیسلامی ئامادە کرد بە فەرماندەیی (عەبدوڵڵا کوڕی عتبان) و رۆیشتن. هێشتا نەگەیشتبوون کە نوێنەری شاری (حەڕان) گەیشتە بەرەوە، وتیان: (سوپای رۆم ناوچەکەیانی چۆڵ کردوە و حەز دەکەین وەك شارەکانی تر لەگەڵ ئێمەش رێك بکەون.)، بە هەمان جۆری شاری (ڕەهاو ڕقە)

---

134. کتاب الفتوح: ابن اعثم، ج١ ص٣٣١.

ڕێك كەوتن و پەیمانیان مۆر كرد. (واقیدی) دەڵێ: هەڵهاتوانی ناوچەكان خۆیان گەیاندە شاری (حەڕان) و (ڕەئس عیون) و لەو ناوچانەدا مۆڵیان خوارد، چاوەڕوانی هەواڵ بوون، بزانن سوپای ئیسلام چی دەكەن. بەڵام پاشای (حەڕان) كە كورد بوو، هەڵهاتنی سوپای ڕۆم و عەرەبی پێ خۆش نەبوو، كە خۆیان ئاڵاند بووە شاری حەڕان.[135]

سوپای ئیسلام بە فەرماندەیی (عەبدوڵڵا) ڕوویان كردە شاری حەڕان، كە ڕۆم و عەرەبەكان زانیان پاشای حەڕان نیازی شەڕی نیە، بەڵكو خەڵكەكەی ئامادە كردوە پێشوازی لە سوپای ئیسلام بكەن و موسوڵمان ببن " هەڵهاتن و چوون بۆ شاری (ڕەئس عیون). شاری حەڕان بە ئاشتی و خۆشیەوە پاشا و گەدایان موسوڵمان بوون. هەموو كەنیسەكانیان كردە مزگەوت. ئەمە یەكەم شارە، گەورە و بچوكیان پێكەوە موسوڵمان بوون. لەم كارەدا (یوقەننا) زانای ئاینی ناوچەكە، دەورێكی گرنگی هەبوو لە موسوڵمان بوونی خەڵكی شاردا، كە دەمێك بوو خۆیان بۆ ئامادە كردبوو. پاشان (یوقەننا) چەند دانیشتن و كۆبونەوەیەكی گرنگی لەگەڵ سەردارانی ئیسلامدا ئەنجام دا، بۆ بەڕێوەبردنی كاروباری ناوچەكە. یەكێك لە ئامۆژگاریەكانی (یوقەننا) بۆ سەركردە ئیسلامیەكان ئەوە بوو (چاك بكەن و چاك بچێنن، با ئەوەش ماوە لە خەڵكی جزیرە چاومان لێ بكات!)[136] سوپای ئیسلام ناوچەكەی جێ هێشت، كاروباری بەڕێوەبردنی دایە دەست خەڵكی شار خۆیان.

## شاری ڕەئس لعیون

---

[135]. مێژوونووسە كۆنەكان پاش و پێشیان لە ڕوداوەكاندا كردووە، ئەویش بە هۆی فراوانی بەرەی جەنگیەوە، سوپای ئیسلام لە یەك كاتدا پێنج سوپا دەنێری بۆ چوار ناوچە لە هەرێمی جزیرە، كە سوپایەك ناوچەی خۆی تەواو كردووە، چووە یارمەتی سوپایەكی تر، هەر مێژوونووسە ناوچەیەكی پێش خستووەو سەركردەیەكی ناو بردووەو، بۆ هەموو بەرە جەنگیەكان بەو جۆرە. منیش كەسیان پشت گوێ ناخەم، هەتا ڕای مێژوونووسەكان لەبەرچاوی خوێنەردا بێ، ڕەنگە هەندێك پێی وابێت تێكەڵ بوون هەیە. بەلای منەوە ئاوا بەسوودترە، هەتا سەرێنێكی چێژكی و بێ سەرچاوە. !

[136]. فتوح الشام: الواقدي، ج٢ ص٨٥-٨٨.

هەڵهاتویەکی زۆر لە شاری رەئس عیون کۆبونەوە، لە ناویاندا چەند سەرکردەو حاکمانی هەڵهاتوی رۆم دەبینرا لەوانە پاشا (شهریان)، ئەم پاشایە نامەی نووسی بۆ پاشا و حاکمەکانی (شەقر) و (زەعفرە) و (حرفناس) و(ئەنطاق پاشای نینوا) و (جیبر گەورەی هەکاری)، کە بێن بە دەمیەوە و یەگ بگرن و کۆببنەوە لە دژی موسوڵمانەکان. موسوڵمانەکان بەمەیان زانی چوون بۆیان[137]. ئەمە لە مانگی رەبیعی یەکەمی ساڵی ١٧ کۆچیدا بوو. پاشان عەرەبەکانیش هەڵهاتن و خۆیان گەیاندە شاری (رەئس عیون) کە پاشایەکی رۆمیان بە سەرەوە بوو بە ناوی (شەهریاز کوڕی فرون)، عەرەبەکان بە پاشای گاوری ئەم شارەیان وت: (ئەوا موسوڵمانەکان هاتن تەنها مەبەستیان عەرەبەکانە نەك رۆمەکان، دەیانەوێ بە زۆر ئێمە موسوڵمان بکەن، ئێمە وا بە باشی دەزانین کە سوپا و هۆردوو بەرینە دەرەوەی شار و بچین بۆیان) پاشای گاوری وتی: (دەترسێم ئێوە بدەنە پاڵیان و پەیمان ببەستن و لە گەرمەی شەڕدا پشتمان بەر بدەن و بمان شکێنن.) رێکەوتن. خەندەقیدەوری شاریان تەواو فراوان کرد، سوپایان دامەزراند. ناردیان بۆ یارمەتی شارەکانی (جملین) و (کفرداران) و (ماردین) و (تەلی مەرزە) و چەند جێیەکی تر. موسوڵمانەکان بە رێگا دەهاتن، لەگەڵ دێهات و خێڵ و خەڵکی ناوچەکاندا رێکەوتنی ئاشتییان مۆرکرد، بەتاك و کۆمەڵ خەڵکیان بانگ دەکردو دەیان دواندن بۆ ئیسلام. بە پێچەوانەی ناوچەکانی تر ئەم هەرێمە زۆر ئاسان رویان لە ئیسلام دەکرد، بە تایبەت گاور و زەردەشتیەکان. هەردوو قەڵای (زیباد) و (زلوبیا) بە ئاشتی رزگار بوو، لەم کاتانەدا زانای گاور و زەردەشتیەکان " لە موسوڵمانەکان و قورئان و باسەکانی خواو پێغەمبەر ورد دەبونەوە، ناوچەکە بوو بوو بە کۆڕی لێکۆڵینەوە و گۆڕینەوە و وتوێژ لە نێوان خۆیاندا، ئەمە یارمەتی زۆری دان بۆ ئاسان موسوڵمان بونی ناوچەکە، تەنها هەندێ لە حاکم و ئاغا و دەرەبەگ و سەرکردە گاورە رۆمەکان نەبێ، کە هەموو لە (بورج تیور)

[137]. هەمان سەرچاوە، ص١٠٢.

کۆبونەتەوە و دەیانەوێ بڕۆن و بگەن بە سەنگەرنشینانی شاری (رەئس عیون)کە شارێکی قەرەبالغ و پڕ قەڵای ناوچەکەیە.

بەلازەری دەڵێت: (عومەر نامەی نووسی بۆ عیاز کە عومەیر کوڕی سەلەمی ئەنساری [138] بە هێزێکەوە بنێرێ بۆ شاری (عەین وەردە) کە مەبەست شاری (رەئس عیون)ە شارێکی ناودارە و پڕ لە کانیاوە[139] . بەلازەری دەڵێت: (عومەیر) لە پێشەوە هێزێکی نارد، رۆمەکان سەنگەریان

---

[138] . عومەیر کوڕی سەلەمی ئەنساری ئەوسی: پیاوێکی زاهید و هاوڕێیەکی نزیکی پێغەمبەر بوو، (اسد الغابة ج٤ ص١٤٤). کە باوکی مرد، دایکی شوی کرد بە (جەلای کوڕی سوەید) و عومەیر لە ماڵی ئەودا دەژیا، جەلای باوە پیارەی کە لە غەزای تەبوك دوا کەوت، وتی: (ئەگەر ئەم پیاوە راست بێ لنحن اشر من الحمر.) عومەیر وتی: ئەی جەلای سوێن بە خوا تۆ کەسێکی خۆشەویستی منی. قسەیەکت کردوە، ئەگەر بیکەیەنم، فەزح دەبیت، ئەگەر لێتی بێدەنگ بم، ئیمانم سەلامەت نابێت، ئەدجا چوو بۆ لای پێغەمبەر و بۆی گێڕایەوە، جەلایش چوو بۆ لای پێغەمبەر و سوێندی بۆ خوارد، کە شتی وای نەوتوەو عومەیر بۆی هەڵبەستوە. پاش ماوەیەك خوای گەورە لە ژووری حەوتەبەقەی ئاسمانەوە نامەی نارد: (یحلفون بالله ماقالوا، ولقد قالوا کلمة الکفر، و کفروا بعد اسلامهم، وهموا بما لن ینالوا. فأن یتوبوایك خیرا لهم.) التوبة ٩/٧٤ جەلای تەوبەی کرد و چاکیشی راگرت. (سیرة ابن هاشم ج٢ ص ١٤١، اسد الغابة ج٤ ص١٤٤).

عومەیر یەکێك بوو لە فەرماندەکانی خەلیفە عومەر، زۆر دڵی پێی خۆش بوو، پێی دەوت (عمیر نسیج وحده)، عومەیر ئەمیری حومس بوو، جارێك عومەر بە عبدالرحمن کوڕی عومەیری وت: لە شام دا لە باوکت بەرێزتری تیا نیە.(الاصابة ج٥ ص ٣٢) یان دەیگوت: (خۆزگە زۆری وەك عومەیرم هەبولیە و پشتم پێ ببەستنایە لە بەڕێوەبردنی کاروباری موسوڵمانانندا). کرایە والی هەرێمی جزیرە، مزگەوتی لە ناوچەکانی (مضر و ربیعة) کردەوە (بلاذري – ص١٨٢)، پاشان کرایە والی حومس (طبقات ابن سعد ج٧ ص٤٠٢)، عومەر زۆر دڵی خۆش بوو کە دەیبینێ کارگێڕەکانی خۆیان یەکلاکردۆتەوە بۆ خزمەتی رەعیەت، خەڵکی شام زۆریان خۆش دەویست. لەسەر منارەی (حومس)ەوە دەیگوت: (لایزال الاسلام منیعا، ما اشتد السلطان، و لیست شدة السلطان قتلا بالسیف و ضربا بالسوط، ولکن قضاء بالحق واخذ بالعدل.) (الفاروق عمر، د.هیکل ج٢ ص٢٢٤) لە سەردەمی خەلیفە عوسماندا نەخۆش کەوت و دلوای کرد عوسمان عەفوی کات و لە والیەتی حومس لای بەرێت، عوسمان رازی بوو، گەڕایەوە ناو کەس و کاری و لە ساڵی ٣١ کۆچی ٦٥١ زاین مردو لە شام ئەسپەردە کرا (الاستعاب – ج٣ ص١٢١٧).

[139] . معجم البلدان: یاقوت الحموي، ج٦ ص٢٥٨.

لێگرتن و بە مەنجەنیق بەردیان بۆ هەڵدان و زەرەریان لە موسوڵمانەکان دا. عومەیر گەیشت و بەسەر ڕۆمەکاندا سەرکەوت و، ڕاوی نان و لەگەڵ خەڵکە ڕەش و ڕوت و ستەم لێکراوە کوردەکەیدا ڕێکەوت و خاکەکەی دایەوە بە خەڵکە ڕەسەنەکەی- کە کوردن – دەقی (بەلازەری و ئیبن ئەسیر) ئاوا دەڵێن: (فدفعت الارض الى اهليها الاصليين)[140] ئەی دەبێ خەڵکی ڕەسەنی ئەم شارانە کێ بووبن جگە لە کورد. واتە: (خاکەکەی لە ڕۆمەکان سەندەوەو دایەوە بە کوردەکان) و ماڵ و منداڵ و خێزانیانی بە سەلامەت پاراست.[141] .

واقیدی دەڵێ: (لەدەرەوەی شار شەڕێکی کورت قەوما و شهر یازی پاشای کوژراو ئەوانی تر رایان کرد بۆ (ڕەئس عیون) حاکمی ئەو شارە (ئەرسالوس) بە خۆی و ئەحبار و خەڵکێکی زۆری شارەوە موسوڵمان بوون، هەر دوای ئەو، شارەکانی (دارا[142] و بیرحا و باعما) بە ئاشتی ڕێکەوتن و خەڵکەکەی موسوڵمان بوون – شاری (ڕەئس عیون)لە مانگی ڕەبیعی یەکەمیساڵی ١٧ کۆچی دا رزگار بوو[143] .

یەکێك لە ڕەوشتە بەرزەکانی ئەم فەرماندەیە (عومەیر کوڕی سەعدی ئەنساری ئەوسی) کە شاری (ڕەئس عیون)ی کوردستانی لە ڕۆمە گاورەکان سەندەوە و دایەوە بە کوردەکان خۆیان: عومەیر کرایە والی (جزیرە)ی کوردستان و (حومس)ی سووریە، عومەری فاروق لە مەدینەوە نامەی نووسی داوای کرد ناوی هەژارەکانی ئەو ناوچانەم بۆ بنووسن بۆ یارمەتی، کە لیستەکە هاتە بەر دەستی عومەر دەبینێ ناوی (عومەیری ئەنساری) تیایە کە ئەمیر بوو، عومەر وتی ئەمە کێیە.؟ وتیان: ئەمیرەکەمانە. وتی ئەویش

---

[140]. الكامل في التأريخ: ابن اثير، ج٢ ص٢٠٨، بلاذري، ص ١٨١.

[141]. قادة فتح العراق والجزيرة: محمود شيت خطاب، ص٥١٥.

[142]. شاری (دارا) لە کۆنا یەکەم پایتەختی (پارتەکان) بوو، ساڵی٢٨١پ.ز. ئێستا بە (ابوالورد) ناوی هەیە، پاشان بوو بە(هێکاتوبیپیلوس)...(مێژووی وڵاتی کوردەواری –جمال رشید احمد، ل٥١٩، بغداد ١٩٨٨).

[143]. فتوح الشام – الواقدي – ج٢ ص١٠٢.

هەژارە، وتیان کەسمان نیە ئەوەندە هەژار بێت، عومەر (١٠٠) دیناری بۆ نارد، ئەویش هەمووی بەخشیەوە بەسەر هەژاران دا، ژنەکەی وتی با دینارێکت دانایە بۆ خۆمان. وتی ئەی بۆ بیرت نەخستمەوە[144]». والیەك ئاوا بۆ رەعیەتەکەی بژی، چۆن ستەمیان لێ دەکات؟

## شاری قـرقـیـسـیـا

سوپای ئیسلام روی کردە (قرقیسیا) کە عەرەب و رۆمە هەڵهاتووەکان بەوەیان زانی، پەلاماری پردە ئاسنینیەکەی سەر ڕوباری (خابور)یان داو شکاندیان، پاشان چواردەوری شاریان قایم کرد، لەو شارەدا زانایەکی ئاینی ناودار هەبوو بەناوی (شەوجوان)، بە نهێنی موسوڵمان بوو بوو، کار ئاسانی زۆری کرد بۆ موسوڵمانەکان. کە موسوڵمانەکان نێزیك بوونەوە، رێیەکی تەنگیان نیشان دان، کە شەو داهات لە ئاوی خابور پەڕینەوە، لەوبەر روبار لەگەڵ زۆر هۆز و خێڵی ناوچەکە رێکەوتنیان مۆر کرد، دانیشتن و وتووێژی زۆر رووی داو بە نەرمی وەڵامیان دەدانەوە، کە لە شار نزیك بوونەوە، عەرەب و رۆمەکان ماڵ و منداڵیان هێنابویە دەرەوەی شار لەگەڵ خۆیان هەتا راکەن، عیاز (وەلیدی کوری عەقەبە)[145]ی نارد بۆ لایان هەتا رێك بکەون " چونە لای

---

[144]. (اخبار عمر: طنطاوی، ص١٩٧.

[145]. وەلید کوڕی عقبە کوڕی ئەبو مطیمی ئەمەوی: بەشداری فەتحی مەککە و جەنگی مەزار و دومە الجندل. بوو، دوای لابردنی (سەعد) لە والی کوفە (وەلید) خرایە جێگەی (ئازربایجان و موقان و بیرطلیسان) ی رزگار کرد، پاشان لەگەڵ خەلکی ئەرمینیا رێکەوت. کە لە ئەرمینیا گەڕایەوە خەلیفە عوسمان بۆی نووسی (معاویە) بۆی نوسیوم ژمارەیەکی زۆری رۆم بۆیان هاتون، وا بە باش دەزانم برایانی کوفە بنێری بۆ یارمەتیان) ئەو کاتە وەلید گەیشتبوە (موسڵ)، عوسمان نوویسیبووی: (هەر کە نامە گەیشتە دەستت یەکێکی ئازاو خێرا کە خۆت دەیناسی بە(٨–٩–١٠) هەزارەوە بنێرە بۆ یارمەتی ئەو شوێنەی کە نێرراوەکە لێوەی هاتووە) وەلید (٨) هەزاری بە (سەلمان کوڕی رەبیعە)دا نارد و خۆی لە موسڵەوە گەڕایەوە بۆ کوفە. کە گەیشتە (کوفە) سەعد بە تەعلیقەوە پێی وت: (نازانین دوای ئێمە ژیر بویت ـ یان ئێمە دوای تۆ تێك چووین.) وەلید وتی: ئەی سەعد زویر مەبە. ئەمە مولکە، هەیە نیوەڕۆ

سەرەك خێڵ و هۆزو ماقوڵانی عەرەبەكان. چەند دانیشتن و كۆبونەوەیەكیان كرد، لە ئەنجامدا پێی وتن: (ئەوەی سەیری عاقبەت بكات ئەمن دەبێ لە خراپە، هیچ كاتێك ئێوە لەوانی پێش خۆتان زۆرتر و بەهێزتر نین، چاك وایە بگەڕێنەوە بۆ لامان و بۆناو حیزبەكەمان) بەم قسانە نەرمی كردن، هەموو عەرەبەكانی ئەو ناوە دایانە پاڵی، جگە خێڵی (ئیاد)، كە كۆچیان كرد بۆ ناو جەرگەی رۆمەكان لە سەروی شام. ئەوانی تر زۆریان موسوڵمان بوون هەندێكیان بەبێ بڕوایی مانەوە، بەڵام بێ بڕواو موسوڵمان هەموو چونە ناو سوپای ئیسلام و دوركەوتنەوە لە گاورە خاچ پەرستە رۆمەكان. پاشان هەموو خەڵكەكەی كۆكردەوە و لەم قسانەی بۆ كردن: خوا مژدەی پێ داوین كە موڵكی كسرای فارس و هەرقلی رۆممان پێببەخشێ و لە بارەمانەوە فەرموویەتی: (ولقد كتبنا فی الزبور من بعد الذكر ان الارض یرثها عبادي الصالحون) پێش شەڕ زۆر لە خەڵكی ناوچەكە موسوڵمان بوون (جزیرە ئاسانترین وڵات بوو كە بە ئاشتی و ڕێكەوتن ڕزگار بوو)[146].

(وەلید) نامەی نووسی بۆ (عیاض)ی سەركردەی كە (خێڵی ئیاد) هەموویان بە خاو و خێزانەوە ڕایان كردوە بۆ ناو رۆمەكان. (عیاض) نامەی نووسی بۆ خەلیفە عومەر و ئاگاداری كرد. عومەر نامەیەكی نووسی بۆ (هەرقل)ی پاشای رۆم بەم جۆرە: (پێم گەیشتوە كە ناوچەیەك لە خەڵكی عەرەب، ناوچەی

---

لێی دەخوا، هەیە عیشا لێی دەخوا.) سەعد وتی: (یەعنی كردتان بە موڵك!) وەلید گەڕایەوە كوفە و لە جێی (سەعد) پێنج ساڵ والی كوفە بوو، خۆشەویست ترین كەس بوو لای خەڵك. مێژوونووسان قسەی زۆریان هەیە لە سەری و دوژمنان بوختانیان بۆ دەكرد و شكاتیان لێ كرد لای عوسمان. رەش و روت خۆشی دەویست و دەست و پێوەند دژی بوون. ئەم پیاوە پێغەمبەر (ص) ناردیە(بنی مصطلق). ئەبوبەكر كردیە والی و مجاهد. عومەر دوو جار كردیەوالی جزیرە. عوسمان كردیە والی كوفە. كە عوسمان شەهید كرا. وەلید عەزل كراو چوو بۆ شاری (رقە) و لەوێ مرد و لەوێ ئەسپەردە كرا. وەلید یەكێك بوو لەو چەند كەسەی كە عوسمان لەسەر دۆشەكی خۆی دای ئەنان. !

[146]. قادة فتح العراق والجزیرة، ص٤٨٧، طبري ج٣ ص١٥٦، ابن اثیر ج٢ ص٢٠٥.

ئێمەیان جێ هێشتووە و ڕایان کردووە بۆ لای تۆ. سوێند بە خوا دەیان نێریتەوە بۆ لامان، یان هەرچی گاوری لای مُن هەیە دمریان دەکەم بۆ لاتان.)

(هەرقل) هیچی بۆ نەکرا ئەوەندە نەبێت کە خێڵی ئیادی دەرکردو ناردیەوە بۆ وولاتی جزیرە. چوار هەزاریان گەڕانەوە ناو خاك وماڵیان و، ئەوانی تر بڵاوبونەوە بە شام دا. ئەم نامەیەی عومەر ئەوەندە توند و حەکیمانە بوو، هەڕەشەیەکی وابوو ئیتر عەرەبەکانی تر نەیان وێرا خاکی موسوڵمانان چۆڵ بکەن و بچنە ناو دوژمن، هەتا خاکی دوژمن نەکەنە بارەگا و بنکە بۆ تۆڵەسەندنەوە، هەتا هەموو عەرەب لەژێر ئاڵاکەیدا کۆبنەوە[147]، بەڵام واقیدی کە لە ئەسڵدا شیعەیە نامەکەی عومەر دەشێوێنێ و عومەر ناشیرین دەکات و ئاوا دەیگۆڕێ (عومەر لە نامەکەی دا نووسیبوی، بیان نێرەوە دەنا هەموو گاورەکانی ناو خاکی خۆم دەکوژم.)[148] عومەر ئەمانی دا بێ بە یەکێك و عەهدو پەیمانی دابێ بیان پارێزێ چۆن دەیان کوژێ." لەبەر ئەوە تەعبیری پێشو ڕاسترە. واقیدی لە هەندێ جێدا زۆرزانانە بۆ ئەوانەی خۆی بیەوێت و مەبەستی بێت دەیشێوێنێ." عومەر (وەلیدی کوڕی عوقبەی کوڕی ئەبی موعیتی ئەمەوی) بەسەر عەرەبەکانەوە و (حەبیب کوڕی مەسلمە)ی بەسەر کوردەکانەوە دانا[149].

(وەلید) ڕازی نەبوو خێڵی (تەغلوب) جگە ئیسلام شتێکی تر وەربگرن. بۆ ئەمە نامەی بۆ عومەر نووسی عومەریش وەڵامی دایەوە: (ئەوانیش هەر لەنیوە دوورگەی عەرەبن جگە ئیسلام هیچی تریان لێ وەرناگیرێ، نابێ گاوریان لێ لە دایك ببێ.)

---

147. الفاروق عمر، د. محمد حسنين هيكل، ج١ ص٢٦٩.

148. فتوح الشام، الواقدي. ج٢ ص٧٤.

149. الكامل في التأريخ، ابن اثير، ج٢ ص١٥٣.

لەجێیەکی تردا ئاوای دەهێنن. وەلید نامەیەکی تری بۆ عومەر نووسی: (دەڵێی چی ئەوانەی ناوچەکەم بە زۆر بکەم بە موسوڵمان و نەهێڵم بێ بڕوا لەو ناوەدا بمێنێ.)

عومەر وەڵامی دایەوە (ئەوە هەر بۆ نیوە دوورگەی عەرەبە، کە نابێ بێبڕوای تیابێت. دەنا بۆ ئەو ناوچە دوورانە قەیدی نیە.) پاشان عومەر ترسا (وەلید) ستەمیان لێ بکات، بۆیە لای برد و (فوراتی کوڕی حەیانی) و (هیندی کوڕی عەوجەمەلی) لەسەر جزیرە دانا. موسوڵمانەکانی (بەنی تەغلوب) لەگەڵ هەندێك لە خزمانیان کە موسوڵمان نەبوو بوون، وەفدێکیان ڕێك خست بۆ (مەدینە) بۆلای (عومەر)، بۆ شکاتی حاڵی خۆیان، موسوڵمانەکانیان بە عومەریان وت: (ئێمە حەزدەکەین جزیە و سەرانە لەم خزمە گاورانەمان نەسێنن، با ڕانەکەن بۆ لای ڕۆم. لە باتی ئەوە بەناوی سەدەقەوە لێیان وەربگرە، نەك بەناوی (جزیە)وە، گاورەکانیان وتیان: (سوێند بەخوا ئەگەر بەناوی جزیە لێمانبسێنن، ئەوا دەچینە ناو ڕۆم و خۆمان سەرشۆڕی ناو عەرەبان دەکەین.) عومەر وتی: (خۆتان سەرشۆڕ دەکەن، ئێوە لە میللەتی خۆتان هەڵدەگەڕێنەوە. سوێند بەخوا مادام ئاوان، هەردەبێت بیدەن، چی دەکەن بیکەن. ئەگەر بچنە ناو ڕۆم، ئەوا لە سەرتان دەنووسم.) وتیان: (شتێکمان لێ بسێنە، ناوی مەنێ جزیە.) عومەر وتی: (ئێمە ناوی ئەنێین جزیە، ئێوە چی ناوئەنێن بینێن.) ئیمامی عەلی وتی: (ئەی عومەر خۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس بەناوی سەدەقەوە لێی وەرگرتن لە باتی ناوی جزیە؟ عومەر وتی: بەڵێ وابوو. ئەنجا عومەر ڕازی بوو بە سەدەقە وەرگرتن لە باتی جزیە، بەوە گەڕانەوە، پاشان عومەر بۆ ئەوەی چاکەیان لەگەڵ بکات بە زیممە حسێبی نەکردن و جزیەی لێ نەسەندن، سا بەڵکو بگەڕێنەوە، کە ئەوەیان بیست زۆری تریان موسوڵمان بوون[150].

---

[150]. التأريخ الطبري: الامم والملوك، ج٣ ص١٥٨.

عەرەبەکانی جزیرە خاوەنی سروشتێکی دەروونی توندو ڕەق بوون، بەردەوام واش بوون، عومەر ترسا پەیوەندی نێوان وەلید و خێڵی تغلب بتەقێتەوە، لەبەرئەوە وەلیدی عەزل کرد بۆ ئەوەی هێمنی و ئاسایش لە ناوچەی جزیرە دا زیاتر بەرپا بێت.[151]

## شـــاری نوسێبین

ڕەتڵی سێیەم بە فەرماندەیی (عەبدوڵڵا کوری عوتبان)[152] بوو، بە داوای (عیاز)ی سەرکردە کەوتە ڕێ بەرەو شاری (نوسێبین)، کە لە شار نزیك بوونەوە دەبینن سوپای ڕۆم کە لە هەموو ناوچەکانی ترەوە هەڵ هاتبوون، لەم شارە کۆبونەتەوەو خۆیان قایم کردبوو. (عیاز) داوای کرد چوار دەروازەی شار بگرن، نەهێڵن کەس لێوەی هاتوچۆ بکات، گەمارۆی شاریان توند کرد، هەر چوار دەروازەی شار کە ناویان (دەروازەی شاخ) و (دەروازەی بازاڕ) و (دەروازەی سنجار) و (دەروازەی ڕۆم) بوو گرت، بۆ هەر دەروازەیەك تیپێکی سوپای دانا و، هەوڵیان دا بچنە ژوورەوە، بەڵام ڕۆمەکان بە گەرمی بەرگریان کرد، گەمارۆ درێژەی کێشا. (عیاز) سوپایەکی بە فەرماندەی (عەمرو کوڕی سەعدی ئەنساری) نارد بۆ شاری (سنجار) و بە ئاشتی ڕێك کەوتن[153]، هەر لەوێوە سوپایەکی تر بە فەرماندەیی (مالکی ئەشتەری کوڕی حارسی

---

[151]. فتوح البلدان، بلاذري ص١٨٥.

[152]. عەبدوڵڵا کوری عوتبانی ئەنساری: بەشداری جەنگی هەڵگەڕاوەکانی کرد (الردە)، چو بۆ عێراق و لە زۆربەی جەنگەکاندا بەشداری کرد، پاشان لەگەڵ (عیاز) بە فەرماندەی رەتڵێك نێرا بۆ رزگار کردنی (نسیبین و سنجار) و میافارقین لە جزیرەی باکوری کوردستان و ئەو میللەتەی لە ستەمی رۆم رزگار کرد، پاشان عیاز ناردنیەوە (کوفە) و بو بە والی (کوفە)، پاشان سوپایەکی نارد بۆ ئەهاوەند. بەفەرماندەی (عەبدوڵڵا و حنیفەی یەمانی) و سەرکەوتن، پاشان ناردی بۆ رزگاری ئەصفەهان و راوونانی یەزدگورد و شهرزاری حاکمی ئەسفەهانی کوشت پاشان لەگەڵ پاشای (جی) زۆرانی گرت لە خواروی ئەسفەهان، پاشا وتی بە عەبدوڵڵا تۆ پیاوێکی تەواوی با ریکەوین بەم جۆرە ناوچەکەی تسلیم کرد (الاصابە ج٤ ص٩٧). پاشان عومەر لەگەڵ سوهەیلی هاورێی ناردنی بۆ فەتحی کرمان. (معجم البلدان ج٥ ص٢٤١).

[153]. کتاب الفتوح: ابن اعثم، ج١ ص٣٣٩.

نەخەعی) نارد بۆ شاری (ئامێدی) و (میافارقین). خەڵکی ئامێدی خۆیان دامەزراندبوو، (مالك) وتی با هەمووومان بەیەك دەنگی توونند بڵێین (الله اکبر). خەڵکەکە راچڵەکین و سەریان سوڕما لەو دەنگە، نوێنەریان نارد بۆلای (مالك). (مەرزبانی ئامێدی) کە زانای شار بوو زۆر بە ئاسانی ڕێکەوتن، مالك هەموویانی ڕازی کرد و شاری بۆ جێ هێشتن. هەر لەوێوە ڕویان کردە شارەکانی (نزول)[154] و بە ئاشتی ڕێك کەوتن. پاشان چون بۆ شاری (میافارقین). بەتریاکی شار کە ناوی (نیتوس) بوو، بەڵام واقیدی بە (ئەسلاغوس) ناوی بردووە.[155] کەسێکی نارد بۆ ڕێکەوتن. ناوچەکە بە ئاشتی و بێشەڕ ئازاد بوو. هەموو سوپاکان گەڕانەوە بۆ(نوسێبین) بۆلای (عیاز)، چەندین مانگ بەردەوام گەمارۆی شاری داوەو خەریکە بێتاقەت دەبێت، عیاز کۆبوونەوەی بە هەموو فەرماندەکان کرد هەتا چارێك بۆ ئەم شارە بدۆزنەوە، فەرماندەیەك کەلای (سەعد)ەوە هاتبوو لە عێراق، وتی فێڵێك هەیە" ئێمەش شتێکی ئاوامان توش هات وامان کرد، بنێرە لە شارەزوور کە ئێستا بە دەست موسوڵمانانەوەیە، گۆزە پڕبکەن لە خۆڵ، دووپشکی شارەزوری تێبکەن، ژمارەیەکی زۆر بهێنن، ئەو گۆزانە بخەنە ناو مەنجەنیق و هەڵیان بدەنە ناو شوراکان، ئەوە چاری ئەم جۆرە کارانەیە، عیاز تیپێکی ئامادە کرد و هەر خێرا ناردنی بۆ شارەزوور، گۆزەیان پەیدا کرد و چەندین باریان لێ بارکردو بە یارمەتی سوپای ئیسلامی ئەو ناوە ڕێکخراو نێرا بۆ هەرێمی جزیرە، کە شەو داهات لە نیوە شەودا و لە خەودا، شار و شوورە و سەنگەر و خەندەق درایە بەر گۆزەی پڕ لە دووپشك، گۆزەکان شکان و دووپشك لە خۆڵەکانەوە بڵاودەبوونەوە، ئەو شەوە شاری شپرزە کرد، بوو بە قیژوقاو. بۆ سبەینێ خەڵکی شار زۆریان بۆ سوپای ڕۆم هێنا کە بە ئاشتی ڕێك بکەوێت، نوێنەری ڕۆم گەیشتە لای عیاز، بەڵام عیاز ڕەدی کردنەوەو

---

[154]. (نزول) شارێکە لە نزیك زاخۆ لە پارێزگای دهۆك، ئەو جێگایە لە نزیك شاخی (جودی) کەشتیەکەی نوح لەویا نیشتەوە.

[155]. فتوح الشام: الواقدي، ج٢ ص١٠٢

وەڵامی نەدانەوە، بۆ شەوی داهاتوو هەرچی مابوو لە گۆزەکان هەڵ درا، خەڵکی لە شار هەڵهاتن، ڕۆمەکان بە سەرشۆڕی هاتنە لای عیاز، عیاز هەرچی سەرکردەو فەرماندەی ڕۆم هەبوو جیای کردنەوەو دەستێکی باشی پیاهێنان.! حەقی چەند ساڵەی کوردی لێ کردنەوە، گەلی کوردی لە ژێر چەپۆکیان ڕزگار کرد. پاشان موسوڵمانەکان داوایان کرد هەموو خێزانە ڕۆمەکان، بەزوترین کات خاکی کوردستان و جزیرە جێ بهێڵن و، بچن بەرەو وڵاتی ڕۆم. بەم جۆرە ئەو ڕۆمە گاورانەیان لە ڕەگ و ڕیشەی خاکی کوردستان دەرهێنا)[156] ئەمە لە مێژووەکەی (ئیبن ئەعسەم کوفی)دا هەبوو، بەڵام ئەوانی تر جۆرێکی تر دەگێڕنەوە: هەواڵ گەیشتە خەڵکی نوسێبین کەوا سوپای ئیسلام بەرەو ئەوان لە جموجوڵدایە، خەڵکی ئەو شارە کوردە، کە١٥ ساڵێك پێش ئەو سوپایە، وەفدیان بە نوێنەری شار ناردووە بۆ مەدینە و لە نزیکەوە بە (محمد) – درودی خوای لەسەر بێ – ئاشنابوون، ئیسلام بوونی خۆیان ڕاگەیاندووە و مژدەیان بۆ شار و ناوچەکەیان هێناوەتەوە [157]. کە سوپای ئیسلام نزیك بۆتەوە، خەڵکی ئەو شارە لە ڕێ و ڕەسمێکیجوان و بەشکۆدا پێشوازیان کردو هاتن بە پیریانەوە و موسوڵمان بوون. پاشای شار (تەریاتس) لەگەڵ زانایان و ماقوڵانی شار کاریگەری زۆریان هەبوو لە موسوڵمان بوونی خەڵکی شاردا. هەموو کەنیسەکان کرانە مزگەوت. موسوڵمانەکان کاروباریان بۆ (تەریاتس) ڕێکخست و شاریان چۆڵ کرد، خۆیان حوکمی خۆیانیان کرد. (تەریاتس) هەر بە پاشای شار مایەوە، هەتا لە سەردەمی خەلیفەی سێیەم (عوسمانی کوڕی عەفان)دا مرد. بەم جۆرە موسوڵمانەکان تەنها ئیسلام بونیان لەو گەلانە ویستووە و هیچی تر! پاشان سوپای ئیسلام، ڕێکەوت بەرەو (ئامێدی) ژنێك حوکمی دەکردن بەناوی (ماریەم) ئەم ژنە بەخۆی و کەسوکار وماڵ و منداڵیەوە موسوڵمان بوون، زۆر

---

156. کتاب الفتوح، ابن اعثم، ج١ص٣٦١.

157. کابانی کوردی، حسن محمود حمە کریم، ل١١، ١٩٩٧.

ئاسان شار ئازاد کرا [158]... خەڵکی ئامێدی بە ئاشتی ڕێك کەوتن و موسوڵمان بوون ئەوی مایەوە جزیەیان دا[159]. (ئیبن ئەسیرو شیت خەتتاب) دەڵێن: (عەبدوڵڵا کوری عەبدوڵڵا کوری عتبان) لە موسڵەوە سەرکەوت و گەیشتە نوسێبین بە ئاشتی چوە شار.[160]

**ئەنجـــــامی ڕووداوەکـــــان**

بەلازەری دەڵێ: (عیاز رقە و حەڕان و ڕەها و نوسێبین و میافارقەین و قرقیسیا و دیهاتەکانی فرات و شارەکانی تری بە سوڵح و ڕێکەوتن و ئاشتی ڕزگار کرد.)[161] (لەسەردەمی خەلیفە عومەردا هەمو جزیرە ئازاد بوو بستێکی نەمایەوە.)[162](ول وایریل دیورانت) دەڵێ: (ئیسلام ئاسانترینی ئاینەکانە و ڕونترینیانە.)[163]، بەم جۆرە هەرێمی جزیرە لە باکوری کوردستان بە ئاشتی ڕزگار بوو.

کە ئەبوعوبەیدە وردبینی و پاکی و ئازایەتی (عیان)ی بە دڵدا چوو، داوای لە عومەر کرد لە سەرکردایەتی عێراقی بسێنێتەوە و، بیخاتەسەر سەرکردایەتی شام. عومەر ڕازی بوو. نامەیەکی بۆ عیاز نووسی بەم جۆرە: (سوپاسی خوا دەکەم کە ویلایەتی جزیرە کەوتۆتە دەستی موسوڵمانان. بە گەیشتنی ئەم نامەیە، جێنشینێك بۆ خۆت دابنێ لە جزیرە کە زانا بێت قسەو کردەوەی یەك بێت، بروا پێ کراوبێت، پاشان زووبە زوو خۆت بگەیەنەرە شام و بڕۆ و لە جزیرە نەمێنی).

عیاز پێش ئەوەی بڕوات، حسابی خۆی پاکردەوە، (عوتبەی کوری فەرقەدی سەلەمی) لە جێی خۆی داناو، چوار هەزار سەربازی بۆ بەجێ هێشت و ئەوی تری لەگەڵ خۆی برد، دووفەرماندەشی دایە. (حبیب کوری

---

[158]. فتوح الشام، الواقدي، ج٢ ص١٠٣.

[159]. هەمان سەرچاوە.

[160]. الكامل في التأريخ، ج٢ ص٢٠٢. قادة فتح العراق والجزيرة: محمود شيت خطاب، ص٤٨٧.

[161]. فتوح البلدان، بلاذري، ج١ ص٢٠٧.

[162]. الاستعاب في معرفة الاصحاب: ابن عبد ربه، ج٣ص١٢٤٣. فتوح البلدان: ج١ص١٧٩.

مسلمە)ی بەسەر کوردەکانەوە داناو (وەلید کوڕی عوقبە)ی بەسەر عەرەبەکانەوە دانا – پاشان (سەهل) و (عەبدوڵلا)ی فەرماندەی ناردەوە بۆ کوفە. کاتێک کە (عومەر) سەعدی بانگ کردەوە بۆ مەدینە، سەعد (عەبدوڵلا)ی لەجێی خۆی دانا بە (والی کوفە) و سەرکردەی هەموو هێزەکانی عێراق، عومەریش ڕازی بوو.[163]

(سەهل)یش بە فەرمانێک کرا بە فەرماندەو، لە (کوفەوە)نێررا بۆ (بەسرە) و، لەوێوە نێررا بۆ ڕزگارگردنی کرمان!

هەرێمی جزیرە لە هەموو وولاتەکان ئاسانتر فەتح بوو، چونکە فشاری ئاینی و ئابووری و کۆمەڵایەتی ڕۆمەکانیان بەسەرەوە بوو،(کارل بروکلمان) دەڵێ (خەڵکی ئەسڵ و ڕەسەنی ناوچەی جزیرە – کە کوردن – سەرشۆڕی چەوسانەوە وستەم و زۆری کەنیسەی ئەرثرزوکسی بوون)[164] (سیر تۆماس ئەرنۆڵد) دەڵێ: (خەڵکی شارەکان بە تایبەتی سنعەتکار و دەست ڕەنگینەکان و کرێکار و جوتیارەکان، بە گەرمی پێشوازیان لە ئاینی ئیسلام کرد، لەبەر زۆری باج و خەراج و ستەمی فارس و ڕۆم و، قورسی و دەسکاری کراوی ئاینی زەردەشتی ومەسیحی، بەلام بە ئیسلام ئازاد بوون، یەکسان سەیر دەکران، ئیسلامیان بەلاوە ئاسان بوو وەریان گرت)[165]

مێژوونووسان هەموو باسی ئەوە دەکەن کە کوردستان بە تایبەت هەرێمی جزیرە ئاسانترین وولات بوو بە کەیف و شەوق و زەوقی خۆیان موسوڵمان بوون، سوپای ئیسلام تەنها جەورو ستەمی رۆمی لەسەر لابردن، ئیتر پڕ بەدڵی خۆیان ئازاد بوون و وەک گوڵ گەشانەوە و لە سایەی ئیسلام دا حەوانەوە.

---

163. الكامل في التأريخ: ابن اثير، ج٣ص٣

164. تأريخ الشعوب الاسلامية: كارل بروكلمان، ص١١٧

165. الدعوة الى الاسلام: سير توماس ارنولد، ص٢٢٨، ترجمة: حسن ابراهيم حسن

واقیدی دەڵێ: (عیاز هەرێمی جزیرەی بە ئاشتی گرت.)[166]

یەعقوبی دەڵێت: (جزیرە بە ئاشتی ڕزگار کرا)[167]

بەلازەری دەڵێت: (جزیرە ئاسان ترین وڵات بوو کە بە ئاشتی فەتح بوو)[168]

کوردەکانی جزیرە زۆر ژیر دیار بوون، یەکەم: خۆیان لە شەڕەکان هەڵ نە ئەقورتان. دووەم: پێشتر نوێنەریان ناردبوو بۆ مەدینە و لە ئاینی نوێ و پێغەمبەرەکەی حاڵی بوون و هەواڵیان هێنایەوە. سێهەم: پێشوازیەکی چاکیان لە ئیسلام کرد و وەکو عەرەبەکان بە شەڕو فیتنە ئاژاوەنانەوە وەڵامیان نەدایەوە، لە ئیسلام و پیاوەکانی وورد دەبوونەوە، بە عەقڵ باوەڕەکەیانیان وەردەگرت. ول دیورانت دەڵێ: (ئیسلام یەکەم ئاین و سیستمە مرۆڤ لەنێوان سێ شتدا سەرپشك دەکات: ئیسلام بوون، جزیە دان، شەڕ. ئاینەکانی تر گەلانی فارس و ڕۆم، تەنها بە شەڕ بەرامبەرەکانیان دەترسان و سەرشۆڕیان دەکردن).

## بارودۆخی شام دوای ڕووداوەکانی جزیـــرە

لەشکرکێشی ناو جزیرە تەواو بوو، بە کەمترین خوێن ڕژان وڵاتێکی فراوان ڕزگار کرا، ئازایەتی لێرەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گەلەی کە لەو خاکەدا دەژیان بێ زاربوون لە ڕۆمەکان، چاوەڕوانی سوپای ئیسلام بوون کە بێت و ئەو مۆتەکەیان لە کۆڵ بکاتەوە، ئەوا هەمووشت جێبەجێبوو، کۆتایی ڕووداو لە بەختی کوردان بوو، موسوڵمانەکان ئاوچەکەیانیان جێ هێشت، ڕۆمەکانیش دەرکران. مایەوە کوردەکان، خۆیان حوکمی خۆیان کرد، مەگەر سەربازگەیەك مابێ بۆ پاراستنیان یان جزیە کۆکردنەوە لەوانەی موسوڵمان نەبوون.

---

[166]. فتوح الشام: الواقدي. ج٢ص٨٧

[167]. تأريخ يعقوبي: احمد بن يعقوب، ج٢ص١٥٠، نجف١٣٥٨ه

[168]. فتوح البلدان: احمد بن يحى بلاذري. ج٢ص٢٠٤، قاهرة ١٩٥٩.

بارودۆخی شام ناتەواو بوو، بە داوای عومەر هیچ جموجۆڵێکیان نەکرد بەرامبەر رۆم جگە خۆرێك خستن، هەموو چاوەڕوانی ڕووداوەکانی ناو جزیرەیان دەکرد کە لە بەرژەوەندی حومس و شام تەواو بوو، جگە لەوەی رۆمەکان پاڵپشتێکی گەورەیان لە دەست چوو لە جزیرە.

ئەبو عوبەیدە فەرماندەکانی بۆ چەند جارە کۆکردەوە، پرس وڕا و لێکۆڵینەوەی دوورودرێژی پێ کردن، باسی جزیرە کرا، لەو لایەنەوە ئەمین بوون، ئێستە یەکلابوونەتەوە بۆ رۆم و ئەو سوپایەی کە لە میسرەوە هێنراوە و لە لێوارەکانی سوریا دابەش بوون.

هەندێکیان وتیان: ڕوداوەکانی جزیرە تەواو بووە و، سوپای عەرەبەکان بڵاوەیان لێ کردوە و خەڵکی قلنسرین پەشیمان بۆنەتەوە و پەیمانیان شکاندووە. خالید وتی: ئەو سوپا زۆرەی کۆمان کردۆتەوە چاك، وایە بجوڵێنرێت، کاتی ئەوەیە تەمێی ئەوانە بکرێت کە پەشیمان بوونەتەوە، (ئەبوعوبەیدە) ڕازی بوو، هەموو سوپایان کۆکردەوە ئەبوعوبەیدە وتارێکی توندی بۆ خوێندنەوە، سوپاکەیان ڕێك خست (خالید) لای ڕاست، (عەباس) لای چەپ (قەعقاع) لە پێشەوە دەڕۆیشت، ئەم سوپایە بەرەو دوو مەبەست کەوتنە ڕێ یەکەم: تەمێکردن و گێڕانەوەی ئەو خێڵانەی پەیمانیان شکاند بوو، دووەم: بەرەو ئەو رۆمانەی لە کەشتیەکان دابەزیون و ناوێرن بێنە پێشەوە. خالید لای خۆیەوە دانرا بۆ سەر کوت کردنی هەڵگەڕاوە و ڕاپەڕیوو و پەیمان شکێنەکان.هەندێکیش نێرا بۆ ئەو عەرەبانەی لە جزیرەوە هەڵهاتبوون، ڕایان دەکرد بەرەو ڕۆم، کەشتییەکان لە ئەنتاکیا دابەزیون و لە نگەریان گرتووە، سەرکردایەتی حومس بڕیاری دابوو پێشەکی هەرقل مەشغوڵ بکرێت بە ئاڵوگۆڕی نامە، هەتا ڕوداوەکان درێژە بکێشێ و نەخشەی هەرقل ئاشکرا ببێت و بزانرێت بۆچی هاتووەو، کەی دەست پێ دەکات و ڕوی مەبەستی بەرەو کوێیە. ئەنجا نامەیەکی درێژی بۆ عومەر نووسی کە بڕیار و ڕای خۆی و ئامۆژگاری بنێرێ. عومەر بیری کردەوە لە نامەکەی ئەبوعوبەیدە و پرس وڕای بە سەرکردایەتی ناو مەدینە کرد، بڕیاری دا خۆی

بکەوێتە ڕێ. چونکە ئەو نەخشەیەی هەرقل و ئەو سوپا زۆرە، ئەوە دەخوازێت سەرکردایەتی مەدینە خۆی سەرپەرشتی بکات. عومەر دەست بەجێ لە مەدینەوە دەرچوو گەیشتە ناوچەی جابیە. هەردوو بەرەی جەنگی عێراق و شام بەشداری ئەم جموجۆڵەیان کرد هەڵوێست لە خەتەر دەچوو. ئەوەی دەخواست کە سەرکردایەتی گشتی سوپای ئیسلام کە (حەزرەتی عومەر)ە، خۆی لە نزیکەوە سەرپەرشتی بکات، و نەخشەی بەڕێوەبەرێت، عومەر سوپایەکی لەگەڵ خۆی هێنابوو، ناوچەی جابیەی هەڵبژارد بۆ بارەگای سەرکردایەتی خۆی، بڕیاری دەرکرد بۆ هەموو هێزەکانی شام، کە لە خۆئامادەکردن و جوڵانی خێرادابن بەرەو ئەو، ئەبوعوبەیدەش هێشتا لە (حومس) دەر نەچووە و داوای لە هەموو هێزەکانی کرد کە خۆی ناردبوونی دەست بەجێ بگەڕێنەوە بۆ حومس، خالید هەڵگەڕاوەکانی (قلنسرین)ی تەواو کرد و گەڕایەوە حومس. خەڵکی جزیرە ژیانی ئاسایی خۆیان دوور لە رۆم و عەرەبە لادەرەکان دەست پێ کردۆتەوە. رۆم هەواڵی پێگەیشت کە سوپای ئیسلام لە شام کۆبونەتەوە، ئامادەن بۆ جووڵان و یارمەتیشیان لە عێراقەوە بۆ هاتووە. رۆمەکان دەیان زانی عومەر ناجوڵێ بۆ فەتحی گەورە نەبێت، هەروەکو چۆن پار هات و قودس و فەلەستینی ڕزگار کرد و ڕێکەوتنەکەی مۆر کرد، دەیان زانی نەخشەی عومەر قوڵ و کاریگەرە، هەروا بە ئاسانی نەهاتووە، رۆمەکان بەمە پشتیان شکاو، لەولایەوە نەخشەکەیان هیچ دەرچوو، خۆ ئامادەکردنی عەرەبی جزیرە هەڵوەشایەوە، شۆڕش و ڕاپەڕینی وا لە شام ڕوی نەدا، کە جێی دڵ خۆشی ڕۆم بێت، ئەوا کەشتیە جەنگیە دەریایەکانی دابەزاندووە و نازانێ بۆ کوێیان بەرێت، چونکە پاڵ پشتیان نیە لەسەر زەوی و، زەوی ئامادەیان نیە تیا ئۆقرە بگرن و نەخشەیان پیادە بکەن. لەبەرئەوە هەرقل داوای کرد لە سەربازە دابەزیوەکان کۆببنەوەو بچنەوە ناو کەشتیەکانیان. لەولایەشەوە زیرەکی بوو بۆ هەرقل، چونکە دەیزانی ئەوەی کە هێناوێتی تیا دەچێ و، بێ پارێزەر دەمێنێتەوە، دوای تیاچونی ئەمانە کەشتی ڕەق و تەق چی لێ بکات، بەم جۆرە نەخشەکەی

عومەری فاروق سەرکەوت، هەر بە جوڵەی خالید هەموو خێڵە عەرەبەکانی شام داوای ڕێکەوتنیان کرد، خالیدیش ڕازی کردن و لەگەڵیان ڕێکەوت، هەتا ڕانەکەن و پاڵپشت دروست نەبێ بۆ هەرقل. ڕەوشتی خالید ئاشتییە نەک شەڕ، ئەمەش حەکیمیەکی تری فەرماندەیەکە لەو کاتە گرنگەدا، دەنا ئەمە دووەم جاریان بوو ئەو خێڵانە هەڵگەڕێنەوە و پەیمان شکێنی بکەن، پاشان لە کۆبونەوەیەکدا بە ماقوڵان و گەورەکانی خێڵەکانی وت: (کەم و زۆرتان لای من گرنگ نیە، ئەگەر ڕاست دەکەن هەر ئێستا چەکەکانتان لابەن و بڵاوەی لێ بکەن و هەر یەکە بچێتەوە ماڵی خۆی.)[169] هەر هەموو بڵاوەیان لێ کرد. پاشان خالید چوو بۆ (قلنسرین) ئەوێشی ڕزگار کرد، هەندێ لە سوپای ڕۆم لە (قلنسرین) ڕایان کرد بۆ (حەلەب)، خالید چوو بۆ حەلەب و گەمارۆی دان و بە ڕێکەوتن ئەوێش تەسلیم بوو، کەچی (ئەبوعوبەیدە) کە حەلەبی لە خالید وەرگرتبوو، هەر لە خۆیەوە چۆڵی کرد، لەسەرئەوە عومەر لۆمەی کرد. ڕۆمەکان هاتنەوە حەلەب. پاشان خالید و عیاز یەکیان گرت و چونەوە حەلەب و ڕۆمەکان ڕایان کرد، (ئەبوعبیدە) ڕوی کردە (لازقیە) و بە فێڵێك لە قەڵاکان دەریان هێنان و ناوچەکەیان ڕزگارکرد، ئەبوعوبەیدە ڕەتلێکی نارد بۆ قەڵای (حەدەس) لە ئاسیای بچوك بە فەرماندەیی(حەبیب کوڕی مەسلمە)، لەوێشەوە ناردی بۆ (قلنسرین)، لەگەڵیان ڕێکەوت یان جزیە بدەن یان شار چۆڵ بکەن. ئەوانیش شاریان چۆڵ کرد و چون بۆ خاکی ڕۆم. عومەر لە(جبایە) ئاگاداری هەموو ڕوداوەکانە، ناوچەکە بەبێ شەڕ ڕزگار بوو، بەرەی جەنگی زۆر کرایەوە، شاری (ئەنتاکیا) گیرا، پاشان (مەیسەرەی کوڕی مەسروقی عەبەسی) لە ئەنتاکیاوە چووە خاکی ڕۆم. یەکەم کەس بوو ئەو خاکە ببڕێ، لە ڕێیەکی تەنگەوە ڕۆیشت، دەبینێ عەرەبەکان ئەوانەی بە ئیسلام ڕازی نەبوون و هەڵهاتوون لە عەرەبی (غەسان و تنوغ و ئیاد) لە جزیرەوە ڕایان کردووە و دەیانەوێ بکەن بە سوپای ڕۆم لە ئەنتاکیا شکاون و

---

[169] . اشهر مشاهير الاسلام والسياسة: رفيق بەگ العظيم، ص٨٦، المطبعة الهندية، ط٤.

دەگەڕانەوە بەرەو(قوستەنتنیە) پایتەختی رۆم. لە پڕێکا (مەیسەرە) پەلاماری دان و زەرەرێکی زۆری لێدان و بڵاوەی پێ کردن.

هەرقل هەروەکو کسرای لێ هات، لەم شار ڕای دەفڕێنن بۆ ئەو شار. یەزدگورد پاشای فارس لە (مەدائن)ی پایتەختیەوە ڕایان فڕان بۆ جلولا و خانەقین وحلوان و رەی و ئەسفەهان، ئێستا لە ئەسفەهانەوە (١٥٠) هەزار سەربازی لە (نەهاوەند) کۆکردوەتەوە. (هەرقل) پاشای رۆمیش لە قودسەوە ڕاویان نا بۆ دیمەشق و حومس حەلەب و ئەنتاکیا و ئێستا بەرەو (قوستەنتنیە)ی پایتەختی لە هەڵهاتن دایە. عومەر نایەڵێ لە هیچ جێیەك خۆیان ساز بکەنەوە و ئۆقرە بگرن.(هەرقل) ئەفسەرێکی خۆی بانگ کرد کە تازە لە ئەسیری هەڵ هاتبوو پێی وت:

- ئەرێ پێم بڵێ ئەمانە چین؟

- سوار چاکن بە رۆژ، عابدو خوا پەرستن بەشەو، ستەم ناکەن لە (زیمە) شتیان ناخۆن بە پارە نەبێت. ناچنە ناویان زویریان بکەن بە خۆشی و بە ئاشتی نەبێت. بۆ دوژمنەکەیان دەوەستن هەتا دەیان شکێنن.

- هەرقل وتی: ئەگەر ڕاست بکەی ئەم جێ قاچەی من دەگرن!

دوو مانگی نەبرد ئەو جێ قاچەیان گرت و، بەرەو ناوەڕاستی وولاتی رۆم ڕای کرد. لە سەر گردێکەوە بە سواری ماینەکەیەوە لای کردەوە و، دەستی بەرزکردەوە و، هاواری کرد: خوا حافیز سوریا خواحافیز، جارێ تر ناتان بینینەوە. ئەنجا هەڵ هات و هەتا قوستەنتنیەی پایتەختی رۆم نەوەستا. هەرقل نکوڵی کرد لە ڕەشبگیرکردنی خەڵکی شام و ئامادەکردنیان، تەنانەت فەرماندە و سوپا و سەرکردەکانی شامی ڕێك نەخستبوو، کە لە شارێکەوە هەڵ دەهات بۆ شارێکی تر، بۆ نەخشە و کۆکردنەوەی هێز نەبوو، بەڵکو یەئس و سەرلێشێوانی زیاتر پێوە دیار بوو، بەڵام عومەر بە هێزی عێراق، جزیرەی تەواو کرد، هەتا سوپای شام ماندو نەکا و سەری لێ نەشێوێ و بۆ جەنگی گەورەتر ئامادەی کردبوو، کە جزیرە تەواو بوو، خۆی هات بۆ شام و،

داوای کرد لەیەك کاتدا هەرهەموویان لە یەك جێگا کۆببنەوە. بـ . . ، .
ڕۆشنی نەخشەکەی پیادە کرد.

جارێکی تر هەرقل لە کۆبوونەوەیەکی فەرماندەکاندا، پێی وتن: ئێمە بەم هەموو چەك و تفاق و سەرباز و سەرکردەیەوە، موسوڵمانەکان بەبێ چەك و سەرباز و سەرکردەوە، بۆ چی زاڵ دەبن بەسەر ئێوەدا.؟ یەکێك لە ئەفسەرەکان هەڵساو وتی:

- دەتوانم بەبێ ترس قسە بکەم؟

- فەرموو چیت هەیە بیڵێ.

وتی: ئەوان وەکو ئێمە نین، ئەوان هەر کە هێرش دەکەن، ئێمە ڕادەکەین. بەڵام کە ئێمە هێرش دەکەین ئەوان سەنگەریان چۆڵ ناکەن. هیچ کەس لەوان نیە، حەز دەکات خۆی پێش هاوڕێکەی بکوژرێ. هیچ کەس لە ئێمە نیە حەز دەکات هاوڕێکەی پێش خۆی بکوژرێ.

شەو بچۆ گوێ لە خێمەکانی ئەوان بگرە، لە زکر و خواپەرستی و قورئان خوێندندان و دەنگێك لە خێمەکانیان دێت وەك دەنگی کورەی هەنگ وایە. بەڵام وەرە سەیری سەربازگە و خێمەکانی ئێمە بکە لە شەراب خواردن و سەرخۆشی و سەما و یاری بە ئافرەت و ڕابواردندان. تەنها ئا ئەوەیە جیاوازی ئێمە و ئەوان.

هەرقل وتی: ئەگەر ڕاست بکەی ئەم جێ قاچەی منیش دەگرن!

(عیاز) بە سوپاکەیەوە بە داوای عومەر کەوتە ڕێ بەرەو ژوور، چونە ناوچەی (دەرب) کە ڕێگایەکە لە نێوان (تەرتوس) و (وولاتی ڕۆم) دا، دۆڵێکی فراوان و تەسکە عیاز یەکەم کەس بوو ئەو دۆڵەی بڕی و ڕێی کردەوە لە جزیرەوە بۆ وولاتی ڕۆم و ئەرمینیا پاشان عیاز سەرکەوت بەرەو (بدلیس) و (ئەرمینیا) و (خیلات) لە ناوەڕاستی ئەرمینیا، ئەم ناوچانە هەموو گاور بوون و ڕێکەوتنیان مۆرکرد. دوا قۆناغی لەشکرکێشییەکەی عیاز (عەین حامن) بوو. پاشان گەڕایەوە شاری (ڕقە)، ماوەیەك مایەوە، پاشان چوو بۆ(حومس)[170] و ماوەیەکی باش لەگەڵ (ئەبوعوبەیدە) ژیان. کە ئەبوعوبەیدە

کاتی مردنی هات (عیان)ی خستە جێی خۆی و عیاز بوو بە (ئەمیری شام).
عومەریش ڕازی بوو فەرمووی: (من ئەمیرێك ناگۆڕم کە ئەبوعوبەیدە دای نابێ.) پاشان نامەی بۆ عیاز نوسی: (من ڕازی بووم لەسەر ئەوەی کە ئەبوعوبەیدە کردوێتی بە والی، کاریکە بەوەی خوا لەسەری فەرز کردووی.)[171]
عیاز والی شام بوو، هەتا ساڵی٢٠ی کۆچی٦٤٠ ی زاین، لە تەمەنی (٦٠) ساڵیدا وەفاتی کرد و هەر لە حومس نێژرا. عیاز یەك فلسی لە دوای خۆی جێ نەهێشت.[172] هەرچی دەست دەکەوت لەپێناوی خوادا دەیبەخشی، ئەم سەرکردانە بۆ دەست کەوتنی دنیا جهادیان نەئەکرد، بۆ تاڵانی کوردستانیان ڕزگار نەکرد، بەڵکو بە داوای خەلیفە بوو، بۆ لابردنی ستەمی ڕۆم لە سەر میللەتی خێر لەخۆ نەدیوی کورد. ئەم سەرکردەیە بوو باکوری کوردستانی گەورەی ڕزگار کرد، با یەکێك لە نمونە بەرزەکانتان بۆ بگێڕمەوە هەتا بزانن ئەوەی کوردستانی ڕزگار کرد چ پیاوێك بوو. وە بزانن بۆچییە وا کورد بۆ هەزارو چوارسەد ساڵە موسڵمان بوەو لەدڵیدا چەسپیوەو وازی لێناهێنێ لەگەڵ ئەو هەموو فشارەی کە تا ئەمڕۆش لەسەریێتی هەر لەسەر ئایینەکەی سوورە!! کە (عیان) بوو بە والی شام. هەندێ لە خزمەکانی ئەوەیان بە هەل زانی، لە نیوەدورگەی عەرەبەوە کەوتنە ڕێ بۆ شاری (حومس) بەڵکو یارمەتیەیان بدات. عیاز زۆر بەخۆشییەوە پێشوازی لێکردن، چەند ڕۆژ لای مانەوە باسی پلەو پایە و ئەجری خزمایەتیان بۆ کرد. وتیان خێر بۆ خوێش نەك بۆ دەروێش. باسیان کرد کە لە ڕێگە چەند زەحمەتیان تووش هاتووە هەتا گەیشتونەتە (حومس)و لای ئەم. ئەویش دەستی برد لە ماڵی خۆی یەکی (١٠) دیناری دانێ، خۆیان (٥) کەس بوون، خزمەکان سەریان سوڕما سەیری یەکیان کرد. نەیان وویست و دایانەوە و گلەییان لێ کرد. عیاز پێی وتن: (کوڕانی مامەم سوێند بەخوا دەزانم خزمن و زەحمەتتان بووە و هەقتانە، بەڵام بۆ لای من نەهاتوون، ئەمە پارەی خادمەکەمە ئەوەم لێداوە بە ئێوە، بم

---

[171]. طبقات الکبری: ابن سعد البصري الزهري: ج٧ص٣٩٨، بیروت ١٣٧٦ه.

[172]. کتاب الفتوح: ابن اعثم الکوفي، ج٣ص٢٤٢.

بورن بەخوا هیچم نیيه. وتیان: (نات بورین چونکه تۆ والی نیوەی شامی، دەبوایه هەر کرێی ڕێگاکەت بدایناية، هەتا پێی بگەڕێنەوه بۆ ماڵەوه.) وتی: (ئەتانەوێ دزیتان بۆ بکەم له ماڵی خوا.؟ سویند بێ بەخوا، به مشار بمبڕنەوه پێم خۆشتره، هەتا خیانەتی یەك فلس بکەم!) وتیان: باشه دەت بورین لەوەی پارەمان بدەیتی، بەڵام تەعینمان بکه به لێپرسراو و فەرمانبەر، تۆ لێپرسراوی هەموو شامیت. دەتوانی بمان کەیت به شتێکی باش، ئەوەی خەڵك بۆت دەکات، ئێمەی خزم چاکترو دڵسۆزانەتر بۆت دەکەین، ئەو خێرەی دەچێته گیرفانی خەڵکی تر، بابێته گیرفانی خزمەکانی خۆت. خۆ تۆ حاڵی ئێمه چاك دەزانیت چۆنه!) وتی: (من ئێوه دەناسم که خاوەنی فەزڵ و چاکەن، بەڵام ئەگەر عومەر بزانێ من کەسێکی خزمی خۆم دامەزراندووه، لۆمەم دەکات.)

وتیان: (ئەی چۆن تۆ ئەبوعوبەیدەی بێ پرسی عومەر له جێی خۆی دایناوه که خزمت بوو، عومەریش پێی ڕازی بوو، تۆش بیکه عومەر ڕازی دەبێت.) وتی: (ئاخر من لای عومەر وەك ئەبوعوبەیده نیم.) به توڕەییەوه پشتی تێ کردن و ڕۆیشت.[173]

## خولی دەرچوونی ئەفسەر و فەرماندەی سەربازیی

عومەر دەیزانی دەوڵەتی ئیسلام دوژمنی زۆره. پیاوی گونجاوی دەخسته شوێنی گونجاوو دەگەڕا به شوێنیان دا، لەبیری ئەوەدا بوو خولێك بکاتەوه بۆ دەرچونی فەرماندەو سەرکردەی سەربازی و بەڕێوەبردن، کاتیش مەجالی نه ئەدا چونکه سنووری فراوان بوو بوو، دوژمنی جۆراوجۆر پەیدا بوو بوو، له فارس و ڕۆم له زەردەشتی و گاور و جولەکه، له بۆچون و باری کۆمەڵایەتی میللەتان. لەبەرئەوه دەیویست هەر له بەرەی جەنگیەکاندا و هەرله گەرمەی شەڕەکاندا خولی فێربوون و دەرچوونی کادری سەربازی و ئیداری بکاتەوه. عومەر سەڵاحیەتی تەواوی هەبوو له دانان و لابردنی سەرکردەکاندا به بچوك و گەورەیانەوه، چونکه ئەو سەرکردەی گشتی هەموو هێزەکان بوو، بۆ هەر

---

[173]. صفة الصفوة: الجوزي ابن فرج، ج٧ص٢٩٨.

جەنگە و سەرکردەیەکی تازە و لیاقەت داری دا ئەنا، کە لەوەو پێش هیچ مارەسەیەکی سەرکردایەتی نەبووە، بۆ نمونە لە بەرەی جەنگی عێراق دا (موسەننای کوری حارسەی شەیبانی) دانا، لە جەنگی(جسر) دا گۆڕی بە (ئەبی عوبێدی سەقەفی) هەرچەندە (ئەبوعوبێد) ناجح نەبوو! دوای شەهیدبوونی (ئەبوعوبێد) (موسەننا)ی هێنایەوە، دوای شەهیدبوونی (موسەننا) (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس)ی دانا، دوای گرتنی (مەدائن و حەلوان) لای برد و(عبدللەی کوڕی عوتبان)ی کردە سەرکردەی جەنگی عێراق.

بۆ هەموو جەنگێك ڕاست وچەپ و ناوەڕاست و پاشەوەی دادەناو یەکێکی دەکردە سەرکردەیان. لە جەنگێکی تردا پێنج کەسی تری دادەنا و نەخشەشی بۆ دادەڕشتن، کەمتر سەرکردەی دووبارە بکردایەتەوە، ئا بەوە هەڵیدەسەنگاندن، نامەی بۆ دەناردن بە بەردەوامی داواشی لێ دەکردن کە بە درێژی باسی شەڕوشوێن و دوژمن و تاکتیکەکانی جەنگی بۆ بکەن. بەو جۆرە خولی فێرکردن و دەرچونی فەرماندە و کادری جەنگی دەکردەوەو زۆر سەرکەوتووبوو، لە جەنگەکانی ئەهوازو کرمان و نەهاوەند و شارەزور و جزیرە و شام و هەرێمەکانی پشتی ئەمانەوە، بەردەوام سەرکردەی تازەی دروست دەکرد، بۆ جەنگی نەهاوەند، کە گەورەترین جەنگی موسوڵمانان بوو، یەکێکی لە گوندێکی دوورو وون دۆزیەوە و کردی بە سەرکردە و، نزیکەی (٤٠) هەزار سەربازی دایە، بەرامبەر (١٥٠) هەزار فارس، زۆر ژیرانە سەرکەوت، دوای ئەو جەنگە فارس نەی توانی یەك بگرێتەوە، بۆیە ناونرا (فتح الفتوح).

بۆ لوبنان (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان)، بۆ ئەردەن (شرحبیل کوڕی حەسەنە)، بۆ هەر جێیەك سەرکردەیەکی تازە و بە توانای هەڵدەبژارد. دەوڵەتی ئیسلامی دوژمنی زۆر بوو، هەتا فراوان بێتەوە سەرکردەی تازەی دەوێ، سوپای زۆر دەبێ و دوژمنی نوێی بۆ دروست دەبێ، بۆیە دەبێ کوڕانی ئازایان بۆ دروست بکرێ، هەتا لە کاتی تەنگانەدا پەکی نەکەوێ و لێی نەبڕێت، هەتا کیان و نیشتمان و ئومە و ئایین و بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان بپارێزێ، چونکە دوژمن لە هەر چوارلاوە دەوری داون، بەخیلن و بەو پێشڕەوی

و دەستکەوتانە، حاقیدن بەوەی وایان بەسەر هاتووە...!! دەبێ لە خەزێنەیاندا کادر و کەسانی بەهێز و بە توانا و شارەزایان زۆر بێت، چونکە رەنگە دوژمنی ناهەموار و، شەڕی خوێناوی و نالەبار و قورسیان بێتە ڕێگە. عومەر بە تەنها ئەو بارەشی گرتبووە ئەستۆی خۆی. بەو جۆرە سەرکردەی نوێی دەخستەوە. یەکێك لە سەرکردایەتی بێ وێنەی عومەر ئەوە بوو ئەو خولەی لە هێمنی شاری مەدینە و مەککەدا نەکردەوە، بەڵکو لە مەیدانی جەنگ دا فێری دەکردن و بە نامە، وانەی تیئۆری فێر دەکردن و، بە هێرش و پەلاماری دوژمنی راستەقینە، نەك وەهمی،... وانە عەمەلیەکانی فێر دەکردن، دواییش داوای نەتیجەی لە خۆیان دەکرد، نەك خۆی تاقیان بکاتەوە! عومەر بەردەوام نامەی بۆ سەرکردەکان دەنارد و، هەمیشە چەندین تەتەری نامەبەر بەرێوە بوون، نامەبەر و نامەهێنەری بە هەموو ناوچەکاندا بڵاوکردبویەوە. زوو زوو سەرکردەکانی دەگۆڕی و جێگەی بۆ سەرکردەی نوێ دەدۆزیەوە و، خەڵکی تازەی دەخستە جێیان، پێشتر کاری تازەی بۆ لابراوەکە ئامادە کردبوو.! ئەم کارانەی عومەر بۆ ئەوە بوو هەتا کادری جەنگی و ئیداری زۆر بن و سەرکردایەتی جەنگەکانی ئایندە بکەن. عومەر تێڕوانینێکی قوڵ و وردی هەبوو لە سروشتی مرۆڤایەتیدا، بۆ تاك و کۆمەڵ و گەلان. چونکە هەر گەلێك سروشتی تایبەتی خۆی هەیە. کە سوپای ئیسلام بەرامبەر رۆم وەستا، رۆم خاوەن ئایینی ئاسمانین، خاوەنی شارستانی و فەلسەفەن، ئەوان زانایانیان خستەوە بۆ جیهان، وەکو سوقرات و ئەفلاتون و ئەرستۆو هی تر، عومەریش بۆ ئەو بەرە جەنگیە سەرکردەی باش و هێمن و زانا و دامەزراو و بە توانا و ئازای هەڵبژاردەی دادەنا وەك (ئەبوعوبەیدە) ئەمینی ئوممەت، (یەزید) شارەزاو پسپۆڕی بەرێوەبردن و سیاسەت، (عەمری کوڕی عاس) کە بە ناوبانگە بە بلیمەتی عەرەب، (خالید) پاڵەوان و ناوداری جەنگی و گەورەی سەقیف. (معاویە) حەکیم و بە ئارام. بەڵام بۆ فارسەکان کەسانێکی دانابوو کە بەو میللەتانە و ئاین و سروشتی ئەو گەلە ڕۆژهەڵاتیانەی دەخوارد. (سەلمانی فارسی) لە جەنگەکانی فارس دا بەشدار بوو، هەتا (مەدائن) گیرا، کە پایتەختی

فارسه، ئیتر له (مەدائن) جیّ نشین کراو، بوو بووه حاکمی شاری مەدائن و جیّی فەخری فارسەکان. بەری جەنگی ڕۆژهەلات بەزۆری سەرەك خێلّ و عەشیرەت وماقولاّنی عەرەبی بۆ دەناردن، چونکه خەلّکی فارس و عەجەم به زۆری عەشایەر بوون و بەیەکیان دەخواردو لەیەك تێدەگەیشت.

## حاکمی شاری رەی پێشوازی له یەزدگورد دەکات

بروکلمان دەگێڕێتەوە، که یەزدگورد له حەلوان هەلّکەندرا، به خۆی و مالّ و مولّك و خەزێنەو دەست وپێوەند و ماقولاّنیەوە، به سواری چوار هەزار ئەسپ و ماین و عەرەبانە، ئەم شار و ئەو شاری دەکرد، هەتا له شاری (رەی) ئۆقرەی گرت و ویستی تیا بمێنێتەوە، شاری رەی دەکەوێته باکوری ناوەڕاستی ئێرانەوە، حاکمی شار ناوی (ئابان جازویه) بوو، پێشوازیەکی گەرمی لیّ کرد، بەلاّم به ئاشکرا هەستی به ماندویێتی و بیّ قەراری و راڕایی و داڕوخان و شکستی یەزدگورد دەکرد، له ناو چەوانیدا دەیخوێندەوە. یەزدگورد که هەلّهاتوە، لەبەردەم دوژمن دا شکاوە و راونراوە و ئێسته پەنای هێناوەته بەر حاکمێك و میوانە، کەچی پاشای موخلیس حاکمی شاری بانگ کردو داوای باج و خەراجی لێدەکرد.

حاکمی (رەی) زۆری پیّ ناخۆش بوو، به یەزدگوردی وت: تۆ ئەوەی که هەت بوو، به نرخ و گران بەها بوو له ژێر دەستدا بوو، له ترسان به جێت هێشتوە، ئەنجا بیانوو به من دەگری و به تەمای من بۆت بنێرم! لەگەلّ حاشیەکەی خۆی دا چەند کۆبونەوەیەکی نهێنی کرد، پاشان پەلاماری یەزدگورد دەدەن و مستیله مۆرەکەی له پەنجەی دادەکەنن و، چەند راپۆرت و چەك و لیستێکی پیّ مۆر دەکەن، لەسەر ئەو شته بەنرخانەی که به یەزدگورد بوو. ئەنجا بەرەلاّی دەکەن. یەزدگورد هەستی به هیچی و داڕوخانی خۆی کرد، زۆر به مەئیوسی شاری (رەی) بەجێهێشت و چوو بۆ شاری ئەسفەهان.[174]

---

[174]. تأريخ الشعوب الاسلامية: بروكلمان. ص١٠٤، دارالعلم ١٩٩٧.

# بەشی پێنجـەم

* جەنگی ئەهواز و نەهاوەند
* رزگارکردنی هەرێمی خوزستان ( ئەهـواز )
* دەستگیرکردنی هورمـزان پاشا و ناردنی بۆ مەدینە
* جەنگی نەهـاوەنـد ( فتح الفتوح )
* خۆئامادەکردنی فارس
* هەڵوێستی سەرکردایەتی ئیسلام
* عومەر چۆن سەرکردەی شیاو دەست نیشان دەکات؟
* بەرەو نەهاوەند
* فەتحولفتوح
* جەنگی هەمـەدان
* نەخشەی دوای نەهاوەند
* رزگارکردنی شاری ( رەی ) و ( دستەنبی )
* نهێنی سەرکردایەتی عومەر
* جولان بەرەو ئەسـفەهان
* بارەگای سەرکردایەتی و سێیەم پایتەختی یەزدگورد
* یـەزدگورد لە نێوان ئەستەخرو کرمان دا

## جەنگی ئەهـواز و نەهـاوەند

### رزگارکردنی هەرێمی خوزستان (ئەهواز)

یەزدگورد شاری ئەسفەهانی کردبوە بنکەی سەرکردایەتی خۆی و، لەوێوە بڕیاری دەردەکرد، بەردەوام خەڵکانی هان دەدا، نامەی نووسی بۆ حاکم و خەڵکی (فارس و ئەهواز) کە بەرەنگاری موسوڵمانەکان بکەن و بچن بە گژیاندا. داوای لێکردن هەموویان لە ئەهواز کۆببنەوە، ئەویش پارەو سەربازی بۆ دەناردن. سوپایەکی زۆریان لە ناوچەکە کۆ کردەوە، (هورمزان)ی حاکمی ئەهوازیان کردە سەرکردەیان.

ئەمیری بنکەی (بەسرە و کوفە)، یەکی نامەیەکیان بۆ خەلیفە عومەر نووسی و ئاگاداریان کرد، ئەویش دوو نامەی نووسی، یەکیان بۆ بنکەی سەربازی (کوفە)، (سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس) بەم جۆرە:

(ئەمیری کوفە سوپایەك کۆبکاتەوە بە فەرماندەیی نیعمانی کوڕی مقرن و بکەونەڕێ بۆ (ئەهواز).

نامەی دوەم بۆ بنکەی (بەسرە) بۆ (ئەبوموسای ئەشعەری) ئەمیری بەسرە، سوپایەك ریك بخات بە فەرماندەیی سەهل کوڕی عودەی . پاشان (ئەبو سەبرەی کوڕی ئەبقی رەهەمی) کرد بە سەرکردەی هەر دوو سوپای کوفە و بەسرە.

عومەر نامەیەکی تری بۆ (عەبدوڵڵا کوڕی قەیس) ئەبوموسای ئەشعەری نارد بەم شێوەیە: (پێم گەیشتوە کە عەجەمەکان جوڵاون و لە خاکی ئەهواز و تستر و منازر خۆیان کۆکردۆتەوە، هەر کە ئەم نامەیەم گەیشتە دەستت، مەیمرێنە هەتا هاوڕێکانت کۆدەکەیتەوەو ئەوانەی تریش کە وەڵامت دەدەنەوە لە خەڵکی بەسرە. پاشان بە پشتی خوا بیانبە، ئەوەی وەڵامی دایەوە، خوای گەورە بەسە بۆ ماڵ و منداڵییان، ئامۆژگاری خۆت و هاوڕێکانت بکە، بەردەوام جەنگیان پێ مەکە، مەگەر خۆیان داوات لێ بکەن. خۆتیان بۆ نەرم بکە. زۆر بە سۆزبەو ئاگاداریان بەو رێکیان بخە.)

که نامەکە گەیشتە ئەبوموسا وتی: (رەحمەت لە عومەر، هەروەکو فریشتەیەك لە نێوان هەردوو چاوەکانیدا وەستابێ و ئەم قسانەی بۆ بگێڕێتەوەو بۆی رێك بخات.)

لە هەمان کاتدا عومەر حەزی بەم جەنگانە نەدەکرد، خۆزگەی دەخواست کە ئیتر بەس بوایە. بەڵام ئەوەتە پاشایانی فارس نۆقرە ناگرن و گەلەکۆمە دەکەن و سوپا دەنێرن، عومەر دەیگوت: (خۆزگە بەسرە و ئەهواز و سەوادمان بە دەست دەبوو، خۆزگە لە نێوان ئێمە و فارس دا شاخێك لە ئاگر دەبوو، نە ئەوان بهاتنایە و نە ئێمە بچووینایە.)[175]

عومەر لە زۆر جێ دا ئەم ئاواتەی دووبارە و سێ بارە دەکاتەوە. دەیویست سنوریکی دیاری کراو بۆ دەوڵەتی ئیسلامی دیاری بکات و دەست بکاتە کاری دەوڵەتداری و رێکخستنی ناومالی کۆمەڵگەکەی، بەڵام دەرفەتی نادەن. ئیسلام لە ئاشتیدا تەشەنە و گەشە دەکات و دادەمەزرێ.

ئەبوموسا خەڵکی شاری بەسرەی کۆکردەوەو وتارێکی گەرمی بۆ خوێندنەوە، پاشان داواو نامەکەی عومەری بۆ خوێندنەوە و داوای لە خەڵکی کرد کە دەبێت (١٠) هەزار سەربازی بۆ کۆبکەنەوە. (عومرانی کوڕی حەسین)ی جێنشینی خۆی لە بەسرە و بە خۆی و سوپایەوە کەوتەڕێ. هەتا گەیشتە قەڵاکانی (منازر)، بست بە بستی ناوچەکەی بەبێ شەڕ رزگار کرد، فارسەکان لە منازیر سەنگەریان گرتبوو، موسوڵمانەکان بەرۆژو بوون، ئەبوموسا پێی شکاندن و بە ماوەیەکی کەم مەنازیری پاك کردەوە.

پاشان سوپای کوفە کە لە رێی خۆیەوە دەهات، لە نێوان (زت) و (روباری تیری) دا دایان لە سوپایەکی (هورمزان) و شکاندیان، هەتا قەراغی (روباری دوجەیل) فڕاندنیان. هورمزان ترسا (ئەهوان بگیرێ)، نامەی رێکەوتنی نووسی، ئەمەش ئەوەیە کە موسوڵمانەکان حەزی لێدەکەن، وەڵامیان دایەوە. بەڵام فێڵ بوو، راست دەرنەچوو! پەیمانی شکاند. ئەمیری

---

[175]. تأريخ الطبري: الامام الطبري. ج٣ص١٧٦.

بەسرە، خەلیفە عومەری لەو ڕێکەوتن و پەیمان شکێنیە ئاگادار کرد، عومەر یارمەتی تری بۆ ناردن و ڕاویان نان تا نزیکی ئەهواز، دایان لە سوپایەکەی (هورمزان)، لەسەر (پردی بازاڕی ئەهوان) راویان نانە ئەوبەر، هورمزان رای کرد بۆ (رام هورمز) و شاری ئەهوازی چۆڵ کرد. پاشان داوای ئاشتی کرد. موسوڵمانەکان رازی بوون. عومەریش زۆر دڵخوش بوو. بەڵام دوبارە پەیمانی شکاندەوە، ئەم جارە پشتیان بە کوردە (لوڕەکان) بەست و بە زۆر هێنانیە ژێر باری شەڕ! موسوڵمانەکان هێرشیان کرد. عومەر گومانی کرد کە هورمزان حەزی لە ئاشتی بێ و موسوڵمانەکان پەیمان بشکێنن! ترسا ستەم لە هورمزان کرابێ. بۆیە داوای لە ئەمیری کوفە کرد کە وەفدێکی (دە) کەسی لە ماقوڵانی کوفە بنێرێ بۆ لێکۆڵینەوە. ئەمیری کوفە (دە) کەسی بۆ نارد کە (ئەحنەف کوڕی قەیسی) تیا بوو، کە گەیشتنە (مەدینە) عومەر بە (ئەحنەف)ی وت:

تۆ لای من راست و بەرێز و پیاویت. پێم بڵێ ئایا (ئەهلی زیمە) ستەمیان لێ کراوە، وا پەیمانیان شکاند؟ یان شتی تر بوە.؟

ئەحنەف وتی:

نەخێر. بەڵکو زۆر چاك بوون لەگەڵیان، تۆ چۆنت حەز کردوە، ئاوا بوون لەگەڵیان.

عومەر وتی:

هەر چیت وت تەواوە! فەرموون بڕۆن بە دەم کارتانەوە.

ئەنجا عومەر نامەی نووسی بۆ هەرێمەکان:

(پەیمان شکێنی مەکەن، لە خوا بترسن، خۆتان بپارێزن، با غەدر و تاوانی خۆتان، خەڵکانی ترتان بەسەردا زاڵ نەکات.).

پاشان نامەیەکی بۆ سەعد و خەڵکی کوفە نارد ئەمە دەقەکەیەتی:

(اما بعد. فاني قد بعثت اليكم عمار بن ياسر اميرا، و عبدالله بن مسعود معلما و وزيرا، و هما من النجباء من اصحاب محمد من اهل بدر، فتعلموا منهما، و اقتدوا بهما، و اني قد اثرتكم بعبدالله على نفسي، وابعث عثمان بن

حنيف على السواد، و رزقتهم كل يوم شاة، فأجعل شطرها و بطنها لعمار بن ياسر والشطر الثاني بين هؤلاء الثلاثة.).[176]

پاشان هێرشیان کرده سەر شاری (سوس) و رزگاریان کرد، لەو شەڕەدا (شەهریار) برای (هورمزان) کوژرا، ئەنجا رویان کرده (تستر) که هورمزان لەوێ خۆی قایم کرد بوو، هورمزان نوێنەری نارد بۆ لای (یەزدگورد)ی پاشا له ئەصفەهان بۆ یارمەتی. ئەویش به چوار وەجبەدا و به چوار وەزیردا (٤٠) هەزاری بۆ نارد، هورمزانیش (٢٥) هەزاری پێ بوو، ئەمە هەمووی له شاری (تستر) کۆبونەوە.

ئێسته (سەعد) له ئەمیری کوفه عەزل کراو (عەماری کوڕی یاسر) کراوەته ئەمیری کوفه. عەمار (عەبدوڵڵا کوڕی مەسعود)ی کرده جێنشینی خۆی و به (شەش) هەزار چەکدارەوە چوو بۆ یارمەتی ئەبوموسای ئەشعەری له (تستر).

ئەبوموسا داوای یارمەتی تری کرد له (عومەر)، چونکه سوپای فارس یەکجار زۆر بوون، عومەر نامەی نووسی بۆ (حەلوان) که (جریر کوڕی عەبدوڵڵای بەجلی) فەرماندەی بوو، بچێت بۆ یارمەتی ئەبوموسا. (جریر) (عروەی کوڕی قەیسی بەجلی) ئامۆزای به هەزار کەسەوە له حلوان جێهێشت و خۆی به چوار هەزارەوە بەرەو شاری (تستر) کەوتەڕێ. سوپای کوفه به فەرماندەیی (نیعمان کوڕی موقرین) و، سوپای بەسره به فەرماندەیی (ئەبوموسا) و سوپای حەلوان به فەرماندەیی (جریر) که دەکاته (٢٠) هەزار کەس له دەشتی (تستر) هەڵیان دا. پێشەکی ئەبوموسا هەردوو فەرماندە (جەریر و نیعمان)ی به سوپاکانیانەوە نارد بۆ شاری (رامهورمز) و هەر زوو گرتیان و هاتنەوە بۆ لای (ئەبو موسا). پاش وت وێژ و ئەخشەیەك هەر هەموویان کەوتنەڕێ بۆ (تستر). هەر سێ سوپاکه گەمارۆیان دان. هەشتا هێرشیان کرد، موسوڵمانێکی زۆر کوژرا.

---

[176]. كنز العمال: ج٢ص٣١٤. رسائل الفاروق: عبداللطيف، ص٩٢ رسالة رقم ١٤٧.

پێش گیرانی شاری (تستر) وەفدێك لە ماقوڵانی خەڵكی فارس هاتن بۆ لای (ئەبوموسا) بۆ ڕێكەوتن. سەرۆكی وەفدەكە وتی: (ئێمە حەزمان لە ئاینەكەتانە، موسوڵمان دەبین بە مەرجێك كە لەگەڵتاندا جەنگ لەگەڵ عەجەمان بكەین. بەڵام جەنگی عەرەب ناكەین. ئەگەر عەرەبەكان جەنگیان لەگەڵ كردین، ئێوە مەهێڵن. كوێمان پێخۆش بێ لەوێ دەبین و، لای كێتانیشمان پێ باش بێ، لای ئەوەتان دەبین. باشترین بەشیشمان دەوێ. دەبێ گەورەكەتان ئەوەمان بۆ مۆر بكات.).

ئەبوموسا ڕازی نەبوو، وتی: (دەبێ ئێوەش وەكو ئێمە بن لە هەموو شتێكدا)، وتیان ڕازی نابین. ئەبوموسا نامەی بۆ عومەر نووسی، عومەر وەڵامی دایەوە وتی: (چیت لێ داوا دەكەن بیان دەرێ).

ڕێكەوتن و موسوڵمان بوون. بەشداری گەرم وگوڕی گەمارۆی شاری تستریان كرد.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئەوانەی موسوڵمان دەبن لە عەجەمەكان، لە بەرەی جەنگی موسوڵمانەكاندا شان بە شانیان دەجەنگن. چاكترین بەش دەبەنەوەو بەرزترین پلەوپایە وەردەگرن لە دەسەڵاتی ناوچەكانی خۆیاندا. ڕەنگە ئەمانە هەر ئەو كوردانە بوبن كە هورمزان بە زۆر هێنابوونی بۆ شەڕ. یان ڕەنگە ئەمانە كوردە لوڕەكانی باكووری ئەهواز بووبن، چونكە سنووری (كوردستانی گەورە) پێش ئیسلام لە ڕۆژهەڵاتی ئەهوازەوە بەرەو خوار چوو بوو بۆ نزیكی كەنداوی عەرەب!

خزری بەگ دەڵێت: (هورمزان بە دەست و پێوەند و زانا ئاینییەكانیەوە هاتنە دەرەوەی شار بۆ خۆنواندن، شەڕێكی خەست قەوما، فارسەكان شكان و كشانەوە ناو شار، خۆیان لە شووراو قەڵاكاندا قایم كرد. هورمزان لە زۆر جەنگی موسوڵمان و فارس دا بەشداری كردبوو، زۆر ڕقی لە موسوڵمانان بوو، لەم دواییەدا لە جەنگی جلولادا بە شكاوی هەڵهاتبوو، پێشتر برایەكیشی كوژرا بوو، كە داوای ئاشتی دەكات بۆ ئەوەیە پەنێك بە موسوڵمانەكان بدات، هەتا ئێستە پێنج جار داوای ئاشتی كردووە و جارێكیش موسوڵمان بووە بە

فیلّ. بزانین چی تر له هه‌گبه‌که‌یدایه. جاریّ تر هێرشی هێنایه‌وه بۆ ده‌ره‌وه‌ی شار، شه‌ڕێکی تر قه‌وما. ئه‌بوموسا به جۆره تاکتیکێکی تر سوپاکه‌ی ڕێکخسته‌وه، هه‌ندیّ مناوه‌شات و شه‌ڕه شیر و تیر و زۆرانبازی ڕووی دا. به‌ره‌ی جه‌نگی زۆر فراوان بوو، به‌شی هه‌مووی ده‌کرد، بڕیار درا که لای ڕاست و چه‌پ هێرش بکات، ده‌نگی الله اکبر و ته‌قه‌ی شمشێر و قه‌لّغان و هاژه‌ی تیر و ڕم و حیله‌ی ماین و شیعر و وتاری گه‌رم وگوڕ دنیای گرته‌وه، له لایه‌کی تره‌وه مه‌فره‌زه‌یه‌کی موسولّمانه‌کان دزه‌یان کرد، له کارێزێکی شاره‌وه به نهێنی چوونه ژووره‌وه‌ی شار، سه‌ر له به‌یانیه‌کی تاریك و ڕوون و ده‌نگی ته‌کبیر و تیر و بگره و به‌رده ناو شاری خرۆشان. سوپای فارس سه‌ریان لیّ شێوا، هورمزان له پشته‌وه به‌ره‌و قه‌لاّیه‌کی تر له دوری شاره‌وه ڕایان کرد. کوژراو و بریندار و ئه‌سیرێکی زۆریان جیّ هێشت.)[177]

## ده‌ستگیرکردنی هورمزان پاشا

ئیبن ئه‌عسه‌م ده‌لّێت: (بۆ شه‌ویّ پیاوێکی شاری هات و کونێکی له شاخه‌کانی پشتی شاره‌وه نیشان دان، که به‌سه‌ر شوراکانه‌وه ده‌چونه ناو شار، ڕیّ و جیّی چاکیان بۆ دانا، بۆ شه‌وی داهاتوو حه‌فتا که‌س خۆیان فیدا کرد و به نهێنی چوونه ژووره‌وه، هه‌تا پالّ ئه‌و ده‌رگایه‌ی که موسولّمانه‌کان خۆیان بۆ ئاماده کردبوو ڕۆیشتن، حه‌ره‌سه‌کانی دیوی ناوه‌وه‌یان کوشت و له شه‌ڕێکی خه‌ست دا زۆربه‌یان شه‌هید بوون، به‌لاّم چه‌ند دانه‌یه‌کیان توانیان ده‌رگای شوراکه بکه‌نه‌وه، موسولّمانه‌کان هێرشیان برده ناوه‌وه، ئه‌و چه‌ند فیداکاره‌ش بوون به ژێر پیّی لێشاوی ولاّخی سوپای ئیسلامه‌وه‌و شه‌هید بوون، هورمزان سه‌ری لیّ شێوا، به وانه‌ی که مابویه‌وه شاریان چۆلّ کرد و هه‌لّهاتن به‌ره‌و ئه‌و قه‌لاّیه‌ی که پێشتر له ده‌ره‌وه‌ی شار ئاماده‌ی کرد بوو، که‌س و کار و مالّ و مولّکی تیا حه‌شار دابوو، سوپای ئیسلام گه‌یشتنه سه‌ری و گه‌مارۆیان له‌سه‌ر توند کرد، که هورمزان زانی حیسابی ته‌واو بوه،

---

177. تأريخ الامم الاسلامية: محمد خضری به‌گ، ص۲۱۰.

ناردی بۆ لای ئەبوموسا کە دەیەوێت بیپارێزێ و بە سەلامەت و خۆی و خاوخێزان و دەست و پێوەندی بگەیەنێتە لای عومەر. ئەبو موسا رازی بوو، لەسەر ئەوە نووسراوێکی بۆ مۆر کرد.)[178]

خزری بەگ) دەڵێت: (هورمزان لەسەر قەڵاکەوە هاواری کردە موسوڵمانەکان: با رازی بین بە حوکمی عومەر، چیم پێ دەکات رازیم.

موسوڵمانەکان هێرشیان وەستاند، هورمزان تەسلیم بوو، شاری تستر و هەموو قەڵاو شوراکانی دەوروبەری پاك کرایەوە.).

ئیبن ئەعسەم دەڵێت: (لە رێ و رەسمێکدا خۆی و ماڵ و منداڵی و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لە قەڵاکان دابەزین، تەسلیم بوون، ناردنیان بۆ لای خەلیفە عومەر.).

خزری بەگ دەڵێت: (ئەبوموسا هورمزانی لەگەڵ ئەبوسبرە کوڕی ئەبی رهەم ی نوێنەری دا نارد بۆ لای عومەر.).

مسکویەی رازی دەڵێت: (ئەبوموسا وەفدێکی رێکخست بە سەرۆکایەتی ئەبوسبرە کوڕی ئەبی رهەم کە لە ناویاندا ئەنەسی کوڕی مالك و ئەحنەفی کوڕی قەیس هەبوو، ئەبیموسی هەتا شاری بەسرە لەگەڵیان بوو، پاشان ئەوانی تر رێکەوتن بەرەو مدینە.).[179]

شاری مەدینە هەواڵەکەیان زانی، هاتنە دەرەوەی شار بۆ سەیری هورمزان، هورمزان خۆی گۆڕی و جلە پاشا و ئاڵتون و تاجەکەی لەبەر کرد. هەمووی بریسکەی دەدایەوە لە ئاڵتون و یاقوت دا. هەر لە رێوە چون بۆ ماڵی عومەر، لە ماڵ نەبوو، هورمزان وتی:

ئەوە بۆ کێ دەگەڕێن.؟

وتیان: بۆ خەلیفە عومەر.

وتی: ئەی کەس نییە کاروباری ماڵی بۆ جێبەجێ بکات.؟

---

[178]. کتاب الفتوح: ابن اعثم الکوفي. ج٢ص٢٣.

[179]. تجارب الامم: ابوعلي مسکوية الرازي. ج١ص٢٣٠، طهران ١٩٨٧.

وتیان: بەڵێ. بەڵام خۆی وا ڕاهێناوە!

هورمزان سەری سوڕما.

وتیان: (لە مزگەوت دانیشتووە.) کەوتنەڕێ، لەوێ نەبوو، منداڵان یاریان دەکرد وتیان: (لە پشتی مزگەوتەوە خەوتوە.)

هورمزان وتی: ئەمە کێیە.؟

وتیان: خەلیفە عومەرە!

وتی: دادپەروەریت بڵاوکردەوە. ئەمین بووی لە میللەت. خەوتیت!

عومەر پێشتر لەگەڵ وەفدێکی (کوفە)دا دانیشتنی کردبوو لە پشتی مزگەوتەوە، کە لێ بووبوونەوە ڕاکشابوو خەوی لێکەوتبوو.

هورمزان وتی: ئەی کوا پاسەوان و پرسگە؟

وتیان: ئەوانەی نییە.

وتی: ڕەنگە پێغەمبەر بێت.؟

وتیان: نەخێر. بەڵام کاری پێغەمبەران دەکات.

ئەمان لەم قسانەدا بوون، عومەر خەبەری بویەوە، هەڵسایەوەو دانیشت، سەیری کردن و فەرمووی: هورمزانە.

وتیان: بەڵێ.

لە هورمزان و ئەوانەی لەگەڵیدا بوو ووردبویەوە، سڵاویان لێ کرد، وەڵامی دانەوە، پاشان وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئەمانەی کردۆتە دەسکەوتی موسڵمانان.[180]

پاشان وتی: پەنا بە خوا لە ئاگری دۆزەخ، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بە ئیسلام ئەمانە و کۆمەڵی ئەمانەی سەرشۆڕ کرد. ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان، دەست بگرن بەم ئاینەوە، لە ڕێی پێغەمبەرەکەتانەوە بڕۆن، دنیا نەتان خەڵەتێنێ، چونکە خەڵکی چاك غەڕا دەکات![181]

---

[180]. كتاب الفتوح. ج٢ص٢٤.

[181]. تجارب الامم: ابن مسكوية، ج١ص٢٣١.

ئەی عومەر، ئەمە پاشای ئەهوازە، قسەی لەگەڵدا بکە.

وتی: نەخێر، هەتا ئەوانەی لەبەریدایە دای نەکەنێ!

تاج و جلە حەریر و دیباج و ئاڵتونەکانی بەری داکەند و بەرگێکی سپی روت و سادەی لەبەر کرد.

ئیبن ئەعسەم دەڵێت: پاشان عومەر چوە مزگەوت و بانگی کرد.

هورمزانیان بۆ هێنا. پێی وت: ئەی هورمزان دەستی خوا چۆن دەبینی، کەچی پێ کردن.؟

هورمزان وەڵامی دایەوە: من یەکەم کەس نیم ئەم سەرشۆڕییەم بەسەردا هاتبێ. بەڵاو موسیبەت هەر تووشی پیاو دەبێت.

عومەر وتی: راست دەکەیت! بڵێ لا اله الا الله، محمد رسول الله.

هورمزان وتی: ئا بەم حاڵەوە نایڵێم.

عومەر وتی ئەت کوژم! هورمزان بە دەستی خۆی دوو سەحابەی کوشتووە. براو کوڕی مالك و مجزوە کوڕی سەور.

هورمزان زانی عومەر لێی توڕەیە ویستی فێڵێك بکات، قسەیەك لە عومەر دەربهێنێ نەیکوژێ. بۆیە وتی: تینومە. پێش ئەوەی بمکوژی ئاوم بدەنێ.

عومەر وتی: ئاوی بدەنێ.

لە جامێکی هەروا دا ئاویان بۆ هێنا، هورمزان وتی: لە شتی وادا نایخۆم. جامی ئاڵتونم بۆ بهێنن.

عومەر وتی: ئێمە ئاو لە ئاڵتوندا ناخۆین.

ئیمامی عەلی وتی: پەرداخێکی قەواریری بۆ بهێنن. وەك ئاڵتون وایە. بۆیان هێنا. ماوەیەك رای گرت.

عومەر وتی: بیخۆرەوە.

هورمزان وتی: دەترسم بمکوژی پێش ئەوەی بیخۆمەوە.

عومەر وتی: خوا وەکیل هەتا نەیخۆیتەوە ناتکوژم!

هورمزان ئەوەی دەویست. بۆیە هەتا توانی جامەکەی دا بە زەویدا و شکاو ئاوەکەی رژا.

عومەر وتی: ئەوە چیت کرد.؟

عەلی وتی: تۆ پەیمان و ئەمانت دایە و سوێندت بۆ خوارد کە هەتا نەیخواتەوە نەیکوژی، ئەوا نەیخواردەوە. کەواتە تۆ بۆت نیە بیکوژی. بەڵام جزیەی بخەرەسەر یا لە مەدینە بمێنێتەوە.

هورمزان وتی: من جزیەم لەسەر نیە. چونکە من پاشای کوڕی پاشام، بەڵام هاتومەتە ناو ئاینی ئیسلام و ئێستە زۆری کەسم بەسەرەوە نیە و بە ئارەزووی خۆم دەڵێم: اشهد ان لا اله الا الله و اشهد ان محمدا رسول الله.

هورمزان موسوڵمان بوو. هەرچیش لەگەڵی دا بوو موسوڵمان بوون، لە ماڵ و منداڵ و کەس و کارو دەست و پێوەند. عومەر ئازادی کردن و دڵخۆش بوو بە موسوڵمان بوونیان، تێکەڵی موسوڵمانان بوون.[182]

بەڵام (خزری بەگ)[183] و ئەبو عەلی مەسکویە رازی[184] جۆرێکی تری دەگێڕنەوە:

عومەر وتی: چۆن دەبینی ئەم غەدر و پەیمان شکێنیەی ئێوە کردتان و ، عاقبەتی کاری خوا، کە ئێمەی سەرخست.

هورمزان وتی: ئەی عومەر، ئێمەو ئێوە لە نەفامەیدا بوین. وەك بڵێی خوا وازی لە هەردوولامان هێنا بوو. ئەو کاتە بەهێز سەردەکەوێت کە ئێمە بووین. ئەو کاتە خوا لەگەڵ کەسمان نەبوو. بەڵام کە لەگەڵ ئێوەبوو، هەرچەند ئێمە بەهێز تر بووین. بەڵام ئەوەتا هەر ئێوە سەرکەوتن بەسەرماندا!.

عومەر وتی: ئێوە زاڵ بوون بەسەر ئێمەدا، چونکە ئێوە یەکیەتیتان هەبوو، ئێمە دووبەرەك و جیاواز و ناکۆك بوین!

لەگەڵ هورمزان وەفدێك هاتبوون، کە ئەحنەفیان لەگەڵ بوو. عومەر وتی: لەوانەیە موسڵمانەکان لەگەڵ ئەهلی زیممە خراپ بن، بۆیە ئەوانیش وازتان لێ ناهێنن.؟

---

[182]. كتاب الفتوح: ج٢ص٢٥

[183]. تأريخ الامم الاسلامية: محمد خضرى بەگ. ج١-٢ ص٢١٩، مصر ١٩٦٩.

[184]. تجارب الامم: ابن مسكوية، حقيقه الدكتور ابوالقاسم، ج١ص٢٣٢، طهران ١٩٨٧.

ئەحنەف وتی: ئێمە هیچمان نەکردووە جگە وەفا و چاکە.

عومەر وتی: ئەی بۆچی ئاوان.؟

ئەحنەف وتی: ئەی ئەمیری بڕواداران، تۆ بڕیارت داوە نەچینە سەریان، داوات لە ئێمە کردوە خۆمان بگرین لەوەی کە بە دەستمانەوەیە، بەڵام پاشای فارس زیندووە و لەبەردەمتاندایە لێی بپرسە. ڕێمان پێ دەگرن و خەڵکمان لێ هان دەدەن، هەتا پاشاکەیان بمێنێ وازمان لێ ناهێنن، دوو پاشا پێکەوە کۆنابنەوە، هەتا یەکیان یەکیان دەردەکەن، بەردەوام خەڵکمان لێ هان دەدەن، هەتا مۆڵەتمان دەدەیت بچینە وڵاتیان و لەسەر وڵاتی فارس لای بەرین و دەری بکەین و لە گەل و میللەتەکەی بکەین. ئەوسا فارسەکان وازی لێ دەهێنن.

عومەر وتی: ڕاست دەکەیت، سوێند بەخوا قسەی ڕاستت کرد و تێت گەیاندم.

هەر لەو کاتانە دابوو، هەواڵ هات کە فارسێکی زۆرو بێ ژمارە لە(نەهاوەند) کۆبونەتەوە. ئیتر عومەر مۆڵەتی دان بچنەوە وڵاتیان.

عومەر (ئەبوموسای ئەشعەری)[185] لەسەر ئەمیری بەسرە لابرد و (عوتبەی کوڕی غزوان)ی خستە جێی. ساڵی پڕنە کردەوە (عوتبە) داوای کرد لە عومەر مۆڵەتی بدات بچێتە (حەج) ئەویش ڕێگەی دا. کە حەجی تەواو کرد، عومەر عەزلی کردو لای برد. هەرچەندە عتبە حەزی کردو داوای کرد بیگێڕێتەوە بۆ سەرکاری (بەسرە) بەڵام عومەر رازی نەبوو، ناچار گەڕایەوە بۆ (بەتنی نەخلە) بۆ ناو کەس وکاری و زۆری نەبرد مرد. کە هەواڵ گەیشتە عومەر. چوو بۆ زیارەتی گۆڕەکەی و وتی: (ئەگەر ئەجەل نووسراوی خوا نەبوایە، من ئەم پیاوەم کوشتوە.). لای کەس و کاری وەسف و سەنایەکی زۆری عوتبەی کرد.

---

[185]. ئەبوموسای ئەشعەری: ژیانەکەی لە سەرچاوەکاندایە بە درێژی.

**پاشان (مغیرەی کوڕی شوعبە)ی خستە جێگەی. ئەمە ساڵی(١٨)ی کۆچی بوو.[186]**

**عومەر راوێژی بە دۆست و دوژمن دەکرد. گەنجی بانگ دەکرد و پرسی پێ دەکردن و رای لێ وەردەگرتن و دەیگوت: ئێوە بیرتان تیژە قسە بکەن.**

**تەنانەت کە (هورمزان) حاکمی ئەهواز لە مەدینە گیرا بوو، فارسەکان لە نەهاوەند کۆ بوبونەوە بۆ هێرش کردن هورمزانی بانگ کردو لە بارەی سێ جێگەوە پرسیاری لێ کردو رای وەرگرت هەتا هەڵوێستی سەربازی وڵاتی فارس بزانێ. بزانێ هەرێمی فارس و ئەسفەهان و ئازربایجان کامیان گرنگترە هێرشی بۆ بکەن، هورمزان وتی: (ئەسفەهان) سەرە، فارس و ئازربایجان دوو باڵەکەیە. دەست بکە بەسەر لە پێشەوە[187] عومەریش وای کرد و خۆی کۆکردەوە بۆ نەهاوەند کە سەر بە هەرێمی ئەسفەهانە!**

---

[186]. التأريخ الامم الاسلامية: خضری بەگ، ص٢٢٠.

[187]. رسائل الفاروق: ص٢٢١.

## جەنگی نەهاوەند ( فتح الفتوح )

### خۆئامادەکردنی فارس

جەنگی (نەهاوەند) لە ساڵی (٢١ك –٦٤١ز) دا روی دا. بە گەورەترین جەنگی مێژووی ئیسلام دەژمێردرێت، کلیلی سەرکەوتن و حەسم کردنی هەموو جەنگ و سەرکەوتنەکان بوو. تەواوی ماشێنی جەنگی و سەربازی فارس تێك شکا. دوای نەهاوەند فارس تواناى کۆکردنەوە و بەرەنگاری رێك و پێکیان نەما. یەکیەتیان هەڵوەشایەوە، راکانیان جیاواز بوو. پەرت و بڵاو بوون، گوێ رایەڵیان بۆ یەك سەرکردایەتی نەما، دوای نەهاوەند، هەر ئەمیر و پاشایەك بۆ خۆی جەنگی دەکرد، تەنها بە تەنها دیفاعیان لە کورسی و ناوچە و هەرێمی خۆیان دەکرد، هەیان بوو شەڕی دەکرد و، هەیان بوو بە ئاشتی رێك دەکەوتن. هەر بۆیە، لەبەر ئەم هۆیانە، جەنگی نەهاوەند ناونرا(فتح الفتوح).[188]

نەهاوەند شارێکە دەکەوێتە لای قیبلەی شاری (هەمەدان)، بە کۆنترین شاری هەرێمی چیا دەژمێردرێت.

. دوای ئەوەی کە سوپای ئیسلام، ئەهوازو شارەکانی هەرێمی فارسیان گرت، سەرکردە فارسەکان لە شاری (مروە)وە لە خۆراسانەوە کەوتنە نامە نووسین و هەواڵ گۆڕینەوە بۆ بەردەوام بوون لەسەر شەڕ، یەزدگوردیش لای خۆیەوە لە (بارەگای گشتی سەرکردایەتی) لە شاری ئەسفەهانەوە نامەی نووسی بۆ پاشایانی (باب، سەند، خوراسان، حەلوان) کە ئامادەبن و بچن بۆ (نەهاوەند) و لەوێوە شاڵاو ببەنە سەر دوژمن.[189]

بەڵام سالح قەفتان دەڵێت: (یەزگوردی سێیەم شای کلۆڵی ئێران بە تەمای گەلەکەی بوو کە تەخت و تاجەکەی بۆ بسێننەوە، ماوەیەکی باش بە کیشوەری ئێران دا سوڕایەوە، بە چاوی فرمێسك و گریانەوە چوەتە لای هۆزە

---

[188] . فاروق عمر: طبيعة الدعوة الاسلامية، بيروت ١٩٧٠. (مجلة المجمع العلمي العراقي).

[189] . مێژووی حەسەنوەیهی و عەیاری، ل١٥٨.

فارسەکان، سکاڵای لا کردون، پاشان روی کردوەتە خێڵە کوردەکان، هاواری بۆ بردون، بە گریانەوە باسی ئابڕوچونی نەتەوەی ئاری تێکەیاندون، هەتا بزاوتونی و هۆشی هێناوەتەوە بە بەر ئێرانیەکاندا، ئەوانیش لەشکرێکی نوێی قورسیان بۆ پێکەوە ناوە، بەڵام هەمویان توانای جەنگیان نەمابوو، بە فەسادی ئیداری شیرازەی یەکیەتیان هەڵوەشابوو، بەرامبەر بە دوژمنی خاوەن عەزم گیانیان تیا نەما بوو، لەبەرئەوە هەرچەندە یەزدگورد لەشکرێکی موناسبی بەم هەوڵ و تەقەلایە کۆکردەوە، بەڵام لەشکرێك بە هاوار و تکا کۆکرابێتەوە، خۆی پێ ناگیرێ، ساڵی٦٤٢ی زاین لە شەڕێکی مەردانەی قورس دا خۆی پێ نەگیرا و شکستی خواردو، ئەوەی ئەوشیروان پاشای بەدبەختیان یەزدگورد لە مەیدانی شەڕدا بە تەمای مەرحەمەتی دوژمن بە جێ هێشتوە.)[190]

رۆژبەیانی دەڵێت: (ساڵی ١٩ك –٦٤٠ز پاش ئەوەی یەزگورد لە حەلوان بە هەڵهاتن دەرچوو، لەگەڵ خەڵکی رەی، قومس، ئەسفەهان، هەمەدان، ماهێن – واتە دینەوەر و نەهاوەند – نامەیان گۆڕیەوە و خۆیان خستە ژێر چەك و بونە سەربازی یەزدگورد، ئەویش مەردان شای بروزلی کردە سەرداریان، ئاڵای (درەخشی کاویانی) کە خۆی بە فیڵ دروستی کردبوو، چونکە (ئاڵاکەی کاوە) لە جەنگی قادسیەدا کەوتە دەستی موسوڵمانەکان.

عەجەمەکان جوڵان بەرەو خاکی نەهاوەند، نامە گۆڕینەوەیەکی چڕوپڕ بوو لە نێوان سەرکردەکاندا، کە لە نەهاوەند کۆببنەوە. لە ماوەیەکدا (١٥٠) هەزار کەس ئامادە بوون. لەوانە (٢٠) هەزاری خەڵکی (ساوە و هەمەدان) بوو، (١٠) هەزاری خەڵکی (نەهاوەند)، (٤٠) هەزاری هەرێمی (فارس و کرمان)، (٣٠) هەزاری (ئازربایجان)، (٢٠) هەزاری لە (رەی و سمنان و دامغان)، (٢٠) هەزاری ئەسفەهان، (١٠) هەزاری (قوم وکاشان)، ئەوەی جێ سەرنجە ئەوەیە کە لە هیچ کام لە نەفیر و داواکاری و نامەکانی یەزدگورد و سەرکردە

---

[190]. مێژووی نەتەوەی کورد: صالح قەفتان، ل١٦٨، بغداد١٩٦٩. مطبعة سلمان الاعظمي.

فارسەکان دا داوا لە خەڵکی شارەزوور و هەرێمی چیا (کوردستان) و هەرێمی جزیرە نەکراوە کە بە مەرجێ کوردستان ئەو کاتە ئەو سێ هەرێمە بوە. وا دیارە راپەڕینەکەی شارەزوور کاری خۆی کردوە و مەجالی نەهێشتوەتەوە بۆ یەزدگورد و سەرکردەکانی کە بنێرێ بە شوێنیاندا و زۆریان لێ بکات و لەو کۆڕوکۆبونەوەیەی نەهاوەنددا بەشداریان پێ بکات. یاخود ناردویەتی بە شوێنیاندا و، نەهاتون بە دەمیەوە، هەر بۆیە ناویان لە لیستەکانی سەرەوەدا نیە.

بەڵێ. ئەو کۆڕوکۆبونەوەیەی نەهاوەند (١٥٠) هەزار کەس بوون، لە سوارە و پیادە و دەست و پێوەند و ماقوڵان و وەزیرو گزیر و زانا ئاینیەکان و پاڵەوان و سەرکردەی سوپای هەموو هەرێم و ناوچەکانی پاشماوەی ئیمپراتۆریەتی ساسانی فارس. جگە لەوەی فیلێکی زۆرو فیڵ و تاکتیکی گەورەو بێ وێنەیان هێنابوو.

یەزدگوردی پاشای فارس لە ئەسفەهانەوە هات بۆ سەیری سوپاکەی و بەرەی جەنگی نەهاوەند. هەموو سەرکردەو سوپاکانی کۆکردەوە و وتارێکی گرنگی بۆ خوێندنەوە و گەڕایەوە بارەگای سەرکردایەتی خۆی لە ئەسفەهان، لە وتارەکەی دا وتی: (خۆتان دەزانن، ئەو پاشایەی کە کتێبەکەی بۆ عەرەبەکان هێناوە مرد – واتە پێغەمبەری ئیسلام – دوای ئەو یەکێکی تر بو بە پاشایان ناوی ئەبوبەکر بوو، کەم ژیاو مرد، پاشان عومەر هات، ئەم تەمەنی درێژ بوو، دەسەڵاتی فراوان بوو، ئەوەتە ئێوە لە هەموو ناوچەکانی ئیمپراتۆرەوە بۆی کۆبونەتەوە، لە هەموو چین و گەل و کەسێکتان تیایە جگە لەوانەی کە لە نیشانەپێکاندا ئازاو لێ زان بوون، شمشێریان کاریگەر بوو، وەك قەڵغان وا بون و شیر و رمیان دەگێڕایەوە. مەبەستی لەوە بوو هەموو گەلێك ئامادەن و بەشدارن جگە کوردە ئازاکان.[191] پاشان دەڵێت: دە وەرن با ئەو سوپا عەرەبیەی کە لێمانەوە نزیکە لە ناوی بەرین و بچینە وڵاتیان و ماڵەکانیان و، لەوێش هەڵیان کەنین و لە رەگ وریشە دەریان بهێنین. ئەگەر وا نەکەین، ئەوا دین و ئێرەشمان لێ دەسێنن، لە وڵاتی خۆمان دەرمان دەکەن،

سەرشۆڕ و نزممان دەکەن، هەر وەك پێیان کردین لە قادسیە و مەدائن و جلولا و ئەهواز. دا)[192]

هەر لەوێ دا بە هەموو سەرکردەو ماقولان و سەرۆکی هەرێمەکانی مۆر کردو پەیمانی پێ پڕکردنەوە کە رانەکەن و دژایەتی موسوڵمانەکان بکەن.

**هەڵوێستی سەرکردەکانی ئیسلام**

ئیبن ئەعسەم دەڵێت: ئەم هەواڵە گەیشتە (عەممار کوڕی یاسر) ئەمیری کوفە[193] بەڵام تەبەری[194] و ئیبن ئەسیر[195] دەڵێن: لەم کاتەدا ئەمیری کوفە سەعد بوو!

راستیەکەی لای ئیبن ئەعسەمە، هەر لە جەنگی پێشودا (ئەهواز)، سەعد عەزل کرا.

واتە: روداوی نەهاوەند لە نێوان عەزل کردنی سەعد و دەست بە کاربوونی (عەممار) دا بوو.

عەممار کە سەرکردەیەکی تازەیە لە هەڵوێستی وا گەورەدا، فەرماندەکانی دەوروپشتی کۆکردەوە و وتی: بە رای ئێوە چی بکەین.؟

وتیان: چاك وایە هەواڵ بدەینە خەلیفە عومەر لە تەواوی کۆبونەوەو مەبەستی فارسەکان ئاگادار بکەین، پێش ئەوەی بکەونە رێ بەرەو لامان.

عەممار نامەی بەم جۆرە نووسی: (... ئەوەی کە روی داوە ئەی ئەمیری بڕواداران ئەوەیە، کە خەڵکی رەی و سمنان و ساوە و هەمەدان و نەهاوەند و ئەسفەهان و قوم و کاشان و راوەند وفارس و کرمان و ئازربایجان.لە خاکی نەهاوەند کۆبونەتەوە بە١٥٠ هەزار کەسەوە، چوار پاشای عەجەم سەرکردایەتیان دەکات کە ئەمانەن:خرزاد کوڕی هورمز، سنفاد کوڕی حەشر، خهانین کوڕی فیروز، شرومیان کوڕی ئەسفەندیار.)[196]

بەلازەری دەڵێت: (مردان شاە سەرپەرشتی هەموو سوپاکان دەکات).[197]

---

[192]. تأريخ الطبري: الامام الطبري، ج٤ص٨٩.

[193]. كتاب الفتوح: ابن اعثم الكوفي، ج٢ص٣٣.

بەڵام ئیبن ئەسیر دەڵێت: (فیروزان سەرپەرشتیان دەکات.)[198]

ڕەنگە هەر یەك ناوبن بەم جۆرە: فیروزان مردان شاه.

لە جێیەکی تری نامەکەی عەمماردا دەڵێت: (ئەو فارسانە بڕیاریان داوەو، پەیمانیان مۆر کردوە و یەکیان گرتوە کە دەرمان بکەن لە خاکەکانماندا و، پاشان دوامان بکەون، ئەوانە کۆمەڵێکی توڕە و کۆن و بە ئێش و ئازار و خاوەن وڵاخی چاك و زۆر بەهێز و چەکێکی قورس و تەلی دڕکاویان ئامادەکردووە. بەڵام دەستی خوا لە سەروی دەستی ئەوانەوەیە، وە ئاگادار بە کە هەرچی سەر بە ئێمەیە و لە شارەکانی نزیکی ئەوانە گرتویانە و کوشتویانە، هاتون و لێمان نزیك بونەتەوە. بڕیاریان داوە بەرەو مەدائن بێن، پاشان بچنە کوفە . ئەمە موسوڵمانانی ترساندوە، هەر بۆیە وا نامەم بۆ نووسیت، هەتا ڕێمان نیشان بدەیت. والسلام)

کە نامە گەیشتە عومەر، خوێندیەوە، ڕاچڵەکی و تێك چوو، ئەوانەی دەوروبەری هەستیان پێ کرد. هەڵساو چوە مزگەوت و هاواری کرد: (کوان کۆچەری‌و پشتیوانەکان، ڕەحمەتتان لێ بێت کۆببنەوە. یارمەتیم بدەن، خوا یارمەتیتان بدات.) لە هەموو لایەکەوە خەڵکی بە دەم هاواری عومەرەوە هاتن، کۆبونەوە. عومەر چوە سەر مینبەری پێغەمبەر ﷺ و بە پێوە وەستا، لە توڕەییدا بزیسکەی دەدا، لە ڕقی فارس، دەستی پێ کرد: (. ئەمڕۆ ڕۆژی غەم و پەژارەیە، گوێ بگرن بزانن چیم بۆ هاتوە لە عێراقەوە.) وتیان چیە ئەی ئەمیری بڕواداران!

وتی: (فارسەکان بە هەموو گەل‌و ناو و پاشا و ئارەزویەکیانەوە، شەیتان دنەی داون و فوی پیا کردون و کۆی کردونەتەوە لە دژمان، لە خاکی خۆیان کێیان لە ئێمە ناسیوە کوشتویانە بە ئەسیر و خەڵکەوە. ئەمە نامەی عەممار کوڕی یاسرە لە کوفەوە، هەواڵی پێ داوم کە لە نەهاوەند ١٥٠ هەزار فارس

---

196. كتاب الفتوح: ابن اعثم، ج٢ص٣٢.

[197] . فتوح البلدان: بلاذري، ص٣١٠.

کۆبونەتەوە و نیازیانە بێنە حەلوان و خانەقین و جلولا، نیەتیانە بگەنە مەدائن و کوفە، ئەگەر بگەنە ئەوێ، ئەوا بەلایەکی گەورە بەسەر ئیسلامدا دەڕژێ. رەحمەتتان لێ بێت قسە بکەن. من رایەکم هەیە جارێ نایڵێم، حەز دەکەم بە مشورەت بێت، چونکە ئێوەش شەریکمن لە چاك و خراپەدا.)

تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا وتی:(خۆت پیاوێکی ژیر و خاوەن ئەزمونی، هەرچی بڵێیت لە خۆتەوە نیە، بڵێ با بیکەین، بارمان کە با بڕۆین.)

زوبیر کوڕی عەوام وتی:(تۆ سەربەرزی ئاینیت.خوا تەمەن درێژت بکات بۆ موسوڵمانان، تۆ بیرت تیژە، ئێمە لەبەر دەستتاین چی باشە بیکە) عومەر وتی: (جگە ئەم دوو رایەم دەوێت.)

عەبدوڕڕەحمان کوڕی عەوفی زوهری وتی: (هەر کەس بە رای خۆی قسە دەکات، تۆ لە هەموومان باشتری، فەرموو بڕۆ و ئێمەش لە دواتەوەین.) عومەر وتی:

رایەکی تر. عوسمان بۆ قسە ناکەیت!، عوسمان وتی: خۆت دەزانی ئێمە لە لێواری ئاگردا بوین، خوا بە پێغەمبەر رزگاری کردین. ئێستەش تۆ بڕۆ بۆیان بە هەموو کۆچەری‌و پشتیوانەوە، هەتا لە رەگیان دەربهێنین و میکرۆبەکەیان بکوژین.

عومەر وتی: چۆن من دەربچم لە مەدینە، کە سوارە و پیادەی تیا نەماوە، خەڵکی لە هەموو پارچەکاندا بلاوەیان کردوە، عوسمان وتی: راست دەکەیت، دەڵێم بنووسە بۆ خەڵکی یەمەن و مەککە و میسر و بەسرە و کوفە، با هەموو ئامادەبن و ببنە سوپایەکی مەزن و زۆر گەورە، بە هەموو شت لە دوژمن بدەین.

عومەر وتی: ئەوەش رایەکە بە دڵ وەرناگیری. رایەکی ترم دەوێ. هەموو بێدەنگ بوون، عومەر لای کردەوە بەلای (عەلی) دا و وتی: ئەی تۆ بۆ قسەیەك ناکەیت.

عەلی وتی: ئەوەی ڕای وت لێت وەرنەگرتن، دڵت هیچی بە دڵ نەبوو، چونکە هەر کەس بە توانای عەقڵی خۆی قسەی کرد. منیش رایەکم هەیە،

دەڵێم: ئەگەر بنووسی بۆ شام بە سوپاوە بێن، ئەوا هەرقل هەرچی گاور هەیە کۆی دەکاتەوەو دێت و هەموو مزگەوتەکانمان دەڕوخێنێ و هەرچی پیاومان هەیە دەیکوژن و ژنانمان دەبەن. ئەگەر خەڵکی یەمەن بێن، حەبەشیەکان دێنە سەرمان. ئەگەر خەڵکی مەککە و مەدینەش بچن بۆ بەسرە و کوفە، ئەوا ئەم ناوە بە چۆڵی جێ دەهێڵن بۆ هەموو خراپەیەك، کە ئێرە گرنگترە لەوەی بۆی دەچیت. ئەوسا موسوڵمانەکان نە ئەشکەوتیان هەیە پەنای بۆ بەرن و، نە پەناگایەکیان هەیە دڵدەیان بدات، دوای خۆت هیچ کەسێك نابێت بۆی بگەڕێنەوە، کە هەر خۆت غایە و پەناگا و ترسێنەری، تۆ لە مەدینە بمێنەرەوە، تیا نەجوڵێی، ئەمەت بە هەیبەت ترە بۆ دوژمن و ترسناك ترە بۆ دڵیان. ئەگەر خۆت بڕۆیت دەڵێن پاشای موسوڵمانان لەبەر بێ سەربازی خۆی هات. لە جێی خۆت بمێنەرەوە کێ دەنێری بنێرە.

عومەر وتی ئەی چی بکەین، ئەوەتە عەجەم هەموو هاتون و دەیانەوێ لە رەگمان دەربهێنن.

عەلی وتی: فێڵێ هەر ئەوەیە، پیاوێکی بە شیددەت و توند و ئازایان بۆ بنێری کە خۆت سەربازەکانت باشتر دەناسی، پشت بە خوا ببەستە و داوای سەرکەوتن لەو بکە، یارمەتی و کۆمەکی ئەو لە کۆمەڵێکی زۆر باشترە. عومەر وتی: باشترین رات وت. بەڵام حەز دەکەم خەڵکی کوفە و بەسرە خۆیان سەرپشکی ئەو شەڕە بکەم. چونکە فێری بون و چاکی لێ دەزانن!

عەلی وتی: ئەگەر راکەی منت بە دڵ بوو، ئەوا بنێرە بۆ (بنکەی بەسرە) با ببنە سێ بەش، بەشێکیان لە بەسرە بمێنێ بۆ پاراستنی ماڵ و منداڵ و شار، بەشێکی‌تر مزگەوتەکان ئاوەدان بکەنەوە بە بانگ و نوێژ و دوعا، بەشی سێیەم با بچن بۆ یارمەتی خەڵکی کوفە، کوفەش وەك بەسرە لێ بکە و دابەشی بکە، ئەوسا بچن بۆ دوژمن.

عومەر بە خەڵکەکەی وت: (ئا ئەوەیە راو بۆچوونی تەواو، سوێند بە خوا منیش هەر ئەو رایەم هەبوو). پاشان وتی: (ئەی عەلی هەر خۆت کەسێك

دەست نیشان بکە بۆ سەرکردایەتی ئەو جەنگە، کەسێك کە چاك بێت بۆ گیانی فارسەکان.)

عەلی وتی: (نیعمان کوڕی موقرنی موزنی.)

عومەر وتی: پێکات ئەی باوکی حەسەن.[199]

## عومەر چۆن سەرکردەی شیاو دەست نیشان دەکات؟

لە جێیەکی تردا ئاوا هاتووە:

عومەر وتی: (کەسێکم بۆ دیاری بکەن بیکەمە فەرماندەی ئەو سوپایە بە مەرجێ عێراقی بێت.).

مەبەستی لەوەیە یان خەڵکی عێراق بێت، یان سەر بە بنکەی سەربازی (کوفە) بێت.

وتیان: تۆ خۆت سەربازی خۆت باشتر دەناسی.

وتی: (واللـه لأولين اميرهم رجلا، يكون أول الأسنة اذا لقيها غداً هو النعمان بن المقرن.).

وتیان: بۆ ئەوە چاکە، هەر بۆ ئەوە تاشراوە.[200]

پێشتر کە سەعد ئەمیری کوفە بوو، نیعمانی کردبوە جابی و باجگر بەسەر خەڵکی (کسکر)ەوە[201] بەڵام نیعمان بەو کارە رازی نەبوو کە دەستی لە پارە کۆکردنەوە دابێ. رقی لە ئیشەکەی بوو، هەر بۆیە نامەیەکی بۆ عومەر نووسی کە لای بەرێت لەسەر ئەو کارە و نووسیبوی: (حەز دەکەم ببمە مجاهد و تێکۆشەری دینی خوا و، پێم خۆشە لەناو تەپوتۆزی تێکۆشان دابم " نەك کۆکەرەوەی پارەو باج.)

پاشان عومەر نامەیەکی بۆ سەعد نووسی کە هەتا ئەو کاتە لەسەر کارەکانی نەچوبوو: (ان النعمان كتب اليَّ بذكر انك استعملته على جباية

---

199. كتاب الفتوح. ج٢ص٤٠.

200. الكامل في التأريخ: ج٣ص٣

201. معجم البلدان: ياقوت حموي، ج٧ص٢٥ دەڵێ..

الخراج، وانه قد كره ذالك ورغب فى الجهاد، فابعث به الى أهم وجوهك الى نهاوند.)[202]يان رەنگە زوتر ئەم نامەیەی بۆ نووسیبێ.

نامەیەکیشی بۆ نیعمانی کوڕی موقرنی موزنی نووسی لە (کسکر) بەم جۆرە: (نامەی خەڵکی کوفەم پێ گەیشت و خوێندمەوە و هەڵم سەنگاند و حاڵی بووم لە کاری فارس و، زانیم کە دەستی خوا لە سەروی دەستی ئەوانەوەیە. خوا سەربازی فریشتەیان بۆ دەنێرێ کە بدات لە پێش و پاشیان، ترس بخاتە دڵیانەوەو قاچیان زەلزەلە پێ بکات، هەتا لە ناویان دەبات، تۆ بچۆ بۆ کۆشکی سپی لە مەدائن و سەربازگە دروست بکە، هەتا سەربازانی کوفە و بەسرە لات کۆدەبنەوە. کە هاتن و کاری رێکخستنی خۆت تەواو کرد، بکەوە رێ بۆ جەنگی دوژمنانی خوا لە نەهاوەند، تۆم کردوە بە سەرکردەی ئەو سوپایە، چاك دەزانم کە خوا سەرت دەخات و، دوژمنت سەرشۆڕ دەکات، چونکە خۆی پەیمانی پێ داوین واخرى لم تقدروا عليها قد احاط الله بها.[203] مەبەست لەوانە فارس و رۆمن. تۆش بڕوات بە پەیمانی خوا بەهێز بێت، ئەو لە پەیمان لانادات، گوێ بگرە ئەی نیعمان. ئەگەر گەیشتن بە دوژمن، با سەبرو ئارامی و خۆگری لە پێشتانەوە بێت، چونکە خوا مژدەی بە خۆڕاگران داوە بەبێ حیساب، جگە لەوەی کە عاقیبەت بۆ موتەقینە. کەواتە بکەونە رێ لەسەر بەرەکەتی خوا، منیش بە خواتان دەسپێرم، ئەو خوایەی کە سپاردە زایە ناکات و، سەلام و رەحمەت و بەرەکەتی خواتان لێ بێت.).

عومەر نامەیەکی زۆری بۆ هەموو ناوچە و هەرێمەکانی وڵات نارد و ئاگاداری کردن. نامەی بۆ بنکەی بەسرە و کوفە نووسی کە کاری خۆیان بکەن. نامەی نووسی بۆ فەرماندەکانی ناوچەی ئەهواز، کە فارسەکانی ئەو ناوچانە سەرقاڵ بکەن و ئەو رێگایانە بگرن کە سوپای لێوە دەنێرن بۆ نەهاوەند، هەتا یارمەتی فارسی ناوچەکە نەگاتە نەهاوەند.[204] پاشان نامەی

---

[202]. رسائل الفاروق. رسالة رقم١٤٤ ص٩١.

[203]. القرآن الكريم: سورة رقم ٤٨ الآية رقم ٤١.

[204]. قادة فتح العراق والجزيرة: اللواء الركن محمود شيت خطاب، ص١٠٣.

نووسی بۆ ئەبوموسا لە بەسرە و، بۆ ئەهلی کوفە، کە یەکی سێ یەکی هێزەکانیان بنێرن. نیعمانی کوڕی موقرن گەیشتە کۆشکی سپی لە (مەدائن)، هەر زووبەزوو سوپای کوفە و بەسرە یارمەتی پێ گەیشت، چەکی دابەش کردو سوپای ڕێکخست و ژماردنی، هەمووی بریتی بوو لە (۳۰) هەزار کەس.

ئەنجا عومەر نامەیەکی تری بۆ نووسی بەم جۆرە: (. بگەنە نەهاوەند بە کاری خوا، بە پشتی خوا بە سەرکەوتنی خوا، بە خۆت و ئەوانەی لەگەڵتدان، مەیان دە لە چاڵ و چۆڵ، ئەزیەتیان مەدە، مافیان مەفەوتێنە، مەیان دە لەچەم و چوخوڕ و قوڕ و لیتە و نشێو، چونکە یەك موسوڵمانم لە سەد هەزار دینار خۆشتر دەوێ.)[205]

## بەرەو نەهاوەند

نیعمان سوپاکەی دابەش کرد، (تەلیحەی کوڕی خویلدی ئەسەدی) بە چوار هەزار ماین سوارەوە کرد بە پێشەنگ و، پێش سوپاکەی خست و ناردی بۆ هەواڵ زانین.[206] جگە لەوە (نیعمان) بە چواردەوری سوپاکە و ڕیگەی ڕۆیشتن و بەرە جەنگیەکەدا سریە و کەمینی تری بڵاوکردەوە بۆ هێنان و کۆکردنەوەی هەواڵی دوژمن. بۆی دەرکەوت هەر لە (حەلوان) هەتا (نەهاوەند) هێزی دامەزراو و تایبەتی وای تیانیە کە شایانی هەڵوێست لێ وەرگرتن بێت.

بە دوای ئەواندا نیعمان پێش کەوت، لای ڕاستی دایە (ئەشعەسی کوڕی قەیس)، لای چەپی دایە (موغیرە کوڕی شوعبە). گەیشتنە جلولا، پاشان حەلوان ، سەنگەریان گرت، چونکە هەواڵیان زانی کە سوپایەکی (دە) هەزار کەسی فارس بە فەرماندەیی (شادوە کوڕی ئازاد مەرد) خۆیان دامەزراندوە. کە هەواڵی گەیشتنی سوپای ئیسلامی زانی، بەپەلە خۆیان کۆکردەوە و کشانەوە بۆ شاری قرماسین (کرماشان)[207]. سوپای ئیسلام ماوەیەك لە

---

[205]. فتوح البلدان: بلاذري، ص۳۰۰. طبري: ج٤ص۲۳۲. الکامل: ابن اثیر، ج۳ص٤.

[206]. کتاب الفتوح: ابن اعثم، ج۲ص٤۳.

[207]. معجم البلدان: یاقوت حموي، ج۷ص٦۳، کرماشان (قرماسین): مەبەست لە (قرماسین) کرماشانە. کە لە بنەڕەتدا (کرماژن — کرمژن) بوو، پاشان بوەتە کرماژان، کرماجان، کرماشان. فارسەکان کە

حەلوان مانەوە و حەوانەوە، ئەنجا نیعمان بانگی کردە (قەیس کوڕی هیبرەی مورادی) و وتی (تەلیحە) لە کوفەوە بۆ حەلوان پێشەنگ و چاوی سوپا بوە، دەمەوێ تۆیش لێرەوە بۆ (قرماسین) پێشەنگ بیت. چوار هەزار سوارەکەی ئەوی وەرگرت و، نیعمان چوار هەزار سوارەی تری دایە کە لە بەهێزترین سوپاکانی ئیسلام بوو. بەمە ژمارەی سوپای پێشەنگ بویە (هەشت) هەزار ماین سوار.(قەیس) گەیشتە (قرماسین).

ئێستە دوو سەرکردەی گەورەی فارس لەوێن و یەکی (دە) هەزار سەربازی فارسیان پێیە، یەکەم: شادوە کوڕی ئازاد مەرد کە لە حەلوان هەڵهات، دووەم: مهرویە کوڕی خسروان. بە هەردوکیانەوە (بیست) هەزار چەکداریان لە کرماشان (قرماسین) مۆڵ داوە.

هەر کە زانیان سوارەی ئیسلام بەرەو قرماسین بەڕێوەن پاشەوپاش کشانەوە بۆ (مازران). موسەڵمانەکان بەبێ شەڕ چونە (قرماسین)، کە شوێنی هاوینە هەواری پاشایانی ساسانی بوو، یادگار و نوسراوەکانیان بە شاخی بێستونەوە هەتا ئەمڕۆش ماوە. پێش و پاشی سوپای ئیسلام لە (کرماشان) قرماسین کۆبونەوە و یەکیان گرت و خۆیان کردەوە بۆ حەوانەوە. (نیعمان) نایەوێ سوپاکەی زۆر ماندو بکات و لەڕێی راستیش لای نەدان و هەروەك سەیرانێکی دەهێنایە پێش چاویان، ئەمەش لەبەر نامەکەی عومەر کە فەرموبوی ماندویان مەکە و لە قوڕ و لیتەیان مەدە.

ئەم هەواڵە گەیشتە ئەو (١٥٠) هەزار سەربازەی فارس لە نەهاوەند، ترس و لەرزو حەشۆکە پەشۆکاوی روی لە ریزو دڵی سوپای فارس کرد، (١٥٠) هەزار دامەزراون و سەنگەریان گرتوە و دەترسن ، بەڵام (٣٠) هەزار بە عەزم و ئیرادە و هێزەوە، بەدەم زیکرو ویردو نوێژ و بڕوا بە خوا، بڕوا بە خۆو بڕوا بە سەرکردایەتیان لە پێشڕەوی دان بۆیان.

---

بەردەوام ناوە کوردیەیەکانیان گۆڕیوە، کردویانەتە (کرمانشاه) و بەر لە ساڵی ٥٠٠ك کرمانشاه لە (الکامل والمنتظم) دا بەکارنەهاتوە.

ئا لێرەدا ئەو فەرمودەیەم کەوتەوە بیر کە پێغەمبەری پێشەواو سەرکردەمان دەفەرموێت[208]: پێنج شتم پێ دراوە بە هیچ کەسێکی تری پێش خۆم نەدراوە. یەك مانگە ڕێ لە دوژمنەوە دووربیم دوژمن دەتۆقێ و دەترسێ. دەسکەوتی جەنگی(الغنائم)م بۆ حەڵاڵ بوە کە پێش خۆم بۆ کەس حەڵاڵ نەبووە. واتە ئەگەر یەك مانگە ڕێ لە دوژمنەوە دووربم، ترس و لەرزو شپرزەیی روو دەکاتە دڵو دەرون و ریزەکانیان.

ئەم هەواڵە گەیشتە نەهاوەند، بە پەلە هەموو سەرکردەو فەرماندەو ماقوڵان کۆبونەوە، سوێندیان خوارد و پەیمانیان تازە کردەوە کە هەرگیز ڕا نەکەن، هەتا دوا موسوڵمان لەناو دەبەن.

سوپای ئیسلام گەیشتە (مردان) یان (مەردومان) و تیا دامەزرا. دوو کەس (بەکیر کوڕی شەداخ) و (تەلیحەی کوڕی خویلدی)ی نارد بۆ نزیکی نەهاوەند بۆ چاودێری و پەیداکردنی هەواڵ و شوێن و حەجمی فارسەکان. هەواڵی چاکیان هێنایەوە. پاشان سوپا کەوتە ڕێ بەرەو نەهاوەند. فارسەکان ئاویان بەر دابویە ئەو دەشت و ڕێگەوبانە، هەتا زەوی بشڵەقێ و قوڕو لیتە ڕێ لە موسوڵمانەکان بگرێت، - هەر وەك وەسیەتەکەی حەزرەتی عومەریان بیستبێ - موسوڵمانەکان ئەو لیتە و قوڕەیان بڕی، دڕك و سیمی دڕکاوی و تەختەی بزماراوی‌و تەلاوییان لەو ڕێگەو بانەدا بڵاوکردبویەوە، سنوری سەنگەرەکانی خۆیانیان بە تەلێکی فراوان داوچێن کرد بوو، جگە لای خۆیانەوە، هەموو ڕێگەوبانێکیان بە دەوری سەنگەر و سەربازگە و شاخ و شاری نەهاوەند دا، تەلاوی کردبوو.

نیعمان کەسێکی بانگ کرد ناوی (مەحمود زەکار) بوو، وتی حەز دەکەم لە شورای فارسەکان نزیك ببیتەوە و، بە نهێنی سەیری ناوەوەیان بکەیت، دەڵێن قەڵایەکیان هەیە لە هەوا، (مەحمود) ڕۆیشت، هەتا گەیشتە بەرەوە شەو داهات. گوێی لە دەنگی حەرەسی فارسەکان بوو قاچی ئەسپەکەی لە تەل و زریسکی دڕکاوی تێك ئالاو، بە زەحمەت رزگاری بوو، هاتەوە و هەواڵەکەی هێنایەوە و وتی: سەنگەریان قایمە، هەموو لایەکیان بە تەلی دڕکاوی تەنیوە،

شەو زریسکی دڕکاوی رادەخەن و بە رۆژ بەرزی دەکەنەوە. سوپای ئیسلام لە نەهاوەند نزیك تر بویەوە، قۆناغێك بۆیان چونە پێشەوە هێرش و پەلاماری پچڕ پچڕ و سوك و بەهێز دەستی پێ کرد. ئیبن ئەعسەم دەڵێت: بە سرودو گۆرانی و تەپڵ لێدان شەڕ گەرم بوو، خەڵکێکی زۆر کوژرا ،، لەناو فارسەکاندا (جیرجان)ی وەزیر بەرکەوت. لە زۆر لاوە فارسەکانیان راونا. هەتا ناو سەربازگە و شوراکانیان بردنیان، شەو داهات، سوپای ئیسلام گەڕایەوە سەنگەرەکانیان، ماندو بون ، بریندارێکی زۆریان پێ برا. (نیعمان) وتارێکی خوێندەوە (. فارسەکان خەتەری بۆ دروست کردون، ئەگەر شکاندتانن، ئەوا خۆشی و شادیە. ئەگەر ئێوە شکان، ئەوا نە بەسرە دەمێنێ، نە کوفە و نە مەدینە. ئێوە، ئێستە بونەتە شورا و دەرگایەك لە نێوان ئیسلام و شیرك دا. ئەگەر ئەو دەرگایە شکا. ئەوا بەڵاو موسیبەت روو دەکاتە ئیسلام. ئەڵڵا ئەڵڵا ئەی سەربەرزەکانی خوا، ئیسلام سەر شۆڕ مەکەن. ئێوە خوا پەرستن، ئەوان خۆر و مانگ دەپەرستن، خوشك و دایك و کچی خۆیان مارە دەکەن، ئێوە بۆ ئەوانە هاتون من سێ جار ئەم ئالآیە بەرز دەکەمەوە و رای دەوەشێنم، لە دوەمدا رمەکان بخەنە سەر بەینی دوو گوێی ماینەکان و سەیری ناوچاوی دوژمن بکەن، لە سێیەمدا هێرش دەکەین و بڵێن لا حول ولاقوە الا بالله.)[209]

دوو رۆژ جەنگ گەرم بوو، موسوڵمانەکان ترسان جەنگ درێژە بکێشێ. خاوەن راو سەرکردەکان لای نیعمان کۆبونەوە، نیعمان پێی وتن: ئەوەتە بت پەرستەکان لە قەڵاو شورە و شارەکانیان دا خۆیان قایم کردوە، نایانەوێ دەربچن، ئێمەش توانامان نیە لە سەنگەرەکانیان دەریان پەڕێنین، خەریکە ماندو دەبین، راتان چیە.؟ چار چیە، چۆن دەتوانین هەڵیان کەنین.؟ هەر یەکە شتێکی وت.

---

209. کتاب الفتوح: ابن اعثم، ج٢ص٤٧.

## فەتحولفتوح

خزری بەگ دەڵێت: نیعمان سەرکردەو و فەرماندەکانی سوپای کۆکردەوە و پرس و رای پێ کردن، ئەمە چەند رۆژێ خایاند، بەردەوام تاوتوێی بار و دۆخیان دەکرد، پێی وتن: خۆ چاك دەبینن خۆ پەرست و مشرکەکان خۆیان دامەزراندوە، لە خەنەق و قەڵاکانیان نایەنە دەرەوە، مەگەر خۆیان بیانەوێت، موسوڵمانەکانیش لەو دەشتە روتەنەدا بە بەر چاوەوەن، نوقسانی زۆرمان لە چاو فارسەکاندا لە هەموو پێوسیتیەك هەیە. ئێوە راتان چییە؟

عومەر کوڕی نەبی کە پیاوێکی پیر بوو وتی: ئەم سەنگەرگرتن و خۆقایم کردنەی ئەوان، لەم درێژە پێ دانەی ئێوە بەهێزترە! ئیتر واز بێنن و پەلاماری ئەو روخاوو پەرتەوازانە بدەن. (عەمرو کوڕی موعید) وتی: ئەوان دیوار و شورایان هەیە ئێمە بێ دیوار و شوراین، بەم جۆرە چی دەکرێت.؟ [210]

(تولەیحەی ئەسەدی) رایەکی تری هەبوو، وتی: (ئەگەر ئەسپ سوارەکان بنێرن پەلاماریان بدەین هەتا تەماع دەخەینە بەر فارس، کە ئەمانە کەمن و بۆیان بێنە دەرەوە و سوارەکانی ئێمە خۆیان شل بکەن ئەوان راویان بنێن و سەنگەر و قەڵاو شورەکانیان چۆڵ بکەن، ئێمە سوپایەك لە بەهێزەکان حەشار بدەین هەر کە ئەوان قەڵاکانیان چۆڵ کردو دوورکەوتنەوە، ئێمەی خۆحەشار دراو خۆمان ئاشکرا بکەین و پەلاماری قەڵاو شوراکانیان بدەین.).

هەموو رازی بوون. نیعمان سوپایەکی تری لە جێیەکی پەنهاندا دامەزراندو شاردیەوە کە شەڕ نەکەن هەتا مۆڵەتیان دەدرێتێ. فێڵەکە دەستی پێ کرد، نیعمان سواری ئەسپەکەی بوو دوو سەرکردایەتی دروست کرد یەکێکیان بە فەرماندەیی قەعقاع کوڕی عەمر بۆ سەرپەرشتی ئەو سوارانەی کە هێرش دەکەنە سەر قەڵاو شورەکان و دوژمن رادەکێشنە دەرەوە " دووەم نیعمان سەرکردەی هەموو سوپاو هاندەر و رێکخەری ئەوانەی کە خۆیان حەشار داوە، ریزەکانی رێك خست ئاڵاکانی تاودا. دەیدا بەلای هەر ئاڵایەکدا،

---

[210]. تأريخ الامم الاسلامية: خضري بەگ، ص٢٢٠.

گەرمی دەکردن و نەخشەکەی بیر دەخستنەوە، قەعقاع سوارەیەکی زۆری برد، بە مەرجی پەلامار و خۆ شل کردن بۆ دوژمن.قعقاع کاری خۆی کرد و شەڕی لە سەنگەرەکان گەرم کرد، فارس گەلەکۆمەی زۆریان بۆ قعقاع و سوپاکەی هێنا، تەواو تەماعی خستە بەر فارسەکان کە هەر هەموو بۆیان بێنە دەرەوە، قەعقاع سوپاکەی لەبەردەم زۆری فارسەکاندا هەڵهاتن و شەڕی پاشەکشەیان دەکردو دووری خستنەوە، نیعمان لای سوپاکەی خۆی بوو نەخشەکەی فێر دەکردن: سێ تەکبیر (الله اکبر) دەکەم، لە یەکەمدا ئامادەبن، لە دوەمدا چەکەکانتان ئامادە بکەن و رمەکانتان بخەنە نێوان هەردوو گوێی ماینەکانتان، لە سێهەمدا من هێرش دەکەم و ئێوەش بە دوامدا. هەواڵ گەیشتە نیعمان کە فارسەکان زۆر لە قەڵاکانیان دوور کەوتونەتەوە، نیعمان تەکبیرەکانی کرد و لەسێهەمدا وتی: (اللهم أعز دينك، وانصر عبادك، واجعل نعمان اول شهيد اليوم على اعزاز دينك و نصر عبادك).[211]

(خوایە ئاینت سەر بەرز بکە، بەندەکانت سەر بخە، خوایە نیعمان یەکەم کەس بێت کە ئەمڕۆ شەهید ببێ لە پێناوی سەربەرزی ئاینت و سەرکەوتنی بەندەکانتدا.) بەم جۆرە نیعمان دوژمنەکانی راکێشایە دەرەوەی سەنگەرەکانیان، بۆ جێیەکی روت و بێ پەناگا کە زوتر موسوڵمانەکان گیریان پێوە خوارد بوو، دور لە قەڵاو شوراو شارەکانیان، هەتا کات تەواو پێگەیی، شەڕی بێ وێنە لە مێژووی ئیسلامدا بەرپا بوو، شەرگە و مەیدانی جەنگ پڕ بوو لە خوێن و لاشە. نیعمان بە هاوڕێکانی وت: ئەگەر خوا شەهادەتی کرد بە نسیبم، دوای من (حوزەیفەی یەمانی) ئەمیرتان بێت، ئەگەر ئەویش بەرکەوت (جەریر کوڕی عەبدوڵلا بەجلی) ئەمیرتان بێت، ئەگەر ئەویش بەرکەت (ئەشعەسی کوڕی قەیسی کەندی)، دوای ئەو (موغیرەی کوڕی شوعبەی

---

[211]. مجلة (المورد): العدد٢، ١٩٩٧/ ص٥٩. الجهاد في خطابة صدر الاسلام: ناهي ابراهيم العبيدي. العراق.

سەقەفی) بێت پاشان نیعمان سەری بەرزکردەوەو وتی: (اللهم انصر ابن مقرن، وارزقه الشهادة، انك على كل شئ قدير.).[212]

بەلازەری دەڵێت: لە نامەیەکی عومەردا هاتوە کە ئەگەر نیعمان پێکرا حوزەیفە، ئەگەر حوزەیفە پێکرا جەریر، ئەگەر جەریر پێکرا ئەشعەس. بچێتە جێگەی.[213]

ئیبن ئەعسەم دەڵێ: (فارسەکان لە سەنگەرەکانیان دەرچوون، فیلی زۆریان پێش خستبوو. ئەو موسڵمانانەی کە خۆیان حەشار دابوو دەستیان کردە هات و هاوار و زیکر و شیعر و هۆنراوە خوێندنەوە. یەکێك هاواری کرد: وازبێنن لەشیعر و هۆنراوە، دڵ بدەنە خواو سەیری ئاڵای ئەمیرتان بکەن. نیعمان سێ جار ئاڵاکەی شەکاندەوە. بوبە ڕۆژی حەشر و دەنگی الله اكبر، پرمەو حیلەی زیاتر لە بیست هەزار ماین، تەقەی شمشێر و شیروتیر و قەڵغان دەگەیشتە کەشکەشانی فەلەك، موسڵمانە تازە نەفەسەکان، تێکەڵ بەفارسە شەڕاویە قەڵاو شورا چۆڵ کردووەکان بوون. جەنگی بێ وێنە ئا لێرەدا روی دا، نیعمان ویستی هەڵبکوتێتە سەر سوارێکی فارس، بەڵام لە دواوە کەسێکی تر دای لەلا کەللەکەی و ناوکی کەرت کردو خوێن و ڕیخۆڵەی بەسەر پشتی ماینەکەدا هاتەخوارەوە و کەوت و شەهید بوو.).

تەبەری دەڵێ: (ماینی نیعمان شەلاڵی خوێن بوو بوو، نیعمان بە تیرێکی دوور پێکراو لە زینەکەی کەوتە خوارەوە، دەم ودەست مرد، کە نەعیمی برای بینی، هاتە لای، دای پۆشی هەتا نەزانن سەرکردەکەیان کوژراوە. ئاڵاکەی برد بۆ حوزیفەی یەمانی. بۆ شەوێ فارسەکان شکان، نەیان هێشت فارسەکان بگەنەوە قەڵاکان.).

تەبەری دەڵێ: (شەڕ تاوی سەند. فارسەکان ویستیان بگەڕێنەوە بۆدواوە، بۆ ناو مۆڵگە و قەڵاو شوراکانیان، دەبینن ڕێیان نیە و بەردەم و پشتیان

---

[212]. كتاب الفتوح: ج٢ص٤٧.

[213]. معجم البلدان: ج٨ص٣٢٩. فتوح البلدان: بلاذري، ص٣٠٠.

گیراوە، چەند سەرکردەی فارس لەو سەرلێشێوانەدا کوژرا، لەوانە (ئازەر کورد، مهربندان، ئەنوشجان، هورمزی کوڕی داران.) و دەیانی تر. موسوڵمانەکان زۆر ماندوو بوون، ئەو هەموو سوپایە بەوان تەواو نابێ، کاری زۆریشیان لەسەر کردبون و ورەیان پێ بەردابوون، لەوانەبون وازبهێنن و بگەڕێنەوە شوێنی سەنگەر و قەڵاکانی ئەوان، (جەریر) هاواری کرد: (موسوڵمانینە سوپای فارس زۆرن، ئێستە یەزگورد لە ئەسفەهانە، کێ دەڵێت سبەی دوو سبەی سوپایەکی تری بێ شومارتان بۆ ناهێنێ و ماندوتان بکات.؟ ئەوا خەریکە خۆریش دەنیشێت، با بڕیار بدەین، شەو دانەیەت خۆمان بگەیەنینە قەڵاکانی شاری نەهاوەند.) هەر ئەو بڕیارە بوو، لەسەر فارسەکانیان توند کرد، هێرش لەسەر هێرش و، دەنگی الله اكبر ئەژنۆی هێنا بوونە لەرزە و، نەیان دەزانی ئەمانە چین، نە شمشێر دەیان بڕێ و نە فیلەکان دەیانترسێنێ! سەنگەر بە سەنگەر و، قەڵاو شۆرەیان پێ چۆڵ کردن و، لە خەنەقەکان دەریان پەڕاندن، تەنانەت شاخ و چەم و دۆڵ خەبەریان لێ دەدان، لە هیچ جێیەك خۆیان بۆ نەدەگیراو هیچ شوێنێ لە خۆی نەدەگرتن.

خوا سەرکەوتنی دا بە (نیعمان)، بەڵام شەهید بوو نەی بینی. ئەمانە جۆرە پیاوێکن کاریان دەوێ نەك بەرهەم، کاری قیامەتی وەك کشت وکاڵی دنیا نیە بەرهەم حسێب بێت ئەوسا قازانجت کردوە، بۆ قیامەت چاکە بکە و بیدە بە دەم ئاودا، لە جێیەکی تر بەر دەگرێ، جگە لەم جێیە کە یەزگوردێکت لێ پەیدا ببێ، نەهێڵێ ئاڵای خێر بەرز بکەیتەوە و تۆوی چاکە بڵاو کەیتەوە، ئەوانە خوا فێری کردون و عومەر بۆی داڕشتون، لە نامەی (١٥٨) دا بە ئەبوموسای ئەشعەری کە لە جەنگی نەهاوەند دا بەشدارە دەڵێت: (فأن خيرتم بين امرين، احدهما للدنيا، والاخر للاخرة، فاختاروا امر الاخرة، فان الدنيا تفنى والاخرة تبقى، كونوا من الله على وجل، وتعلموا كتاب الله، فانه ينابيع العلوم و ربيع القلوب.)[214] یان لە نامەی (٩٢) دا بۆ سەعد دەفەرموێ، بەڵام چ

---

214. رسائل الفاروق: رسالة رقم ١٥٨.

سەرکردەیەك حەقیقەتی وای فەرمووە! چ سەرکردەیەك هەیە ئاوا خاكی دوژمنی ناسیبێ، دەرونی بەرامبەر هەڵسەنگاندبێ و، چاڵ و چۆڵی ئاخ وشاخ و داخیانی زانیبێ و، پڕ بە پێستی نامە دابەزێنێ. هەر كەس ئاوا دوژمنی ناسیبێ، هەرچەندە گەورە بوبێ، پوچ سەنگی كردوە، دەفەرموێ: (فسر من شراف نحو فارس بمن معك من المسلمين، وتوكل على الله، واستعن به على امرك كله، واعلم فيما لديك، انك تقدم على أمة عددهم كثير وعدتهم فاضله وباسهم شديد، وعلى بلد منيع وان كان سهلا كؤود لبحوره و فيوضه و دأدئه، الا ان توافقوا غيضا من فيض، واذا لقيتم القوم او احد منهم، فابدؤهم الشد والضرب، واياكم والمناظرة لجموعهم ولا يخدعنكم، فأنهم خدعة مكره امرهم غير امركم الا ان تجادوهم.)[215]

بەڵێ: نمونەی وەكو (نیعمان)، جۆرە پیاوێكن، كە لە كەسی تر ناچن و، هیچ كەسێكی تریان لێ ناچێت، تاوانە بیان شوبهێنی بە كەسانی تر، ئای لەو شەهیدیە و ئای لەم شەهیدانە! ئەم مەردە خۆشی و حەوانەوەی ناو شاری (كسكر)ی بە دڵ نیە، حەز ناكات لە جێیەكدا كەوتبێ و پارەو خراج و جابێتی بە دەست بێت. نامەی بۆ خەلیفە عومەر نووسی كە لای ببات و بیكاتە مجاهد و سەرباز لە بەرەی جەنگی دا. حەزی لە دۆشەكی نەرم نیە، دڵی بە تەپوتۆز و بۆنی وڵاخی ناو بەرەكانە. ئەو كاتە كە عومەر سجلەكەی هەڵدایەوە بگەرێ بۆ یەكێك بیكاتە سەركردە، لە نێوان لاپەڕەی تۆمارەكەیدا نامە كورتەكەی (نیعمان)ی بینی وەكو بە خوێن نووسرابێ وابوو. نامەكەی دەرهێناو تۆمارەكەی لابردوو وتی دۆزیمەوە. ئەنجا فەرموی:

(والله لاولين اميرهم رجلا، يكون أول الأسنة اذا لقيها غداً هو نعمان بن المقرن فقالوا: هو لها.)[216]

---

[215]. رسائل الفاروق: رسالة رقم ٩٢ ص٧٢.

[216]. قادة فتح بلاد فارس: اللواء الركن محمود شيت خطاب، ص١٠٢. بيروت ١٩٦٥.

نیعمان بەتەمابوو سەربازێك بێت، بەڵام نیەتی پاکی کردیە سەرکردەی گەورەترین سوپا، کە هەتا ئەو کاتە موسوڵمانەکان ئامادەیان کردبێت، سەرکەوتنەکەش ناونرا (فتح الفتوح). ئەمانە ترازێکی ترن لە مرۆڤ، کە هەمیشە دەست ناکەون. نیعمان دوعای شەهیدبونی خۆی و سەرکەوتنی موسوڵمانانی کرد. خوا هەردوکیانی پێ بەخشی، خۆ تاواندنەوە لە پێناوی خواو خەڵك و ئایین و بڕوادا.

ساڵی ٢١ کۆچی شەهید بوو، (مەعقەل) ی برای دەڵێت: کە چومە سەری ئاوم پێ بوو، دەم و چاویم شۆرد. وتی تۆ کێیت.؟ وتم: مەعقەل. وتی موسوڵمانەکان چییان کرد؟ وتم: مژدەم بدەرێ بە سەرکەوتنی خوا. وتی: سوپاس بۆ خوا. نامە بنووسن بۆ عومەر! پاشان (مەعقەل) نیعمانی برای نیشانی جەنگاوەران داو وتی: (هذا امیرکم قد اقر الله عینه بالفتح وختم له بالشهادة.).[217]

شەڕەکە ئەوەندە گەورە بوو، چەند شەوو و ڕۆژ موسوڵمانەکان حەوانەوەیان نەبوو، وا شەکەت بوو بوون حەزیان دەکرد بەدزی فارسەوە لە جێیەکی پەنادا بحەوێنەوە. (ساریەی کوڕی زەنیمی کەنانی) کە خۆی و سریەکەی زۆر ماندوبون. ویستیان بچنە دۆڵێك کەمێك بحەوێنەوە. خەریك بوو خۆیان دەکردەوە، تومەز فارسەکان پێیان زانیبون. سوپایەك هات بۆیان ویستی بە چیاکەدا هەڵزنێ و سەرکەوێ و گەمارۆیان بدات. کات گەرمەی نیوەڕۆیە. ئەمان لە دەشتی نەهاوەند ئەمە حاڵیانە، عومەر لە مەدینە لە هەمان کات و ساتدا لە گەرمەی وتاری هەینی دایە. تومەز لاشەی لە مەدینەیە و دڵی لای سەربازە برسی و تینوو ماندوەکانیەتی، خوای گەورە پەردەی تەنەکانی لە نێوان ئەوو مەیدانی جەنگەکەدا لابردوو شاشی دڵی تۆماری جەنگەکەی نیشانداو وای بینی کە سوپایەکی فارس خەریکە بۆ (ساریەو کۆمەڵەکەی) سەردەکەوێ و گەمارۆیان دەدەن. نەیزانی چۆن فریایان بکەوێ و دوو هەزار

[217]. فتوح البلدان: بلاذري، ص٣٠١.

کیلۆمەتر بڕێ، هەر ئەوەندەی زانی دەمی هاتە گۆو هاواری کرد (یا ساریة الجبل. الجبل) ئەوانەی لە مزگەوتی مەدینە دانیشتبون، سەریان سوڕما لەم تێکەڵیەی عومەر. ساریە و کۆمەڵەکەی لە دۆڵی نەهاوەند وتیان ئەوە دەنگی عومەر بوو گوێتان لێ بوو.؟ ساریە وتی: خۆتان کۆ بکەنەوە و بەو شاخەدا هەڵزنێن، ئەوە هاواری عومەرە و داوای شتێکمان لێ دەکات. کە سەر دەکەون دەبینن سوپایەکی فارس هەتا نیوەی شاخەکە هاتون. بە حەماسەیەکەوە عومەر ئاسا لێیان هاتنە دەست و سەرەو خوار دایان بڕین و لە ناویان بردن، هێشتا دەنگەکەی عومەر لە گوێیاندا دەزرنگایەوە. ئەم هەواڵە هەموو مەفرەزە و لەشکر و سوپای موسوڵمانانی گرتەوە. بیریان لەوە دەکردەوە کە عومەر بە دڵ و گیان لە گەڵیاندایە و لە خەفەتی بێ هەواڵی ئەوان ئارامی نییە!

ئەو چەند شەوو رۆژە عومەر لە مەدینەوە خەو و خۆراکی نەبوو، بە تەمای هەواڵ بوو، دەچوە قەراغ شار و چاوەڕوانی بەرید و هەواڵنێر بوو.

(محمد حسنین هیکل) دەڵێت: لە نەهاوەندەوە (عروەی کوڕی زەید) یان نارد مژدەی سەرکەوتن بدات بە عومەر و خەڵکی مەدینە. هەر کە لە مدینە نزیك بویەوە حەزرەتی عومەر بینی ترسا، چونکە هەر عروە بوو پێشتر هەواڵی شکستی موسوڵمانەکان و شەهید بوونی ئەبوعوبیدەی سەرکردەی هێنا لە جەنگی (جسر) دا، عومەر جەنگی (جسر)ی بیرکەوتەوە، هەر کە عروەی بینی وتی (انا لله وانا الیه راجعون) بەڵام عروە وتی: نەخێر ئەی عومەر، بەڵکو سوپاس بۆ خوا کە سەری خستین، ئەنجا روداوەکەی بە درێژی بۆ گێڕانەوە.[218]

ئیبن ئەعسەم دەڵێت: کە عومەر (عروە)ی بینی ترسا، وتی: چیت پێیە.؟

عروە وتی: مژدە و سەرکەوتن!

---

[218]. الفاروق عمر: د. محمد حسنین هیکل، ج٢ص٤٠. مطبعة مصر، القاهرة.

**عومەر وتی نیعمان چی کرد.؟[219]**

**وتی: ئەسپەکەی شەڵتانی خوێنی دوژمن بوەو خۆشی شەهید بوو!**

**عومەر زۆر خەفەتی خوارد. وتی: انا لله وانا الیه راجعون. نەیتوانی خۆی بگرێ و نەگری. وای دەزانی سەرکردەی هەموو سوپاکانی ئیسلامی لە دەست چووە. یەکیان وتی: (ئەو رۆی تۆی دەناسی.) عومەر وتی: (ئەوانە پاکانی خوا بوون، بە روی خۆیان، بە ماقوڵی خۆیان جەنگان، نەك بە ناسینی عومەر!).**

**ئەبو موسای ئەشعەری لە ژێر سەرکردایەتی نیعمان دا فەرماندەی سوپای بەسرەی دەکرد لە جەنگی نەهاوەند دا. دوای تەواو بونی نەهاوەند چوو بۆ دینەوەر و بە ئاشتی رزگاری کرد، پاشان چوو بۆ ماسبزان و سیروان و بە ئاشتی رزگاری کردن.[220] بەڵام لە جێیەکی تردا هاتوە کە (ماسبزان) زرار**

---

[219]. نعمان کوڕی مقرنی موزنی: عەبدوڵلا کوڕی مسعود دەڵێ: بڕوا ماڵی هەیە و نیفاقیش ماڵی هەیە، یەکێ لە ماڵە بڕوادارەکان ماڵی مقرنی موزنیيە، مقرن (دە) کوڕی هەبوو سنان و سوید و عبدالله و عبدالرحمن و عقیل و معقل و نعمان و نعیم و مرضی و ضرار. هەموویان هاوڕێی پێغەمبەر بوون، ئەو ئایەتە لەسەر ئەوان هاتە خوارەوە (و من الاعراب من یؤمن بالله والیوم الاخر.) الاصابة. ج٦ص١٢٦. نعمان لە ساڵی پێنجەمی کۆچی دا لە مانگی رەجەب بە خۆی و براکانیەوە و (٤٠٠) کەس لە خزمانی شاری مزنی) هاتنە خزمەت پێغەمبەر و موسوڵمان بوون، اسد الغابة ج٥ص٢٠. نعمان بە (١٢٠)کەسی خزمیەوە لە فەتحی مەککەدا بەشداریان کرد، نعمان سەرۆکی ئەو وەفدە بوو کە لە (١٨) کەس پێك هاتبوون (سەعد) ناردنی بۆ لای یەزدگورد لە جەنگی قادسیەدا. (الکامل، ج٢ص١٧٥). دوای جەنگی قادسیە (سەعد) نعمانی نارد بۆ لای عمر بۆ مژدەی سەرکەوتن لە قادسیەدا. نعمان ساڵی ٢١ی‌کۆچی شەهید بزز، گۆڕەکەی لە (ئەسفینديان)ە لای ئەصفەهان. شەش فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ریوایەت کردووە.

[220]. قادة فتح بلاد فارس: محمود شیت خطاب، ص١٨٢، بلاذري: ص٢٠٤.

**گرتی و دینەوەر (حوزەیفە) گرتی. دوای نەهاوەند حوزەیفە گەڕایەوە بۆ (کوفە)، عومەر کردی بە والی ئەو ناوچەیەی کە روباری دجلە ئاوی دەدا.**[221]

---

221. طبري: ج٣ص٢٢٩. بلاذري: فتوح البلدان، ص٣٢١. لە معجم البلدان دا ئەو هەڵەیە کراوە کە حوزەیفە لە (باب الابواب) لە ئەرمینیە شەهید بووە، راستییەکەی ئەو حوزەیفەیە نیە" بەڵکو حوزەیفەی کوڕی ئەسیدی غەفاریە. بەڵکو حوزەیفەی یەمانی گۆڕەکەی لە شاری بغدادە.

## جەنگی هەمــەدان

(نەعیم) و (قەعقاع)[222] پارچە شكاوەكانی ماشێنی جەنگی فارسیان هەتا هەمەدان راونا، سەركردەی فارسەكان كە زانی توانای خۆڕاگریان نەماوە نوێنەریان نارد بۆ رێكەوتن و جزیە دان.

ئەوانیش نامەیان بۆ حوزەیفە نووسی كە تا ئێستا لە جێگەی نیعمانە و سەركردایەتی هەموو بەرەكانی نەهاوەند دەكات. حوزەیفە رازی بوو، پەیمان نامەیەكیان مۆر كرد كە لەسەر ئاینی خۆیان بمێننەوەو جزیە بدەن.[223] سوپاكانی فارس وردە وردە ناوچەكانیان جێ دەهێشت و دەگەڕانەوە هەرێمەكانی خۆیان. فارسەكان لە شاری (رەی) خۆیان كۆكردەوە و بە نیاز بون بەر لە موسوڵمانەكان بگرن و نەهێڵن زیاتر بچنە ناوەوە. نوێنەریان نارد بۆ لای خەڵكی (هەمەدان) و هانیان دان كە پاشگەز ببنەوە و پەیمانیان بشكێنن هەتا یارمەتیان بۆ دێت، ئەوانیش پەشیمان بونەوە و بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی پەیمانیان دا. ئەم هەواڵە گەیشتە خەلیفە (عومەر). ئەویش داوای لە نەعیم كرد كە بە سوپایەكەوە بڕوات بۆیان و شاری هەمەدان بگرێتەوە و سزای ئەو پەیمان شكێنیە بدات، هەتا جارێكی تر لە كاتی ئاوا

---

[222]. قعقاعی كوڕی عەمروی تمیمی: ئەبوبەكر ئاوا وەسفی دەكات (لا یهزم جیش فیه مثل قعقاع) ساڵی (نۆ)ی كۆچی وەفدێكی تمیم هاتنە لای پێغەمبەر، دوای غەزای تەبوك و لەو رۆژەوە ئەو خێڵە بونەتە موسوڵمان. قعقاع دەڵێ " پێغەمبەر فەرموی: چیت ئامادە كردوە بۆ جیهاد) وتم: تاعەتی خواو پێغەمبەر و ماینەكەم. پێغەمبەر فەرموی: (تلك الغاية) (الاصابة: ج٥ص٢٤٤). قعقاع بەشداری جەنگی هەڵكەڕاوەكانی كرد، پاشان چوە شام، پاشان لەگەڵ خالید بەشداری جەنگەكانی كاظم و حیرە و ناوچەی سەواد و ئەنبار و عین التمر و دومة الجندل و قادسیە و مدائن و جلولاو خانقین و نەهاوەندی كرد. ئەمە جگە لە جەنگەكانی وڵاتی شام زۆر هەوڵی دا فیتنەی سەردەمی عوسمان روو نەدات، ناچار چوە پاڵ ئیمامی عەلی و ویستی رێكەوتنێك لە نێوان عەلی و عائشة و طلحە بكات. بەشداری جەنگی جەمەل و صفین ی كرد لە بەرەی عەلی دا. هەر لە سەردەمی ئەو فیتنەیەدا مرد، ساڵی ٤٠ی كۆچی ٦٦٠ی زاینی.

[223]. الكامل في التأريخ: ابن اثير. ج٣ص٦.

ناسك دا کاری وا نەکەن. پاشان بۆی نووسیەوە. ئەگەر خوا هەمەدانی بۆ ڕزگار کردی، مەوەستە هەتا دەگەیتە خۆراسان.[224]

ئەم هەواڵە گەیشتە خەڵکی هەمەدان، ترس و لەرز دایگرتن. نەعیم سوپای (دوانزە) هەزاری ڕێك خست و لە کەمترین ماوەدا گەمارۆی شارەکەیانیدا. خەڵکی هەمەدان دووبارە نوێنەریان ناردەوە و داوایان کرد کە ئیتر جارێ تر پەیمان شکێنی ناکەن و بە گوێی سوپای فارس ناکەن. هەموولا ڕازی کران و جزیەیان لەسەر دانان. هێشتا نەعیم لە هەمەدان بوو کە هەواڵ هات هێزەکانی (دەیلەم و ڕەی و ئازربایجان) یەکیان گرتوە و لە (واج ڕوز) کۆبونەتەوە بە سەرکردایەتی سێ سەردار، (موتا) سەرداری دەیلەم، زینەبی (ئەبو فەرخان) سەرداری سوپای ڕەی، (ئەسفەندیار) برای ڕۆستەم سەرداری سوپای ئازربایجان بوو.

نەعیم چوو بۆیان. هێشتا دانەمەزرابوون کە فارسەکان پەلاماریان دان. شەڕێکی خەست ڕووی دا. فارسەکان سودیان لە تاریکی شەو وەرگرت و هەریەکەیان خۆی گەیاندەوە هەرێمی خۆی!

خزری بەگ دەڵێت: (نەعیمی کوڕی موقریب) لە هەمەدان بوو، هەواڵ هات کە سوپایەکی زۆری فارس لە نزیك کەلاوەکانی نەهاوەند دامەزراون. چوو بۆیان، ڕاوی نان، پاشان هەر لەوێوە کەوتە ڕێ بۆ شاری (ڕەی) لەگەڵ خەڵکەکەی ڕێکەوت، سەرکردەکەیان ناوی (زینەبی کوڕی قولە) بوو. نەعیم (سۆلە)ی برای نارد بۆ سەر شاری (قومس) و بە ئاشتی ڕێك کەوتن. پاشان نامەی پاشای (جرجان)ی بۆ هات لە نزیك (قەزوین) داوای ئاشتی کرد، شاری ڕەی و (دستەنبی) کە سەر بە وڵاتی چیا (هەرێمی چیا) بوو بە ئاشتی ڕێك کەوتن و خەڵکی (تەبەرستان) لە نزیك دەریاچەی قەزوین (خەزەر) بە ئاشتی ڕێك کەوتن.[225]

---

[224]. تأريخ الامم والملوك: الامام الطبري. ج٣ص٢٢٢.

[225]. تأريخ الامم الاسلامية. محمد خضري بەگ. ص٢٢٥

## نەخشەی دوای نەهاوەند

دوای جەنگی نەهاوەند کە ناونرا بە (فتح الفتوح) کە بوە هۆی تەفروتونا کردنی سوپای فارس و لەناوبردنی (ماشینی جەنگی ئیمپراتۆریەتی ساسانی فارسی). ئەوە بوو (١٥٠) هەزار سەربازی فارسی کە لە بەهێزترین سوپاکانیان بوو بە ماوەی هەفتەیەك جەنگ شکستی خواردو لە مەیدانی جەنگدا هەڵهات. عومەر بۆی دەرکەوت ئەم کارە بەو جۆرە ناڕوات. قسەکەی (هورمزان) کە پرسی پێ کرد، لەو سێ هەرێمە، یەکەم جار پەلاماری کوێ بدرێ، هورمزان بە راست وەڵامی دایەوە و وتی (ئەسفەهان) سەرە، هەرێمی فارس و ئازربایجان دوو باڵن. واتە بدە لە (سەر) دوو باڵەکە لە پەل وپۆ دەکەون، هەرچەندە هەندێ مێژوونووس وتویانە بدە لە دوو باڵەکە، سەر شپرزە دەبێ " هورمزان راست وەڵامی دایەوە. ئەم قسەیەی هورمزان لە لایەك و وتەکەی ئەحنەف لە لایەکی ترەوە کە لەگەڵ هورمزان هات بۆ مدینە و بە عومەری وت: هەتا یەزدگورد لە ژیاندا بێ میللەتانمان لێ هان دەدا و حەوانەوەمان نابێت، رێگەمان بدە با بچینە ناوەوە بۆی.

عومەر فەرمووی راستت وت!

ئەم دوو قسەیە وای لە عومەر کرد نەخشەی دوای نەهاوەندی وەستان، بڕیاری دا بە توندی هێرش بکاتە سەر وڵاتی فارس و دوای یەزدگورد بکەوێ شار بە شار هەتا یان لە ناوی دەبات یان دەیکات بەو دیوی سنوری وڵاتی فارس دا. بۆ ئەو مەبەستە (حەوت) تەشکیلاتی تازەی پێکهێنا لە فەرماندەکانی کوفە و بەسرە بۆ ئەم شار و هەرێمانە:

| | |
|---|---|
| ئەحنەفی کوڕی قەیسی تەمیمی | بۆ خۆراسان. |
| مجاشع کوڕی مسعودی سەلەفی | بۆ ئەردەشێر و خرەسابور. |
| عوسمان کوڕی ئەبی وەقاسی سەقەفی | بۆ ئەستەخر. |
| ساریە کوڕی زەنیم کەنانی | بۆ فسا و درابجرد. |
| سوهەیل کوڕی عدی | بۆ کرمان. |

عاسم کوڕی عەمرو                    بۆ سجستان.
حەکەم کوڕی عومەیر                  بۆ مکران.
بە نامە و ئامۆژگاریەوە هەموویانی خستەڕێ.[226]

دوای فەتحولفتوح (نەهاوەند) وڵاتگیری و بڵاوبوونەوەی ئیسلام قۆناغێکی تازەی وەرگرت، لەگەڵ ئەوەی کە پێشتر موسوڵمانەکان حەزیان دەکرد لە بەرەی جەنگی شام دا بەشداری جیهاد بکەن، بەڵام ئێستە و دوای نەهاوەند مەیلیان گۆڕا و کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتن بۆ بەشداری جیهادی وڵاتی عێراق و فارس، ژمارەیەکی زۆر گەیشتنە کوفە و بەسرە کە دوو ویستگەی کۆکردنەوەو ناردنی سوپا بوو بۆ ناوەوەی وڵاتی فارس بۆ بنبڕکردن و لە رەگ و ریشە دەرهێنانی سوپای زۆر و ستەمی فارس بەسەر میللەتانی ژێردەستیانەوەو، وەمەئیوس کردنی پاشای کڵۆڵ (یەزدگورد) لەوەی کە ببێتە درك لەبەر پێی موسوڵمانانداا.

## رزگارکردنی شاری ( رەی ) و ( دســـــتەنبی )

لە جێیەکی تردا ئاوا هاتووە. کە نەهاوەند تەواو بوو، عومەر نامەی نووسی بۆ (عەمار کوڕی یاسر): (سوپاس بۆ خوا کە پەیمانی خۆی بەجێ هێناو بێ یرواکانی شکاند. دەستکەوتتان بوو، هەر کە نامەم گەیشتە دەستت، بۆ موسوڵمانەکانی بخوێنەرەوە، پاشان لە سوپای کوفە دە هەزار هەڵبژێرە و بیدە بە عروە کوڕی زەیدی تائی و پێی بڵێ بیان بات بەرەو شاری ـ رەی و دوستنبی ـ بەڵکو خوا سەریان بخات.)

سوپا کەوتە رێ، چوە حەلوان، جەریر لەوێ بوو، گەیشتە هەمەدان، کشا بەرەو شاری (ساوە)، کە (دە) هەزار فارس بە سەرکردایەتی (داور کوڕی ئەزدهان) لەوێ خۆیان دامەزراند بوو، هەر کە سوپای ئیسلام نزیك بویەوە. فارسەکان بەبێ دەرگیری هەڵهاتن. نەوەستان هەتا شاری (رەی). لەوێ هەموو

[226]. تأریخ الطبري: ج٤ص٢٢١. تأريخ الامم الاسلامية، ص٢٢٤. رسائل الفاروق، ص١٢٤ رسالة رقم ٢٢٠.

کۆبونەوە. هەواڵ گەیشتە پاشای (رەی) کە ناوی (فرخنداد کوڕی یەزدا مەهری گەورە) بوو. ئەویش خۆی کۆکردەوە، بە هەڵهاتووەکانیشەوە بوونە (چل) هەزار کەس. هاتن بەرەو خواروی شار و بەرامبەر موسوڵمانەکان وەستان. پاش کورتە شەڕێك فارسەکان تێك شکان و داوای ئاشتیان کرد. لەگەڵیان رێك کەوتن. نامەی سەرکەوتن بۆ عومەر نێررا.

هێشتا نەعیم کوڕی موقرین هەر لە هەمەدان بوو. خەڵکی شاری (رەی) پەیمانیان شکاند و خۆیان کۆکردەوە بۆ هێرش. عومەر نامەی نووسی بەم جۆرە: (یەکێك لە جێی خۆت دابنێ لە هەمەدان، بڕۆ هەتا دەگەیتە شاری رەی، بگە ئەو کۆمەڵەی کە کۆبونەتەوە بۆتان. پاشان لە شاری رەی بمێنەرەوە، چونکە ناوەڕاستی وڵاتیانە، هەر لەوێوە کۆدەبنەوە، کوێی تریشت بوێ، لەوێوە زوو دەیگەیتێ).

لە جەنگی هەمەداندا باسمان کرد کە سێ هێزی سێ هەرێمی وڵاتی فارس لە شاری (واج روز) کۆبونەتەوە، سەرکردەی سوپای رەی ناوی زینەبی(ئەبو فەرحان) بوو، لەو شەڕەدا خراپ شکان. کاتێ کە زینەبی بە شکاوی دەگەڕێتەوە بۆ (رەی)، پاشای شار لە زینەبی تووڕە دەبێ و لەسەر کار لای دەبات. رەنگە زینەبی لە شەڕی واج روزدا درێغی کردبێ و سەرکردەی هەرێمەکانی تر شکاتیان لێ کردبێت " چونکە زینەبی وەسفی رەوشت و پابەندبوونی موسوڵمانەکانی دەکرد و، رەخنەی لە پەیمان شکێنیەکانی خۆیان گرتبوو، کە جارێك خەڵکی هەمەدانیان هان دا پەیمان بشکێنن و جارێکی تر خۆیان کردیان. زینەبی کەس وکاری زۆر بوو خاوەنی راوبۆچوون و کەسێتی‌یەکی ناوچەکە بوو، هەر کە سوپای موسوڵمانەکان لە شار نزیك دەبێتەوە، پەیوەندییان پێوە دەکات و موسوڵمان بونی خۆی و کۆمەڵەکەی رادەگەیەنێت. لە قەراغ شار پێشوازیەکی گەرم لە سوپای ئیسلام دەکات. ئێستە سیاوەحش کوڕی مهران بوەتە پاشای رەی. موسوڵمانەکان لەلاپاڵی شاخی رەی هەڵیان دا. ئەوانەی کە دژی پاشای فارس بوون لە کورد و لایەنگرانی زینەبی (ئەبو فەرخان)، چونە شاخ و پەیوەندیان بە سوپای

ئیسلامەوە کرد. ئەو رۆژە هەتا ئێوارە شەڕ بوو. کە شەو داهات (زینەبی و نەعیم) کۆبونەوە.

زینەبی وتی:(ئەوان زۆرن، ئێوەش کەمن. ئەگەر سوارێکی باشم لەگەڵ بنێری، جێیەکی نهێنی شارەزام، هەر ئەمشەو دەچینە شار، ئێمە لە ناوەوە شاریان لێ دەشڵەقێنین و ئێوەش لە دەرەوە هێرش بهێنن. ئەوسا ناتوانن خۆیان بگرن.)[227]

نەعیم کۆمەڵە سوارەیەکی چاکی لەگەڵ ناردن بە فەرماندەیی (مونزر کوڕی عەمرو موزنی) و (عەمرو کوڕی نیعمان کوڕی موقرینی موزنی.) کە برازای خۆی بوو، خستیە ئەو مەوقفە خەتەرەوە[228]، نەعیم لە دەرەوە ئەو شەوە لەم لاو لاوە سوپای فارسی مەشغوڵ کردبوو. زینەبی لە جێیەکی نهێنی‌یەوە مەفرەزەکانی بردە ناو شار. لە هەڵمەتێکی خێرادا دەنگی الله اکبری ناوشار، شاری شڵەژاند. هێرشی سوپای دەرەوە بە توندی دەستی پێ کرد و فارسەکان لە دەرو ناوەوە گەمارۆ دران. هەتا شەبەقی بەیانی شەڕ بەردەوام بوو، فارسەکان سەنگەرەکانی خۆیان نەئەناسیەوە. لە تاریك و روونی بەیانی دا سوپای فارس هەڵهات و شاریان چۆڵ کرد. (نەعیم) هاتە ناو شار. ئەوەندەی شاری مەدائن دەسکەوتیان بوو. (نەعیم) زینەبی کوردی دانا بەسەر شاری (رەی)یەوەو، کۆمەڵێك چاك سازیان لە شاردا ئەنجام دا، یەکێك لەوانە شارە کۆنەکەی روخاند و، لە جێیەکی چاکتردا بە یارمەتی سوپای ئیسلام، شارێکی رێك وپێکیان دروست کرد هەر لە نزیك شارە کۆنەکەوە.[229]

(رەی) پایتەختی باکوری رۆژهەڵاتی هەرێمی چیا (کوردستان) بوو، کوردستانی ئەو کاتە سنوری هەتا (تاران)ی ئەمڕۆ درێژ بوو بویەوە، دەوڵەتی ساسانی، خەڵکی فارسی لە هەرێمی فارسەوە لە باشورەوە دەگواستەوە ئەو

---

[227]. الكامل في التأريخ: ابن اثير. ج٣ص٩.

[228]. الاصابة في تميز الصحابة: ج٧ص٢١.

[229]. تأريخ الطبري: الامام الطبري، ج٣ص٢٣١

ناوچانه و له کوردی دادەڕنی! شاری (ڕەی) بت خانەیەکی زۆری تیا بوو. له هەموو لایەکەوە خەڵکی دەهاتن بۆ پەرستگاکان.

پەرستگای گەورە (ماڵی ئاگر) لەم شارەدا دروست کرابوو، جگە لەوە شاری ڕەی ناوەڕاستی ڕێگای بازرگانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و باکور و باشوری هەرێمەکان بوو. لەبەرئەوە دەستکەوتێکی ئابوری گرنگ بوو بۆ موسوڵمانەکان و پشتی فارسەکانیشی پێ شکا. هەر بۆیە دوای ڕەی شارەکانی تر بە ئاسانی رزگار دەبوو. پێشبینیەکەی خەلیفە عومەر هاتەدی!.

پاشان خەلیفە عومەر نامەیەکی بۆ (نەعیمی کوڕی موقرین) نووسی بەم جۆرە: (ان قدم سويد بن مقرن الى قومس، و ابعث على مقدمته سماك بن مخرمة، و على مجنبته عتيبة بن النهاس و هند بن عمروا الجملي.)[230]

نەعیم (سوەیدی کوڕی موقرین)ی برای نارد بە سوپایەکەوە بۆ شاری (قومس) و بە ئاشتی ڕێك کەوتن.[231]

ئیبن ئەسیر دەڵێت: (عومەر نامەی نووسی بۆ نەعیم کە (سوەید)ی برات پێش بخە بۆ قومس. بە ئاشتی گرتیان.[232] عومەر نامەی نووسی بۆ (عروه کوڕی زەید) کە بە سوپایەکەوە بگاتە قوم و کاشان لە باکوری ڕۆژهەڵاتی شاری ئەسفەهانەوە، بە ئاشتی رزگاری کرد. پاشان نامەیەکی بۆ نوسیەوە و دەست خۆشی لێ کرد و پێی وت: (نەجوڵێی هەتا نامەت بۆ دەنووسمەوە.) نامەیەکیشی بۆ ئەبوموسای ئەشعەری نووسی لە بەسرە کە بە سوپایەکەوە بگاتە ئەسفەهان بۆ یارمەتی عەبدوڵلا.

## نهێنی سەرکردایەتی عومەر

لە ژیانی خەلیفە عومەردا نهێنی شاراوەی ورد هەیە، کە لە مرۆڤی ئاسایی ناچێت. توانایەکی سەیری هەبوە لە سەرکردایەتی سوپا و حوکمداری میللەتدا. سەردەمی عومەر بە چەرخی زێڕین دەژمێردرێت بۆ دەوڵەتی

---

230. رسائل الفاروق: رسالة رقم (١٩٠) ص١١١.

231. قادة فتح العراق والجزيرة: اللواء الركن محمود شيت خطاب، ص١٢٧

232. الكامل في التأريخ: ابن اثير، ج٣ص١٠.

ئیسلامی، له دەسەڵاتی ئەودا سنوری دەوڵەت فراوان بوو بە جۆرێك کە بە چەندین سەدەی تر ئەوەندە فراوان نەبوو، نەدەبوو وە ئەوەندەش دەسکەوتی بە دەست نەهێناوە. ئەو سەرکەوتن و دەسکەوتانەی خەلیفە عومەر – رەزای خوای لێ بێت – ئەو فەتحانە لە دوو سیفەتیەوە وە بەرهەم هات:

یەکەم: توانایەکی بەهێزی هەبوو لە هەڵبژاردن و دیاری کردنی سەرکردە و فەرماندە و ئەمیر و فەرمانبەرەکانی دا، کەسی مناسبی لە جێی مناسب و پڕ بە پێستدا دادەنا.

دووەم: توانایەکی کارامە و وورد و ئیداری بەهێزی هەبوو لە سەرکردایەتی کردنی میللەتی ئیسلامیدا. ئەو توانایە موکتەسەب بوو، لە ئەنجامی تاقیکردنەوەی ژیان و هەڵس و کەوتی رۆژانە و ئەزمونی حوکمداریدا بە دەستی هێنابوو، بە توانا بوو لە دانان و دەست نیشان کردن و کۆکردنەوەو ناردن دا، چونکە قوتابیەکی بەردەستی پێغەمبەر و ئەبوبەکر بوو.

عومەر بۆ هەڵبژاردنی فەرماندە و سەرکردەکانی، کۆمەڵێك خاڵی هەبوو رەچاوی دەکرد کە دەبوو لە کەسی بەرامبەردا هەبێت.

١- دەبوو سەحابە بێت، نەیدەهێشت غەیری سەحابە ئەمیر بێت بەسەر سەحابەکانەوە چ لە کاری سەربازی یان مدنی دا.[234]

٢- فەزڵی سەحابەی کۆنی دەدا بەسەر سەحابەی تازەدا، هەرواش لە خۆیەوە کاری نەئەدا بەسەریاندا.

٣- کەسێکی هەڵدەبژارد خۆگر بوایە، هەڵنەچوایە، لە دووی هەل بگەڕایە، بیقۆستایەتەوە، بیزانیبایە کەی کاتی شەڕ و هێرش و خۆگرتنەوەیە.

٤- کەسێکی دادەنا بەهێز و زاڵ بوایە، هەر کات کەسێکی بەهێزتری دەست کەوتایە، هەر خێرا ئەوی تری دەگۆڕی، معاویەی خستە جێی شەرحەبیل، وتیان بۆ؟ وتی: (اني لم اعزله من سخط و لكن اريد رجلا اقوى من

---

[233]. الاصابة في تميز الصحابة: ج١ص٣٠٩.

رجل.) شەرحەبیلیش وتی بۆ لات بردم؟ عەیبم چی بوو.؟ قسەکەی نەگۆڕی وتی: (ارید رجلا اقوی من رجل!)[234]

که سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسی نارد بۆ سەرکردایەتی سوپای عێراق وتی: (انه رجل شجاع رام).[235]

٥- که سوپایەکی کۆکردایەتەوە، کەسێکی دەکردە ئەمیریان خاوەن فقهو زانست بوایە.

٦- خەڵکی بیابان و لادێکانی نەدەکردە ئەمیر بەسەر خەڵکی شارەوە، جارێك (عوتبەی کوڕی غزوان) ئەمیری بەسرە هات بۆ مدینە، عومەر وتی کێت داناوە بەسەر خەڵکی بەسرەوە لە جێی خۆت، وتی: (مجاشع کوڕی مەسعود). عومەر زویر بوو، فەرموی: ئایا کەسێکی لادێیی دائەنێی بەسەر شاریەکانەوە.[236] چ سەرکردەیەکی ئەمڕۆ پابەندی ئەم ڕەوشتانە دەکات!

## جوڵان بەرەو ئەسفەهان بارەگای سەرکردایەتیو سێیەم پایتەختی یەزدگورد

یەزدگورد لە دوو پایتەخت (مەدائن) و (حەلوان) هەڵکەندرا، خۆی ئاڵاندە شاری (ڕەی)، پاشای شار ڕێگەی نەدا. ناچار هاتە خوارەوەو لە (ئەسفەهان) جێگیر بوو، کردیە پایتەختی سێیەم و بارەگای سەرکردایەتی هەموو هێزەکانی.

ئێستە سوپای ئیسلام لە سێ لاوە گەمارۆی ئەسفەهانی داوە و لە ئان و سات دایە هێرشی بۆ بکرێ. شاری ڕەی دەکەوێتە باکوری ئەسفەهانەوە، هەمەدان دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای ئەسفەهانەوە، (قومس) دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی ئەسفەهانەوە، (قوم و کاشان) لە خواروی قومسەوەیە. (ئەهواز) دەکەوێتە باشوری ڕۆژئاوای ئەسفەهانەوە.

---

[234]. الكامل في التأريخ: ج٣ص٦.

[235] . فتوح البلدان: بلاذري، ص٢٥٥.

[236].الرسول القائد: محمود شيت خطاب، ص٤٢٧.

ئێستە سوپای ئیسلام ئەو شارانەی گرتووە کە ناومان بردن، یەزدگورد ڕێگەی نەماوە بۆ هیچ لایەك ڕا بکات، جگە ڕێگایەکی تەسك کە دەیگەیەنێت بە (هەرێمی فارس)، کە شوێنی لە دایك بوونی رەگەزی فارسەو لەوێوە بۆ هەرێمەکانی تر بڵاوبونەتەوە. پێشتر وتم کە عومەر زۆر بە مشومرە بوو، پرس ورای بە گەنجان دەکرد و دەیگوت ئێوە بیرتان تیژە گوێی لە (ئەحنەف) دەگرت کە سەرکردە و پیر و پیاوماقوڵی کوفە بوو، وتی ئەحنەف ڕێگەمان بدە با بچینە ناو خاکی فارس و یەزدگورد دەر بکەین چونکە هەتا ئەو بمێنی خەڵکمان لێ هان دەدات. پرسی بە دوژمنیش دەکرد، بە هورمزانی وت: ئەسفەهان و هەرێمی فارس و ئازربایجان کامیان گرنگترە هێرشی بۆ بکەین. هورمزان راستی وت: ئەسفەهان سەرە بۆ لاشە، فارس و ئازربایجان دوو باڵەکەیە.[237] عومەر تێگەیشت کە ئەگەر سەر پان بکاتەوە، دوو باڵەکە لە پەل و پۆ دەکەون، هەر بۆیە لەسەری توند کرد. هێرش لەسەر ئەو شوێنە گەرم بوو کە یەزدگورد خۆی تیا حەشار داوە.

نەخشەی هەموو هەرێمەکان لەبەردەستی عومەردا بوو، ناوی هەموو سەرکردە و فەرماندە و کارگێڕەکانی تۆمار کردبوو، لەسەر عیلم و زانست و بە بەرچاوی روونەوە کاری دەکرد. عومەر بڕیاری هێرشی دەرکرد، یەزدگورد زانی چاری ناچارە، سێ بارە خۆی کۆکردەوە و ئەمجارە بەرەو هەرێمی فارس، سەری خۆی هەڵگرت و کەسێکی کردە پاشای شار بە ناوی (مەزاربە فازوستان).

عەبدوڵڵا کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە کرا بە سەرکردەی ئەو سوپایە. ئەو کاتە بنکەی سەربازی فارس لە شاری (جی) بوو لە نزیك ئەسفەهان. عەبدوڵڵا ئەمیری کوفە بوو، بەڵام بۆ سەرکردەی جەنگی باش بوو هەتا ئەمیری هەرێمێك " هەر بۆیە عومەر نامەی بۆ نووسی بیێتە سەرکردەی سوپایەك بۆ ئەسفەهان وە یارمەتی دا بە ئەبوموسای ئەشعەری والی بەسرە، کە سوپایەك

---

237. رسائل الفاروق: رقم الرسالة(٤١١)ص٢٢١، جمع و تخريج عبداللطيف اسماعيل الجبوري، ١٩٨٩.

ببات و ببێتە فەرماندە لەبەردەستی عەبدوڵڵادا، عەبدوڵڵا لە نەهاوەندەوە دەرچوو، هەموو سوپاکەی نیعمانی کوڕی مقرنی پێ بوو، شەڕێکی قورس قەوما، ناوچەی (رستاقی شێخ)یان گرت [238]. فارسەکان گەڕانەوە بۆ(جی) کە ئێستە پێی دەڵێن (شهرستان)[239]، بنکەی سەربازی فارس لەوێ بوو، شارێکە بە پیت ترین و ئاوەدانترین خاکی هەیە، جێیەکی فێنکە " پاشاکان کردبوویان بە جێگەی خۆیان.[240] شورایەکی گەورە دەوری شاری دابوو، قەڵای سەختی تیا دروست کرابوو.

ماوەیەکی زۆر گەمارۆی شاریان دا فارسەکان هاتنە دەرەوە و بەرامبەر یەك وەستان. بەڵام سەرکردەی فارس کە نازناوی (فازوستان)[241] بوو، ناردی بۆ لای عەبدوڵڵا: (نە هاوڕێکانم بکوژە، نە هاوڕێکانت دەکوژم، با تەنها من و تۆ زۆران بگرین. گەر من تۆم کوشت، ئەوا بگەڕێنەوە، گەر تۆ منت کوشت سوپاکەم تەسلیمت دەبێ، کە بۆ هیچ کەسێك سەرشۆڕ ناکەن.) عەبدوڵڵا وتی باشە، زۆرانیان گرت، فازوستان سەرەی بوو، شمشێرێکی دا لە قایش و پاڵوی ماینەکەی عەبدوڵڵاو پچڕاو زینەکەی کەوتە خوار، عەبدوڵڵا کەوت و بە روتی سوار بویەوە، بەڵام زۆر رقی هەستا. شمشێرەکەی راوەشاند. سەرەی بوو پەلامار بدات، فازوستان ترسا و وتی: (بەسە. تۆ پیاوێکی تەواوی، حەز دەکەم رێك بکەوین. هەرچیتان گرتوە بۆ خۆتان، ئەمەولاشتان دەدەینێ، بەڵام با ئێمە بۆ خۆمان دانیشین و جزیە بدەین.) لەسەر ئەوە رێك کەوتن. بەم جۆرە هەموو هەرێمی ئەسفەهان ساڵی ٦٤٣زایینی گیرا. پاش ماوەیەك (فازوستان) بە خۆی و سی سوارەوە هەڵهاتن و خۆیان گەیاندە لای یەزدگورد. مەرزبانی (تەبەرستان) ناردی بە شوێن یەزدگوردا کە بچێتە لای، جێی ئەوان شاخاوی

---

[238]. الكامل في التأريخ: ج٣ص٧

[239]. معجم البلدان: ج٣ص١٩٦

[240]. قادة فتح العراق والجزيرة: ص٤٤٨

[241]. فازوستان: لەقەبێکە تەنها لە چوار حاکمی دەوڵەتی فارسی دەنرا.

و قایم و سەختە. کارل بروکلمان دەڵێت: قبوڵی کرد[242] . بەڵام تەبەری دەڵێت: قبوڵی نەکر[243] . ئەوەی تەبەری راست ترە، چونکە یەزدگورد دەست بەجێ لە ئەسفەهان هەڵهات و چوو بۆ ئەستەخر لە هەرێمی فارس[244]. یەزدگورد شاری ئەستەخرِ (برسیبولس)ی هەڵبژارد چونکە شوێنی لە دایك بوونی (ئاریە) و لانکی ئاری نەژادە، شارێکی ئاینی بوو، پەرستگای زۆری تیا بوو، یەزدگورد پاشای فارس وای دەزانی خەڵکی لەبەر پیرۆزی ئەو شارە بەرگری و کۆمەك و پاڵپشتی لێدەکەن.

## یەزدگورد لە نێوان ئەستەخرو کرمان دا

یەزدگورد بە خاوخێزان و کەس وکار و دەست وپێوەند و پاشا و میرە هەڵهاتوەکانەوە لە شاری (ئەستەخر) نیشتەجێ بوو، ئەم هەواڵە گەیشتە عومەر.

کە (فازوستان) گەیشتە لای یەزدگورد و هەواڵی سەرکەوتنی موسوڵمانەکانی لە ئەسفەهان گێڕایەوە، یەزدگورد تێك چوو، یەکێك لە پیاوماقوڵانی شاری بانگ کردو پێی وت: (بۆم دەرکەوتوە و من دەزانم کە ئەم عەرەبانە تەنها دوای من کەوتون. من دەچم بۆ هەر شارێك، دێن بە دوامدا. لەبەرئەوە بەلای منەوە شاری کرمان لە هەموو جێیەك باشترە و دورترە. هەق وایە ئێوەش بەرگری لە شار و ماڵتان بکەن.)

یەزدگورد (ئەستەخر)ی جێهێشت و چوو بۆ (کرمان) و لە کۆشکی (هەزارمێرد) دابەزی، سوپای ئەستەخرِ خۆیان کۆکردەوە و چونە دەرەوەی شار.[245] هەواڵ گەیشتە (عەبدوڵڵا)، ئەویش (ئەبوموسای ئەشعەری) بۆ ناردن بە (١٧) هەزار کەسەوە. لە ئەسفەهانەوە کەوتنەڕێ، بەرامبەر یەك وەستان. ئەبوموسا وتی: هەر هەموومان بەیەك دەنگ هاوار بکەین (الله اکبر). هەتا

---

[242]. تأريخ الشعوب الاسلامية: كارل بروكلمان، ص١٠٤، الطبعة السابعة، دارالعلم، بيروت١٩٧٧.

[244]. كتاب الفتوح: ابن اعثم الكوفي، ج٢ص٧٠.

[245]. تأريخ الامم والملوك: الطبري، ج٣ص٢٣٧.

هێزیان تیابوو بەرەو ڕووی دوژمن هاواریان کرد. ئەم دەنگە ترس و لەرزی خستە دڵیانەوە، شتی وایان نەبیستبوو، لە ماوەیەکی کەم دا مەیدانی جەنگیان جێهێشت و شاریان چۆڵ کرد.

هەواڵ گەیشتە یەزدگورد کە فارسەکان بەبێ شەڕ شاریان چۆڵ کردووەو سوپای ئیسلام بەڕێوەیە، ئەو کاتە هەموو دەست و پێوەند و ماقوڵانی کرمان لای یەزدگورد دانیشتبون. کە ئەو هەواڵەیان بیست، تۆقین، وردە وردە کۆبوونەوەکەیان چۆڵ کرد. دەیانزانی نەگبەتی ئەم وڵاتە بەم پاشا کلۆڵەوەیە، خەفەت پاشای داگرتبوو، کەس وکار و پاشا و ئەمیر و کوڕانی پاشایانی پێشوو دۆش دامابوون. هیچ هەیبەتێکیان نەما بوو، لە جەنگی (حەلوان)ەوە خەڵکی باسی دەکەن و گلەیی لێ دەکەن، پاڵپشتی تەواو کەم بوو بوو، هیچ هەرێمێك حەزی نەدەکرد ڕوویان تێ بکات، مەگەر بە تەماعی ئەو خەزێنە و مجەوهەرات و ماڵ و موڵکە بێ پاسەوانە کە لە سەدان ولاخ بار کرابوو. یەکێك لە ماقوڵانی شاری کرمان کە پێشتر لای یەزدگوردی چۆڵ کرد بوو، لە دەرەوە هاواری کرد بوو، ئەم بەڵایە چییە تێمان ئاڵاوە! من وا دەبینم نەگبەتی ئێمە بەم پیاوەوەیە، هاتە ژوورەوە بۆ لای یەزدگوردو وتی: (ئەی پاشای کلۆڵ و نەگبەت، من قسەیەك دەکەم تۆ وەڵامم مەدەرەوە، ئێمە سەیرین نەك تۆ! ئێمە سەیرین کە شتی وەکو تۆمان کردوەتە پاشای خۆمان.) ئەنجا قاچی گرت و لەسەر تەختی پاشایییە بێ زەوقەکەی ڕایکێشایە خوارەوە و بە بۆڵە بۆڵ چووە دەرەوە. ئەم هەواڵە لە شاردا بڵاوبویەوە، زۆر لە هەیبەتی پاشای کەم کردەوە، ئەوەی لەگەڵی بوو لە خێزان و دەورووبەر دەستیان کرد بە گریان. بە خەفەت و مەئیوسیەوە داوای لە دەست وپێوەند کرد، وڵاخەکان ئامادە بکەن و بەرەو خۆراسان کەوتنە ڕێ![246]

---

[246]. کتاب الفتوح: ج٢ص٧١-٧٢.

# بەشی شەشەم

* کوردستان لە نێوان نەخشەیەکی دوو سەرەدا
* موسوڵمانێتی کورد لە پێنوسی مێژوونووسانەوە.
* شارە کوردییەکان بە ئاشتی رێکدەکەون.
* رزگارکردنی باب و ئەرمینیـــــا

## کوردستان لە نێوان نەخشەیەکی دوو ســـــەردا

جەنگی نەهاوەند سەرکەوتنی زۆری بە دەمەوە بوو، دوای ئەوە فارسەکان نەیان توانی لەسەر رایەك، یان لە بەرەیەکی یەکگرتوودا کۆببنەوە، بەڵکو بە چاوێکی شوم و نەگبەتیەوە دەیان ڕوانیە یەزدگوردی پادشاو، وەك دومەڵێکی لێ هاتبوو لەبەرچاوی نەك میللەتە ژێردەستەکان، بەڵکو فارسەکان خۆشیان و بە ئاواتەوە بوون ئەو ملۆزم و مۆتەکەیان لە کوڵ بێتەوەو شەڕ کۆتایی بێت!

عومەر دەیزانی، نە سوپای فارس و، نە یەزدگوردی پادشا، قورسی سەربازی و سیاسیان لە ئەرزی واقیعدا نەماوە، وەك تەنێکی نامۆ و بێزراویان لێ هاتوە و، مانەوەیان بە خراپ دەزانن. لەبەرئەوە بڕیاری دا بەرەیەکی جەنگی تر بکاتەوە و سوپایەکی تر بنێرێ. چونکە دەیزانی ئیمپراتۆریەتی ساسانی لەبەریەك هەڵوەشاوەتەوەو بە کەمترین سوپاوە بۆ کوێیان بوێ بەرگریان نیە و دەتوانن بۆی بڕۆن.

ئەو کاتەی کە عومەر لە (هورمزان) پاشای دەستگیرکراوی ئەهوازی پرسی: رات چیە بەرامبەر ئەسفەهان و فارس و ئازربایجان. هورمزان وتی: (ئەسفەهان) وەك سەرە بۆ لاشە. ئازربایجان و فارس دوو باڵن. عومەر تێگەیشت دەبێ لە پێشەوە سەریان پان بکانەوە. ئەوسا دوو باڵەکە لە پەل وپۆ دەکەون، لەبەرئەوە سوپای نارد بۆ ئەسفەهان و گرتی و سەری تەواو کرد. هەر لە ئەسفەهانەوە سوپای نارد بۆ هەرێمی فارس و شاری (ئەستەخر) ی رزگار کرد، سوپای خستە دوای یەزدگورد هەتا نەهێڵێ بحەوێتەوە. دوای ئەوە بەرەیەکی تری جەنگی کردەوە، هەتا باڵەکەی تریش کە ئازربایجانە تەواو بکات و سەر و هەردوو باڵ لە بەردەم سوپای ئیسلامدا نەمێنێ و، کۆتایی بە ئیمپراتۆریەتی ساسانی فارسی بهێنێ، کە بە درێژایی هەزار ساڵ زیاترە دەستی لە گەردنی میللەتە ژێردەستەکاندایە، کورد سەری بۆ هیچ داگیرکەرێك دانەنەواندوە، ئەگەر ئیسلامی بە داگیرکار بیزانیایە، بەرەنگاری دەوەستا، بەڵام لە هیچ جێیەکدا تاکە رمێکی بەرامبەر رانەگرتوە.! هەر بۆیە

نه (عومەر) وە نه (هورمزان) باسی کوردستان و هەرێمی چیا و شارەزوور ناکەن و لەو سەر و دوو باڵەدا ناویان نیە.لە هیچ مێژوویەکی بڕواپێکراودا نیە کە کورد سوپای کۆکردبێتەوە یان خەڵکی هان دابێ دژی ئیسلام.بە گوێرەی هەموو مێژوونووسەکان، کوردستان ئاسانترین وڵات بوو کە لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا رزگار کرا.

جگە ئەو سوپایەی کە دوای یەزدگورد کەوتبوو، عومەر نەخشەیەکی تری دوو سەرەی دارشت و بەرەو ئازربایجان ناردی، ئەم نەخشەیان بە هەردوو دیوی کوردستاندا دوو سوپا دەنێرێ و ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە، کە بە رۆژهەڵات و رۆژئاوی کوردستاندا سەردەکەون، هیچ شەڕێك لەگەڵ کوردەکاندا رونادات، کورد رێیان لێ ناگرن، خەڵکیان لێ هان نادەن و کۆناکەنەوە. بەڵام هەر لەگەڵ خاکی کوردستان دەبڕن و دەگەنە ناو خاکی ئازربایجان و ئەرمینیا لە سەروی کوردستان، شەڕی خەست و گەورە روو دەدات کە پادشای ئەو دوو وڵاتەی تیا بەشدارە. هەموو مێژوونوسەکان ئەم دوو شەڕەیان بە وردی گێڕاوەتەوە، بەڵام بۆ کورد هیچیان تۆمار نەکردوە، بڵێی هۆی ئەمە چی بێت.؟ پێشتر لە جەنگی (حەلوان) دا باسم کرد کە پێش (٥)ساڵ بەر لەم سوپا دوو سەرەیە، کوردەکانی شارەزوور لە موسڵەوە تا هەمەدان بە هەولێر و زاموا (شارەزوور)[247] و دەشتی هەولێر و ماهێشتی کرماشانەوە، بۆ پاڵپشتی لە سوپای ئیسلام و راگەیاندنی موسوڵمان بونی خۆیان، راپەڕینێکی جەماوەریان سازدا لە دژی دام و دەزگای فارسەکان و کوردستانیان لێ پاك کردنەوە. بۆ وەڵامی ئەوە یەزدگورد لە حەلوانەوە دوو هەزار چەکداری لە هێزی تایبەت بە سەرکردایەتی(پاو) بۆ ناردن بۆ سەرکوت

---

[247]. شارەزوور دەشتێکی فراوانە، دەکەوێتە نێوان هەمەدان و هەولێر لە هەرێمی چیا. (معجم البلدان. ج٥ص٣١٢) (اثار البلاد واخبار العباد، القزويني. ص٢٩٧). بەڵام (بلاذري، ص٣٢٩) دەڵێت: بەردەوام شارەزوور و دەستگاکانی سەر بە موسڵ بوون، هەتا سەردەمی عەباسیەکان و کۆتایی خەلافەتی هارونە رەشید، ئیتر گۆڕانکاری تیا کرا.

**کردنیان.[248] بەڵام سەرنەکەوت و نەیتوانی لە هەورامانەوە سوپا بەرێتە خوارەوە بۆیان. لەو رۆژەوە هەتا ئەمڕۆ و، نەخشە دوو سەرەکەی خەلیفە عومەر، ئەم وڵاتە ئارامە و، خۆیان حوکمی خۆیان دەکەن، نەخشەکەش بەم جۆرەیە:**

**بەلازەری دەڵێ: عوتبەی کوڕی فەرقەدی سەلەمی لە شارەزوورەوە کەوتە ڕێ بۆ رزگار کردنی ئازربایجان.[249]**

**مەحمود شیت خەتاب و بەلازەری دەڵێن: بکیر[250] کوڕی عەبدوڵڵای لیسی لە حەلوانەوە نێررا بۆ رزگارکردنی ئازربایجان.[251]**

**بەڵام تەبەری دەڵێ: (کە عومەر مۆڵەتی دا بە سوپای ئیسلام بکەونە ڕێ و بڵاو ببنەوە بە وڵاتی فارسدا، بکیر و عوتبەی نارد بۆ فەتحی ئازربایجان و**

---

[248]. مێژووی کوردو کوردستان: محمد مەردۆخی کوردستانی، ل١٨٤-١٨٥. مطبعة اسعد، بغداد١٩٩١.

[249]. فتوح البلدان: بلاذري. ص٣٢٢

[250]. بکیر کوڕی عبدالله لیسی: هەر بە منداڵی موسوڵمان بوو، لە نزیک پێغەمبەرەوە دروودی خوای لەسەر بێ گەورە بوو، هەر بە منداڵی خزمەتی پێغەمبەری دەکرد، کە باڵق بوو بە پێغەمبەری وت: ئەی پێغەمبەری خوا من گەورە بووم، بومەتە پیاو، حەزدەکەم بێم بۆ ماڵی ئێوە. پێغەمبەر رازی بوو، فەرموی (اللهم صدق قوله ولقه الظفر) (اسد الغابة.ج١ص٢٠٤). بکیر لە جەنگەکانی باشوری عێراق لە قادسیە و حیرەدا بەشدار بوو، یەکەم کەس بوو لە جەنگی (مدائن) لە ئاوی دجلە پەڕیەوەو بە ئەسپەکەی وت (ثبي اطلال وثباً) چوە ئاوەکەوەو خەڵکیش بە دوای دا. ئازربایجانی رزگار کرد، ویستی بچێتە (باب الابواب)، بەڵام (سوراقە) پێشی کەوت، پاشان سوراقە ناردی بۆ (موقان). ئەبوبەکر لەگەڵ سەعد ناردی بۆ عێراق کە بچێتە (حیرە) سی کەسی لەگەڵ بوو، لە رێگە دەبینێ خوشکی گەورەی حیرە لەگەڵ کۆمەڵێك ئافرەت رەقس و سەما دەکات بۆ ئاغایەکی فارس، پەلاماری دان گەورەکەیانی کوشت و ئافرەتەکانی رزگار کرد. (طبري: ج٣ص١٢).

جارێك لە مەدینە لەسەردەمی عومەردا جولەکەیەك کوژرا. عومەر لەسەر مینبەر وتی: خوا منی کردوەتە خەلیفە و کەسێك دەکوژرێ من پێی نازانم. پاشان وتی: (ئەوە کەسێك نیە پێم بڵێ کێ بووە.؟. بکیر هەڵسا وتی: من بووم. چونکە بینیم کە رای دەبوارد بە ژنی مجاهدێك. منیش خۆم بۆ نەگیرا. (اسد الغابة: ج١ص٢٠٤).

[251]. قادة فتح العراق والجزيرة: اللواء الركن محمود شيت خطاب. ص٤٦١. دارالفكر، بيروت١٩٧٧.

عەقدی لەگەڵ کردن و هەریەکە رێیەکی بۆ دیاری کردن و ئامانجێکی بۆ دەست نیشان کردن، داوای لە عوتبە کرد کە لە حەلوانەوە پێش بکەوێت بەلای راستدا بەرەو باشوری ئازربایجان، بەڵام داوای کرد لە بکیر کە پێش کەوێت بەلای چەپ دا لە موسڵەوە و لەوێوە بۆ باکوری ئازربایجان.) [252]

پاشان یارمەتی بۆ (بکیر) نارد، عومەر داوای کرد لە (سەمماك کوڕی خرشەی ئەنساری) ئەم پیاوە ئەبو دجانە نیە. کە لە شاری (رەی)یەوە بکەونە رێ بەرەو (بکیر).

کە گەیشت دەبینێ (بکیر) تووشی دەرگیریەك بوە لەگەڵ سوپای فارس لە کێوی (جرمیزان) لە ناوچە شاخاویەکانی سەر سنوری ئازربایجان.[253]

بکیر لەحەلوانەوە بە ناو سنوری کوردستاندا دەڕوات هەتا دەگاتە ناو ئازربایجان، لەو هەموو رێگەیەدا شەڕێك لەگەڵ کورد روونادات، بەڵام کە دەگاتە خاکی ئازربایجان دەبینێ سوپایەکی فارسی بە سەر کردایەتی (ئەسفەندیار) کۆبونەتەوە، پەلاماریان دەدەن، فارسەکان دەشکێن و ئەسفندیار دەگیرێ.[254]

شتێکی سەیرە، ئەو هەموو جموجۆڵە سەربازیە، کردنەوەی ئەو هەموو بەرە جەنگیە، ئەو کوردستانە فراوانە، کوردستان پڕە لەجێی تەماع، شاری گەورە و دەشتی فراوانی کشت وکاڵ و وڵاتی پڕ بەراو و ڕوبار و ئاودار. شاری هەولێر ـ ئەربیل ـ ئەربائیللو کە کۆنترین شاری رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، جێی تەماعی فارس و ڕۆم بوە. کەرکوك کە لە سەردەمی ساسانیەکاندا

---

[252]. تأريخ الطبري: ج٣ص٢٢٤.

[253]. قادة بلاد فارس: الواء الركن محمود شيت خطاب. ص٢٠٦. بيروت ١٩٦٥.

[254]. طبري: ج٣ص٢٣٤، ابن اثير (الكامل)، ج٣ص١٠-١١. دکتور محمد حسنين هيكل لە کتێبی (الفاروق عمر) دا، ج٢ص٤٤ دا دەڵێ: خەلیفە عومەر (سەماك)ی نارد بۆ یارمەتی (بکیر و عوتبە)... بەڵام راستیەکەی تەنها ناردی بۆ یارمەتی (بکیر) چونکە سوپاکان خۆیان جیابون و رێیان جیا بوو، هەدەفیان جیاواز بووە.

پێیان دەوت (گەرمەکان) واتە وڵاتی گەرم.[255] شاکر خەسباك وای بۆدەچێ گوتیەکان دروستیان کردبێ.[256] وە ئەسکەندەری مەکدۆنی ساڵی ٣٣٠پ.ز تەماعی تێ کردوە و پاشان پەلاماری ئەربیلی داوە، وە لە سەردەمی مادەکاندا ناوی (ئەرپخ) بوە، وە کۆنترین هەواڵی کەرکوك ئەوەیە کە لە پاشماوەکانی تەقویمی جوگرافی سەرجۆنی ئەکەدی دا هاتووە ساڵی(٢٥٣٠-٢٤٧٣) پێش زاین کە ناوی کەرکوکی بردوە بە (ئەرپخ).[257] ئەم شارە کۆن و پڕ قەڵاو شارستانیانە. کەچی سوپای ئیسلام ڕویان تێ ناکات. سوپای ئیسلام دەدات بەلای کەرکوك دا و دەچێت بۆ هیت و تکریت و موسڵ و قرقیسیا. ئەو هەموو لە شکرکێشی و جەنگانە بوە، دەستیان بۆ کەرکوك و هەولێر نەبردوە، ئەو هەموو سوپایەی فارس و ڕۆم لەو شارانەدا کۆبونەوە دژی ئیسلام. کەچی لە کەرکوك و هەولێرەوە خۆسازدان و خۆکۆکردنەوە نەبوو دژی ئیسلام. ئەمانە ئەگەر مانایەك ببەخشن، هەر ئەوەیە کە ئەو ڕاپەرینە سەرانسەریە جەماوەریە کوردیەی شارەزوور، لە هەمەدانەوە بۆ هەولێر و موسڵ دەوری خۆی بوە و کاریگەری لەسەر خەڵکی هەبوە، سقەی کوردی لای موسوڵمانەکان پتەو کردوە و ئازادی کردون. لە ئیسلامدا ئازادی تاك و کۆمەڵ پارێزراوە. لە منتیقی ئیسلامدا هەموو میللەتێك لە هۆز و خێڵ و خێزان پێك هاتوە. (وجعلناكم شعوبا و قبائل لتعارفوا)[258] یان لە بارەی زمان و ڕەنگەوە دەفەرموێ: (ومن اياته خلق السماوات والارض واختلاف السنتكم والوانكم، ان فى ذلك لآيات للعالمين)[259] لەبەرئەوە ئیسلام دان دەنێ بە زمان و ڕەنگ و " مافی هەموو کەس و میللەت و هۆزێکی داوە. ماف لە بنەڕەتدا جەعلێکی خواییە، هەموو کەس و گەل و هۆز و میللەتێك دەبێ داوای بکا و

---

[255]. منطقة كركوك و محاولات تغير واقعها القومي: الدكتور نوري طالباني. ص٩. لندن ١٩٩٥.

[256]. الكرد والمسألة الكردية: الدكتور شاكر خصباك. ص١٤. بغداد١٩٥٩.

[257]. منطقة كركوك. دكتور نوري طالباني. ص١٣.

[258]. القرآن الكريم. سورة الحجرات، آية ١٣.

[259]. القرآن الكريم. سورة الروم — آية ٢٢.

هەولّی بۆ بدات. مینحەیەکی خواییە دەبێ پارێزراو بێت. خوای گەورە خۆی ڕەنگ و زمانی کردوە بە ئایەتی خۆی: (ومن الناس و الدواب والانعام مختلف الوانە كذلك: سورة فاطر / ٢٨) هەر کەس دەیەوێ ڕێز لە ئایەتی خوا بگرێت، با ئەو دوانە پێشێل نەکات. مافێك خوا دابێتی، مرۆڤ ئەگەر بڕوادار بێت بە خوا و بە قورئان، چۆن دەبێ زەوتی بکات، لە ئیسلامدا لە قورئاندا تاك مافی هەیە، گشت (کۆ) مافی هەیە، زەوت کردنی یان خواردنی مافی یەك کەس، وەك خیانەت کردنە لە مافی کۆ، هەموو میللەتێك مافی ئەوەی هەیە خۆی دەربخات، خۆی نیشان بدات، چی باشە بۆ خۆی و زمان و خاك و ڕەنگ و ڕوی بیکات، نابێ بهێڵێ بیتاوێننەوە، زمانی یاساغ بکەن، بە جیاوازی لە کەسانی تر سەیری بکەن، یان بەشی بدەن، با بچوکەکان لە گەورەکاندا نەتاوێنەوە، خۆیان نەهێڵن بتاوێنەوە، خۆیان بە پاشکۆی گەورەکان نەزانن. وە بۆیان هەیە هەموو شێوازێکیش بەکاربهێنن، بە گوێرەی کات و سات و شوێنی گونجاو و لەبار، بۆ سەندنەوەی مافیان.

هەر لەو ڕوانگەیەشەوە وەك لیوا شاکر دەڵێت[260] کە ئیسلام شارێ یان وڵاتێکی ڕزگار دەکرد، بەجێی دەهێشت بۆ خەڵك و دانیشتوانی خۆی، مەگەر بیویستایە لە هێزێك بیان پارێزێ حیمایەی بۆ دابنانایە، دەنا خۆیان ئازاد بوون بە هەموو مانای ئازادی. کورد هەستی بە هەموو ئەمانە کرد، هەر بۆیە وەری گرت، خۆیان لە شەڕەکانەوە نەدەئالاند، دوریان دەگرت و خۆیان پسکە کردبوو هەتا بزانن بەچی دەگات، وەك بلێی چاوەڕوانیان دەکرد، هەتا بکەوێت بە بارێکی خێردا. ئەو بارەی کە ئەوان دەیانویست، ئەمەش لە خۆوە نەبوو، یان لە ترسان نەبوو، کێ هێندەی کورد ئازایە بە تایبەت ئەگەر بداتە لایەنی شەڕ هەر نایبڕێنێتەوە.!، خۆی دەفەوتێنێ و واز ناهێنێ! کە ئاینی زەردەشتیان لە کورد داڕنی و، کرایە ئاینی فارس و ئیمپراتۆریەتی فارس، هەموو ناوە کوردی و پاشای کورد و خاکە کوردیەکانیان لە ئاوێستا گۆڕی،

---

[260]. يرموك. اللواء الركن، شاكر محمود. ص١٣٩، ١٩٨٦. بغداد

دەسکاری کراو زیاد و کەمی بۆ کرا، ئیتر کورد لە بۆشاییدا دەژیا، دەبوو ئەو بۆشاییە پڕ ببێتەوە، ئەوە یاسای سروشتە! ناچار بوو بگەڕێ بە دوای مژدەکانی زەردەشت و ئاوێستا[261] و ماریفەتی پیر شالیاردا[262].لە دوی ئاینی نوێ و پێغەمبەری نوێ دەگەڕا، کە ئیسلام سەری هەڵدا، هەر خێرا لە چەند جێی کوردستانەوە بە نهێنی نوێنەریان نارد بۆ حیجاز، هەر کە ناسیان خۆیەتی. راوەستان، دەست بەرداری فارس و رۆم بوون، چاوەڕوانیان کرد هەتا سوپای ئیسلام گەیشتە سنورەکانی کوردستان، ئەوسا لە خاکی کوردا بەیەك شادبون و ئازاد بون و حەوانەوە. پڕ بەسیەکانیان هەناسەی بەختەوەریان هەڵمژی! زۆر سودیان لە ئاین وەرگرت، بەرهەمی زۆریشیان دابە ئیسلام، کاتی خۆی ئاینی زەردەشتیان کردە فاکتەری دروست کردنی دەوڵەتی میدیا ئەمە پێش ئیسلام. لە ژێر سایەی ئیسلامیشدا زیاد لە (٦٠) دەوڵەت و میرنشینی کوردیان دروست کرد، کورد عەقڵیەتێکی بەمێزی هەیە بۆ حکومەتداری، ئەگەر هەمان هۆکانی کاتی خۆی بۆ بێتە پێش. کورد حەزی لە ئاینە، بۆی دەمرێ، هەر وەکو پێشوتر بۆی مردوە، مێژوونووسان ئاوا وەسفی کوردستانیان کردوە: (کوردستان لانەو لانکی ئاین بوە.)[263]

خەڵکی کورد ساتێك بێ ئاین نایانکرێ. هەر وەك پێشوتریش بەبێ عەقیدەو بیروباوەڕ نەیانکراوە. نموونە زۆرە. (پیروەت کوڕی بارام) کە زاناو عاقڵمەند و ژیرێکی کورد بوە لە ناوچەی (مەرجێن)[264] واتە (مەرگە) لە بۆسەدا بوە کە ئەو پێغەمبەرە سەرهەڵبدات کە ئاوێستا و زەردەشت و پیرشالیار مژدەیان پێداوە، کاتیشی دیار بوو، هەموو جار لە کوردستانەوە لە ناوچەی مەرگە لە پارێزگای (سلێمانی ئەمڕۆ) وە تونشوی دەپێچایەوە دەکەوتە ڕێ بۆ

---

261. ئاینی کورد لە تۆفانی نوحەوە تا سەرەتای ئیسلام:حسن محمود حمە کریم. ل١٥-١٨، چاپی سێیەم، ١٩٩٨.

262. پیرشالیاری زەردەشتی، ل١٨.

263. گۆڤاری رامان: ژمارە (٢١)، لاپەڕە(٦٥).

264. کابانی کوردی: حسن محمود حمە کریم، ل٧.

شام بۆ لای راهیبە گاور و جولەکەکان بۆ هەواڵ زانینی پێغەمبەری نوێ و راگۆڕینەوە لەسەر مژدەکانی ئاوێستا و ئنجیل و تەورات بەرامبەر پێغەمبەری چاوەڕوان کراو. ئەو کاتەی ئەم سوپایە کە ڕەنگە(عوتبە) سەرکردەی بێت، دەچێت بۆ ئازربایجان. (پیروەت[265] )ی زانای کوردی زەردەشتی کە بە ڕوداوەکەدا دیارە دەمڕاستی ناوچەکە بوە، بە خۆی و دوانزە کەس لە ماقوڵان و سەرۆکەکانی کورد دەچن بۆ بارەگاکەیان لە (سیناجیان)، ئەوانیش دەیانبەن بۆ لای سەرکردەی سوپاکە، پیروەت دەڵێ: (ئارەزوی ئیسلام بون دەکەین.) سەرکردەی سوپاکە زۆری پێ خۆش دەبێ. هەمویان موسوڵمان دەبن[266]. ئێستەش لە ناوچەی مەرگە باس وخواسی پیروەت هەر ماوە، چاك وایە کۆبکرێتەوەو کاری لەسەر بکرێت. ئەم راستیانە تێکەڵە بە کۆمەڵێك بوختان و هەڵبەستراوبوەوناشرین کراوە، هەندێ مێژوونوسی کورد ئەم هەڵوێستەی پیرۆت (ئەگەر راست بێ) تاوانبار دەکات و ناو وناتۆرەی ناشرین دەخەنە شوێنی کە دواتر لە جێی خۆی دا باسی دەکەین!

بەڵێ. کە سوپای ئیسلام دەگاتە کوردستان. کورد دەستەوسان دانانیشن، وەڵامی ئیسلام دەدەنەوەو بە گیان و بەلاشە تێکەڵی دەبن. ژیانی دۆزەخیان بۆ دەبێتە بەهەشت، لە بەندایەتی خەڵك دەبنە بەندەی خوا، ئەو هەموو ئاینە جیاوازە لە زەردەشت و ئاگرپەرستی و مانی و مەزدەك و گاور و جولەکە بە لقەکانیانەوە گۆڕیان و کردیانە یەك ئاین، یەکیەتی و یەك ریزی و یەك دڵی بۆ کورد دروست کرد و، جیاوازی نێوانیانی نەهێشت. ئەو هەموو ئاغایەتی و میرایەتی و، هەر ناوچەیەك رای جیاواز و پیاوی لایەك بون، کۆی کردنەوە و کردنیە یەك مەبەست، جاران دوژمنی فارس و رۆم و عەرەب و ئازەر و ئەرمەن

---

[265]. کوردستان و ئاینی ئیسلام: رۆوف سلیم حوێزی: لاپەڕە ٩٧. چاپخانەی جامعە ١٩٧٠. ئەم کتێبە تەرجەمەی دەست نوسێکی فارسی بوە و ئەم نووسەرە بەناوی خۆیەوە بڵاوی کردۆتەوەو لەم ماوەیەدا پێی زانراوە، هەندێ دەست تێوەردانی تیا کردووە، زۆربەی بوختان و هەڵبەستە!

[266]. کابانی کوردی بە نوێنەری کورد دەگاتە حیجاز: حسن محمود حمە کریم. ل٧، چاپی سێیەم ١٩٩٨.

بون و ئەوانیش دەیان چەوساندنەوە، ئێستە بونەتە برا و لە ئاست و ریزی ئەواندا خۆیان دەبیننەوە. زوڵمی فارس و رۆمیان بە سەرەوە نەما. لە تەسكایی كوردستان خرانە ناو دەوڵەتێكی فراوان، هەتا خۆی و دەورووبەر بناسێت، ئێستە زۆری كەسیان بە سەرەوە نیە، خۆی خاوەنی خۆیەتی. ئەگەر جاران لە كاتی جەنگدا دەخرانە پێشەوەی سوپای فارس و رۆم و قەڵای دوژمنیان پێ دەروخاندن. وە لە ئاشتی دا كرابونە خزمەت كاری كۆشك و تەلار و ئاگردان و پەرستگاكانی فارس و رۆم. ئێستە بونەتە بەندەی یەك خوا و كێ لە خوا ترس تر بێ ئەوە لە پێشترە لای خوا. (لافرق لعربي علی عجمي الا بالتقوی.)[267] (وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا. ان اكرمكم عندالله اتقاكم.)[268]

بەڵێ دوو سوپا، بە دوو دیوی كوردستاندا بەلای راست و بەلای چەپ دا، لە رۆژهەلات و لە رۆژئاوای كوردستانەوە، لە دوو خاڵەوە، بە بڕیاری خەلیفە عومەر لە مەدینەوە بەرەو ئازربایجان دەكشێن. هەردوكیان یەك مەبەستیان هەیە دەبێ بیپێكن:

یەكەم: لە خاڵی شارەزورەوە بە سەركردایەتی عوتبەی كوڕی فەرقەدی سەلەمی راستەوڕاست بەرەو ژور و بەلای راستدا بەرەو باشوری ئازربایجان كشان بەم نەخشەیە: شارەزور، مهابات، مەراغە، دەریاچەی ئورمیە، تەبرێز پایتەختی هەرێمی ئازربایجان، لەم رێگەیەدا مێژوو هیچ بەرەنگاری و رێگریەكیان تۆمار نەكردوە، جگە پێشوازی كوردەكان بە تایبەت (پیرۆتی كوڕی بارام) زانای پایەبەرزی ناوچەی (مەرگە) كە بە خۆی و دوانزە كەس لە سەركردەكانی كورد دەچن بۆ لایان و ئیسلام بونی خۆیان رادەگەیەنن، وەكو واقیدی گێڕاویەتەوە.

---

[267]. حديث نبوي.

[268]. القرآن الكريم: سورة الحجرات، الآية ١٣.

دووەم: لە خاڵی حەلوانەوە، بە سەرکردایەتی (بکیر کوڕی عەبدوڵڵا لیسی) بە لای چەپ دا بەرەو ژوور بۆ باکوری ئازربایجان کشان بەم نەخشەیە: حەلوان، خانەقین، جەلولا، تکریت، موسڵ، عمادیە، ئورمیە (رەزائیە)، سلماس، خوی، مرند، تبریز. بروانە نەخشەی ژمارە (٦).

پاڵپشتی ئەم سوپایە دەکات بە سوپایەک کە لە شاری (رەی) بەرەو باکوری رۆژئاوا بکشێن و بگاتە سوپاکەی (بکیر). ئەم سوپایەی شاری (رەی) بە سەرکردایەتی (سەماک کوڕی خرشەی ئەنساری) بوو. کە (سەماك) گەیشتە لای (بکیر) دەبینێ لە ناو خاکی ئازربایجاندا توشی دەرگیریەك هاتوە لەگەڵ سوپای فارسدا بە سەرکردایەتی (ئەسفەندیار) لە کێوەکانی (جرمیزان) " بەڵام زۆری نەبرد چوار دەوریان دان و فارسەکانیان شپرزە کردو (ئەسفەندیار) و کۆمەڵێك گیران، (ئەسفەندیار کوڕی فرخزاد) تازە لە جەنگی سێ قۆڵی (واج رود) بە شکاوی گەڕابوریەوە، ئەمەشی بەسەر هات.[269]

لە شاخی (جرمیزان) لە باکوری رۆژئاوای هەمەدان لە ناو خاکی ئازربایجان گەیشتن بەیەك، شەڕێکی (یانزە) رۆژی قەوما. (سەماك) یش بە سوپایەکەوە لە شاری (رەی)ەوە هاتبوو بۆ یارمەتی (بکیر) گەیشتن بەیەك و گەمارۆی فارسەکانیان دا، فارس شکاو ئەسفەندیار یەخسیر کرا.

(ئەسفەندیار) بە (بکیر) ی وت: حەزت لە شەڕە یان لە ئاشتی.؟ بکیر وتی: ئاشتی. پاشای ئازربایجان وتی: (لای خۆت بمهێڵەرەوە، چونکە خەڵکی ئازربایجان جۆرێکن، ئەگەر من لەگەڵیان رێك نەکەوم و نەچم بۆ لایان و نەرمیان نەکەم، بۆتان ناوەستن، پەنا دەبەنە بەر شاخە بەرزەکان، خۆیان حەشار دەدەن و یارمەتی لە قەبەچ و رۆم وەردەگرن، ئیتر بە ئێوە چار ناکرێن.)

(بکیر) رازی بوو. ئەسفەندیاری نارد بۆلایان. هەموو هاتنەوە، رێکەوتنێکیان مۆر کرد، هەموو ئازربایجان ئازاد بوو، (بکیر) نامەی نووسی بۆ

---

[269]. تجارب الامم: ابو مسكوية الرازي. ج١ص٢٥٠. طهران ١٩٨٧.

خەلیفە عومەر. ئەویش دەسخۆشکەری لێ کردن، داوای لێ کرد نەوەستێ هەتا دەگاتە ولاتی (بابولئەبواب) کە بەندەرێکی گەورەیە لە سەروی رۆژئاوای دەریاچەی قەزوین (خەزەر) و باکوری ئازربایجان. ئەوێی رزگار کرد ئەوسا هاتە خوارەوە بۆ ناوچەی (موقان) و لەسەر ئەم خالانە رێك کەوتن: (ئەمە ئەو رێکەوتنەیە کەلە نێوان بکیر و خەڵکی موقاندا مۆر کرا لە شاخی قەبج، کە ئەمین بن لە ماڵ و نەفس و گەل و ئاینیان. لە پاداشتی ئەوەدا، لەسەر هەموو باڵقێك پێویستە سالانە یەك دینار بدات، لەسەر موسوڵمانەکانیش پێویستە وەفایان هەبێ و خوا کۆمەکی هەموو لایەك بکات. ئەگەر نکوڵیتان کرد، ئیتر ئەمین و ئەمان بۆ کەس نامێنێ، هەتا لادەران تەسلیم دەکەن.)[270]

تەبەری دەڵێ: (کە ئازربایجان رزگار کرا بکیر بۆ خەلیفە عومەری نووسی رێگەی بدات پێش بکەوێت. ئەویش رێگەی دا کە بچێت بەرەو بابولئەبواب و یەکێك لەجێی خۆی دابنێ. ئەویش عوتبەی دانا، بکیر پەلەی کرد بگاتە بابولئەبواب کە گەیشت، دەبینێ سوراقە پێش کەوتوە، پێکەوە گرتیان. پاشان سوراقەی نارد بۆ رزگار کردنی موقان[271].

---

[270]. قادة فتح بلاد فارس. اللواء الركن خطاب. ص٢٠٧.

[271]. ئازربایجان وشەیەکی فارسیە بە مانای (خاکی ئاگر) یان (پەرستگای ئاگر) دێت، ئەم ناوەی بۆ ئەوە لێ نراوە چونکە پەرستگای ئاگری زۆری تیا بوە پێش ئیسلام، ولاتێکی خۆش و مەملەکەتێکی گەورەیە و زۆربەی شاخە، بەناوبانگترین شاری (تبریز)ەو گەورەترین شاری (ئەردەبیل)ە، جگە لە شارەکانی (مەراغە، ئورمیە، خوی، سلماس، مرند، موقان.) معجم البلدان، ج١ص١٥٩{، } اثار البلاد واخبار العباد، ص٢٨٤ (موقان): موقانیش پارچەیەکە لە ئازربایجان، دۆڵ و شاخ و دێهاتی زۆری تیایە، تورکەکان ئەو کاتە داگیریان کردبوو بۆ لەوەڕگا (معجم البلدان: ج٨ص١٩٩)

**بکیر گەیشتە جێی مەبەستی خۆی، بزانین (عوتبە)[272] بەچی دەگات: عوتبە زۆر پیاوێکی ئەمین و ئەمان بوو، هەر لە شارەزورەوە هەتا دهۆك و هەولێر و موسلّ ی سەرپەرشتی دەکرد، لە خالّی خۆیەوە کەوتەڕێ، چوە موسلّ، یارمەتیەکی زۆری لە کوردەکانی ئەو ناوچەیە وەرگرت، کەوتنە ڕێ بەرەو ناوەوەی ئازربایجان، کە (بەهرام کوری فرخزان) زانی براکەی ئەسیر کراوە، بە سوپاکەی خۆی و شکاوەکانی برایەوە، چوە ڕێگەی (عوتبە)، شەڕێکی توند روی دا فارسەکان شکان، هەرێمی ئازربایجان بە تەواوی یەکلا بویەوە، ئێستە زۆربەی خاکی کورد لە دەستی فارس و ئازەر و ڕۆم رزگار کراوە، تەنها کەمێکی ماوە لە ژێر دەستی ئەرمەنەکاندایە، ئەم کوردە داماوە، لە کوێ توانای ئەوەی هەیە، وەلاّمی هەر هەموو لە سوپاکانی فارس و رۆم و ئازەر و ئەرمەن و گورجی و خەزەر و قەبج و ئالانی و تورکی. هتد بداتەوە، خۆ رەنگە**

---

[272]. عتبەی کوڕی فەرقەدی سەلەمی، پێش جەنگی خەیبەر موسولّمان بوو، لەگەلّ پێغەمبەر دا صلی الله علیە وسلم دوو غەزای بینیوە، بە داوای خەلیفە ئەبوبکر چوەتە سەر هەلگەڕاوەکان، لە فەتحی عێراق و موسلّ دا بەشدا بو سالّی ١٧ کۆچی کرایە والی موسلّ دوای (عرفچە). پاشان چوو بۆ فەتحی شارەزوور و سامغان و دار اباز، گەیشتە ئازربایجان و نامەی بۆ عومەر نووسی:(ان فتوحی قد بلغ اَزربایجان) ئەویش کردیە والی ئازربایجان و (عرفچە)ی گێڕایەوە بۆ موسلّ. عتبە لەگەلّ سەرداری فارس لە ئازربایجان کە ناوی (بهرام) بوو کردیە شەڕو شکاندی و لەگەلّ خەلکی ئازربایجان ئەم ڕێکەوتنەی مۆر کرد.(دەشت و شاخ و دۆلّ و سنور و خەلك و نەفس مالّ و مولك و ئاینتان پارێزاو بێت بە مەرجێ جزیە بدەن بە گوێرەی تاقەت و تواناتان.) فتوحاتی عتبە گەیشتە ئەرمینیا. عتبە خۆشەویست بوو لای خەلکی ئازربایجان، کە عتبە لا برا لە سەردەمی خەلیفە عوسمان دا، دەست بەجێ خەلکی هەلگەڕانەوە و پەیمانیان شکان. شیرینیەکی خۆش هەبوو لە ئازربایجان پێیان دەوت (خەبیس)، حەزی دەکرد خەلیفە عومەری خۆشەویستی لەوە بخوات، دوو پارچەی بەتایبەت لە ئازربایجانەوە بۆ نارد، بەڕای خۆی دلّسۆزی کردوە، کە عومەر لێ ی خوارد بەشی هەموو ئەوانەی مزگەوتی داو وتی زۆر خۆشە. بەلاّم کە زانی دیاریە و لەو ڕێ دورەوە کەسێکی بۆ زەحمەت دراوە، ئەوەی کە مابوو ناردیەوە و نامەیەکی گلەیی نارد بۆ عتبە بەم جۆرە (انه لیس من کدك ولاکد امك ولا کد ابیك، لاتاکل الا ما یشبع منه المسلمون فی رحالهم.) عتبە زۆری حەزی لە بۆن و عەتر بوو، (ام عاصم) ی خێزانی دەلّێ: ئێمە چوار ژن بوین لە دەوری عتبە زۆر خەریکی خۆمان دەبوین، بەلاّم ئەو لە هەمووما بۆن خۆشتر بوو.

وەڵامی هەموشیانی دابێتەوە هەتا لە پەل وپۆ کەوتوە و هێزی لێ براوە و، هەموو زاڵ بوون بە سەریدا. وا ئێستە ئیسلام هاتوە، ئەو میللەتە چوار پەل بەستراوە دەکاتەوە، لە زیندانی زۆرداران دەری دەهێنێ و ئازادی دەکات و دەیکاتە خاوەنی خۆی. لەگەڵ ئەوەی کە سوپای ئیسلامی رزگارکەری میللەتان لە ناوچەی ئازربایجاندایە بە گەورەترین هێز و لەئاستێکی بەرزدا، کەچی خەزەرێکان شەرم ناکەن و پەلاماری کوردەکانی باکوری کوردستان دەدەن. وەکو ساڵح قەفتان دەیگێڕێتەوە کوردەکان بە یارمەتی سوپای ئیسلام دەچن بەگژ خەزەرەکاندا: (کوردستانی باکور توشی هێرشی عەشایەری تورکیخەزەر بوە، کوردەکان لەگەڵ لەشکری عەرەبدا ئەم عەشایەرە کێویانەیان شکاند و دەریانکردن.)[273] ئەگەر ئیسلام زوتر فریا بکەوتایە، کورد هێجگار ئاوای بەسەر نەدەهات.!

جارێ تر ساڵح قەفتان چاکەیەکی زۆر گرنگی تری سوپای ئیسلام دەگێڕێتەوە. بەڵام بە داخەوە لە باتی وەسف کردن زەمیان دەکات، کە بە مەرجێ جێگەکە وەسف و سەنای زۆر هەڵدەگرێ، کە ئەمەش بە ڕاستی بێ ئینسافی نیشان دەدات و دەڵێ:

(لەدوای پەیدابوونی ئیسلامیەت ئەوە بوو سوپای ئیسلام دەستی کرد بە داگیرکردنی دنیا. لەشکری ئیسلام هات و ئازربایجانی داگیرکرد، وەك هەموو کوردەکانی تر، کوردەکانی ئێرەش موسڵمان بوون، سەرداری ئیسلام جارێ بەرژەوەندی وەها بوو کە توخنی سەربەخۆیی نەتەوەکە نەکەوێت، بەڵکو لەبەر دووری وولآتەکە لە ناوچەی خەلیفەی ئیسلامەوە، کە شای ئیسلام بە قازانجی زانی کە سەرۆکی کوردەکان خەڵات بکات و دەسەڵاتیان زیاد بکات، بە مانە کوردەکان فریویان خوارد. ئارامی وڵاتەکەی پێش خست.)[274]

---

273. مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ: صالح قەفتان، ل١٧١.

274. مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ: صالح قەفتان، ل١٨٤.

یەکەم: موسوڵمانان چوبنە هەر وڵاتێك، ئەگەر موسوڵمان بوبن، حوکمیان داوەتە دەست خۆیان، نەك هەر تەنها بۆ کورد بوبێ و خەڵەتاندبنیان. دووەم: کوردەکانی ئازربایجان لە ژێر دەستی ئازربایجان بون و دەیان چەوساندنەوە، ئەمە لەلایەك، لە لایەکی ترەوە کورد و ئازەر هەردوکیان لە ژێر چنگی فارسەکاندا بون، ئەسفەندیار و بهرامی برای، کە فارس بون، حوکمی هەردوکیانیان کردوە، ئازەر باشتر بون چونکە مل کەچی فارسەکان بون دژی موسوڵمانەکان، بەڵام کوردەکان مەیلیان بەلای موسوڵمانەکانەوە بوە، هەتا لێیان نزیك بونەوە، ئەوسا بونە موسوڵمان و چەکیان هەڵگرت بۆ سوپای ئیسلام لە دژی فارس و ئازەر و ئەرمەن و رۆم، کە بەردەوام قامچیان بەسەر کوردەکانەوە بوە، کوردەکانی ئازربایجان موسوڵمان بون، حوکمیان دانێ، بەڵام ئازەرەکان موسوڵمان نەبون و جزیەیان قبوڵ کرد...

هەرێمی ئازربایجان کە سەرکردەی فارس (ئەسفندیار) حاکمی بوو، بەشێکی چاك لە خاکی کوردی لە سێ لاوە داگیر کردبوو و خستبویە سەر هەرێمی ئازربایجان بە تایبەت زۆرێکی لە هەرێمی چیاو هەرێمی شارەزوور داڕنی بوو، دیاریکردنی سنوری جوگرافیای کوردستان و ناوچە کوردیەکان لە کاتی پەیدابوونی سوپای ئیسلامدا کارێکی ئاسان نیە، ئەو کاتە کورد نە کیانی سیاسی هەبوە، نە سنوری دیاریکراو بە کورد، بەڵکو بە گوێرەی سیاسەتی ئەو کاتە دابەشیان کردبوو بەسەر هەرێمەکانی دراوسێ دا. هەرێمی ئازربایجان ئەو کاتە هەتا سنوری مهابات و سەردەشت و بانەی ئەمڕۆ هاتبو.

عومەر بڕیاری دا ئازربایجان نەجات بدات و، ئەو سوپا فارسیە بەهێزە تەواو بکات. چونکە ئاستەنگی بۆ بەرەیەکی جەنگی فراوانیان دروستکردبوو، کە لە ناوچەی مازیندران‌و رەی و هەمەدان و شارەزوور تا موسڵ دەسەڵاتیان ڕۆیشتبوو. بە تایبەت سەرکردەی فارسی (ئەسفندیار کوڕی فرخزان) برای ڕۆستەم وەزیری بەرگری و سەرکردەی هەموو هێزەکانی ساسانی بوو، لە قادسیە کوژرا، وە (بەهرام) کە سەرکردەیەکی ناوداری قوە

زاریبە لە ناوچەکەدا ئەمانە لە بنەڕەتدا خەڵکی ناوچەی مازندرانن و پاڵەوانی گەورەیان بۆ ئیمپراتۆریەتی فارس ئەنجام داوە. ئێستا کە عومەر سەرپەرشتی دوو هێز دەکات بۆ رزگار کردنی ئازربایجان، سەرکردەی ئازربایجان ئەسفندیار، بە سوپایەکی ماندوەوە، لە جەنگێك کە لە نێوان شاری رەی و هەمەدان دا لە (واج رون) روی دا، شکستیان خواردوە و ئەوەتا بە شکاوی بۆ ئازربایجان دەگەڕێنەوە. پێش ئەوەی بگەنەوە وڵاتیان، (عومەر) ئەو دوو سوپایەی لە دوو لای جیاوازەوە بۆ ناردن، هەتا پێش ئەوەی بحەوێنەوەو، خۆیان رێکبخەنەوە، چاری دەردیان بکەن، بەراستی ئەمە نەخشەیەکی بێ وێنەیە و قۆستنەوەی هەلێکی زێڕینە، مەگەر هەر عومەر بۆی بچێ!

بکیر لە حەلوانەوە سەرکەوت، لە رۆژهەڵاتی کوردستانەوە لەناو خاکی نەهاوەندەوە چوە ناو خاکی ئازربایجان. ئەسفندیاری ماندوو کە ئەوەی بیست، هیچ چاری نەبوو جگە لەوەی سوپا بێ شومارە ماندووەکەی بهێنێتە رێی و بەریان بگرێ. بەڵام سوپایەکی بێ نەخشەی ماندوو و شکاو با زۆریش بن، چییان پێ دەکرێت بەرامبەر سوپایەکی تازە نەفەسی ئامادە و بە نەخشەو کوردێکی زۆر لە سوپاکەدا هەبن. بە هەردوو دیوی کوردستاندا سەردەکەون و رێگەیان لێ ناگرن، بەڵکو یارمەتی هەردوو سوپاکەی بکیر و عوتبە دەدەن بۆ فەتحی وڵاتانی پشت کوردستان و، ئەو دەستە رەشانەی لەسەر خۆشیان و میللەتانی ترە کۆتا دەکەن!

بکیر و سەماك کاری خۆیان تەواو کرد بێ ئەوەی لەگەڵ کورددا هیچ روو بەڕوو بوونەوەیەك روی دا بێ. عوتبەش سەرکەوت. عمر داوای کرد لە بکیر یەکێك لە جێی خۆی دابنێ، ئەویش عوتبەی دانا کە کارەکان تەواو بکات لە ئازربایجان. بەڵام سەرکردەیەکی فارس لەو ناوچەیەدا بە ناوی (بەهرام) سوپایەکی کۆکردەوە بۆ لێدانی عوتبە، هەتا نەهێڵێ کاری تەواو بکات، جەنگێکی توند قەوما، فارسەکان کە هەر لە زوەوە ورەیان روخا بوو، بڕوایان بە شەڕ نەما بوو شکان و ناوچەکە کەوتە دەستی موسوڵمانەکان. پێشتر (عیاز کوڕی غەنەم) کە سەرکردەی هەرێمی جزیرە بوو (عوسمانی کوڕی ئەبی

عاسی سەقەفی) نار بۆ ئەرمینیە، هەر کە قاچی نایە ناو خاکی ئەرمینیە جەنگی (تەست) روی داو سەحابەیەکی بەڕێز شەهید بوو بە ناوی (سەفوان کوڕی معتەل).[275]

بە ڕاستی سەیرە. ئەو هەموو سەرکردە فارسیانە لە ئازربایجان و ئەرمینیە و بابولئەبواب، ئەو هەموو جەنگە گەورە و بچوك و شەهیدبونی ئەو هەموو سەحابەیە لە خاکی تردا. کەچی ناوی سەحابەیەك نەهاتوە لە خاکی کورد و بە دەستی کورد کوژرابێ. بەڵام کە بە کوردستانی ئەمڕۆدا دەگەڕێیت، شار و دێ و ناوچە نیە گۆڕ و مەرقەد و قەبرستانی بە ناوی سەحابەوە تیا نەبێت، وەکو نوسەرێکی عیلمانی، راست دەڵێت: (دۆڵی سماقوڵی لە پارێزگای هەولێر بە درێژایی ئەو دۆڵە هەزاران گۆڕی لێیە وەکو دانیشتوانی ناوچەکە دەگێڕنەوە کە لەم دۆڵەدا شەڕێکی قورس لە نێوان ئەسحابەکان و کافران دا بوە، ژمارەیەکی زۆر لە ئەسحابە کوژراوە، لەم ناوچانەدا نێژراون. بەڵام هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی لەم قسانە ناکات. رەنگە ئەفسانە بێت.)[276]

### موسوڵمان بوونی کورد لە پێنوسی مێژوونووسانەوە

مێژوونوسان باسی شەڕیان نەکردوە لە نێوان کورد و ئیسلامدا، بەڵام باسی ڕێکەوتن و ئاشتیان کردوە، نەك هەر ئەوە، بەڵکو دەڵێت یارمەتی سوپای ئیسلامیشیان داوەو دوژمنەکانیان بۆ شکاندون، ڕۆژبەیانی دەڵێ: (پارسی و ساسانی هەوڵی ئەوەیان دا کە کوردەکان زەبون و ژێر دەستە بکەن، کە سوپای ئیسلام، نا شارەزای وڵاتی چیای سەخت، لەگەڵ دەوڵەتی فارسی کەوتنە شەڕەوە و زانیان کورد دژی ساسانیە. بە رابەری و پێشەنگی کوردان توانیان بە چیا سەختەکاندا هەڵگژێن و بەسەر ئیمپراتۆریەتی

---

[275]. الاصابة في تميز الصحابة: الامام احمد العسقلاني. ج٣ص٢٥١. اسد الغابة: ج٣ص٢٦ دەڵێن: صفوان کوڕی موعتەل غەزای مریسع و خەندەقی بینی، پیاوێکی ئازاو نەترس بوو، لە جەنگەکانی عێراق و شام دا بەشدار بوو، پاشان چووە هەرێمی جزیرە، لە یەکەم هەنگاویان بۆ ناو ئەرمینیە شەهید بوو.

[276]. پەنجەکان یەکتری دەشکێنن: نەوشیروان مصطفی. ل٣٠٢.

ساسانیدا زاڵ بن، هەرچەندە کورد لە ئەهواز و بەرازەروز و شارەزور و حەلوان و کرماشان و زۆر جێی تردا بە ئاشتی کوردستانیان دایە دەستەوە.)[277] لە جێیەکی تردا دەڵێ: (سوپای ساسانی بەبێ یارمەتی هێزی کورد، هەرگیز توانای شەڕیان نەبوەو لە هەر کوێ کوردەکان بە ئاشتی لەگەڵ هێزە موسوڵمانەکان رێك کەوتبن، ئەوان خۆیان رزگار کردوەو هەڵهاتون.)[278]، یان دەڵێ: (وا دیارە کوردەکان کە لە ستەمی ساسانی بە تەنگ هاتبون، بون بە ڕێ نومای سوپای ئیسلام و شەڕیان بۆ شاهەنشاە نەکردوە و، هەموو شارەکانیان هەر بە بێ شەڕ و بە ئاشتی داوە بە دەستەوە.)[279] مەسعود محمد دەڵێ: (کورد خۆشحاڵ بوە بە هاتنی ئیسلام، هەتا فارس و رۆمیان لە کۆڵ بکاتەوە.)[280] سیر مارك سایکس دەڵێ: (کورد وا بە ئیسلامەوە چەسپان و پەیوەست بوون، کە هیچ میللەتێکی تر وا بە ئاسانی و سەربەست قبوڵیان نەکرد...)[281]

موحەممەد مەردۆخی دەڵێ: (کورد بە رەزامەندی خۆی ئاینی ئیسلامیان پەسەند کردو موسوڵمان بوون)[282] محمد ئەمین زەکی دەڵێ: (کوردەکان بینیان و تێفکرین کە ئەم ئاینە تازەیە، بە تەواوی موافقی تەبع و وجدانیانە، لەبەر ئەوە بە ئاسانی و بەرەبەرە قبوڵیان کرد.)[283]

دکتور حسین خەلیقی دەڵێ: (زۆر جار کوردە موسوڵمانەکان لەشکری گەورەیان ساز دەدا و دژ بە فارس و رۆم و عەرەبە لادەرەکان جەنگاون بۆ تەمێ کردنیان. چەندین دەوڵەت و ئەماراتی سەربەخۆیان دروست کردوە و

---

[277] . مێژووی حەسەنوەیهی و عەیاری: محمد جمیل رۆژبەیانی، ل٦٠.

[278] . هەمان سەرچاوە، ل١٥٧.

[279] . هەمان سەرچاوە، ل١٥٦.

[280] . گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد: بەرگ(٥)، مەسعود محمد.

[281] . وارثانی خلفا: ل٢٥٢.

[282] . کورد و کوردستان: محمد مەردۆخی کوردستانی، ل٩٤.

[283] . کوردو کوردستان: محمد امین زەکی، ل١٢٣.

**شەرعی خوایان تیا بەرپا کردوە و سەر بە دەوڵەتی گەورەی ئیسلامی بوون.)**[284]

**مامۆستا هەژار دەڵێ: (ئاینی پاکی بێگەردی ئیسلامەتی کە لە سەرەتاوە پەیدا بوە، تیشکی برایەتی و یەکسانی وە چیاکانی کوردستانیش کەوتوە، تاریکایی و ئاگرپەرستی لەسەر رەواندوین و چاکان و پاکانی ئیسلامی پێشو تێیان گەیاندوین کە موسوڵمانان هەموو پێکەوە بران و رەش و بۆر و سپی و مۆر و زەرد و کەوەیەك لە ئارادا نیە. ئەگەر جاران کەمێکی بێ کەس بوون، وا ئێستە لە سایەی ئاینی تازەوە بونەتە زۆر و کەس زۆریان لێ ناکات.)**[285]

**سالح قەفتان کە قەومیەکی تۆخ و خاوەنی رای تایبەتە، چاکی دەپێکێ کە دەڵێ: (بە زمان زەدی لەناو خەڵکی کوردستاندا شورەت وایە کە نەژادی ئەمڕۆ بە زۆری شمشێر موسوڵمان بوە و، ئەم قسەیە پشتاوپشت بەجێ ماوە. بە مەدا وا دیارە باوك و باپیرانمان وایان زانیوە کاتی خۆی عەرەبەکان کە هاتوون کوردستانیان زەوت کردوە، دەستیان داوەتە شیر و هەرچی موسوڵمان نەبوە کوشتویانە بەو تەرحە موسوڵمانێتیان بە زۆر بڕیوە بەسەر کوردەکان دا، بگرە بەو جۆرە بەسەر گشت گەلەکانی تریشا. ئەگەر ئەمە راست بوایە، ئەبوو عەرەبەکانی ئەو حەلە لە موسوڵمان بەو لاوە چ تایفەیەکی تریان لە وڵاتی ئیسلاما نەمێشتایە، ئەی جولەکە و عیساییەکان بۆ چ مانەوە تەشقەڵەیان پێ نەکراوە.)**

**(کوردەکان ئەو کاتە کە زەردەشتی و بت پەرستی بوە، بە موشریك دانراوە، عەرەبەکان بەبێ گومان تەقەلای لە ناوبردنی ئەم جۆرە ئاینەیان داوە، بەڵام نەك بە زۆری شمشێر، بەڵکو بە زۆرداری سیاسەت پێکیان هێناون بۆ نمونە: عەرەبەکان چونکە خۆیان هێشتا شارەزای کشت وکاڵ نەبوو بوون، هاتون موڵکی خاوەن ئەرزی ئەمیریان بەسەر خەڵکە کۆنەکەدا دابەش کردوە،**

---

[284] . کۆمەڵناسی کوردەواری: د. حسین خەلیقی. چاپخانەی الحوادث، بغداد ۱۹۹۲.

[285] . شەرەفنامە: شەرەفخانی بدلیسی، وەرگێڕ: عبدالرحمن هەژار، ل۳۰.

دڵیان خۆش کردون و، لەسەر ئەوەشا، مۆڵکانە و زەکاتی سوکیان لێ سەندون، بەم کارانە، ئەو خەڵکانەیان بە تەبیعەتی حاڵ منەتباری خۆیان کردوە، چونکە لە چاو زوڵم و زۆرەکانی حکومەتی رابوردودا، ئەم زەریبەیە سوك و بە کەڵك بوە بۆ قەومەکە، عەرەبەکان لەگەڵ خوڵق قایمی خۆیان، چونکە ئیدارەکەشیان توند و تۆڵ و عادلانە بوە، تەنزیماتەکانیان خێرا سەری گرتوە و، بەوە لەگەڵ منەتباری خەڵکەکەدا وڵاتەکەش ئاوا بوەتەوە و، زۆربەی ئەهلەکە بە حکومەتەوە نووساوە. جا بەم سیاسەتە نەرم و رەنگینە لە ئێران و کوردستانا عەرەبەکان حاکمیەتی خۆیان خێرا ساغ کردوەتەوە و زۆر بە گورجی تیا دامەزراوە و موسوڵمانیشیان بڵاوکردوەتەوە.)[286]

جەواهێر لال نەهرۆش لە یاداشت نامەکەی دا راستیەکی پێویستی بەم شوێنە وتوە: (. ئیتر عەرەبەکان وڵات دوای وڵاتیان دەگرت، وە زۆر جار جەنگیان بەبێ کوشتار بردۆتەوە! وە دوای وەفاتی پێغەمبەر – درودی خوای لەسەر بێ– بە (٢٥) ساڵ عەرەب هەموو وڵاتی فارس و سوریە و ئەرمینیا و بەشێك لە ناوەڕاستی ئاسیای رۆژهەڵات و میسر و بەشێك لە سەروی ئەفریقیایان بە ئاسانی گرت! چونکە – ئەو گەلانە – زۆر ستەمیان دیبوو بە دەست زۆرداری ئیمپراتۆریەتی فارس و رۆمان و شەڕ و شۆڕی تایفەگەریەوە.)[287]

مامۆستا هەژار دەڵێ: (کوردەکان کە بینیان لە ئیسلامدا. هەموو رەگەز و تیرە و هۆز و نەتەوەیەك لە بەرامبەر بارەگای خودای بەرزا یەك جۆرن و یەك تەرزن. هەر رەنگێك و زمانێك لەبەر بەرۆچکەی خۆرەتاوی ئیسلامەتیدا بە سانایی دەحەوێتەوە. کوردیش کە چونەتە ژێر سێبەری ئاڵای پیرۆزی ئەم ئاینە پاکەوە، دیتویانە وەك بیستویانە وایە. موسوڵمان هەموو پێکەوە بران و

---

286. مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ: صالح قەفتان، ل١٧٢، بغداد ١٩٦٩.

287. چاوپیاخشاندنێك بە مێژووی جیهاندا: جواهر لال نەهرۆ. وەرگێڕ: رؤوف محمد زوهدی، ج١ ل٤٢.

بۆ یەکتر پشت و پەنان، ئەگەر جاران کەمێکی بێ کەس بوون، وا لە سایەی ئاینی تازەوە بونەتە زۆر و کەس زۆریان لێ ناکات.)[288]

پاشان هەژار وەك مێژوونووسێکی هەڤبێژ و نزیك، نەك وەك رۆژهەلاتناسێکی دوور و قسە هەلبەست، تفەنگ بە تاریکیەوە بنێ و، هەرگیز کوردی نەبینیوە و نەیناسیوە، بۆ دژایەتی دین و مەبەستێکی ناباش وشە هەلدەبەستێت، هەر بۆیە هەژاری موکریانی کوردناس و کوردپەروەر و لەناو ئازارەکانی کوردا تلاوتەوە و پێگەیوە، لە ناخەوە دەلێ کوردەکان: (ئاین و رەوشتی نوێیان بەلاوە زۆر لە رێ وشوێنی پێشینی پڕ ئازاری ئاگر پەرستیەکە لەبارتر و چاکتر بوە و لە سایەی ئەو فرمانە ئاسمانیەدا کە قورئانە، ماوەیەکی زۆر باش حەسانەوە.)[289] هەر دوای ئەوە راستیەکی تر دەلێ کە کەس ناتوانێ رەخنەی لێ بگرێ و شتێك بلێ، هەژار غەم و خەفەتی خۆی هەم بۆ کورد و هەم بۆ ئیسلام هەلدەرێژێ و دەلێ: (بەلام، سەد ئاخ وداخ و مەخابن، ئەم جەژنە پیرۆزە، زۆری نەخایاندوە و لەشکری خەم و پەژارە دووبارە سەری لێ داونەوە و، بە سەربەستی نەماونەوە. دەسەلاتدارە راست و دروستەکانی ئیسلام بەرە بەرە ئاسۆی ژیانیان ئاوا بوون.)[290]

دکتور حسینی خەلیقی کە خۆی چەپیە، بەلام هاتنی ئیسلام بە وەرچەرخانێکی گرنگ و بەرەو پێش چونێکی نوێ دادەنێ لە ژیانی مرۆڤایەتیدا کە بێ گومان کوردیش گەلێکە لە کۆمەلگای مرۆڤایەتی سەر زەوی دا و دەلێت: (لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، بە سەرهەلدانی ئیسلام، چوارچێوەی رژێمە کۆیلەدارەکان تێك روخا و پەیوەندی ئابوری و کۆمەلایەتی و سیاسی گۆڕا و، نەزمی نوێ و بۆچونی تازە لەسەر شێوەی

---

288 . شەرەفنامە: میر شەرەفخانی بدلیسی، وەرگێڕ ماموستا هەژار. ل٣١.

289 . هەمان سەرچاوە: چاپخانەی نعمان، نەجەف ١٩٧٢، ل٣١.

290 . شەرەفنامە: ل٣١

ژیانی مرۆڤ و نرخەکەی دامەزرا، بەم جۆرە ئیسلام لە قۆناغێکی بەرەو پێش چونی کۆمەڵدا دەوری بنەڕەتی و چالاکی هەبوو.)[291]

دوای روخانی حکومەتی میدیا ساڵی٥٥٠ پ.ز هەتا هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان ساڵی٦٢٠دوای زاین، واتە کورد (١١٠٠) ساڵێك بە دەم رەشەبای شەڕی نێوان فارس و رۆمەوە، پەت پەتێنی زۆری پێکراوە و، هەرچی لەو (١٥٠) ساڵەی حکومەتی میدیا بەرقەرار بوو، پێیان ڕشت و، کارێکیان پێ کرد، دەرونی روخا، بڕوای بە کەس نەما، دوژمنی هەموو لایەك بوو، لە حاڵەتێکی ئینتحاردا دەژیا، پێش و پاشی خۆی نەدەناسی، تەنها ئیسلام دەیتوانی تەداوی و چاری ئەم نەخۆشە کوشندە بکات، ژیرەکانی ئەو میللەتەش لە پیاوە ئاینیەکانی زەردەشتی (پیر)، بە دوای چارەی گەلەکەیاندا دەگەڕان، دەیانزانی لەو رەمزانەدایە کە (گاتا و زەردەشت و ئاوێستا و ماریفەت) بە گەلەکەی داوە، ئیسلام، قورئان، پێغەمبەری چاوەڕوان کراو هات، ناسیان، باوەشیان پیا کرد، زانیان پڕ پێست و شیفای ناخ و، پڕ کەرەوەی بۆشاییانە، بۆی ژیان و بۆی مردن، هەموو لایەنی ژیانیان گۆڕا. بەڵام هەندێ خراپەی شاراوەی ناو پشتی ناخ و دەرونی هەر ماو نەیتوانی دەست بەرداری ببێت، لەگەڵ ئەو هەموو تێکەڵ بونە لەگەڵ ئیسلام و بیروباوەڕی دا، پاشماوەی نەخۆشی (خۆش باوەڕی) و (یەك نەگرتن) و (خۆفرۆشتن) و (پوازێتی) هەرماوە. شەڕ ئاوایە، هەر بۆیە دەوڵەتە زلهێزەکان، بە زۆر و بە فێڵ و تاکتیك، دەیفرۆشن ، ئیسترادی دەکەن بۆ گەلە ژێردەست و بچوك و بەرامبەرەکانیان، شەڕ هەموی نەخۆشیە، چەند زەرەر لە لەشی میللەت و ئابوری دەوڵەت دەدات، (دە) ئەوەندە ناخ و شعور و دەرونی تاك و کۆمەڵی میللەت، ئاڵۆز و شێواو و بریندار و پڕ میکرۆب و نەخۆشی دەرونی دەکات...!! سەرکردەی ژیر ئەوەیە، هەموو شێوازێك بەکاربهێنێ بۆ سەرکوت کردنی شەڕ و خونساکردن و مەفعول نەهێشتنی، پێغەمبەر درودی خوای

---

291. کۆمەڵناسی کوردەواری: د. حسین خەلیقی. ل٢٢١ ب١.

لەسەر بێت لە ڕێکەوتنی حودەیبیە دا ویستی کۆتایی بە شەڕ بهێنێ و شێوازی حیوار و پەیڤین و گوتار و نامە و نوێنەر بەکاربهێنێ. هەتا ماوەیەك سەرکەوتوو بوو، بەڵام شەیتانی شەڕ نەیهێشت.! حەزرەتی عومەر پێنج جار لە تەمەنی خەلافەتی دا هەوڵی دا کۆتایی بە وەیشومەی شەڕ بهێنێ، بەڵام یەزدگورد ڕازی نەبوو، وای دەزانی خێر لە شەڕدایە! هەر ئەو شەڕە درێژ ماوەیەی سەردەمی عومەر بوو، میکرۆبی عەبدوڵڵا کوڕی سەبەئی جولەکە و، جوڵانی کرمی دوو ڕوەکان و شەهیدبونی عوسمان و جەنگی نێوان عەلی معاویەی تیا بە بەرهەم هات. ئەگەر بە شێوازێکی بەهێز ئاشتیان فەرز بکردایە، زەنگی خەتەری شەڕیان کز کردایە، تەمەنی حوکمی خولەفا درێژەی دەبوو، شارستانی ئیسلامی دامەزراوتر و جیهانێکی فراوان تر و پێشکەوتوتریان درێژە پێ دەدا. بەڵام هەزار مەخابن...!!!

شەڕ کۆمەڵێك نەخۆشی فەرز کرد بەسەر دەرونی کوردا کە هەتا ئەمڕۆش گەورەترین بەڵای ڕێگری میللەتەکەیە لەبەردەم سەربەخۆیی دا. ئیسلام زۆر شتی کوردی چاك کرد، پاك و بێ غەل و غەشی کرد، بەڵام کە شەڕی شەیتانەکان تێی ئالانەوە، خۆیشی دەستی گەورەی تیایدا هەبو، نەخۆشیە کۆنەکان لە سپۆر جوڵان و هاتنەوە مەیدانی چالاکی! (یەك نەگرتن) یەکێکە لەو نەخۆشیانە، (گاوا) مامۆستای سوڵتان موراد لە هەق ئەوەی کە کورد هەرگیز یەکیان نەگرتوە دەڵێ: (کورد لەوەتەی هەیە لە وتەی شاد و ئیماندا نەبێت یەکتریان نەگرتوە.)[292] واتە یەك پارچە خۆیان بۆ ئیسلام کردەوە، بەڵام وازیان لە نەخۆشی یەك نەگرتن نەهێناوە!

خاتو ڤاسیلیڤیا[293] وەسفێکی سەیری کورد و ئاین دەکات: (دڵسۆزی خەڵك بۆ سەرکردە ئاینیەکان ئەوەندە بەهێز بوو، کە دوای تیاچونی

---

[292]. شەرەفنامە: وەرگێڕ مامۆستا هەژار، ل٣٦، نەجەف ١٩٧٢.

[293]. خاتو ڤاسیلیڤا: ناوی یڤگینینا ئیلیچنا ڤاسیلیەڤا، ناوێکی پرشنگداری ڕۆژهەڵاتناسی و کوردناسی وڵاتی سۆڤیەتە، شەرەفنامەی کردووەتە ڕوسی، چەندین وتار و لێکۆڵینەوەی لەسەر

میرنشینەکانیش توانیان سەرکردایەتی بزوتنەوەی کوردایەتیش بۆ سەربەخۆیی بگرنەوە دەست.)[294]

کورد ئازا بوە ناوی (کورد) بە مانای پاڵەوان دێت، باوەڕی بە هەرچی نەبوایە سەری بۆ دانەئەنەواند، بەڵام کە ئیسلام هات بەو جۆرە بوو کە (سافراسیتاف) دەیگێڕێتەوە: (بەر لە ئیسلام هیچ کاتێك کورد سەری بۆ کەس نەچەماندوەتەوە.)[295] بەڵام کە ئیسلام هاتە بەردەمی، فترە پاکەکەی کورد لە ژێر تەپوتۆزی هەزار ساڵەی جەنگی فارس و رۆمەوە جوڵاو، زوو بە زوو لەگەڵیدا گونجا.

خاتو ڤاسیلیڤیا دووبارەی دەکاتەوە: (هۆشیاری و کۆمەڵایەتی – کورد–سیمایەکی ئیسلامی هەیە. ئەوەش دەبێتە زەمینەیەك بۆ لێك جیابونەوەی پرۆسەکانی فکری و کۆمەڵایەتی و سیاسی. هەتا رۆژانی ئەمڕۆش ئیدۆلۆژیای ئیسلامی لە ناو کوردا زاڵ و بەر کەماڵە.)

لە درێژەی باسەکەی خاتو ڤاسیلیڤیادا (ئەو رایانەش بە درۆ دەخاتەوە کە دەڵێن کوردەکان موسوڵمانێکی خراپن، یان هەر بە ناو موسوڵمانن، یان ئیسلامەتی کوردان جێگەی باوەڕ نییە.)[296]

ئیسلام کە هاتە کوردستان تەدبیری ماقوڵیان بوە، بەڵام مامۆستا ساڵح قەفتان جۆرێکی تر لێکی دەداتەوە: (زۆر ئەگونجێ حکومەتی عەرەبی ئیسلامی ئەو حەلە بۆ پێکهێنانی مەسڵەحەتی خۆی و قایم کردنی بناغەی دەوڵەتەکەیان تەدبیری ماقوڵ و سیاسەتی ئیداری زۆر جوانیان پێکەوە نابێت، لە کاتی فەتحی ئیسلاما عەرەبەکان وەك بە زۆری بازوو، پڕشتی چەك، خەریکی داگیرکردنی وڵاتان بوون، لەگەڵ ئەوەشا وێڵی تەرتیباتێکی واش

---

مێژووی کورد هەیە وەکو (چەمکەکانی تایفە و عەشیرەت و قەبیلە لە شەرەفنامەدا) (ژیان و بەرهەمەکانی ماە شەرەفخانم کوردستانی) (تایبەتمەندیەکانی ئیتێکێتی کوردی) و ئەوی تر.

[294] . گۆڤاری رووناکبیری. ژمارە (٢) ل١٧٣.

[295] . شەرەفنامە: وەرگێڕ مامۆستا هەژار – وتەی یەحیا خەشاب – ل١٢٠.

[296] . گۆڤاری رووناکبیری. ژمارە (٢) ل١٧٤.

بوون که نەیەڵێ جارێکی تر ئەو وڵاتانەیان لە کیس بچێتەوە، بە راستی لە مێژوودا کەم نەتەوە هەیە لە ئیدارەی موڵك و بەڕێوەبردنی ئەقوامی بێگانەدا وەك عەرەبەکان بە رێك وپێکی سەرکەوتبێت. عەرەبی تازە موسوڵمان وەك لە سوپاگەریدا هۆشیار بوە، بیری سیاسەت و ئیدارەی وڵاتیشی تەواو بوە. ئەم نەتەوە زیرەکە زانیویە کە لە وڵاتە داگیرکراوەکانا ئەگەر لە بناغەوە بابەتە ئیدارەیەکی نەرم و نیان نەخاتە کار، قەومەکانیان بۆ داگیر ناکرێت، بەڵکو ئەبێت هەمیشە لەگەڵیان لە جەنگدا بن. لەبەرئەوە لە لایەکەوە هاتون ئەرزیان داوە پێیان، دڵیان خۆش کردوون، لە لایەکی تریشەوە توخنی ئیشی قەومیان نەکەوتون و ئازاریان نەداون، لەبەر ئەم سیاسەتە نەرمە، کوردەکان وردە وردە تەسلیمیان بون و لەگەڵ ئیدارەی عەرەبدا رێك کەوتون.)[297]

سالح قەفتان وشەی موسوڵمان بە عەرەب ناو دەبا، کە ئەو سوپایانە هەرگیز بە ناوی عەرەبایەتیەوە نەهاتون، ئەوانە هەتا عەرەب بوون، داماو بون بە دەستی فارس و رۆم و حەبەشەوە، بەڵام کە قەومایەتیان لابرد و بیروباوەڕی ئیسلامیان وەرگرت، ئەوەیان کرد کە کردیان، هیچ گەلێکیان نەکردووە بە عەرەب، تەنها ئیمان و بڕوایان لە خەڵکی ویستوە. زۆرجاریش قەفتان بە داگیرکاریان ناو دەبات. کە بە مەرجێ داگیرکار ئەوە نیە کە خۆی وەسفیان دەکات، ئەوە رەوشتی زۆردار نیە، بەڵکو ئەو موسوڵمانانە هاتون تەنها بیروباوەڕی ئیسلامەتی بڵاوبکەنەوە و بەس، کوردیش وەکو سالح قەفتان و مێژوونوسانی تر باسی دەکەن، زۆر بە هەرزان و بە ئاشتی ئەێیان وەرگرتوون و، وەك ئەمین زەکی دەفەرموێ: (تێفکرین کە ئەم ئاینە تازەیە بە تەواوی موافقی تەبع و ویجدانیانە. قبوڵیان کرد.)

سالح قەفتان لە جێیەکی تردا دەڵێ: (عەرەبەکان ئەم سیاسەتە جوانە میللایەیان وە نەبێ هەر لە کوردستان و ئێران بەکارهێنا بێ، بگرە هەر لە سنوری چین، هەتا قەراغ دەریای زوڵومات ئەتڵەسی لە هەموو کیشوەرە

---

297. مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ: صالح قەفتان، ل١٧٢. بغداد ١٩٦٩.

داگیرکراوەکان بەجێیان هێناوە.) بەڵام دوای ئەم وەسفە جوانانە دوبارە دەکەوێتەوە هەڵەوە و دەڵێ: (بۆیە لە مێژوودا ئەبینین لە دوای پێغەمبەر(د.خ) بە سەد ساڵێك زۆربەی قەومە دانیشتوەکانی سەر زەمینی ئیمپراتۆریەتی عەرەب بوون بە موسوڵمان و بووشن بە عەرەب و میللەتی خۆیان لە دەست داوە.) میللەت نیە و گەل نیە لە دنیادا بە هیچ زوڵم و زۆر و ستەمێکیش، واز لە زمان و خاك و نەتەوەی خۆی بهێنێت، یەك نمونەش لەبەردەستدا نەبووە، دەنا دەیهێنایەوە. ئەوەتا ئێمەی کورد لەگەڵ ئەو هەموو زوڵم و زۆرەی وڵاتانی دەوروبەر، بە راگواستن و کوشتن و کیمیاوی بەسەراکردن و راپێچ و رەو پێکردن و ون کردنمان، هەر لە زیادبوون و چەسپاندنی مافی رەواماندایین. ئەوە مافی خوایە بۆ زمان و رەنگ و گەل و نەتەوەکان، نابێ بتاوێنەوە. بەڵام نەگبەتی ئێمە لەوەدایە، باسێکی وا بەمێژ، بە قسەیەك بە دوو ووشە لاواز دەکەین و لە نرخی کەم دەکەینەوە. دەبوو مامۆستا قەفتان لە رەوتی جوانی خۆی دانەبەزاندایە و باسە بەمێژەکەی تێکەڵ نەکردایە!

## شارە کوردییەکان بە ئاشتی رێك کەوتوون

لە مێژووی سەردەمی خولەفای راشدین دا سێ جەنگی زۆر گەورە روی داوە، کە بە گەورەترین جەنگ دادەنرێت لە مێژووی ئیسلامدا. یەکیان لە خاکی عەرەبدا بوەو دوانیانی لە خاکی کوردا.

جەنگی یەکەم (قادسیە) بوو لە خوارووی کوفە، کە شکستی هەرە گەورەی بەسەر فارس هێنا، (رۆستەم) وەزیری بەرگری و سەرکردەی هەموو هێزەکانی فارسی ساسانی تیا کوژرا، ئاڵای ئیمپراتۆر کە ناوی (درەوشی کاویانی) بوو کە ئاڵاکەی کاوەی ئاسنگەر بووە، کەوتە دەستی موسوڵمانەکان، زیاد لە سەد هەزار سەربازی فارس کوژرا.

جەنگی دووەم (جەلەولا) بوو کە لە خاکی کوردا روی دا، بەڵام دەستی کوردی تیا نەبوو، یەزدگوردیش نەفیری عامی دەرکرد زیاد لە سەد هەزار سەربازی لە هەموو هەرێمەکانەوە هێنا، خەنەقێکی زۆر گەورەی بۆ هەڵکەندن و سەنگەری بۆ بەستن و هەر هەمووی تێکردن بە سەرکردایەتی مهرانی کوڕی

یەزدگورد، لەو جەنگەدا مەهران و دەیان سەرکردەو سەد هەزار سەرباز کوژرا. (شابانو) کچی یەزدگورد ئەسیرکرا، لەتاو زۆری لاشەی کەوتوو ناوچەکە ناونرا جەلەولا.

جەنگی سێیەم (نەهاوەند) بوو، یەزدگورد نەفیری عامی دەرکرد، پاشماوەی هێزەکانی هەموو هەرێمەکانی کۆکردەوە و لە دەشتی (نەهاوەند)، بە سەرکردایەتی و سەرپەرشتیاری (فاروزان) و فەرماندەیی دەیان وەزیر و سەرکردە و زیاد لە (١٥٠) هەزار سەرباز. یەزدگورد خۆی لە ئەسفەهانەوە ئاگادار بوو، لە ماوەی هەفتەیەکدا سەرکردە و وەزیرەکان و فەرماندەی هەرێمەکان و زیاد لە سەد هەزار سەربازی فارسی کوژراو لەبەر گەورەیی سەرکەوتنەکەش ناونرا جەنگی (فتح الفتوح).

ئەم سێ جەنگە هەیبەتی ئیمپراتۆریەتی فارسی ساسانی شکاند، قڕی خستە ناو سەرکردەو لەشکرە تایبەتیەکانی دەرباری شاهەنشاهی، سەرنویشتی جەنگی یەکلا کردەوە.

لەگەڵ ئەوەی کە ئەم دوو جەنگەی دوایی (جەلەولا و نەهاوەند) لە خاکی کوردا رویان دا، بەڵام بە هیچ کلۆجێ دەست و مەیل و ویستی کوردی لەسەر نەبوو، بەڵکو یەزدگورد بۆ مەبەست و بەرژەوەندی خۆی خستنیە خاکی کوردانەوە. بەڵکو کە سوپای ئیسلام رووی کردە خاکی کوردستان، ئەگەر فارس شکابن و هەڵهاتبن، ئیتر شارە کوردەکان بە ئاشتی رێك کەوتون و هاتون بە دەم ئیسلامەوە و هیچ رووبەڕووبونەوەیەکی لەگەڵ ئیسلامدا تۆمار نەکردوە.

لە بڕگەی پێشودا قسەی مێژوونوسەکانم هێنا لەسەر ئیسلام بوونی کورد، کە هەمووی لە سەرچاوەکانەوە هەڵگۆزرا بوو هەتا بە ئاسانتر لەبەردەستی خوێنەردا بێت و سقەی بەهێزتر دروست بکات بۆ ناوەرۆکی مەبەستی بابەتەکە، لێرەشدا بڕگەیەکی ترم هەڵبژاردوە لە سەرچاوەکانەوە کە باس لە شارە کوردیەکان دەکات کە بە ئاشتی و ئاسان لەگەڵ سوپای

ئیسلامدا رێك کەوتون، هەتا رونتر و کۆیی تر و ئامادەتر مەبەستەکان بپێکیّ:-

- رۆژبەیانی دەڵێت: (بەرازە روز - بلدرون) و (میهروز - مهروت) کە لەم دواییەدا کرایە (کەنعان)، (بەندەنیجین - مەندەلی) و حەلوان و شارەزوور، ئەمانە هەموو بە ئاشتی رزگار کراون.[298]

- ئیبن ئەعسەم دەڵیّ: هەر لە جەلەولا هەتا نەهاوەند شارەکانی نێوانیان هەموو بە ئاشتی رزگار بوون، موسوڵمانەکان بەبێ شەڕ بە سەرکردایەتی نعمان کوڕی مقرن چونە (قرماسین - کرماشان)[399]

- بەلازەری دەڵیّ: هاشم هەڵی کوتایە سەر (حەلوان) و بە ئاشتی گرتی، پاشان چوو بۆ (دینەوەر) و لەوێوە چوو بۆ (قرماسین - کرماشان) و بە ئاشتی رێك کەوتن.[300]

- رۆژبەیانی دەڵیّ: دینەوەر (کرماشان-قرماسین) و(میهرەجان گجگ - قذق) و سیروان و صەیمەرە و ئیزە و شوش. ئەمانە هەموو بە ئاشتی رزگار کراون.[301]

- ئیبن ئەعسەم دەڵیّ: (هەر ئەو رۆژە موسوڵمانەکان چونە خانەقین بەبێ شەڕ، پاشان چونە قەسری شیرین بەبێ شەڕ. سوپای موسوڵمانان بەبێ شەڕ گەیشتە حلوان.)[302]

- ئیبن ئەسیر دەڵیّ: (نەعیم و قەعقاع کەوتنەڕێ بۆ هەمەدان لەگەڵ حاکمی شار بە ئاشتی رێك کەوتن.)[303]

---

298. ولاتگیری رەشەخاکی عێراق: مەلا جمیل رۆژبەیانی، ل١١، چاپی یەکەم، ١٩٩٧ سلێمانی.

399. کتاب الفتوح: ابن اعثم الکوفي، ج٢ص٤٧.

300. فتوح البلدان: بلاذري، ص١١١.

301. ولاتگیری رەشەخاکی عێراق: مەلا جمیل رۆژبەیانی، ل١١، چاپی یەکەم، ١٩٩٧ سلێمانی.

302. کتاب الفتوح: ج٢ص٢٨٠، بیروت١٩٦٨.

303. الکامل في التأریخ: ابن اثیر، ج٣ص٦.

– ڕۆژبەیانی دەڵێت: (خانەقینی بە ئاشتی گرت. کەوتنە ڕێ بۆ حەلوان، ئەوێشی بەبێ شەڕ گرت.)[304]

– ڕۆژبەیانی دەڵێ: (وادیارە کوردەکان کە لە ستەمی ساسانی بە تەنگ هاتبوون ئەوان بوون بە ڕێ نومای سوپای ئیسلام و شەڕیان بۆ شاهەنشاهی نەکردوە، هەموو شارەکانیان هەر بەبێ شەڕو بە ئاشتی داوە بە دەستەوە).

لە جێیەکی تردا دەڵێ: (لێرەدا ئەبێ ئەوە دیاری بکەین یەکەم: سوپای ساسانی بەبێ یارمەتی هێزی کورد هەرگیز توانای شەڕیان نەبوەو، لە هەر کوێ کوردەکان بە ئاشتی لەگەڵ هێزە موسوڵمانەکان ڕێك کەوتون، فارسەکان خۆیان بۆی دەرچوون. وا دیارە هەندێ لە کوردەکان هاوکاریان لەگەڵ سوپای ئیسلام کردوە، ئەوەتە سەعد کوردێکی (قوباد) ناو دائەنێ بە سەرداری حەلوان لە باتی قەعقاع)[305]

– خزری بەگ دەڵێ: (نەعیمی کوڕی مقرن لە هەمەدانەوە چوو بۆ ڕەی، بە ئاشتی ڕێك کەوتن، پاشان سوڵەی برای نارد بۆ شاری قومس و بە ئاشتی ڕێك کەوتن، پاشان نامەی پاشای جورجانی بۆ هات لە نزیك دەریاچەی قەزوێن کە داوای ئاشتی کرد بوو، شاری ڕەی و دستەنبی کە سەر بە وڵاتی چیا بوون (اقليم الجبال) بە ئاشتی ڕێك کەوتن، خەڵکی تەبەرستان لە نزیك دەریاچەی خەزەر بە ئاشتی ڕێك کەوتن.)[306]

– ڕۆژبەیانی دەڵێ: هێزێکی ئیسلامی لای تکریتەوە ڕوی کردوەتە کوردستان، لە چیای حەمرینەوە هاتوەتە (باوەزی – بوازيج) و لە وێوە بە کەناری شیوی خاصەی خواروودا کە تێکەڵ بە ڕوخانە دەبێت و (زەغەیتون) دێنێتە بەرهەم، کە پێیان ئەوت (عيث) ڕو ئەکەنە (رازانات – دەشتی ئیفتخار

---

[304]. خانەقین لە مێژوودا: گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ژمارە ١٨–١٩، ل٣٤١، بغداد.

[305]. مێژووی حەسەنوەیهی و عەیاری: مەلا جمیل ڕۆژبەیانی، ل١٥٦–١٥٧.

[306]. تأريخ الامم الاسلامية: خضری بەگ، ص٢٢٥. قادة فتح العراق والجزيرة: اللواء الركن محمود شيت خطاب، ص١٢٧.

– عەلی سەرای) و لەوێوە روو ئەکەنە (خوێ لین – خوڵنجان – توزخورماتو) و (دێ کوك – دقوقاء)، ئنجا (کەرخینی – کەرکوك) و (کەرخ جدان – قەرەحەسەن) و (خاینجار – قەرەهەنجیر – هەزار کانی). ئەم ناوانە هەموو سەر بە ئوستانی (باجەرمی – بیس گەرمای – وڵاتی گەرمیان)ە. ئەو فەرماندانەی ئیسلام ئەم وڵاتانەیان هەموو بە ئاشتی گرتووە. ئەمانە لای خۆرهەڵاتی باشوری کوردستانە.) (لای باکور و خۆرئاوای کوردستانیشەوە، هەرێمەکانی جزیرە – ئامود – موسڵ – هەکاری – هەولێر.) ئەنجا بەرەو ژوور بۆ کوردستانی سەرو ئازربایجان و ئەرمینیە. هۆی ئەوەی کە کوردی ئەم ناوە بە ئاشتی خۆیان دایە دەستەوە، بۆ رزگاری بوو لە ستەم و بەد کرداری دەسەڵاتی ساسانی، هێزی عەرەبی ئیسلام بە رابەری و پشتیوانی کورد هەڵگڕانە شاخەکان.)[307]

– لە (اسد الغابة)دا هاتووە (بەرگری کەرانی ناو قەڵای موسڵ داوای رێکەوتنیان کرد، عەبدوڵلا گەیشتە موسڵ، داوای لە هەڵهاتوان کرد بگەڕێنەوە و پەیمانی دانێ کە مافیان دەپارێزێ و هەموو سەربەست و ئازادن لە ژیان و بیروباوەڕیاندا، ئەوانیش گەڕانەوەو رێکەوتنیان مۆر کرد.)[308]

– شیت خەتاب دەڵێ: (زۆر بە ئاسان شاری قرقیسیا رزگار بوو – شارێکە لە سێگۆشەی گەیشتنی روباری خابور بە روباری فورات – لەگەڵ خەڵکەکەی رێك کەوتن کە جزیە بدەن و لەسەر ئاینی خۆیان بمێننەوە.)[309]

– واقیدی دەڵێ: (عیاز کوڕی غەنەم هەرێمی جزیرەی بە ئاشتی رزگار کرد.)[310]

– یەعقوبی دەڵێ: (جزیرە بە ئاشتی رزگار کرا.)[311]

---

[307]. وڵاتگیری رەشەخاکی عێراق: مەلا جمیل رۆژبەیانی، ل١١، چاپی یەکەم، ١٩٩٧ سلێمانی.

[308]. اسد الغابة: ج٣ص٢٦٤.

[309]. قادة فتح العراق والجزيرة: محمود شيت خطاب، ص٤٠٤.

[310]. فتوح الشام: ابن عمر الواقدي.

[311]. كتاب الخراج: ابويوسف اليعقوبي.

– بەلازەری دەڵێ: (هەرێمی جزیرە – بۆتان – ئاسانترین وڵات بوو بە ئاشتی رزگار کرا.)[312]

– تەبەری و شیت خەتاب و ئیبن ئەسیر دەڵێن: (شاری قرقیسیا بە ئاسانی رێك کەوتن، زۆر لە خەڵکی ناوچەکە موسوڵمان بوون. جزیرە – بۆتان – ئاسانترین وڵات بوە کە بە ئاشتی و رێکەوتن رزگار بوون.)[313]

– ئیبن ئەعسەم دەڵێ: عیاز کوڕی غەنەم سوپایەکی بە فەرماندەیی عەمر کوڕی سەعد نارد بۆ شاری سنجار و بە ئاشتی رێك کەوتن.)[314]

– واقیدی و ئیبن ئەعسەم دەڵێن: مالکی ئەشتەری کوڕی حارسی نەخەعی نارد بۆ شاری (ئامێدی) و (میافارقین)، لەگەڵ مەرزبانی ئامێدی بە ئاشتی رێك کەوتن. مالك هەموویانی رازی کرد، پاشان شاری بۆ بەجێ هێشتن، هەر لەوێ وە رویان کردە شاری نزول – نزیك شاخی جودی – بە ئاشتی رێك کەوتن، پاشان چون بۆ شاری میافارقین، بەتریارکی شار (نتوس)، کەسێکی نارد بۆ رێکەوتن، ناوچەکە بێ شەڕ ئازاد بوو.)[315]

– واقیدی دەڵێت: هەندێ مێژوونووس دەڵێن شەڕێکی قورس لە شاری نوسێبین روی داوە لە نێوان سوپای رۆم و ئیسلامدا، لە ئەنجامدا هەموو سەرکردە رۆمەکانیان کوشت و، ئەسیرەکانی تر بەرەڵا کران ئەوسا شار گیرا. بەڵام مێژوونووسەکانی تر ئاوای دەگێڕنەوە. خەڵکی ئەم شارە پێشتر نوێنەریان نارد بوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، کە سوپای ئیسلام لە سەردەمی خەلیفە عومەردا، لە شار نزیك بونەوە، خەڵکی شاری نوسێبین لە رێورەسمێکی جوان و بە شکۆدا پێشوازیان لێ کردن و، موسوڵمان بوون، پاشای شار (تریاتس) لەگەڵ زانایان و ماقوڵانی شار موسوڵمان بوون، کەنیسەکانیان کردە مزگەوت. موسوڵمانەکان کاروباریان بۆ تریاتس رێك

---

[312]. فتوح البلدان: بلاذري.

[313]. قادة فتح العراق والجزيرة: محمود شيت خطاب، ص٤٨٧. طبري:ج٣ص١٥٦. ابن اثير: ج٢ص٢٠٥.

[314]. كتاب الفتوح: ابن اعثم الكوفي، ج١ ص٣٣٩.

[315]. فتوح الشام: الواقدي، ج٢ص١٠٢. كتاب الفتوح: ابن اعثم، ج١ص٣٣٩.

خست و شاریان چۆڵ کرد، تریاتس بە پاشا مایەوە، هەتا سەردەمی خەلیفە عوسمان ئەوسا مرد.[316]

– خەتاب‌و ئیبن ئەسیر و واقیدی دەڵێن: پاشان سوپای ئیسلام ڕێکەوت بەرەو (ئامێدی)، ژنێك حوكمی دەكردن بە ناوی (ماریەم) ئەو ژنە بە خۆی و كەس و كار و ماڵ و منداڵیەوە موسوڵمان بوون، زۆر ئاسان شار ئازاد كرا.[317]

– بەلازەری دەڵێ: (عیاز شارەكانی – رقە و حەران و رەها و نوسێبین و میافارقین و قرقیسیا و دێهاتەكانی فورات و شارەكانی تری بە سوڵح و ڕێكەوتن و ئاشتی رزگار كرد.)[318]

– بەلازەری‌و ئیبن عەبدڕەبە دەڵێن: (لە سەردەمی خەلیفە عومەردا، هەموو جزیرە بەئاشتی ئازاد بوو، بستێكی نەمایەوە.)[319]

– واقیدی دەڵێ: (خەڵكی شاری (رقە) وەفدێكیان نارد بۆ لای (عیازی كوڕی غەنەم) و زۆر بە ئاسانی ڕێك كەوتن.)[320]

– ئیبن ئەسیر دەڵێ: موسوڵمانەكان و خەڵكی شاری (رقە) بە ئاشتی ڕێك كەوتن، بەم جۆرە هەرێمی جزیرە ئاسانترین وڵات بوو كە بە ئاشتی فەتح بووە.)[321]

– مەحمود شیت خەتاب دەڵێ: سوهەیل كوڕی عودەی بەرەو شاری رقە كەوتەڕێ، خەڵكی شار داوای ئاشتیان كرد، سوهەیل لەگەڵیان ڕێك كەوت.)[322]

---

[316]. فتوح الشام: واقدي، ج٢ص١٠٣.

[317]. الكامل في التأريخ: ابن اثير، ج٢ص٢٠٢. قادة فتح العراق والجزيرة: محمود شيت خطاب، ص٤٨٧.

فتوح الشام: الواقدي، ج٢ص١٠٣.

[318]. فتوح البلدان: بلاذري، ج١ص٢٠٧.

[319]. الاستعاب في معرفة الاصحاب: ابن عبد ربه، ج٣ص١٢٤٣. فتوح البلدان: ج١ص١٧٩.

[320]. فتوح الشام: الواقدي، ج٢ص٦٥.

[321]. الكامل في التأريخ: ابن اثير، ج٢ص١٥٣ حققه علي شيري، بيروت – دارالتراث العربي.

[322]. قادة فتح العراق والجزيرة: محمود شيت خطاب، ص٤٧٣–٤٨١.

– تەبەری‌و ئیبن ئەسیر دەڵێن: سوهەیل و عیاز پێکەوە چون بۆ شاری (حەران) و لەگەڵ خەڵکەکەی رێك کەوتن. پاشان عیاض (سوهەیل و عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە)ی نارد بۆ شاری (ڕەهـا) لەوێش بە ئاشتی رێك کەوتن، بەم جۆرە جزیرە جزیرە ئاسانترین وڵات بوە فەتح کرا.[323]

– خزری بەگ دەڵێ: (عیاز) چوو بۆ (ڕەهـا) بە ئاشتی رێك کەوتن، پاشان چوون بۆ (حەران) بەبێ شەڕ رێك کەوتن.[324]

– ئیبن ئەعسەم دەڵێ: بەتریارکی شاری (ڕەهـا) نوێنەری نارد بۆ لای (عیاز) بەم جۆرە (ئەگەر وەك خەڵکی رقە پێمان رازی دەبن، ئەوا ئێمەش ئامادەی رێکەوتنین)،(عیاز) بە رەزامەندی وەڵامی دانەوە. عیاز داوای لە سوپاکەی کرد کە خەڵکی شاری رەها لە (زیمە و عەهدی) ئێمەدان، ئەزیەتیان مەدەن، مەچنە ماڵیان بەبێ مۆڵەت.[325]

– واقیدی دەڵێ: عەبدوڵڵا کوڕی عوتبان رۆیشت بەرەو شاری (حەران) هێشتا نەگەیشتبون کە نوێنەری شار پێشوازی لێکردن و وتیان سوپای رۆم ناوچەکەمانی چۆڵ کردوە، حەز دەکەین وەك شارەکانی تر لەگەڵ ئێمەش رێك بکەون. بەو جۆرە پەیمانیان مۆر کرد.

لە جێیەکی تردا دەڵێ: (پاشای حەڕان خەڵکەکەی ئامادە کرد و پێشوازیان لە سوپای ئیسلام کرد، شاری حەڕان بە ئاشتی و خۆشیەوە پاشاو گەدایان موسوڵمان بوون. هەموو کەنیسەکانیان کردە مزگەوت. سوپای ئیسلام شارەکەی بەجێهێشت بۆ خۆیان.)[326]

---

[323]. تأريخ الطبري: ج٣ص١٥٧. الكامل في التأريخ: ج٢ص١٥٣، بيروت١٩٨٩.

[324]. محاضرات في تأريخ الامم الاسلامية: الشيخ محمد خضري بك، ج١-٢ ص٢١٨، مصر ١٩٦٩.

[325]. كتاب الفتوح: ابن اعثم الكوفي، ج١ص٣٣١.

[326]. فتوح الشام: الواقدي، ج٢ص٨٥-٨٨.

- ئیبن ئەسیر دەڵێ: (هەردوو قەڵای زیباد و زلوبیا نزیك بە شاری رەئسولعیون بە ئاشتی رزگار بوون. دوای ئەوەی رۆمەكان لە شاری راس العیون راو نران)

- ئیبن ئەسیرو بەلازەریئاوا دەڵێن: (فدفعت الارض الی اهلیها الاصلیین) واتە خاكی وڵاتەكە درا بە خاوەنە رەسەنەكانیان كە كوردن.[327]

- واقیدی دەڵێ: دوای رەئسولعیون شارەكانی (دارا و بیرحا و باعما) بە ئاشتی رێك كەوتن و خەڵكەكەی موسوڵمان بوون.[328]

---

[327]. الكامل في التأريخ: ابن اثير، ج٢ص٢٠٨، بلاذري: ص١٨١.

[328]. فتوح الشام: الواقدي، ج٢ص١٠٢.

## رزگارکردنی باب و ئەرمینیا

عوتبە بووە ئەمیری ئازربایجان. ئەوە بوو پەیمانێکی بەهێزی لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە مۆر کرد، کە سەربەستی تاك و کۆمەڵ و، ئازادی بیروباوەڕ و ئاینی تیا بوو بۆ کورد و ئەرمەن و مەجوسی و گاورەکانی ناوچەکە، بڕیاری نووسی کە ماڵ و سامان و شەرەف و کەرامەتیان پارێزراو بێت.

داوایان لە خەلیفە عومەر کرد، کە پێش بکەون بەرەو ژوور، بۆ پاراستنی سنوورەکانی دەوڵەتی ئیسلامی لە هێرشەکانی تورك و خەزەر و ئازەر و گورجی و ئالانی و ئەرمەنە کێویەکانی قەوقاس، کە لە ئەفسانەکان دا بە (پشتی قولەی قاف) ناسراوە. جگە لەوە ناوچەیەکی ستراتیژی سەربازی گرنگ بوو بۆ سوپای ئیسلام و، کۆتاکردنی دەستی فارس و رۆم لەسەر ئەو ناوچە و گەلانە.

لە لایەکی ترەوە مەترسیان دەخستە سەر ئەو ناوچانەی کە دەڕوانن بەسەر دەریای رەش (بنتس) کە شاری قوستەنتنیەی پایتەختی رۆمی بە سەرەوەیە. وەك لە فەرموودەکەی پێغەمبەردا هاتووە – درودی خوای لەسەر بێت –. (من فتح قسطنطينية فنعم امير اميرها، ونعم الجيش ذلك الجيش) واتە ئەوەی شاری قوستەنتنیە رزگار بکات، چاکترین ئەمیری ئەو لەشکرەیەو چاکترین سوپای ئەو سوپایەیە.

خەلیفە عومەر رێگەی دان، سوپایەکی چاك بەڕێ کەوت بەرەو (دوین) پایتەختی ئەرمینیای چوارەم، کە پارچەی چوارەمی ئەرمینیا بوو، شارێکی کوردی بوو، کە سوپای فارس بە پێشڕەوی موسوڵمانەکانی زانی، هەردوو پردی (جرازان) و (منیر ئاموریان)یان پچڕاند، ئەمە تەگەرە بوو لە ڕێی موسوڵمانەکاندا، بەڵام پاشایەکی کوردی لە شاری (مکس) بە ناوی (واردیك) چاوساغی بۆ سوپای ئیسلامی کرد، لە ڕێیەکی ترەوە بردنیەو لە ئاوی (ئازات، ئازاد، ئاراس) پەڕاندنیەوە، پشتیان لە پایتەختی ناوچەکە (دوین)

(نوین)[329] گرت، لە ماوەیەکی کەم دا ئازادیان کرد. بەم جۆرە بەشی چوارەمی هەرێمی ئەرمینیایان (ئەرمینیای چوارەم) ئازاد کرا، کە زۆربەی دانیشتوانی کوردن! ئەرمەنیش ئەو بەشەی کوردستانی بۆ خۆی زەوت کرد بوو، بەشی ژیانی کوردی ئەو زەمانە، سەر بەشی مالآن بوە، بەلآم سوپای ئیسلام ئەوەشی سەندەوە و خستیەوە سەر کوردستانی گەورە.[330]

عومەر (سوراقەی زولنور[331] )ی کردبووە والی بەسرە، کە ئازایەتی تیا شك برد، بە نامەیەك لای برد و ناردی بۆ جەنگی نەهاوەند و و رەی و پاشان بۆ ناوچەی (باب)، ئەبوموسای ئەشعەری خستە جێی بۆ والی بەسرە. نامەکەی عومەر بەم جۆرە بوو:. سوپایەك رێك بخات، پێشەنگ بداتە عەبدوڕڕەحمان کوڕی رەبیعەی باهلی، لای راست بداتە (بکیر کوڕی عەبدوڵلا) و لای چەپ بداتە (حوزەیفەی کوڕی ئەسیدی غەفاری) – ئەمە حذیفەی یەمانی نیە –. ئەم سوپایە کەوتەڕێ، پاشان خەلیفە عومەر نامەی نووسی بۆ (حەبیب کوڕی موسلیم) کە بە هێزێکەوە، لە جزیرەوە بکەوێتە ڕێ بۆ یارمەتی (سوراقە)، کە سوپا لە (باب) نزیك بویەوە، پاشاکەیان کە ناوی (شەهربران) بوو، داوای لە

[329]. هەندێك لە مێژوونوس و لێکۆڵەرەوان لەسەر ئەو رایەن کە سەلاحەددینی ئەیوبی خەڵکی ئەم شارەیە، بەلآم هێشتا روون نەبۆتەوە، هەندێکی تر دەڵێن (نوین)ی نزیك رەواندز نزیکترە.

330. فتوح البلدان: بلاذري، ص٣٢٧

[331]. سوراقەی نوالنوری کوڕی عەمرو کوڕی لبنە، صحابەیەکی خۆشەویست بوو، لە سەردەمی پێغەمبەردا، گەنجێکی خوێن گەرم بوو لە سەردەمی ئەبوبەکردا، عومەر کردیە والی بەسرە، پاشان ئەبوموسای ئەشعەری خستە جێی و، سوراقەی نارد بۆ ناوچەی (باب)، خەڵکی ناوچەی باب خۆیان هاتن لەگەڵ سوراقە رێك کەوتن، پاشان فەرماندەکانی بەردەستی خۆی نارد بەم جۆرە: (بکیر) بۆ (موقان). (حبیب) بۆ (تفلیس)، (حذیفە) بۆ (ئالانی) و (سەلمان) بۆ جێیەکی تر، پاشان نامەی سەرکەوتنەکانی بۆ عومەر نوسی. ئەمیش سەری سوڕما و پەشۆکا، چونکە عومەر نەیناربون، لەبەرئەوەی ناوچەکە فراوانە و ژمارەی ئەمان کەمە. هەر بۆیە زۆری نەخایاند هەڵیان کەندنەوەو رلویان نان، جگە لە (بکیر) لە (موقان). سوراقە لە هەرێمی (باب الابواب) مرد پێش ئەوەی بەرهەمی بەدەست هاتووی بە تەواوی ببینێ. عبدالرحمن کوڕی ربیعەی باهلی لە جێی خۆی دانا.

سوپای ئیسلام کرد کە بیپارێزن و بیبەن بۆ لای عەبدورڕەحمان کە پێشەنگی سوپاکە بوو، بردیان. دانیشتن. پاشا وتی: (من دراوسێی دوژمنێکی هارم، دراوسێی کۆمەڵێ میللەتی نەزانم کە هیچ لە دنیا نازا[illegible] اکرێ پشت بەوانە ببەسرێ، من نە قەبەجم، نە ئەرمەنم. ئێوە توانیتان وڵاتی من بگرن، ئێستە من لە ئێوەم و دەستم لەگەڵ دەستاندایە و سەرکەوتن بۆ ئێوەیە، چیتان پێ خۆشە وا دەکەم، بەڵام داوایەکم هەیە حەز ناکەم بە جزیە سەرشۆڕمان بکەن، با دوژمنەکانتان بە کەم باسمان نەکەن و گاڵتەمان پێ نەکەن.)[332]

بەڵام ئیبن ئەعسەم لە (الفتوح)دا بەم جۆرەی دەگێڕێتەوە: پاشاکەیان ناوی شەهریر ئەز بوو بە عەبدورڕەحمانی وت: (ئێوە وڵاتی ئێمەتان گرتوە، منیش ناچارم لەگەڵ ئێوە بم، ئێمە بەرامبەر دوژمنێك وەستاوین کە فارس و ئەرمەنە، پێیان رازی نین، بەڵام لەگەڵ ئێوە دەستمان لە دەستتان دایە، خوا بەرەکەت بخاتە ئێمە و ئێوەش، خوا پاداشتی ئەوەتان بداتەوە کە هاتن و لە چنگی فارس رزگارتان کردین، ئێمە لە فارس بێزارین، ئێمەیان خوارد، سەرکەوتن هەر بۆ ئێوەیە بەڵام حەز دەکەم بە جزیە سەرشۆڕمان نەکەن!)

عەبدورڕەحمان وتی: (پیاوێك لەوێ دایە، حەز دەکەم بچینە لای ئەو) کە چونە لای سوراقە و باسەکەیان بۆ گێڕایەوە، سوراقە وتی: (هەرچی دەیڵێی منیش قبوڵمە. بەڵام جزیە بۆ ئەوانەیە کە دانیشتوون، ئەوەی دێتە پاڵ ئێمە و چەك هەڵدەگرێ با جزیە نەدات، پاشاش قبوڵی کرد.) سوراقە دەقی ئەم رێکەوتنەی نارد بۆ خەلیفە عومەر و داوای یارمەتی لێ کرد. عومەر ئەم خاڵەی زیاد کرد، کە دەتوانن پشت بە بێ دین ببەستن لە شەڕدا و، بەکاریان بهێنن بەرامبەر نەدانی جزیە.[333]

ئەبو یوسف دەڵێ: (شەهریراز پاشای وڵات چوو بۆ لای عەبدورڕەحمان و گلەیی کرد لە ئەرمەن و قەبج کە رەقن بەرامبەری و قینیان لێیەتی و چیان

---

[332] . قادة فتح بلاد فارس: اللواء الركن محمود شيت خطاب. ص٢١٠.

[333]. كتاب الفتوح: ابن اعثم الكوفي. ص٢٢٦.

بەسەر وڵاتەکەی هێناوە، پاشان داوای کرد لە جزیە عەفوی بکەن.)[334] عەبدوڕڕەحمان وتی: (دەبێ هەر جزیە بدەن مادام یارمەتیمان نادەن لە دژی دوژمنەکانمان، بەڵام ئەوەی یارمەتیمان بدات، ئەوە جزیەی لەسەر هەڵدەگرین.) سوراقە نامەی ئەم ڕێکەوتنەی نووسی بۆ عومەر، عومەریش ڕازی بوو، هەر بەو جۆرەش لەگەڵ ئەرمەنەکان ڕێك کەوتن ئەمەش دەقی ڕێکەوتنەکەیە کە مانای زۆر بەرزی تیایە:

(بسم الله الرحمن الرحيم. هذا ما اعطى سراقة بن عمر، عامل امير المؤمنين عمر بن الخطاب، شهربراز و سكان ارمنية و الارض من الامان، اعطاهم امان لأنفسهم و اموالهم و ملتهم الاّ يضاروا ولا ينقصوا على اهل ارمينية والابواب الطراء منهم والثناء ومن حولهم، فدخل معهم ان ينفروا لكل غارة و ينفذوا لكل امر ناب او لم ينب رأه الوالي صلاحا على ان توضع الجزاء على من اجاب الى ذلك الا الحشر والحشر عوض عن جزائهم ومن استغنى عنه منهم و قصد، فعليه مثل ما على اهل ازربايجان من الجزاء والدلالة والنزل يوما كاملا. فأن حشروا وضع ذلك عنهم، و ان تركوا اخذوا به.)[335]

مەحمود شیت خەتاب لێرەدا دەڵێ: مەرج و پەیمانی ئاوا، لە هیچ ڕێکەوتنێکی نێوان دوو هێز، یەکیان سەرکەوتوو، ئەوی تریان شکاو و ژێرکەوتوو، لە مێژوودا نیە و نەبووە! هەتا دوای دانانی یاسای جەنگ و بێلایەنی لە یاسای نێو دەوڵەتاندا، حەز دەکەی سەیری جیاوازی نێوان ئەم دوو دەقە بکە کە یەکیان لە سەدەی حەوتەمی زایینی دا نووسراوە کە ئەوەی سەرەوەیە و، ئەمی تریان دەقی ڕێکەوتنی (فرسای) نێوان ئەڵمانیا و وڵاتانی هاوپەیمانە (الحلفاء) کە دوای جەنگی جیهانی یەکەم لە سەدەی بیستەمدا نووسراوە، بزانە چۆن ئەڵمانیا و عوسمانی شکاو دادەچۆڕن و پارچە پارچە و دابەشیان دەکەن و، ئەوە بۆ نزیکەی سەد ساڵێك دەبێ تا ئێستەش

---

[334]. كتاب الخراج: اليعقوبي بن ابراهيم ابويوسف. ص٧٢، مصر.

[335]. تأريخ الطبري: الطبري، ج٣ص٢٣٦.

هەڵنەساونەتەوە. ئەو کەسە راستی کردووە کە وتویەتی: (جیهان هەرگیز رزگارکەری لەمانە عاتیفانە و بە سۆز و بە رەحم تر و لەخۆبوردە تری نەدیوە لە مێژوودا.)[336]

سوراقە مەبەستە سەرەکیەکانی هەموو پێکا، پاشان کۆبونەوەیەکی بە فەرماندەکانی کرد و بەم جۆرە دابەشی کردن:

١- بکیر کوڕی عەبدوڵلای نارد بۆ (موقان)، پاشان ناردی بۆ ناو تورکە خەزەریەکان کە دێهاتێکی زۆری تیا بوو، بۆ لەوەڕگا بە سوود بوو.

٢- حەبیب کوڕی مسلمەی نارد بۆ تفلیس.

٣- حوزەیفەی کوڕی ئەسیدی غەفاری نارد بۆ (ئالان) کە کۆمەڵێ شاخە لە وڵاتی شیشانی ئەمڕۆ.

٤- سەلمان کوڕی ربیعەی باهلی نارد بۆ جێیەکی تر کە ناوی نەهاتوە.

سوراقە نامەی سەرکەوتنەکانی بۆخەلیفە عومەر نوسی، ئەویش سوپاسی خوای کرد چونکە ئەو ناوچانە سوپا و چەك و جبەخانەی زۆری دەویست. بەڵام سوراقە بە شێوازی نەرمی و ئاشتی و رێك کەوتن و شەڕێکی کەم هەمووی تەواو کرد.

پاشان سوپایەکی تری بەرەو لایەکی تری ئەرمینیا و زنجیرە چیاکانی قۆقاز نارد، گەیشتنە ناوچەی (ئاران) کە پارچە پارچەکانی سوپای فارس خۆیان تیا حەشار دابوو. بکیر سەرکەوت بەرەو (باب الابواب) واتە مەمەڕ و رێگاو گوزەری چیای قەوقاز و دەریای خەزەرە. دەکەوێتە باکوری هەرێمی (ئاران).[337]

ئەم ناوچانە هەتا سەردەمی خەلیفە عوسمان هەر ما. خەلیفە عوسمان داوای کرد لە (سەلمان کوڕی رەبیعەی باهلی) کە بەرەو وڵاتی (ئاران) بکەوێتە

---

336. قادة فتح بلاد فارس: اللواء الركن محمود شيت خطاب. ص٢١٠.

337. الكامل في التأريخ: ابن اثير. ج٣ص٢٨.

ڕێ، شارەکانی بیلقان و بروکە و شمکو و شابران و شوران و ئەوانی تر ڕزگار کران.[338]

پاشان عوسمان داوای کرد لە والی شام (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) کە (حەبیبی کوڕی مەسلەمەی فەهری) بنێرێتە سەر بەشەکانی تری ئەرمینیا، ئەویش بە (هەشت) هەزارە وە لە شامەوە ناردی، دوای شەڕێکی کەم ئاشتی مۆرکرا، ڕۆمەکان لەم سەرکەوتنانە ترسان لە هەموو میللەت و گەل و هۆزەکانی ئەو ناوە سوپایەکی زۆریان کۆکردەوە بۆ سەر موسوڵمانەکان.(حبیب) خەلیفە عوسمانی ئاگادار کرد، ئەویش داوای لە (معاویە) کرد سوپایەکی بۆ یارمەتی بۆ بنێرێ، هەروەها خەلیفە عوسمان داوای لە والی کوفە (سەعیدی کوڕی عاس)ی کرد کە یارمەتی بۆ بنێرێ چونکە حبیب پێ گیراوە. ئەویش سەلمان کوڕی ڕەبیعەی باهلی بە (شەش) هەزارەوە بۆ نارد.[339] سوپای ڕۆم بە سەرکردایەتی (بەتریارک بندار منیاف) لە نزیك شاری (شمتات) کۆبونەوە، شەڕ قەوما. ڕۆم هەڵهات و شکا. (حەبیب) چوە شاری (مربالا) و بەتریارکی شاری (خەلات) پێشوازی لێ کرد، پەیمانە ئاشتیەکەی کاتی خۆی و (عیازی کوڕی غەنەم)ی نیشان دا، کە پێشتر مۆریان کرد بوو، هەمو شارەکانی ئەو ناوە کە کورد بوون پەیمانی ئاشتیان مۆرکرد، بەم جۆرە فەتحی ئەرمینیا و ئاران و موقان و باب الابواب، بە ئاسانی تەواو بوو. هیچ خاکێکی کورد نەما لە ژێر دەستی هیچ لایەکدا بێت، هەر هەموی کەوتە دەستی موسوڵمانەکان و کوردەکان خۆیان یەك لا کردەوە بۆ ئاینی ئیسلام.

ئەوەی لێرەدا جێی بناشت و گلەییە ئەوەیە:

یەکەم: ڕزگاربوونی کوردستان بە ئاشتی، سەروەریەکی گەورەیە، خۆلادان لە شەڕی فارس و ڕۆم ژیریە، دژایەتی نەکردنی سوپای ئیسلام کارێکی

---

[338]. فتوح البلدان: بلاذري. ج١ص٢٤٠.

[339]. هەمان سەرچاوە، ص٢٢٤.

حەكیمانە بوو بۆ كورد. بەڵام سەد حەیف كە ڕێكەوتنێكی تۆمار كراوی نێوان كورد و سوپای ئیسلام دیار نیە، باسێكی روونی دانیشتنێكی نێوان سەردارێكی كورد و سەردارە ئیسلامیەكان باسی نیە.بە مەرجێ كە دەنگ و باسی ئیسلام لەگەڵ گەلە بچوكەكانی وەك ئەرمەن و نیتاق و ئازەر و قەبەج و تەبرستان و ئاران و موقان و باب و ئەوانی تر هەیە و هەر هەمووی نووسراوە، كە بە مەرجێ كورد لە روی خاكەوەو لە روی دانیشتوانەوە چەند قاتی هەموو ئەو گەلە بچوكانە دەبێت.

دووەم: ناوی كورد بە هیچ جۆرێك نەهاتوە، نە بە كورد یان گورد یان كوردۆ یان كاردۆخی یان كاردا كە مێژووی پێش ئیسلام ناوی بردون. ئەی نەدەبوو سەردارێكی كورد بهاتبایە خۆی بناسانایە و خۆی و گەلەكەی و ویست و داواكاریانی ببردایە و شتێكی لە شێوەی نامە یان ڕێكەوتن یان دانیشتن تۆمار بكردایە، وەك ئەو هەموو گەلە بچوكانەی تر كە پێشتر باسكران یان دواتر باسیان دێت. ئۆباڵی ئەم گلەییانە بە رای من هەر هەمووی لە ئۆباڵ و ئەستۆی سەردارە كوردیەكانی ئەو كاتانەدان و، لەوان ناترازێ، ئەگەر بهاتنایەتە پێشەوە و ناوی خۆیان‌و گەل و داواكاریەكانیان ببردایە ئێستە عەقڵیەتی ئەو كاتە و ناوی چەند شار و پاشا و سەردارمان دەزانی و هەندێ لە باری كۆمەڵایەتی و ئایدۆلۆژی و سیاسیان حاڵی دەبووین. بەڵام سەد حەیف و داخ و ئۆف. یان دەبێ كورد سەردار و دەم راستی نەبوبێ و، خاوەنی هیچ نەبوبن و، بە هەڵهاتنی فارس و رۆم شیرازەی ناوچە كوردیەكان شێوا بێت، یان كورد هەر ویستویانە فارس و رۆم و شەڕی هەزار ساڵەیان لە خاكی كوردستاندا یان لە كۆڵ ببێتەوە و هیچی تریان نەویستوە كە ئەمەش هەر لاوازی دەردەخات، یان دەیان ئەگەری تر كە هەر هەمووی ئەو بۆشاییە پڕ ناكەنەوە كە شتێكیان بۆ كوردی دوای خۆیان و مێژوو جێ نەهێشتوە!

# بەشی حەوتــەم

* (کوردستان و ئاینی ئیسـلام) کتێبێکی هەڵبەستراوە!

* ژیان نامەی واقــیـدی

* واقــیـدی لە ترازوی لێکۆڵەرەواندا

* هەردوو کتێبی (فتوح سواد العراق) و (کوردستان و ئاینی ئیسلام) راستن، یان هەڵبەستراو؟

* پەتــی درۆ کورتـــە

* بانەیی ئەسحابەکـــــوژ لە چییەوە هاتووە؟

## (كوردستان و ئاينى ئيسلام) كتێبێكى هەڵبەستراوە!

لە بەشەكانى پێشودا ئەوە سەلما كە كوردستان بە ئاشتى رزگار بووە، وە شەڕێكى واى شايانى باس لە كوردستاندا روى نەداوە، بە تايبەت مێژووەكان هيچ شەڕێكى نێوان كورد و سوپاى ئيسلاميان تۆمار نەكردووە، ئەگەر شتێكيش روى دا بێ، ئەوە لە نێوان سوپاى فارس و رۆم، لەگەڵ سوپاى ئيسلام دا بوە، تەنها هەر ئەوەندە بوە كە لەسەر خاكى كوردستان بوە، كە لە لايەن فارس و رۆمەوە داگيركراوە.

بەڵام پێچەوانەى ئەوەى باسكرا كتێبێكە بە ناوى (كوردستان و ئاينى ئيسلام) لە نووسينى (مەلا رەئوف سليم حوێزى) كە لە ساڵى ١٩٧٠دا لە بەغداد چاپ كراوە و بە زمانى كورديیە، باس لەوە دەكات كە سوپاى ئيسلام بە سەركردايەتى خاليد كە خەليفە عومەر مۆڵەتى داوە، بە فەرماندەيى قەعقاع و زرار و عەبدوڵلاى كوڕى عومەر و وائلە و عەبدوڕڕەحمان كوڕى ئەبوبەكر و ئەنەسى كوڕى ماليك و زوبێرى كوڕى عەوام و ميقداد و فەزل كوڕى عەباس و سالم و عەبدولقادرو.هتد. ئەمانە بە سوپايەكى چوار هەزار كەسى، كە زياد و كەمى دەكرد، لە روى شامەوە هاتنە كوردستان، پاشان چوونە هەولێر و ئەنجا بەرەو ناوچەى مەرگە و پشدەر و ئەزمڕ و قەڵاچوالان و سابڵاغ و بانە رۆيشتون و، شەڕێكى توند و خوێناوى لە نێوان كوردەكان و سوپاى ئيسلامدا روى داوە، هەتا لە دوايى دا كورد قەتڵ و عام كراوەو ن ژن و منداڵ و سامان و ماڵى بە تاڵان براوەو، بە زەبرى شمشێر موسوڵمان كراوە. لەو شەڕانەدا، جگە خاليد، هەر هەموو فەرماندەكان دەكوژرێن و، كوردستان دەبێتە گۆڕستانى ئەسحابان.

زۆر لەو نوسەرە كوردانەى ئەمڕۆ كە بۆ خاڵى لاواز و هەڵوێستى نزم لە ئيسلام دەگەڕێن و، ئەوانەى دەيانەوێ كورد موسوڵمان نەبێ. لەم كتێبە زۆر سوديان وەرگرتوەو، نمونەيان لێ هێناوەتەوەو كرديانەتە چەكى دەستيان هەتا كورد لەبەرچاوى موسوڵمانانى جيهان و، ئيسلام لەبەرچاوى كورد بخەن.

ئەم کتێبە پێچەوانەی باسەکەی منە، ئەگەر ئەم نوسراوە راست بێت، سەرچاوە مێژووییەکان پشتی بگرن، ئەوا لێکۆڵینەوەکەی من هەڵدەوەشێنێتەوە و، دەکەوێتە بەر سەرنج و توانج و پوچەڵ دەبێتەوە.

لە زوەوە بە تەمام شتێك لەسەر ئەم کتێبە بنووسم، زۆر هەوڵم داوە سەرچاوەی هێنانی ناوەرۆکی ئەم کتێبە بدۆزمەوە، هەردوو بەرگەکەی فتوح شامی واقیدیم خوێندەوە، باسی نەکرد، فتوح بولدانی بەلازەریم ئەم دیو دیو کرد، تیا نەبوو، من گومانم هەر بۆ ئەو دوانە دەچوو. گەڕام بە دوای (تجارب الامم)ی ئیبن مەسکویەدا، ئەویش لە شێوەی واقدیە دەستم نەکەوت، ئەوە پێشتر تەبەری‌و ئیبن ئەسیرو ئیبن کەسیرو خزری بەگم خوێندبویەوە، کە گرنگترین سەرچاوەی مێژووی ئیسلامن، زۆر بە کەمی باسی ناوچە کوردیەکانیان کردوە نەك کورد! نەمتوانی هیچ لەسەر ئەو کتێبە بنووسم، کە بە مەرجێ لە حەفتاکاندا چەند جارم خوێندوەتەوەو لەزەتم لەوە دەبینی کە کورد هەبوەو بەرگریان لە ناوچەی خۆیان کردوە و، زانا و دانشمەند و پاشا و حکومەت و ئافرەتی وایان هەبوە، حوکمی کوردان بکات.

لە دوای هەشتاکانەوە کە مێژووم دەخوێندەوە روناکاییەکم بۆ دەرکەوت کە ساسانی نەیهێشتوە کورد دەسەلات و کیانی هەبێ، ئیسلامیش ئاوایان بە هیچ گەل و میللەتێك نەکردوە کە ئەم کتێبەی مەلا حوێزی باسی دەکات. چەند خاڵێکی لاوازی کتێبەکەم بۆ دەرکەوت و هەندێ لام بچوك بویەوە. کە دەستم کردە نووسینی شتێك کە هەندێك پێیان وایە مێژووە. زۆر رقم لەو کتێبە هەڵسا و هەمیشە لە خەیاڵم دا بوو چۆن چۆنی وەڵامی بدەمەوە. لە هەندێ جێ‌دا کتێبەکە ناوی واقدی دەبات، زۆر هەوڵم دا کتێبەکانی واقیدی پەیدا بکەم، جگە فتوحی شام هیچم دەست نەکەوت، پاشان بە مەبەستی پەیداکردنی سەرچاوەی مێژوویی چومە بەغداد و هەواڵی کتێبەکانی واقیدیم پرسی، کتێبی زۆرم هێنا، هی واقیدی تیا نەبوو، لە کەسی شارەزام دەپرسی، کە مەلا رەئوف ئەم سیپارەیەی لە کوێوە هێنابێ، باسی هەزار و چوار سەد ساڵ لەمەوبەر بەو وردیە، دەبێ لە سەرچاوەوە هێنابێتی، نەیان دەزانی.

ناوی سەحابەی زۆری بردوە، ناوی شار و دێهاتی زۆری ناو کوردستانی تیایە، قابیلە هەڵبەستراو بێت! لێکۆڵینەوەم لەوە کرد بوو کە تەمەنی ئەو شارانەی کوردستان یان سەد ساڵ یان هەندێ لەوە زیاترە، جگە هەولێر و کەرکووك مێژوو هیچ کام لەوانی تری ناو نەبردوە، ئەم ناوی سابلاغی بردوە بەڵام لە کۆندا بە مهابات بە ناوبانگ بووە، ئەو سەحابانەی کە ئەو باسی کردوون یان نەهاتونەتە کوردستان کە ئەو هێناونی، یان نەکوژراون و کە ئەو کوشتونی، یان پێش ساڵی (٢١-٢٥)ی کۆچی مردون یان پاش ئەو مێژووە بە ماوەیەکی زۆر. جگە لەوە ئەم ناوی هیچ سەرچاوەیەکی نەبردوە، جگە لەوە لە هەندێ جێدا ناوی واقیدی هێناوە کە دەزانم واقیدی لای مێژوونوسان و فەرموودەناسان جێی متمانە نیەو لەو (٣٠) هەزار فەرمودەیەی کە هێناویەتی جگە (ئیبن ماجە) دانەیەکیان لێ وەرنەگرتوە، زۆر کەس بەوە تاوانباریان کردوە کە دەیان کتێبی دزیوەو بە ناوی خۆیەوە بڵاوی کردونەتەوە، یان هەڵیبەستوون.

پاشتر لە تاران پێشانگای کتێبی جیهانی کرایەوە، عەزمم لێ جەزم کرد کە فریای بکەوم، من نیازم نەبوو لە مەریوان لابدەم، بەڵام نامەی کەسێکم پێ بوو لە سلێمانیەوە بۆ کابرایەکی مەریوانی کە کتێبخانەیەکی هەبوو. ناچار مامەوە هەتا نامەکەم گەیاندێ.دانیشتبوم لە لای، چاوم هەڵتۆقی بە کتێبی فتوح سوادی عیراق دا کە رێك بەرامبەرم دانرا بوو، کە چاوم بۆ تیژکرد، دەبینم هی واقیدیە و دامگرت. هەتا سنە (سنندج) هەر سەیرم دەکرد، دەبینم هەموو باسەکانی کتێبی (کوردستان و ئاینی ئیسلامی) مەلا رەئوفی تیایە. جگە لە پەراوێزێکی سەد لاپەڕەیی بەهێزی لەسەر کتێبەکە تیا بوو، پەراوێزەکەم هێندەی بابەتەکە پێخۆش بوو.

ئەم کتێبە هەر لە رێوە گەورەترین دەسکەوتی سەفەرەکەم بووە، کتێبەکە لە لایەن مەلا عەبدولعەزیز واعیزی سەردەشتیەوە، لە عەرەبیەوە وەرگێڕا بوو بۆ فارسی. عەرەبیەکەشی لە دنیادا تەنها یەك نوسخەی هەیە، ئەویش دەست نووسە و، نازانن چۆن کەوتوەتە ماڵی مەلا عەبدولسەمەد خەڵکی مەرگە، لە

دیوی کوردستانی عێراق دا، ئەو نوسخەیە یەك بەرگە، کۆمەڵێك خەتی (٣١١)لاپەڕەیی تیایە، لەسەر ئاگاداری شێخ موحەممەد رەئوف نەقشبەندی نەوەی شێخ ئەمین بێژەیی لەبەری گیراوەتەوە و، دوای چەند لەبەرگرتنەوەو دەستاودەستێك، محمد رؤوف تەوەکولی داوا لە مەلا عەبدولعەزیز واعیزی دەکات هەموی وەردەگێڕێتە فارسی، ئێستە نوسخە ئەسڵیەکەی لای نەوەی شێخ محمد ئەمینە. وە مێژووی نوسینی بە گوێرەی نوسخە لەبەر نووسراوەکە کە لە لایەن حاجی قادر رحیم پورەوە نوسراوە، ساڵی ١٣١٨ کۆچی نووسراوە، کە بەم جۆرە دەستی پێ کردووە (الحمد لله الولي الموفق والصلاة على النبي المدقق و آله و اصحابه الطاهرين الظافرين بالتوفيق، قال الروايات باسانيد صحيحة عن حضر الفتوح من اصحاب السير والتواريخ مثل الواقدي و محمد بن اسحاق و غيرهم، قالوا سمعنا و حدثنا انباء الصحابة.) کۆتاییەکەشی بەم جۆرە هاتوە: (تمت الجزء الثالث من فتوحات العراق للامام المهام والمدقق الفهام عمر ابن مفتي البغداد سنة ١٣١٨هجري قمري.)

نوسینی ئەم دەست نووسە حاجی قادر رحیم پور (خەڵکی سردەشت)ە.

لە کۆتایی نوسخەکەدا بە فارسی نووسراوە: (تمام شد فتوحات قسمتی از خاك عراق مربوط به جنگ اصحاب به اکراد، جزء سوم از فتوحات عراق قسمت عربی ان، که مرحوم حاجی ملا عبدالعزيز واعظی با زحمات زیاد از فتوحات عراق که در مرگه عراق پیش ملا عبدالصمد بوده، استخراج و بعد هم به فارسی ترجمه فرموده و اینجانب حاجی قادر رحیم پور هم با خط خودم که از جناب حاجی شیخ رؤوف نقشبندی نسخه مزبور را گرفته و پاك نویسی نموده در تاریخ ٢٥/آذر ماه یکهزار و سیصد و شصت وهشت هجری شمسی اتمام رسید بعون الله الملك المنان.)[340]

مامۆستا نادر کریمیان کە پێشەکی و راست کردنەوەو تەعلیقاتی بۆ فارسیەکە نووسیوە، دەڵێ: فەهرەستی چاپی دەستنوسەکانی کتێبخانە

[340]. فتوح سواد العراق، واقدی، وەرگێڕ بۆ فارسی، ملا عبدالعزيز واعيزی، ل١٢٧ تهران ١٣٧٤.

گرنگ و ناودارەکانی دنیا گەڕام ناوی ئەم کتێبە نیە، هەروەها نسخە عەرەبیەکەی ئەو کتێبەم لە هیچ فەهرەستێکی عەرەبیدا نەبینی. وە لای هیچ کەس، لای هیچ دەزگا و فەهرەستێکی عومومی ولأتانی عەرەبیدا باس نەکراوە، هەروەها لە (تأریخ الادب العربی) کارل واریل بروکلمان بە ناوی (فتوح سواد العراق) نەهاتوە.وە لە کتێبی (المعجم المطبوعات العربیة والمعربة)ی اپر یوسف الیان (سرکیس) کە فەهرەستی تەواوی کتێبە چاپکراوە عەرەبیەکانە، کە هەر لە سەرەتاوە هەتا ساڵی ١٩١٩ ناوی هەموو کتێبە چاپکراوەکانی تیایە، ناوی ئەو نەهاتوە.[341] لەبەرئەوە گومان لەسەر ئەو کتێبە لە زیادبوندایە.

لە سنە لە کتێبخانەیەکدا گۆڤارەکانم رووپەڕ دەکرد، لە لاپەڕەیەکی یەکێکیاندا چاوم کەوت بە وێنەی بەرگی هەردوو کتێبی (کوردستان و ئاینی ئیسلام)ی مەلا رەئوف‌و، کتێبی (فتوح سواد العراق)ی واقیدی کە مەلا واعیزی وەریگێڕا بوو بۆ فارسی، کابرایەك بە فارسی بابەتێکی جوانی نوسیبوو بەراوردکاریەکی چاکی لە نێوانیاندا کرد بوو. هەر زۆر بە پەلە ئەوەشم کری، زۆر گۆڤاری ترم هەڵدایەوە هیچم نەبینی. بەم جۆرە کارەکەی من زۆر ئاسان بوو، پیاو کە سەرچاوەو شایەتی لە پاڵدا هەبوو، بە گوڕتر و بەهێزتر لێ دەنەوێ.

کە گەڕامەوە عێراق، دەبینم کتێبێك لە بازاڕدا دەرچووە بە ناوی (وڵات گیری رەشەخاکی عێراق) کە رێك و پێك (فتوح سواد العراق)ەکەی واعیزییە و رۆژبەیانی لە فارسیەوە وەریگێڕاوەتە سەر کوردی، ئەمەی مامۆستا رۆژبەیانی وەکو باسی کردووە، لە ناوەڕاستی شەستەکاندا لە تاران وەری گێڕاوە بۆ کوردی، لەبەر نەبونی مەیدانێك بۆ چاپ، لە کتێبخانەی ئەوقافی سلێمانی دایناوە، هەتا ئەم دواییە، کە وەزارەتی رۆشنبیری زانیویە بە کەڵکە، لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٧دا چاپی کردوە. ئەم چوار سەرچاوەیە یارمەتیدەر و

---

[341]. فتوح سواد العراق، واقدی، وەرگێڕ بۆ فارسی، ملا عبدالعزیز واعیزی، ل١٢٧ تهران ١٣٧٤.

پاڵنەر بوو، هاندەرێکی چاك بوون، ئەو وەرزەیان بۆ هێنامە کایەوە، کە هەندێ لەسەر راستی روداوەکان و سقەی ئەو سەرچاوەیەی (واقیدی) بدوێم کە ئەو کتێبەی تیا هاتوەتە بەرهەم.

پێش ئەوەی بچینە سەر روداوەکانی کتێبەکە و لێکۆڵینەوە لە ناوەرۆکی، چاك وایە ئەو کەسە بناسین کە لە کوردی‌یەکەدا جار جارە ناوی هاتوەو دەڵێ (واقیدی دەگێڕێتەوە) یان لەسەر بەرگی فارسیەکەدا نووسراوە (بەروایت محمد بن عمر واقدی). کەواتە واقیدی کێیە.؟

## ژیاننامەی واقــیـدی

ناوی (موحەممەد کوڕی عومەری واقیدی)یە، لە ساڵی (١٣٠)کۆچی دا لە شاری (مەدینە) لە دایك بوە.[342] بەڵام رۆژبەیانی بە هەڵە دەڵێ لە شاری (مەککە) لە دایك بوە.[343] سەرەتا خەریکی بازرگانی گەنم بوە، وەك خۆی دەگێڕێتەوە: لە مەدینە گەنمم دەفرۆشت، سەد هەزار درهەمی خەڵکم هێنا بوو بۆ گەنم، بەڵام لە وەجبەیەکدا هەمویم لە دەست چوو، روم لە عێراق کرد.[344] لە کارێکدا کە لە سەفەرێکی حەجی هارونە رەشیددا بۆی کرد، (دە) هەزار درهەمی بەخشش دایە، ئەویش قەرزەکانی لێ دایەوە و لە چەند حسابێکی تردا گوزەرانی ژیایەوە، لە چەند چالاکی و هەڵس وکەوتێکدا دەرکەوت کرایە قازی بەشی رۆژهەڵاتی بغداد. هەر لەوێش لە سەردەمی مەئمون دا مرد. مردنەکەی رێکەوتی (٢٠٧)ی کۆچی بوو.[345]

واقیدی خاوەنی زیاتر لە (٥٢) بەرهەمی گەورەیە. لە فەرمودەو تەفسیر و ئەدەب و فقە و سیرە و فتوحات و مەغازی دا بەرهەمی هەیە.خەتیبی بغدادی دەڵێ: کە واقیدی لە بەشی رۆژهەڵات باری کرد بۆ بەشی رۆژئاوا، کتێبەکانی

---

[342]. فتوح سواد العراق،واقدی، وەرگێڕ بۆ فارسی، ملا عبدالعزیز واعظی، ل٧٧، تهران ١٣٧٤.

[343]. وڵاتگیری رەشەخاکی عێراق: مەلا جمیل رۆژبەیانی، ل١، سلێمانی ١٩٧٧.

[344]. تأریخ بغداد: احمد بن علی خطیب بغدادی، ج٣ص٤، قاهرة، مطبعة السعادة.

[345]. . فتوح سواد العراق، واقدی، ص٩٧.

(١٢٠) بار بوو.[346] یان دەڵێن واقیدی (٦٠٠) سندوق کتێبی هەبوە، لەو هەموەی دا تەنها کەمێکی بە دەستی ئێمە گەیشتوە، کە ئەویش بە زۆری فتوحات و غەزاواتە. وەکو (فتح منف والاسکندریة) (الفتوحات) (فتح ارمینیة) (بلاد مابین النهرین) (فتوح الاسلام) (فتوح الاسلام لبلاد العجم و خراسان) (فتوح افریقیة) (فتوح الامصار) (فتوح البهنساء) (فتوح الجزیرة) (فتوح سواد العراق) (فتوح الشام) (فتوح العراق) و زۆری تر.

## واقیدی لە تەرازوی لێکۆڵەرەواندا

مێژوونوسان و لێکۆڵەرەوان دەڵێن، دوای تەحقیق و بەدواداچون دەرکەوتوە کە ئەم کتێبانە هیچی هی خۆی نیە. بەڵکو بە ناوی خۆیەوە بڵاوی کردوەتەوە. یان خەڵکانی تر بە ناوی ئەوەوە بڵاویان کردوەتەوە، باسەکان، ناوەرۆکی کتێبەکان، گوماناوین و هەڵەی زۆریان تێدایە. (فتوح الشام)ەکەی واقیدیم خوێندەوە، چاپی (١٩٥٤)ە، بە دوای هەندێ روداوی دا چووم، لە روداوە مێژووییەکاندا، لە ساڵەکاندا، لە بەشداری فەرماندەکاندا هەڵەی زۆر زۆری تیایە. کتێبێکی هەیە کە (٣٠)هەزار فەرمودەی تیایە. هیچ کام لەوانەی فەرموودەیان کۆکردوەتەوە، دانەیەکیان لێ وەرنەگرتوە، جگە (ئیبن ماجە). زۆر بە خراپ وەسفیان کردوەو تاوانباریان کردوە. بە هەمان شێوە لە فتوحات و مەغازیەکاندا قسەی زۆری لەسەرە:

١- ژان سواژە دەڵێ: گێرانەوەی زۆر لە بارەی فتوحاتەکانەوە کە بەناوی واقیدیەوە بڵاوکراونەتەوە، هەڵبەسراوە، بەڵکو ئەو نووسراوانە هی دوای واقیدین.[347]

٢- فوئاد سزگین دەڵێ: هەندێ لە روداوە گێڕراوە مێژووییەکان، کە بە ناوی واقیدیەوەیە، جگە لەوانەش کە نوسخە دەست نووسەکانیان هەتا ئێستەش ماون و لەبەر دەستان، یان هەندێ لەوانە بە ناوی واقیدییەوە چاپ

---

[346]. تأريخ بغداد: ج٣ص٥.

[347]. مدخل تأريخ شرق اسلامي: ژان سواژە، ص٢١٠، ترجمة وتحقيق نوش افرين انصاري.

**کراوە، ئەوانە لە رۆژگاری دواتردا نووسراون.[348] واتە دوای واقیدی نووسراون.**

**٣- ئەحمەد کوڕ عەلی نەجاشی دەڵێ: (هەموو کتێبەکانی واقیدی، نووسراوی ئیبراهیم کوڕی محمد کوڕی یەحیایە و، واقدی بە ناوی خۆیەوە نقڵی کردوە.)[349]**

**٤- شێخ توسی دەڵێ: (ان الواقدي سرق مصنفاً لابراهيم بن محمد بن يحى بن اسحاق المدني المتوفي سنة ١٨٤هجري.) هەمان قسە لە (الرجال، ص١٢، نجاشي) دا هاتوە، وە لە (فهرست كتب الشيعة و أسماء المصنفين، ص٣، طبع الثاني)دا هەمان وتە چەند بارە دەکاتەوە.[350]**

**ئەوە لە لایەك. لە لایەکی ترەوە، ئەوانەی فەرمودەیان کۆکردۆتەوە و، لە زانستەکانی فەرمودەدا شارەزاییان هەیە، گلەیی زۆر لە واقدی دەکەن، کە بەبێ سەرچاوە، ئەو هەموو فەرمودانەی کۆکردۆتەوە بێ ئەوەی ناوی زنجیرەی گێڕانەوەکانی هێنا بێ.**

**دەستەیەکی تر لە زانایانی فەرمودە، واقیدیان بە لاواز وەسف کردوە و، بە (مەجروح) ناویان بردوە. بە قسەی (زەهەبی) کە دەڵێ:(و استقر الاجماع على وهن الواقدي.)[351] واتە هەموویان واقیدیان بە سست باس کردوە لە زانستی فەرمودەدا. وە واقیدیان لەوانەدا ژمارە کردوە کە فەرمودەی لاوازیان گێڕاوەتەوە وەکو:**

---

[348]. تأريخ التراث العربي: فؤاد سزگين، ص٢٩٤، ترجمة محمودفهمي حجازي.

[349]. كتاب الرجال: احمد بن علي النجاش، ص٢٧٢، تهران – مركز نشر كتاب، (بى تا)

[350]. فتوح سواد العراق، برويت محمد بن عمر واقدى، ترجمة وتحشية: الاستاذ عبدالعزيز واعظى سرىشتى، ص٨٦، مقدمة و تصحيح و تعليقات: نادر كريميان – تهران ١٣٧٤ ئيرانى.

[351]. ميزان الاعتدال: ذهبي، ج٢ص١١٠.

١- ئیمامی بوخاری دەڵێ: موحەممەد کوڕی عومەری واقیدی قازی بغداد (متروك الحديث) ساڵی ٢٠٩ مرد.[352] تێبینی بکە بوخاری بە (متروك الحديث) ناوی بردوە.

٢- یاقوتی حەمەوی لە ئیمامی بوخاریەوە هێناویەتی بەم دەربڕینە (سكتوا عنه)[353] واتە شارەزایانی فەرمودە کە پرسیاریان لێ کراوە لە بارەی واقیدیەوە، بێدەنگ بون و سقەیان نەداوەتێ.

٣- ئیمامی نەسائی لە کتێبی (الضعفاء والمتروكون) دا لە بارەی واقدیەوە وتویەتی: محمد کوڕی عومەری واقدی (متروك الحديث)ە[354].

٤- ئیبن عەماد لە نەسائیەوە دەگێڕێتەوە (نەسائی دەڵێ: واقیدی فەرمودەی دروست کردوە)[355]

٥- دار قوتنی لە هەمان سەرچاوەدا دەڵێ: شوێنەواری لاوازی (ضعف) لەو فەرمودانەدا دیارە کە واقدی هێناویەتی.

٦- ئیبن ناسرەدین دەڵێ: (ئیمامەکان لەسەر ئەوەی کۆکن کە هیچ لە حدیثەکانی واقیدی وەرنەگرن، جگە (ئیبن ماجه)، (ئیمام زەوهەبی) لە (شذرات) دا هەمان قسە دەکات.

٧- (ئیبن عدی) و (یاقوتی حەموی) و (ئیبن راهویە) و (دارقوتنی) و (ئیبن مەعین) و (ئەبی حاتەم) و (نەسائی)وهەر هەموویان فەرمودەکان کە واقیدی ریوایەتی کردون، بە (لاوان) دایان ناوە.

٨- خاوەنی (معجم المطبوعات) ج٢ ص١٩٠٧ لە قسەی زانایانی فەرمودەوە دەڵێ: (وقيل فيه هو كذاب ليس بثقه ولا يكتب حديثه.)[356]

---

[352]. المجموع في الضعفاء والمتروكين: الامام البخاري، ص٤٨٤.

[353]. معجم الادباء: ياقوت حموي، ج١٨ص٢٨٨.

[354]. المجموع في الضعفاء والمتروكين: نسائي – دارقطني – بخاري – دراسته و تحقيق الشيخ عبدالعزيز عزالدين السيروان، بيروت، دارالقلم ١٩٨٥.

[355]. شذرات الذهب: ابن عماد حنبلي، ج١ص١٨.

ئەگەر بچینە سەر بابەتەکانی تری، وەکو سیرە و تەفسیر و ئەحکام و فیقهو ئەوانی تر. ئەوەندەی تر قسەی لەسەر هەیە. جا کەسێك زانایان لێی رازی نەبن و، متمانەیان پێی نەبێ، یان کەسێك ئ ـەموو فەرمودەیەی گواستبێتەوە، بێ لێ وردبونەوەو تحقیق کردن، دەبێ چی کردبێت لەناو رووداوەکانی مێژودا، ژیان نامەکانی چۆن نوسیبێتەوە، ئەگەر ئەو نەترسا لە فەرمودەکەی کە پێغەمبەر دەفەرموێت: (لا تكذبوا عليَّ، فانه من كذب علي فليج نار) یان دەفەرموێ (من تعمد عليَّ كذباً فليتبؤ مقعده من النار)[357] ئەمە لە لایەك. جگە لەوە دوو رای تر هەیە لە خاڵەکانی سەرەوەدا دیارن:

١- یان ئەوەیە واقدی ئەو هەموو دەست نوسانەی هی کەسانی تر کە کۆی کردونەتەوە، بە ناوی خۆیەوە بڵاوی کردونەتەوە.

٢- یان ئەوەیە کە ئەم بڵاوکراوە پڕ حەشوەو گوماناویانە، دەستێکی رەش بە ناوی واقدیەوە بڵاوی کردونەتەوەو، بۆ مەبەستێکی خراپ خستونیەتە پاڵ ناوی ئەو بۆ ئەوەی لە پاڵ ئەودا، کە خوێندەوار و خاوەن کتێبخانەیەکی گەورەی ناو شاری بغدادە، بیان شارێتەوە. من بۆ ئەمەی دواییان دەچم.

ئەوەی لێرەدا مەبەستە بیڵێین و بیکەین ئەوەیە:

یەکەم: بە دوای ئەو مەغازی و فتوحاتانەدا بچین کە بەناوی واقدیەوە بڵاوکراوەتەوە بزانین هەتا چەندە راستیان تیا دیارە!

دووەم: بزانرێ لە کوێوە ئەو باسە گومانیاویانە خراوەتە ناو بەرهەمەکانی واقدیەوەو کێ کردوونی و، بە چ مەبەستێك کراوە!

ئێمە لێرەدا هەر لەسەر ناوچەی هەرێمی کوردستان (چیا، شارەزوور، جەزیرە) دەوەستین، چونکە باسەکانمان تەنها لەو سنورانەدایە.

---

[356]. فتوح سواد العراق: (نخستين تأريخ فتوحات اسلامي در كردستان) به روايت محمد بن عمر واقدى، تصحيح وتعليق نادر كريميان، تحشية و ترجمة عبدالعزيز واعظى سردشتى، ل٩٠-٩١ تهران ١٣٧٤ ه

[357]. رواه البخاري في كتاب العلم رقم ١١٠ ج١ص٢٤٤. فتح الباري، دار الريان ١٩٨٦.

له بەشەکانی پێشوی ئەم کتێبەدا، باس لەوە کرا کە هاتنی سوپای ئیسلام بۆ کوردستان، جگە چەند شەڕێکی کەم کە سوپای فارسی گێڕایان بە سوپای ئیسلام نەك کورد! هیچی وا روی نەداوە. شایەتیشم بۆ ئەوە، ئەو هەموو سەرچاوانەیە، کە روداوەکانم لێوە هەڵ گۆزیون، وە هەموویان لەسەر یەك ئاستی راستی دەڕۆن و یەك باس دەگێڕنەوە و زۆر لانادەن. لەناو هەمویاندا تەنها (واقیدی) باسی کۆمەڵێك شەڕی خوێناوی نێوان سوپای کورد و سوپای ئیسلامی گێڕاوەتەوە، جێی سەیرە و هەقی تێڕامانە، بۆچی تەبەری‌و ئیبن کەسیرو ئیبن ئەسیرو ئیبن خەلدون‌و ئیبن ئەعسەم‌و خزری بەگ‌و ئەوانی تر. کە کاکڵەی مێژووی ئیسلامیان نووسیوە، ئەو رووداوانەیان باس نەکردووە، بەڵام واقدی بە تاقی تەنیا هێناویەتی.

ئەوە بە جۆرێ دەسەلمێ، کە لە روداوەکان و، لە ژیانی سەرکردەکان و راستی هاتنیان بۆ کوردستان و کۆن و تازەیی ئەو شارانەی کە ناوی بردون بکۆڵرێتەوە، ئەگەر دەرچوو، ئەوا راستە، ئەگەر دەرنەچوو، ئەوا رووداوەکانیش بە درۆ دەکەونەوە، بۆ نموونە واقیدی و ملا رەئوف سلیم و زۆری تر، کە لە واقیدیان گێڕاوەتەوە دەڵێن قەعقاع و عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب لە جەنگی کوردستاندا کوژراون. بەڵام قعقاع بە مردنی خوایی لە دمشق دەمرێ و، عەبدوڵڵاش بە مردنی خوایی لە شاری مدینە کۆچ دەکات. بۆ نزیکەی (٢٠) سەحابە ئاوا دەکەوێتە هەڵەوە، جگە لە دەیان شتی تر کە لە شوێنی خۆی دا باسیان دەکەین.

واقیدی خۆی ئەو پیاوە کەم سقەیە، کە قسەی زاناکانم لەسەر هێنایەوە نەگبەتیەکەی لەوەدایە لە کاسبی گەنم دا ئیفلاسی کرد و شاری مدینەی جێ‌هێشت و گەیشتە بغداد. لە بغدادیش مرد، دوای خۆی هەرچی کتێبێك بۆ فێڵ یان بۆ بڵاوکردنەوەو دروستکردنی گومان لەناو موسوڵمانانندا، یان تاوانبارکردنی کەسێك یان میللەتێك بوو بێت، بە ناوی ئەو داماوەوە بڵاویان کردۆتەوەو، جێشی گرتوە، یەکێك لەو دەیان کتێبانە باسی فەتح کردنی کوردستان دەکات لە لایەن سوپای ئیسلامەوە کە پڕیەتی لە بوختان و تاوان

و، دروست کردنی حقد و رق و قین له دڵی کوردا بەرامبەر ئیسلام، جگه له کوشت و کوشتار و تاڵانی و وەحشی گەری، که سوپای ئیسلام له هیچ غەزا و فتوحاتێکی دا، له هەموو جیهاندا شتی وای نەکردوە، ئەو کتێبەی واقدی ناوی (فتوح سواد العراق)ە. نازانرێ چۆن کەوتوەته ناو کتێبخانەی بنەماڵەی (مەلا سەمەدی مەرگەیی). پاشان هەر لەوێ مامۆستایەك بەناوی (مەلا عبدولعەزیز واعیزی سەردەشتی) بە تکای کەسێکی تر، ئەو دەست نووسە عەرەبیە وەردەگێڕێتە فارسی، بەڵام بۆی نارەخسێ بە چاپی بگەیەنێ هەتا ئەم یەك دوو ساڵەی دوایی، ساڵی (١٣٧٤)ی ئێرانی کەوتە بازاڕ، بەڵام کەسێکی کوردی عێراق بەناوی (مەلا رەئوف سەلیم حوێزی) ساڵی ١٩٧٠ له چاپخانەی جامیعە کتێبێکی بڵاوکردەوە کە کت ومت لە سەرەتاوە تا کۆتایی ئەو کتێبەیە و، بە ناوی خۆیەوەو بە ناوی (کوردستان و ئایینی ئیسلام) چاپ کراوە، کە دوو بەشە، بەشی یەکەم لە لاپەڕە (٧) هەتا لاپەڕە (٧٦) بە شیعر و هۆنراوە داڕێژراوە، بەشی دووەم لە لاپەڕە (٧٧) هەتا (١٣٢) بە پەخشان نووسراوە بەو نیازەی وەك جاری جارانی شانامە، لە دیوان و قاوەخانەکان بخوێندرێتەوە (کە رەنگە ئێستاش خوێندنەوەی بەهن ساو قەڵای خەیبەر و رۆستەم و زۆراب و.هتد) هەر باوی بێ.[358]

رۆژبەیانی دەڵێ: کە ئەم سیپارەیەم خوێندەوە، بۆم دەرکەوت ئەمە هەر کتێبەکەی (فتوح سواد العراق) لای مەلا سەمەدە، مەلا رەئوف کردویەتی بەهی خۆی. بە راستی لەم کارە سەرم سوڕ نەما، چونکە زۆر کەس بە دزێتی بەرهەمی خەڵك بون بە خێوی گەواهی نامەی بەرزی ماجستێر و دکتۆرا.

بەڵام لەوە سەرم سوڕما، ئایا رۆشنبیرێکی مەزنی وەك کاك مەسعودی جەلیزادە، یا مەلایەکی وریا، یا مێژووزانێکی شارەزای مێژوو، ئەم کتێبەی نەدیبوو، نەخوێندبۆوە، کە رەخنەی لێ بگرێ و، خوێنەری گەنجی سادە تێگەیێنێ، کە هەم کتێبەکە هی مەلا رەئوف نیە و هەم بنەڕەتەکەشی جێی

---

[358]. ولاتگیری رەشەخاکی عێراق: مەلا جەمیل رۆژبەیانی، چاپی یەکەم، ل٢، سلێمانی ١٩٩٧.

گومانه و نابێ باوەڕی پێ بکرێ و، تاوانە ڕێ بدرێ بە کوردستاندا بڵاوببێتەوە. واعیزی ناوی کتێبەکەی ناوە (فتوحات سواد العراق) مەلا سەمەد ناوی ناوە (فتح العراق)، بەڵام مەلا ڕەئوف ناوەکەی گۆڕیوە بە (کوردستان و ئاینی ئیسلام) ئەمەیان بۆ هەڵبەستەکە، بەڵام پەخشانەکەی ناوناوە (غەزەواتی سەحابان لە بەشی سەروی کوردستان) وا دیارە مەلا ڕەئوف ئەم هەڵبەستەی (مەولەوی) ئەمری نەبیستوە:

بیگریو بیدزی و، کلکی هەڵپاچی لە دەست خاوەن ماڵ هەرگیز دەرناچێ

ئایا مەلا ڕەئوف حویزی[359] ئەم کتێبەی لە کوێ وە هێناوە و، ئازایانە بە ناوی خۆیەوە چاپی کردوە، ئەم کتێبە ڕێکوپێك لە (فتوح سواد العراق)ەکەی (عەبدولعەزیز واعیزی سەردەشتی)[360] دەچێت، کە بە تەکلیفی خەڵك و زەحمەت و شەونخونی زۆر لە عەرەبیەوە وەریگێڕاوەتە سەر فارسی. جارێ با

---

[359]. ملا رۆوف سلیم حویزی: ساڵی ١٩٠٨ لە کویسنجق لە دایك بوە، ساڵی ١٩٢٦ زانستە ئیسلامیەکانی تەواو کردوە، ساڵی ١٩٤٠ کەوتەڕێ بەرە وهندستان بۆ فێرکردنی عیلم و زانست، بە زمانی فارسی وانەی دەوتەوە لە حەوزەی علمی یعقوبیەی هندستان و شەشە مانگ لەوێ مایەوە، بەڵام مانەوەی شەش مانگ هەر لە یەك تێ ناگەن نەك بەخشینی علومی صرف و نحو و تجویدی قران. پاشان گەڕایەوە بەسرە و بغداد و لە (کەمپی جبلەمەر) حەوت ساڵ مایەوە، پاشان گەڕایەوە شاری کۆیە، ساڵی ١٩٦٠ لە لایەن ئەوقافەوە کرایە ئیمامی مزگەوتی کۆن لە کۆیە، ساڵی ١٩٧٠ ئەم بەرهەمەی خستە بازاڕ (کوردستان و ئاینی ئیسلام) بەڵام دوای (٢٥)ساڵ دەرکەوت هی خۆی نیە.

[360]. عبدالعزیز واعظی سەردەشتی: ساڵی ١٨٩٥ زاینی لە شاری کۆیسنجاق لە دایك بوە، صرف و نحو اداب و منطق و حکمت و بلاغت و فقه و حدیث و تفسیر هەر لەوێ تەواو کرد، لە ساڵی ١٣٢٣ کۆچی کۆچی کرد بۆ سەردەشت، لە خانەقای بیارەی سردشت بویە (امام) سەر خەتمەی خانەقا. لە سەردەمی رضاخاندا توشی راونان و گرتن بوە، بەریەرەکانی زۆری حکومەتی فاسدی پەهلەوی کرد و بە کافری حسێب کرد لەبەرئەوە بەردەوام لە گرتن و راونان دا بوو، لە ١٨ربیع الاول ١٣٩٩ی کۆچی لە پاڵ یەکێ لە پایەکانی مزگەوتی دارالسلام لە نوێژی نیوەڕۆدا مرد، تەمەنی ٨٦ساڵ بوو. واعظی (٦٧)بڵاوکراوەی هەیە لە زانستە ئیسلامیەکان و شعر و ئەدەبیات و سەفەرنامە و مێژوو لەوانە: (بیان مبهمات قرآن – مفردات قرآن – رساله قرآن شناسی – رساله تجوید قرآن – الاحادیث الصحاح – رساله الامام والمأموم – ترجمەی نور الیقین – شرح گوناهان کبیره).

بزانین جیاوازی نێوان کوردی و فارسیەکە چەندە، ئەوسا دەچینەسەر ئەوەی ئەم کتێبە چەندە لە راستییەوە نزیکەو رووداوەکان راستن، یان لەم دواییەدا دروست کراون و، دەستێکی چەپەڵ چاندویەتی بە فێڵ، فڕێی داوەتە کوردستان و هەتا بچێتە کتێبخانەی کوردی و، کوردەکان بزانن کە ئیسلام بۆچی باووباپیرانی ئەوانیان قەتڵ و عام کردوە، بەوە رق و قین و گومان لە دڵی کوردا بەرامبەر ئیسلام دروست بکەن. درۆ بەری کورتە، بڕ ناکات. ئەم دوو نووسەرە واعیزی و حوێزی هەردوکیان خەڵکی شاری (کۆیسنجق)ن وە لە دایك بوی سالآنێکی لە یەك نزیکن. حوێزی ساڵی ۱۹۰۸ لە دایك بوە، واعظی ساڵی ۱۹۱٤ لە دایك بوە. کەواتە هەردوکیان لەیەك سەرچاوەوە، یان نزیك بە یەك دەستیان کەوتوە، یەکیان دەیڵێ و ئەوی تریان دەیشارێتەوەو بە ناوی خۆیەوە بڵاوی دەکاتەوە.

نوسخەی فارسی و کوردییەکە جیاوازیان کەمە، زۆربەی باسەکانیان لە یەکەوە نزیکن، هەردوکیانمان لەبەردەستایە، وەك کاك (ئەحمدی شەریفی) دەڵێ کەس ناکەین بە دز ئێمە خاڵەکان دەڵێین با خوێنەر خۆی دادوەر بێت.

لە مەتنی فارسیەکەدا هاتوە کە نوسخە عەرەبیەکە لە لای (مەلا عەبدولسەمەد نامی) لە (مەرگە) بوە، مەلا عەبدولعەزیزواعزی دەستی گەیشتوەتێ و وەری گێڕاوەتەسەر فارسی، بەڵام لە مەتنی نوسخە وەرگێڕاوە کوردیەکەدا کە مەلا رەئوف سەلیم حوێزی ساڵی۱۹۷۰ لە بەغداد چاپی کردوە، ناوی (مەلا عەبدولسەمەد)ی تیا نیە بەڵکو لە لاپەڕەی کۆتایی دا نووسیویەتی:

تەواو بوو ئەم غەزواتە بە عنایەتی خدای تبارك و تعالی، بە دەست خطی ملا علی مؤذنی مزگەوتی مەلا جامی بۆ مامۆستام مەلا رؤوف سلیم ئاغا غفرالله لنا ولجمیع المسلین آمین.

١- بە گوێرەی پێشەکی هەردوکیان، ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح سەرکردەی سوپای شام، دوای ئەوەی کە لە شام بویەوە، نامەی بۆ خەلیفە عومەر نووسی بۆ مەدینە، داوای لێ کرد کە دوای فەتحی شام بەرەو رۆژهەڵات

بڕۆین یان ڕۆژئاوا.؟ هەردوکیان وایان نووسیوە، بەوەدا دیارە هەردوکیان لە یەك سەرچاوە هێناویانە و وەریان گێڕاوە، ئەوەی جیاواز بێت هەر ئەوەیە کە لە وەرگێڕاوە فارسیەکەدا نووسراوە (قبائل اکراد کوهستان) بەڵام لە کوردیەکەدا ئەمە نەهاتووەو ناوی کورد نەبراوە. ئەمە بۆ جیاوازی دوو کتێبەکە، بەڵام لە ئەسڵدا نامەی وا ئاراستەی عومەر نەکراوە، بڕوانە (رسائل الفاروق) کە نزیکەی (٤٥٠) نامە و وەڵامی تیایە.[361]

٢- لە فارسیەکەدا وەڵامی نامەکە هاتوە لە لاپەڕە (١٥٤) ناوی (کورد) هاتوە، بەڵام لە مەتنی نامەکەدا لە کوردیەکەی حوێزی دا لاپەڕە (٧٩) بەم جۆرە هاتوە: (گەلی کورد و شار و دێ و دەشت و دۆڵ و شاخی کوردەکان) هاتوە، بەڵام لە زمانی خەلیفە وە لە فارسییەکەدا ئاوای نوسیوە: (و خبر بە من رسیده کە در مرجین مرگه.)

٣- بەڵام لە کوردیەکەدا ئاوا هاتوە (هەواڵم بۆ هاتوە کە لە هەرێمی کوردان. لە مرجین کە بە کوردی پێی دەڵێن مەرگە پاشایەك هەیە) لە کوردیەکەدا دەڵێ ناوی (فروخ)ە لە فارسیەکەدا دەڵێ ناوی (فروخان خان)ە.

٤- لە کۆتایی نامەکەدا لە فارسیەکەدا لاپەڕەی (١٥٦)دەڵێ:

أ. در ان موقع اول خزان روز ٥شنبە بیست روز از ماە جمادی الاولی گزشتە برابر سنە ٢٥بیست و پنج از هجرت خیر البشر بود.

ب. بەڵام لە کوردیەکەدا لاپەڕە (٨٠) دەڵێ: (ئەو کاتە وەرزی پایز بوو ڕۆژی ٥ شەممە بیستەمی جەمادی یەکەمی ساڵی بیستەمی کۆشی بوو).

٥- لە فارسیەکەدا لاپەڕە (١٥٦) بە کورتی باسی نامەی ئەربیل دەکات. بەڵام لە کوردیەکەدا لە لاپەڕە (٨٦)دا بە درێژی باسی قەڵای هەولێر و پاشاکەیان ناوی (جاتلیس) بوو، شەڕی خەڵکی بەرامبەر سوپای ئیسلام و

---

[361]. بڕوانە رسائل الفاروق عمر بن الخطاب: عبداللطيف اسماعيل عيسى، ١٩٩٠، الشركة العراقية للطباعة الفنية المحدودة. کە نزیکەی ٤٥٠ نامەو وەڵامی تیایە.

خەڵکی هەولێری بە ناوی (کوردان) ناو بردووە، بەڵام لە فارسیەکەدا شتی وای تیا نیە!

لە فارسیەکەدا پێش ئەربیل سوپای ئیسلام چون بەرەو ناوچەی (ئەرموتە) ئەو ناوچانەیان فەتح کردوە، بەڵام لە کوردیەکەدا دەڵێ: (ئەرموتە) دێیەکە لە نزیک کۆیە)، باسی شەڕی توندی خەڵکی ئەو ناوچەیە دەکات و باسی راهیبێك دەکات کە سواری وڵاخێك بوەو بەرەو سەربازگەی موسوڵمانەکان دێت و، ئەوان بە عیسی سوێند دەدا کە ئەو ناوچەیە چۆڵ بکەن و واز لە خەڵکی ناوچەکە بهێنن و پاشای ئەو ناوچەیەی بە (بەتروس باوکی کرمایس) ناو بردووە کە لە جەنگدا دەکوژرێ و کوردێك بەناوی (کولاوەکون) سوپایانی ئیسلام ئاگادار دەکات کە سەرچاوەی قەڵاکە لە کویایە، پێش گرتنی ئەو قەڵایە خەڵکی دێهاتی ناوچەی (کوجار) دێن بۆ لای سوپایانی ئیسلام و جزیە قبوڵ دەکەن، خەڵکی ئەو ناوە بە (کورد) ناو دەبات، بەڵام لە فارسیەکەدا ئەم باسە نیە.

٦- وشەی (منجوران) لە لاپەڕە ٨٩ ی کوردیەکەدا ناوی ناوچەیەکە، لە فارسیەکەدا هاتوە بە (منجورات).

٧- خالید کوڕی وەلید فەرماندەی سوپای ئیسلام نامەی نارد بۆ مەلیك (فرخ پاشا شیدر) کە لە کوردیەکەدا لاپەڕە (٩٠) باسی دیاربکر و موسڵ و عێراق دەکات، بەڵام لە فارسیەکەدا لاپەڕەی (١٦٠) باسی ئەو ناوانەی تیا نیە.

٨- لە لاپەڕە ١٦٦ی فارسیەکەدا دەڵێ: واقدی دەڵێ لە شاری مرجین (مرگە) زانایەکی دانشمەندێکی هۆشیار هەبووە بە ناوی (بیرون کوڕی بارام). بەڵام لە کوردیەکەدا لاپەڕە (٩٦) دەڵێ ئەو زانایە بەناوی (پیروت کوڕی بارام)ە.

٩- لە فارسیەکەدا لاپەڕە (١٧١) دەڵێ: ئەو کەسەی کە (عەمر کوڕی عودەی) کوشت ناوی (برابك) بوو لە کوردیەکەدا لاپەڕە (١٠١) دەڵێ ئەو پیاوە کوردە ناوی (باریگ)ە.

١٠- له جەنگێکدا کە لە ناوچەی (قمان - لە فارسیەکەدا) و (دوگومان - لە کوردیەکەدا) رویداوە، عەبدوڕڕەحمان لە سەردارەکانی سوپای ئیسلام پەلاماری فیروزانی دا و کوشتی. ئەمە لە فارسیەکەدا لاپەڕە (١٧٤)، بەڵام لە کوردیەکەدا لاپەڕە ١٠٢ ناوی فیروزان نەهاتوە.

١١- لە کوردیەکەدا لە باسی رزگارکردنی (دوگمان)دا و کوژرانی پاشای ئەوان بە دەستی (فەزل کوڕی عەباس) نووسراوە کە سوپای ئیسلام لە روباری زابی بچوك پەڕینەوە هەتا گەیشتنە دەربەندی پشدەر، لاپەڕە (١٠٦)، بەڵام لە فارسیەکدا لە لاپەڕە ١٧٧دا ناوی روباری زابی بچوك و دەربەندی پشدەر نەهاتوە.

ئەمە جگە لە زۆر جێی تردا وەك لاپەڕە:

(١٦١ ی فارسی و ٩٢ی کوردی) و (١٧١ی فارسی و ١٠١ی کوردی)

(١٧٣ی فارسی و ١٠٢ی کوردی) و (١٧٣ی فارسی و ١٠٣ی کوردی)

(١٧٦ی فارسی و ١٠٣ی کوردی) و (١٨٣ی فارسی و ١١٣ی کوردی)

(١٨٩ی فارسی و ١١٨ی کوردی) و (١٩٣ی فارسی و ١٢١ی کوردی)

(١٩٩ی فارسی و ١٢٥ی کوردی) و (٢٠٤ی فارسی و ١٢٨ی کوردی)

(٢٠٥ی فارسی و ١٢٩ی کوردی) و (٢٠٥ی فارسی و ١٣٠ی کوردی)

پاشان مامۆستا ئەحمدی شەریفی مهاباتی دەڵێ:

ئەوەی لەم دوو کتێبەدا هەیە پێویست بە بەراوردکردن و لێکۆڵینەوە دەکات، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت لەگەڵ ئەوەی کە هەندێ جیاوازی لە ناو و شوێنی جوگرافی و هەندێ روداودا کە زۆربەی ناوی شوێنە جوغرافیەکان ناوی تازەن و هی ئەم دواییەن پەیدا بون ئەوە نیشان دەدات کە نووسەری ئەم دوانە (چ کوردی - چ فارسی) نە عەبدوڵڵا واقدیە، نە محمد بن عمر واقدیە، بەڵکو دانەری ئەمانە و رێکخەری ئەمانە دەبێ کەسێك بێت لە ٦٠-٧٠ ساڵ پێش ئێستە هەڵی بەستبێ. لە کۆتاییدا چاك وایە بڵێم کە هەندێ ناوی شار و شوێن کە لەو کتێبەدا هاتوە وەك سابلاغ و ئیسماعیل قلی و قرە جولون و

قره بابا و خوشقدم. هەتا دوایی. بەرونی ئاشکرایە کە ئەو ناوانە لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا نەبوون.[362]

**هەردوو کتێبی (فتوح سواد العراق) و (کوردستان و ئاینی ئیسلام)، راستن یان هەڵبەستراو؟**

جولەکە و دوژمنانی ئیسلام لە سەرەتای ئیسلامەوە زۆر هەوڵیان دا بە ناوی پێغەمبەرەوە فەرمودە دروست بکەن و، بە ناوی خەلیفەکان و یارانەوە روداوی ناجۆر و بڕیاری نەگونجاو دروست بکەن، هەتا ماوەیەکی باشیش بۆیان سەری گرت و هەتا ئەمڕۆش هەزاران فەرمودەو روداویان دروست کردوە و بوەتە گرفت لەبەردەم زانایاندا. بەڵام بەردەوام کۆمەڵێکی زۆر زانا پەیدا بوون لە ناسین و لێکۆڵینەوەی فەرمودەدا و خەریکە زاڵ دەبن بەسەر هەموو فەرمودەکاندا و خراپەکانیان جیا دەکەنەوەو پاکەکان گوڵبژێر دەکەن.

هەر بەو شێوە مێژووی ئیسلامیش کەوتەبەر ئەو شاڵاوە دڕندانە و، سەدان روداوی ناجۆر و نەگونجاو و، دەیان کتێبی هەڵبەستراو و پڕ بوختانیان، بە ناوی نووسەری کۆنەوە لە شێوەی دەست نووسدا نووسی و، بە دزیەوە لە ماڵی ئەم زانا و ئەو مزگەوت و مۆزەخانەدا بڵاو کرایەوەو پاشانیش چاپکران و خرانە سەر خەزێنەی رۆشنبیری ئیسلامی و ماوەیەکی چاك كاريان پێکراو رەواجیان هەبوو. هەتا دووبارە کۆمەڵێك توێژەرەوە و لێکۆڵەرەوەو مێژوونووس پەیدا بوون و بەراوردیان کردن و لەو دەست نوسانە رامان‌و لەگەڵ هەمە لایەنەی ژیانی ئەو نووسەرە کۆنانەدا دایان لە تەرازوی مەحەك‌و دەرکەوت و باشیان لە خراپ جوێ کردەوە، هەرچەندە هەتا ئەمڕۆش تارمایی هەرماوە.

یەکێك لەو میللەتانەی کە زۆر خراپ بە مێژووەکەی کراوە و بوختانی زۆری بۆ هەڵبەستراوەو فەرمودەی پێغەمبەریان لە دژ دروست کراوە کوردی

---

[362]. گۆڤاری ئاوێنە: ژمارە ٢٤-٢٥، ژمارەی تایبەت، ساڵی ١٣٧٥، نگاهی گذرا به کتاب (فتوح سواد العراق) احمد شریفی - مهابات، ل١١٦.

بەدبەختە، بەڵکو هیچ میللەتێکی تری ئیسلامی هێندەی کوردی پێ نەکراوە، یەکێ بە زۆڵ لە قەڵەمی داوە، یەکێ دەڵێ ئەسڵیان قەرەجە، یەکێکی تر بە جنۆکە، زۆر کەس بە وەحشی و دڕندە، میجەرسۆنیش روداوێکی دروست کردوە و فەرمودەیەکی هەڵبەستوە کە گوایە پێغەمبەر نەفرینی لە گەڵی کورد کردوە کە هەرگیز یەك نەگرن!

ئەمانە و دەیانی تر مێژووی کوردیان شێواندوە، کەسێك کە دەیخوێنێتەوە ماندوو دەبێ، بێزار دەبێ و خێرا وازی لێ دەهێنێ!

دوای ساڵی ١٩٠٠ دەست نووسێك فڕێ درایە ناو کوردستان، لە بێ ئاگایی زانایانی ئاینی ئەو کاتە " کاری خۆی کردو ئەوەی لای خەڵك دروست کرد، کە کورد بە زەبری شمشێر موسوڵمان بووە و، موسوڵمان بوونی کوردان وەکو (ڤاسیلیڤا) راستی دەکاتەوە جێی بڕوا نیە.

ئەوەی بە مێژوو و کیان و ئاسەوار و کلتور و رۆشنبیری و خاك و کەسایەتی نەتەوەی کورد کراوە، بە دەواری شڕ نەکراوە، هەر میللەتێکی تر ئەوەندەی پێ بکرایە ئێستە تۆزیشی نەمابوو، بەڵام خۆگری و ئارامی کورد بەرامبەر گرفتەکان جێی فەخر و شانازیەتی، هەموو شتی لە دەست دا بەڵام هەر پەیوەست بوو بە ئاینەکەیەوە و سەدان ساڵە وازی لێ نەهێناوە.

خراپترین کتێب کە لەسەر کورد نووسراوە ئەوەی مەلا حوێزیە، کاری خۆی کرد بویە چەکی دەستی دوژمنان. بەڵام با ئێمە بزانین رووداوەکانی ئەو کتێبە چەندە لە راستیەوە نزیکە:

١- بەو (دە) خاڵەی پێشودا سەلماندمان کە ئەو کتێبە هی مەلا رەئوف حوێزی نیە و، بەڵکو هی کەسێکی ترە و ئەو وەری گێڕاوەو بە ناوی خۆیەوە بڵاوی کردۆتەوە، ئەمە فێڵێك لە کوردیەکەیدا!

٢- بە گوێرەی فارسیەکەی عەبدولعەزیز واعزی سەردەشتی کە (٣٨٠) لاپەڕەیە و لە کتێبێکی عەرەبی وەری گێڕاوە، خۆی باسی دەکات و لە ماڵی مەلا سەمەدی مەرگەیی دەستی کەوتوە کە عەرەبیەکە لەسەری نووسراوە هی موحەممەد کوڕی عومەری واقدییە.

٣- له ژیاننامه و بەرهەم و هەڵسەنگاندنی واقیدی دا به گوێرەی زانایانی حدیث و لێکۆڵەرەوان سەلماندمان که واقدی کەسێکی بڕوا پێکردوو و دەست پاك نەبوە و زانایان مێژوو فەرمودەیان لێ وەرنەگرتووە و رەنگە بەناوی واقدیەوە بڵاوکرابێتەوە و واقدیش لێی بێ بەری بێت.

٤- به گوێرەی هەندێ شیکردنەوەی جمیل رۆژبەیانی و مەسعود موحەممەد و ئەحمدی شەریفی مهاباتی که زۆر لەو ناوانەی که ئەو کتێبە ناوی بردوون ناوی شار و شوێنە جوغرافیەکان، ئەو شار و جێگایانه له سەردەمی هاتنی ئیسلام دا نەبون و بەم تازەییە له سەردەمی قەرەقۆینلو و ئاق قۆینلو و سەردەمی عوسمانی و تورك دا دروست بون و ناوی تازەن وەك (ساوجبلاغ ـ ئیسماعیل قولی ـ قەرە جولون ـ قەرە بابا، خوشقدم)، بەوانەدا وا دیاره ئەم کتێبە تازە نوسراوەو بۆ دروست کردنی گومان و دژایەتی و ناشرین کردنی هاتنی سوپای ئیسلام هەڵبەسراوە و بڵاوکراوەتەوە.

٥- ئەو روداوانەی لەم کتێبەدا هەیه هیچ کام له مێژوونووسه بڕوا پێکراوەکان باسیان نەکردووە وەك(ئیبن کەسی، ئیبن ئەسیر، تەبەری، ئیبن ئەعسەم، بەلازەری، یاقوتی حەمەوی، ئیبن خەلدون، خزری بەگ، کارل بروکلمان و ویل دیورانت. هتد.

٦- ئەو سەحابانەی که ئەو باسیان دەکات و گوایە هاتونەتە کوردستان و شەڕیان کردووەو شەهید بوون، راست نیه هیچیان نه هاتونەتە کوردستان و زۆربەیان به شەهیدیش نەڕۆیشتونو ساڵەکانیشی راست نین

٧- ئەو پاشایانە یان ئەو حکومەتە کوردیانەی که ناویان هاتوە، هیچ مێژونوس و مێژویەك باسیان ناکات و ناویان نەهاتوە جگه لەو کتێبەدا.

٨- ئەو نامانەی بۆ عومەر نێرراوەو وەڵامەکانیان، هیچیان له کتێبی (رسائل الفاروق عمر بن الخطاب) دا نەهاتوە که نزیکەی (٤٥٠) نامەی خەلیفە عومەری تیایە.

بەمانەدا دیارە، که ئەم کتێبە ئەسڵی نیه و هەڵبەستراوە:-

١- ئەو کتێبە (کوردستان و ئاینی ئیسلام) مەلا رەئوف دەڵێ: ئەبوعوبەیدە کوڕی جەراح سەرکردەی سوپای شام نامەیەکی بۆ خەلیفە

عومەر نوسی کە شام و ئەرمەن و دیاربکر و موسڵ فەتح کرا، لە جەنابت دەپرسین ئایا بگەڕێینەوە بۆ حیجاز یان بەرەو رۆژهەلات بچین یان بۆ رۆژئاوا.[363] بەلام لە فارسیەکەی (فتح سواد العراق) دا دەڵێ وتویەتی: ئایا لەشکری ئیسلام بەرەو حجاز بگەڕێتەوە یان روو بکاتە عێلات و خێلاتی کوردەکان.[364]

ئەم نامەیە لە هیچ سەرچاوەیەکی ترەوە نەهاتوەو هیچ مێژوونوسێکی تر نەیگێڕاوەتەوە، نامەم نەدیوە لە سەردەمی خەلیفە عومەر و عوسمان و علی دا ناوی کورد ببات.

٢- حوێزی دەڵێ خەلیفە عومەر ئاوا وەلامی نامەکەی دایەوە: (خۆتان ساز بکەن. چوار هەزار کەس تسلیم بە خالیدی کوڕی وەلید بکەن و بەرەو قەومی کوردان بکەونە ڕێ. لەگەڵ خالید، زوبیر کوڕی عەوام، فەزلی کوڕی عەباس، میقداد ئەسوەد، عەبدوڕڕەحمان کوڕی ئەبوبەکری سدیق، عەبدوڵلا کوڕی عومەری کوڕی خەتاب، زراری ئەزوەر. ئەمانە بە دەشت و دەرو شار و دێهاتی ولاتی کوردەواریدا بلاو بکەرەوە، من خەبەرم هەیە سێ پاشای بەهێزیان هەیە: یەکیان فەروخ ، دووەم: مالیکی ئەشتەر و سێیەم دانیکور. بۆ سەر ئیسلام دەعوەتیان بکە، ئەگەر نەیان کرد داوای جزیەیان لێ بکە، ئەگەر نەیان دا شەڕیان لەگەڵ بکە. خەبەرم هەیە لە مەرجێ کە بە کوردی پێی دەڵێن مەرگە پاشایەك هەیە فەروخ ناو، شورە و قەلایەکی زۆر محکەمی هەیە، خۆیشی زۆر یاغی و خوێن ڕێژە)[365]

لە فارسیەکەدا دەڵێ: (پاشاکان ناویان فەروخ خان، مالك ئەژدەر، دانی کۆرە.) پاشان دەڵێ: ئەم هێزە لە ٢٠جمادی یەکەم ساڵی ٢٥ی کۆچی لە ئەینەواوە روی کردە کوردستان.[366]

---

[363]. کوردستان و ئاینی ئیسلام: ملا رؤوف حوێزی. ل٧٧. بغداد ١٩٧٠.

[364]. فتوح سواد العراق: واقدی، وەرگێڕ عبدالعزیز واعظی سردشتی، ل١٥٣ تهران ١٣٧٤ کۆچی.

[365]. کوردستان و ئاینی ئیسلام. ل٧٩.

[366]. فتوح سواد العراق: ل١٥٤-١٥٥.

له کتێبی (رسائل الفاروق عمر بن الخطاب) دا که (٤٥٠) نامەی خەلیفە عومەری تیایە، گەڕام بۆ نامەیەکی لەم جۆرە، بە هیچ شێوەیەك، نە ناوی ئەو سەحابانە، نە بەرەو روی کوردستان هاتبن، نە ناوی ئەو پاشا کوردانەی تیا بوو.[367] لە مێژووەکانی تەبەریو ئیبن کەسیرو ئیبن ئەسیرو ئیبن ئەعسەمو خزری بەگدا ناوی پاشا و نامەی لەم جۆرە چنگ ناکەوێ!

یەکێکی تر لە هەڵە فەزیعەکان دەڵێ ساڵی (٢٥)ی کۆچی رویان کردە کوردستان کە بە مەرجێ خالیدی سەرکردەیان ساڵی ٢١ی کۆچی لە شاری حومس مرد[368]. بەڵام لە فارسیەکەدا وەك باسم کرد دەڵێ: ساڵی (٢٥)ی کۆچی عومەر رێگەی دا بچێت بۆ کوردستان، ئەو پێشتر مرد بوو، بەوەدا دیارە بوختان و هەڵبەستراوە. ابن جبیر[369] و معجم البلدان[370] هەمان رایان هەیە. هەروەها بۆ زیاتر شارەزایی بڕوانە: طبقات [371] و الاصابة[372] و اسد الغابة[373] و الاستعاب[374] و تأريخ ابي الفداء[375].

مەلا جمیل رۆژبەیانی لەوەدا کەوتوەتە هەڵەوە کە گوایە واعزی راست دەکات ساڵی (٢٥)ی کۆچی هێرشەکە کراوە، چونکە خالید ساڵی (٢١) مرد بوو![376] لەم مێژووەدا درۆی شاخ داری لەو جۆرانەی زۆر تیایە!

---

367. رسائل الفاروق: عبدالطيف اسماعيل عيسى، ١٩٩٠، الشركة العراقية للطباعة الفنية المحدودة.

368. قادة فتح العراق والجزيرة: اللواء الركن محمود شيت خطاب، دارالفكر، ص١٦٨، سنة١٩٧٧.

369. رحلة ابن جبير: ص٢٩٠

370. معجم البلدان: ج٣ص٣٤٠.

371. طبقات ابن سعد: ج٧ص٣٩٧.

372. الاصابة في معرفة الصحابة: ج٢ص١٠٠.

373. اسد الغابة: ج٢ص٩٦.

374. الاستيعاب: ج٢ص٤٣٠.

375. تأريخ ابي الفدا: ج١ص١٦٤.

376. ولاتگیری رەشەخاکی عێراق: مەلا جمیل رۆژبەیانی، ل٢١، ١٩٩٧.

له كوردييەكەدا دەڵێ: حاكمی شاری هەولێر ناوی (جاتليس)[377] بوو. بەڵام له فارسيەكەدا كه ڕۆژبەيانی كردويه به كوردی دەڵێ: ناوی وەها له مێژووەكاندا نيه و دەبێ هەڵه بێت[378] . جگه لەوە هەولێر لەو كاتەدا سەر به ڕۆم نەبوە وەك واقيدی دەڵێ بەڵكو سەر به فارس بووە.

پاشان دەڵێ: (عەبدوڵڵا كوڕی جەندەل) له شەڕی هەرموتەدا كوژرا. بۆ ناوی ئەو عەبدوڵڵايه گەڕام له (الاصابة – الاستعاب – اسد الغابة)دا كه ژيانی زياتر له (٢٠) هەزار سەحابەی تيايه، ناوی نەبوو. كابرايەك به ناوی (كولاه كون) و سەردارێك به ناوی (جاروسه) له هيچ مێژوويەكدا ناوی نەهاتوە. له لاپەڕە ٨٨دا حوێزی نوسيويەتی خاليدی كوڕی وەليد بانگی (ئەبودوجانەی كرد، فەرموی بڕۆ بۆ لای پادشای مرجين كه ناوی فروخ خان بوو.

وتمان خاليد نەهاتوەته كوردستان، دووەم خاليد چوار ساڵ پێش ئەم مەوعيدەی كه ئەمان دايان ناوە مردوە، سێيەم ئەبودوجانه كه ناوی ئەسڵی (سەماك كوڕی خەرشەی ئەنساری)يه، تەحقيق كراوە كه ئەو كەسە: (ئەو گۆڕەی له ماوشانسی دەشتی قەزوێنە و بەناوی ئەبودوجانە، زيارەتگايە، هی ئەو نيه و له بنەڕەتدا درۆيه، ئەو نەگەيوەته كوردستان و ئێران. سەير ئەوەيه كۆلكه مەلا و زڕەشێخەكان جاران خانمە ئاوسەكانيان هەڵ دەخەڵەتان و نوشتەيەكی چوار مەتری ئەبو دوجانەيان بۆ ئەنووسی بۆ پاراستنيان له دێو و درنج و جنۆكە، كه منداڵەكانيان له زگا نەخنكێنن.)[379]

واعزی له جێيەكی فارسيەكەدا دەڵێ: (خاليد داوای كرد له ئەبودوجانەی ئەنساری كه بچێت بۆ لای فەروخ خانی پادشای مەرجين. زۆر دور نەكەوتبويەوە له وڵاخەكەی كەوتە خوارەوە. زرار كوڕی ئەزوەر چوو به دەميەوە. دەبينێ تيری بەركەوتوە. لاشەكەيان هێنا ناشتيان.[380] ئەمانە دەڵێن

---

[377]. كوردستان و ئاينی ئيسلام: ل٨١.

[378]. وڵاتگيری ڕەشەخاكی عێراق: مەلا جميل ڕۆژبەيانی، ل٢١، ١٩٩٧.

[379]. هەمان سەرچاوە: ل٢٢.

[380]. فتوح سواد العراق: واعظی، ص١٥٨–١٥٩. وڵاتگيری ڕەشەخاكی عێراق: ل١٧–١٨.

ئەبودوجانە لەم شەڕەدا بە دەستی کورد کوژراوە کە سالی ۲٥ی کۆچی روی داوە، بەلام ئەم سەرچاوانە وا نالێن: (واقدی) لە (الردە، ص٧٤) – (ئیبن سەعد) لە (الطبقات الكبير، ج٣ص٥٥٧) – (بەلازەری) لە (فتوح البلدان) دا و – یەعقوبی لە مێژوەکەی دا ج٢ص١٢٠، هەموویان لەسەر ئەوەن کە ئەبودوجانە سالی (١١)یان (١٢)ی کۆچی لە جەنگی (ئەلردە) دا شەهید بوە. دیارە ئەم کتێبەی واعزی و حوێزی هی واقدی نیە چونکە واقدی لە ئەلردەدا دا وەکو سەرەوە دەلێت!

هەروەها لە باسی (زرار کوڕی ئەزوەر) دا سەرچاوەکان دەلێن کە ئەویش نەهاتوەتە کوردستان وەکو: الاصابة في تميز الصحابة: ابن حجر، ج٢ص٢٠٨-٢٠٩دا دەلێ: ضرار کوڕی ئەزوەر لە جەنگی یەمامەدا شەهید بوو کە لە دژی ئەبومسلمی کەزاب کردیان. ئیمامی بوخاری لە (تأريخ الكبير) دا دەلێ: زرار لە سەردەمی خەلافەتی ئەبوبەکردا شەهید بوو. ئەو کاتە سوپای ئیسلام هەر لە باشوری عێراق بوو. نادر کریمیان لە تعلیقاتی فارسیەکەدا لاپەرە ٢٤٨دا دەلێ: (تمام این اخبار مشوش و قابل تکذیب است، زیرا ضرار بن ازور به قول بیشتر محدثین و مؤرخین به سال ١١هجری قمری در واقعه یمامه به شهادت رسیده[381] . کەواتە کوردستانی بە دوو چاو نەبینیوە.

واعیزی لە لاپەرە (١٦٤)ی فارسییەکەداو، حوێزی لە لاپەرە (٩٤)ی کوردییەکەدا دەلێن خالیدی کوڕی وەلید بۆ خۆی سوار بو، لەگەل باقی سەحابان، وەکو فەزلی کوڕی عەباس و زوبێری عەوام و زراری کوڕی ئەزوەر و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری سدیق و عەبدوللای کوڕی ئەیوب رۆیشتن بەرەو (مەرجین) مەرگە. لە جێیەکی تردا دەلێ: خالید هەزار کەسی خستە ژێر فەرماندەی عەبدوللا کوڕی عومەر و ناردی بۆ شیدەر (پشدەر)، هەروا هێزێکی خستە تەك میقداد و، ناردی بۆ (شهرین) (شارستێن)، کە هەموو ولاتەکە

---

[381]. فتوح سواد العراق: مقدمة وتصحيح وتعليق: نادر كريميان، ص٢٤٨.

راماڵن و تالآنی بکەن.[382] لە سوپای میقداد تەنها دوو کەس کوژرا بوون لە عێڵی تەی ناویان حارس و عیباد بوو. ئەنجا دەڵێ عەبدوڵلا کوڕی عومەر کە چوو بووە شیدەر هەموو گوند و ئاواییەکانی تالآن کرد بوو!، میقداد بە تالآنی شهرینەوە گەڕایەوە، لەو شەڕانەدا فەزل کوڕی عەباس و زوبێری کوڕی عەوام و زۆری تر کوژران.

لە شەڕی فروخدا. عومەر کوڕی عەدی هاوڕێی میقداد کوژرا. مقداد سوپای فروخی تەنگەتاو کرد و زۆری لێ کوشتن، بەڵام لە یارانی دوو کەس شەهید بوون کە ناویان حارس و عباد بوو لە عێڵی تەی[383]. ئەم دوانە لە شەڕی شهرین دا تۆزێ پێشتر کوژرا بوون، بەڵام وەك ڕۆژبەیانی دەڵێ: وا دیارە بە هیمەتی نووسەری ئەم سیپارەیە جارێکی تر زیندوو بوونەوە بۆ کوشتنی کوردی کافر و تالآن کردنیان.[384] بە نیسبەت شەهیدبوونی فەزلل کوڕی عەباس و زوبێری کوڕی عەوام کە پێشتر لەو جەنگە نابەرامبەرەدا کوژرا بوون لە جەنگی شیدەر دا. پاش چەند لاپەڕەیەکی تر دووبارە هەواڵی زیندوبونەوەیانتان بۆ دەگێڕمەوە و دێنەوە ژیان بۆ گیانی کوردو شەڕ دەکەن. (ئەنجا مقداد ویستی لاشەی عومەر کوڕی عودەی بنێژێ. بەڵام لاشەی پێنج کەسی تریان لە یارانی دۆزیەوە بە ناوی سالم، عەبدولقادر، واسیلە، سەعد، جوندوب.). ڕۆژبەیانی دەڵێ نە لە فەرهەنگەکاندا و، نە لەو کتێبە مێژوویی‌یانەدا کەباسی شەڕەکانی وڵاتی چیا (کوردستان) ی تێدا هاتووە ئەم ناوانە پەیدا نەبوو.

---

[382]. وڵاتگیری ڕەشەخاکی عێراق: ل٢٣.

[383]. هەمان سەرچاوە، ل٢٤.

[384]. هەمان سەرچاوە، ل٢٧.

### پەتی درۆ کورتە

با ئێستا بزانین ئەو سەحابانەی پێشەوە کە ناومان بردون، راستە هاتونەتە کوردستان یان وەکو ئەوانی تر هەڵبەستراو و بوختان بۆ کراو و درۆن. ئەوە بێگومان بن کە لە هەمان ئەنجامی ئەوانی پێشویان بەدەر نیە::

١. فەزلی کوڕی عەباس: کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕی هاشم قریشی‌یە، کوڕی مامی پێغەمبەرە (ﷺ) لە زۆرترینی جەنگەکان لە گەڵیدا بەشدار بووە، دایکی ناوی (لبابەی بچوك کچی حارسە) یەکێ بوو لەوانەی پێغەمبەریان شۆرد، لە زوربەی جەنگەکانی شام لە سەردەمی ئەبوبکردا بەشدار بوو، (ئیبن سەکەن) دەڵێ لە جەنگی ئەجنادین لە فەلەستین شەهید بوو، هەندێ تر دەڵێن لە جەنگی یرموك دا شەهید بوو، بەڵام راستترینی قسە ئەوەی ئیمامی بوخاری‌یە، کە دەڵێ لە سەردەمی خەلیفە ئەبوبکر دا مرد. لە فتوحی بولداندا[385] دا دەڵێ لە تاعونی عەمواس دا لە ساڵی ١٨ کۆچی دا مرد لە شام. سەیری ئەم سەرچاوانە بکە: الاصابة فی تمیز الصحابة: ابن حجر العسقلانی، ج٣ص٢٠٨. طبقات الکبیر: ابن سعد، ج٤ص٢٧. هیچ سەرچاوەیەك ناڵێ هاتوەتە عێراق یان کوردستان و، لە هیچ جێ‌یەکی کوردستاندا ناوی نەهاتوە.

٢. عەبدوڵڵا کوری عومەر هەوڵی دا لە جەنگی (بەدر و ئوحد)دا بەشدار بێ، منداڵ بوو نەیان هێشت، لە فەتحی مەککە بەشدار بوو، موفەسیر و فەقیهێکی گەورە بوو، یەکێ بوو لە شورای شەش نەفەرە بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە. (٢٦٣٠) فەرمودەی گێراوەتەوە، لە فتوح سوادی عێراقدا کە واعیزی بە فارسی و، حوێزی بە کوردی گێراویانەتەوە: گوایە عەبدوڵڵا کوردستانی قڕ کردوەو ژن و منداڵی کوشتوەو ماڵیانی بە تاڵان بردووە، پاشان لە کوژرانەکەی دا ئەم درۆ باڵدارانەیان بۆ هەڵ بەستوە کە کورتەکەی ئەمەیە: خالید و عەبدوڵڵا لە کوردستان دەگەڕانەوە، لە بەینی موسڵ و هەولێردا

---

[385]. فتوح البلدان: بلاذري، ص٢٠٢.

تووشی چەند گرفتێك بوون، پیرەژنێك وەستا بوو، وتی من موسوڵمانم ناوێرم بپەڕمەوە، عەبدوڵڵا پیرەژنەکەی کردە کۆڵی و کە گەیشتنە ناوەڕاستی ئاوەکە ژنەکە لە ژێرەوە چەقۆیەکی دا لەسەر دڵی عەبدوڵڵا و مرد، خالیدیش پیرەژنەکەی کوشت.[386] لە تەحقیق و تەعلیقی نادر کریمیان دەڵێ: ئەو رووداوە (قطعا دروغ است و شدیدا قابل تکذیب می باشد.)[387] صاحب تهذیب الاسماء: ج١ص٢٧٨ دەڵێ عەبدوڵڵا ساڵی ٧٣ی کۆچی مرد. ئیبن خەلەکان: ج١ص٢٤٦ دەڵێ وەفاتی عەبدوڵڵا ساڵی ٦٣ بوو لە تەمەنی ٨٤ ساڵی دا مرد. لە طبقات الکبری: ئیبن سەعد، ج٤ص١٣٨ دا دەڵێ وەفاتی عەبدوڵڵا ساڵی ٦٤ی کۆچی بوو، دوا یاری پێغەمبەر بوو کە لە شاری مەککە مرد.[388] لە (استعاب)دا دەڵێ عەبدوڵڵا لە مەککە مرد ساڵی ٧٣ی کۆچی، لەوەدا خیلاف نیە، وەسیێتی کرد کە لە قەبرسانی (الحل) ئەسپەردەی بکەن، بەڵام نەیانتوانی لەبەر شەڕی حەجاج، بەڵکو دفن کرا لە (زی تەوا) لە قەبرستانی [illegible] عەوام کوڕی خویلد، لە عەشەرەی موبەشەرەیە، یەکەم کەس بوو کە بۆ ئیسلام شمشێری هەڵکێشا. کوڕی مامی پێغەمبەر بوو، ساڵی ٢٨ پێش کۆچی لە مەککە لە دایك بوو، بە هەوڵی ئەبوبەکر موسوڵمان بوو، لە جەنگی ئوحد و یەرموك دا بەشدار بوو، ئەندامی شورای شەش نەفەرە بوو بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە، لە شام و عێراق و ئەفریقیا جهادی کردوە، کە عوسمان شەهید کرا، زوبیر لە روداوێکی ئەسەف باردا لە تەمەنی ٦٧ساڵی دا ساڵی ٣٦ی کۆچی شەهید کرا و، ئیمامی عەلی زۆر غەمبار کرد، زوبیر ٣٨ فەرمودەی ریوایەت کردوە.[389] گۆڕی لە شاری (زبیر)ە لە نزیك شاری مەککە. رۆژبەیانی دەڵێ: ئەم پیاوە کوردستانی نەدیوەو شەڕی تیا نەکردوە.[390]

---

[386]. کوردستان و ئاینی ئیسلام: حوێزی، ل١٣١. فتوح سواد العراق: واعظی، ص٢٠٧.

[387]. فتوح سواد العراق: واعظی، ل٢٥٥.

[388]. الاصابة: ج٢ص٣٥٠. وفیات الاعیان: ابن خلکان، ج١ص٢٤٦. تهذیب الاسماء: ج١ص٢٧٨.

[389]. الاصابة: ج١ص٥٤٦. حلیة الاولیاء: ج١ص١٨٩. الاعلام الزرکلي: ج٣ص٤٢.

[390]. ولاتگیری رەشەخاکی عێراق: ل٢٠.

ئەمانە وا دەڵێن، کەچی مەلا حوێزی دەڵێ ساڵی ٢٥یکۆچی لە شەڕێکدا لە کوردستان بە دەستی کورد کوژراوە. بەڵام بە داخەوە ئەو (١١) ساڵیش دوای ئەو کوشتنە درۆینەیەی کوردستان هەر مابوو!

٤- عەبدوڵڵا کوڕی جەندل: لە لاپەڕە ٨٣ ی کوردستان و ئاینی ئیسلام و، لاپەڕە ١٥٦ی فارسیەکەدا دەڵێ لە ئەرموتە عەبدوڵڵا کوڕی جەندل کوژرا. ئەم کەسە بە یەکێك لە یارانی پێغەمبەر (ﷺ) ناونوس کراوە و باس کراوە، بەڵام لە هیچ کتێبێکی سەحابان دا وەك (الاصابە والاستعاب)و ئەوانی تردا ناوی نەهاتووە، بەڵام لە تەبەری دا چ٣ص٢٤٢٤دا یەك جار ناوی هاتوە ئەویش بە ناوی راوی نەك سەرکردە یان سەرباز، واتە روداوی خەڵکی گێڕاوەتەوە نەك خۆی بەشدار بوە. هەروەها یەعقوبیش لە مێژووەکەی دا چ٢ص١٧٦دا ناوی کەسێکی بردوە بە ناوی (جەنادە کوڕی ئەفیەی ئازدی) کە لە ساڵی ٥٣ی کۆچی دا شاری (ترسوس)ی فەتح کردوە، تەئریخی یەعقوبی چ١ص٥١٦ دەڵێ ئەم پیاوە قسە هەر ئەوەیە کە ونە و هەویەی نیە.[391]

٥. فارسیەکە لە باسی داگیرکردنی (دوگمان) دا دەڵێ وائلە کوڕی ئەسقەع، کە خۆی لە شەڕەکەدا بوە، گێڕاویەتیەوە کە هەموو دارایی و سامانی کورد بەر تاڵان کەوت. مەلا رەئوف حوێزی ناوی یاداشت نەکردوە، تەنها واعزی لە فارسیەکەدا هێناویەتی. رۆژبەیانی دەڵێ بە گوێرەی مێژوونوسەکان ئەم کابرایە لە سەردەمی خەلیفەی سێهەم عوسمان دا لە شەڕەکانی ئێران و ئیسلامدا هەبوە پاشان ساڵی ٩٨-١٠٥ی کۆچی مردوە، بەڵام لە ساڵانی ١٨-٢٥ لە شەڕەکانی کوردستاندا نەبوە.[392] واتە حەفتا ساڵێك دوای باسەکەی ئەوان مرد.

٦. قەعقاع کوڕی عەمر. واعیزی لە فارسیەکەدا کە مامۆستا ملا جمیل رۆژبەیانی کردویە بە کوردی و پەراوێزی بۆ نوسیوە دەڵێ: خالید چاوەڕوانی

---

[391]. فتوح سواد العراق: تحقيق نادر كريميان، ص٢٤٥.

[392]. وڵاتگیری رەشەخاکی عێراق: مەلا جمیل رۆژبەیانی، ل٢٠.

قەعقاع بوو کە بە فەرمانی ئەبوعوبەیدە هاتبوو بۆ شارەزوور، ئەوە بوو ئەبوعوبەیدە بە فەرمانی (عومەر) پاش داگیرکردنی شام سوپاکەی بکاتە دوو بەشەوە، بەشێکی لە ژێر فەرماندەیی خالید دا بێت و ئەوی تری بخاتە ژێر فەرمانی قەعقاع. ئەم بڕیارە ڕاست نیەو لە هەموو ژیانی ئەبوعوبەیدەدا بڕیاری وای نەداوە و سوپا بەو شێوەیە نەکراوە بە دوو بەشەوە ئەم باسە لە هیچ سەرچاوەیەکدا نیە. ئەمە لە لایەك لە لایەکی ترەوە قعقاع دوای جەنگی قادسیە ساڵی (١٥)ی کۆچی ئیتر پەیوەندی بە شامەوە نەما و کەوتە ژێر فەرماندەیی سەعد کوڕی وقاس و سوپای عێراقەوە، جگە ئەو هێڵەی کە هاتە جەلولاو لەوێوە چوو بۆ خانەقین و حەلوان و کرماشان و نەهاوەند و هەمەدان. نە چوەتە کوردستان، قەعقاع فەرماندە نەبوە، بەڵکو هەمیشە سریەی (قوە زاریبە)ی پێ بوە بۆ کاتی پەلە بەکار هێنراوە، وەکو مامۆستا ڕۆژبەیانی دەڵێ درۆیە ئەمانە هیچیان لە کوردستانی نێوان دوو زێ دا، واتە نێوان چیای حەمرین و قەندیل لە شەڕا نەبون.[393]

قعقاع هەتا سەردەمی ئیمامی عەلی ماوە ساڵی ٤٠ کۆچی لە کوفە مرد.

لێرەدا لە جێیەکدا سەرم لە مێژونوسی کورد (ڕۆژبەیانی) سوڕدەمێنێ کە لە چەند جێدا ئەم سیپارەیەی (حوێزی و واعزی) ڕەد دەکاتەوە و دەڵێ درۆ و هەڵبەستە و تەمەنی هەڵبەسراویشی زۆر نیە، کەچی لە زۆرجێ‌ی تردا لەگەڵ ڕوداوەکانی باسە درۆکاندا هەڵدەچێ و، هەندێ قسەی ناجۆر دەگرێتە ئیسلام و پێغەمبەر و سوپایانی ئیسلام و زۆر دوژمن کارانە وەسفیان دەکات. وەکو تەواوی ڕوداوەکان بە هەڵبەسراو و گوماناوی ناو. ئەمەیان لە چی.؟ بۆ نمونە. لە لاپەڕەی (٣)دا گلەیی دەکات لە بابەتەکەی حوێزی و دەڵێ (مێژووزانێکی شارەزای مێژوو ئەم کتێبەی نەدیبوو نەیخوێندبویەوە، کە ڕەخنەی لێ بگرێ و، خوێنەری گەنجە سادە تێگەیەنێ، کە هەم کتێبەکە هی مەلا ڕۆوف نیە و هەم بنەڕەتەکەشی جێ ی گومانەو، نابێ باوەڕی پێ بکرێ و

---

[393]. وڵاتگیری ڕەشەخاکی عێراق: مەلا جمیل ڕۆژبەیانی، ل٣٥.

تاوانە ڕێ بدرێ بە کوردستاندا بڵاوببێتەوە.). کەچی هەردوای ئەوە قسەکانی حوێزی بە ڕاست دەزانێ‌و هەڵدەچێ‌و قسەی نابەجێ بە سەحابەکان‌و فتوحات دەڵێت. نازانم ئەمە نەخۆشیە یان پیری‌و لەبیرچوونە؟!

واعیزی لە لاپەڕە (١٨٦)ی فارسیەکەدا هێناویەتی، بەڵام ڕۆژبەیانی وای تەرجەمە نەکردوە و دەڵێ: خالید داوای لێ کردن موسوڵمان بن. بەڵام ئەوان سەریان دانە هێنا و پەسەندیان نەکرد، خالید دەستوری دا بە سوپا قڕیان تێ خستن. جا هەمویان دایە بەر شمشێر. ئەنجا چونە ناو شارەوە و هەمویان تاڵان کرد.) بەڵام فارسیەکە وانیە ڕۆژبەیانی هەندێ شتی زیادی وتوە. لە فارسیەکەدا دەڵێ: اسیران را جمع کرندو دینی اسلام را برایشان عرض نمودند نپزیرفتند، همەرا بقتل رسانیدند پس از ان یاران پێغمبر داخل شهر گردیدە شروع بە تهلیل و تکبیر خداوند عظیم کردند و درود رحمت بر پیغمبر بشیرو نذیر فرستادند.) دەڵێ کە چونە شار تهلیل و تکبیری خوای گەورەیان کرد. بەڵام ڕۆژبەیانی وای تەرجەمە کردوە کە چونە شار هەمویان تاڵان کرد. هەموو تەرجەمەکە پێویست بە تحقیق دەکات! با بچینە سەر لایەکی تری ڕۆژبەیانی کە لە پەراوێز بۆ ڕستەی(هەمویان دایە بەر شمشێر) دا وتویەتی (کوشتنی دیل و منداڵ و پیر و پیاو ژن و پەك کەوتە لە هیچ ئاین و لە هیچ یاسێکی مرۆڤایەتیدا دروست نەبوە. بەڵام سپایانی عەرەب و جاشەکانیان درێغی‌یان لەم کارە نەدەکرد، وا دیارە لەسەر بنەڕتی (غەزو) و (انفال) نەڕۆیشتن.؟؟؟؟؟)[394]

لە پەراویزی ژمارە (٢) لاپەڕە (٢٥) دا ڕۆژبەیانی دەڵێ: ئەم سیپارەیە لە بنەڕەتدا بە دەست هەڵبەستی دەزانم و لام وایە مەلاییێکی کورد لە سەدەکانی ئەم دواییەدا. هەڵیبەستوە.)[395] ئەی ئەگەر هەڵبەستە بۆ لەگەڵ باسەکەدا هەڵدەچی‌و بە ڕاستی دەزانی‌و جوێنێك دەدەی کە حوێزیش نەیوتووە.

---

[394]. ولاتگیری رەشەخاکی عێراق: مەلا جمیل ڕۆژبەیانی، ل٢٤.

لە جێیەکدا لە فارسیەکەدا هاتوە کە (پیرۆت کوڕی بارام) بە خۆی و دوانزە کەسەوە موسوڵمان بون، بەڵام حاکمی کورد لە رقان خۆیان و خاو خێزانی کوشتون چونکە بونەتە موسوڵمان. ئێستە لە وڵاتی مەرگە گۆرەکانیان کراوەتە زیارەت گاو پێی دەڵێن (پیرۆتە سوور). رۆژبەیانی تەعلیق لەمە دەداو دەڵێ: وەکو کەوی پێ سور خیانەتیان لە نەتەوەی خۆیان کردوە و، کوڕانی نەتەوەی خۆیان (بە دوژمن) بە کوشت داوە. واتە ئیسلام و دینی پێغەمبەر دوژمنە. پاشان دەڵێ: ئەگەر وانەبێ خەڵك بۆچی دەبن بە جاش، واتە پیرۆت کە موسوڵمان بوە، بوەتە جاشی ئیسلام. پاشان قسە بە مەسعود موحەممەد دەڵێ و تاوانباری دەکات کە وەسفی پیرۆتی کردوە دەڵێ: بەڵام بە راستی مەخابنە، مامۆستایەکی خاوەن ئەندێشە و بە مێشکی وەکو مامۆستا مەسعود لاپەڕەی کاغەزی سپی، بە وەسفی جاشێکی روڕەشی وەك پیرۆتە سوور، بە قسەی پیرە ژنان و پیرە پیاوانی کوردی ساویلکەی خڵەفاو بخاتە لاپەڕەی مێژوو.[396]

رۆژبەیانی لە سەرەوە دەڵێ: (ئەم سیپارەیە لە بنەڕەتدا بە دەست هەڵبەستی دەزانم و لام وایە مەلایەکی کورد لە سەدەکانی ئەم دواییەدا. هەڵی بەستوە.)

کەچی هەر (دە) دێڕ لە خواروی ئەوەوە ئاوا هەڵدەچێ و چیرۆکەکەی لێ دەبێتە راست و بە چوار دەوردا جنێو و وشەی ناشرین بۆ ئیسلام و کەسێ دەتەقێنێ، کە چیرۆکەکە دەڵێ موسوڵمان بوە. مامۆستا مسعود تاوانبار دەکات. بەمەرجێ لەم لێکۆڵینەوەیدا سودی زۆر لە مامۆستا مسعود وەرگرتوە! لەم باسەدا رۆژبەیانی لە خەڵەفاو دەچێت.

هەر (دوو) دێڕ لە خوار ئەو برگە توندەوە دەڵێت (وا دیارە نووسەری ئەم سیپارە داستانیە درۆیە.)[397] بە راستی حەیفە بۆ مامۆستا و بیر تیژو

---

[396]. وڵاتگیری رەشەخاکی عێراق: مەلا جمیل رۆژبەیانی، ل٢٦.

[397]. وڵاتگیری رەشەخاکی عێراق: مەلا جمیل رۆژبەیانی، ل٢٦.

مێژوونوسێکی گەورەی کوردی وەك مەلا جەمیل رۆژبەیانی بە تایبەتیش کە مەلا بێت، بەو جۆرەیە بە رەنگاری ئیسلام و هاتنی ئیسلام بکات بۆ کوردستان. بە تایبەت تر کە ئەو بە هۆی ئیسلامەوە فێری خوێندەواری و ناسراو بوە و، لەو سەرچاوەیە ئاوی سازگاری خواردوەتەوە، ئەگەر وانە بێ، ئەوسا چ جیاوازیەك لە نێوان مەلا جەمیل خاوەنی لێکۆلینەوە و، مەلا رەئوف حوێزی هێنەری ئەو هەموو بوختانە هەڵبەسراوانەدا هەیە، خۆ هەردووکیان (مەلان). من پێم باشە بە نوسراوەکەدا بێتەوە و ئەو هەڵانەی چاك بکاتەوە کە سەریان لە بێ بڕواییەوە دەردەچێت. جگە لەوە کە ئەم بابەتەی رۆژبەیانی دەست نووسی شەستەکان بووە، ئایا ئێستەش رای وایە، یان خۆی رازی بوە بە چاپ کردنی ئەو دەست نوسەی کە ئەو کاتە خۆی ئامادە نەبوو.؟ چونکە ئەم دوو جۆرە قسەیە کە پێچەوانەی یەکن بۆ نووسەری گەورە ناگونجێن، تۆ کە بڕوات بەو کتێبە نیە، تورە بوون و بۆ هەڵچون یانی چی.؟

لە جێیەکی تردا باسی ئەو کتێبە هەڵبەسراوە دەکات و زۆر جوانی دەهۆنێتەوە: لە بەشی کوردستانی خواروی نێوان دوو(زێ)دا سەدان ساڵە کتێبێکی دەسنووسی پڕ لە درۆ و دەلەسە هەیە بە ناوی (فتوحات سواد العراق)ە و دەنگی داوەتەوە و وەکو شانامەی جاری جاران لە دیوەخانان و لە مزگەوتانیشا بۆ کوردی سادە ئەخوێندرێتەوە، کەس نازانێ کێ نوسیویەتی.؟ کەی نووسراوە.؟ چۆن کەوتوەتە کتێبخانەی بنەماڵەی مەلا سەمەدی مەرگەیی، هەروەك قاوە، گوایە دانراوی (واقیدی)یە، ناواخنەکەی باسی داگیرکردنی هەندێ جێی کوردستانە، لە لایەن یارانی پێغەمبەرەوە، ئەو بنەماڵەیە کە ئەم کتێبی (فتوح سواد العراق)ەی لایە وەکو گەنجینە پاراستویەتی، نە بە خواستن بە کەسی ئەدا، نە بە کڕین و فرۆشتن، نە رێی ئەدا کەسێك رونوسێکی لەسەر بگرێتەوە، گوایە ئەم کتێبە لە کتێبخانە دەسنوسەکانی میسردا هەیە، بەڵام ئەم باسەی کوردستانی تیا نیە، ئەوەی جێی لێ رامانە ئەوەیە کە شێوەی داڕشتنی ئەم سیپارەیە کوتومت لە شێوەی داڕشتنی (فتوح الشام)ە کەی واقدی دەچێت، بەڵام باوەڕ ناکرێ

واقدی خۆی، کە لە بنەڕەتدا خەڵکی شاری مەککەیە، نەزانێ کە زۆربەی ئەو یارانەی کە ناویان لەم سیپارەیە هاتوە هەر لە شاری مەکەدا مردوون و نەگەییونە کوردستان. جا وەك وتم وا باوە کە سەدەها ساڵە ئەم کتێبە وەك شانامە. بۆ خوێندەوارو نەخوێندەوار و زاناو نەزان خوێندراوەتەوە کوێرانە (تعبدا) باوەڕیان پێ کردوە کەس لیٚ ی نەکۆڵیوەتەوە.[398]

لە جێیەکی تردا دەڵێ (من بڕوا ناکەم ئەم هەموو ئەفسانە نەزانانە هی واقدی بێت، بێ گومان هی مەلایەکی کوردی نیمچە خوێندەوار (کۆلکە مەلا) ئەم مەتەڵانەی ڕێك خستوە و لە مزگەوت و دیوەخانا بۆ خەڵکی نەخوێندەواری خوێندوەتەوە.)[399]

لە جێیەکی تردا دەڵێ: (لەگەڵ ئەوەدا کە من داستانەکەم هەر لە بناغەوە پێ درۆیە.)[400] بەم جۆرە ئەم دەستنووسە ڕەتدەکاتەوەو بە درۆ لە قەڵەمی دەدات، کەچی ئاواش لەگەڵ درۆکاندا هەڵدەچێت!

دوای ئەوەی خالید شەهبارە و رەبەتی داگیر کرد، فەرمانیدا بە سوپای ئیسلام بچێ و روبکاتە ساوجبلاغ، رۆژ بەیانی دەڵێ ساوج بلاغ – سوغون بلاق واتە کانی سارد، ئەم ناوە لە دەورانی سەفەوی دا پەیدابوە.)[401] واتە (لە سەردەمی سوپای ئیسلامدا نەبوە.) لەو حەلەدا پادشای ئەو ناوە ژنێکی جوان بوو گوایە ناوی (ئەرجانوسە) بوو لە بنەماڵەی (بەرداس) بوو کە بە بنامەڵەی سەرداری ساو جبلاغ و موکریان بون، گوایا باوکی کابرایەکی داوێن پیسی ستەمکار وخراپە کار بوە. حەنزەلە ناوی پێغەمبەر بوە لەو ناوچەیە، ئامۆژگاری زۆری کردوە کە واز لە چەپەڵی بهێنێ سودی نەبوە، شەڕێکی خوێناوی لە نێوان سوپای ئیسلام و خەڵکی ئەم ناوچەیە روی دا لە ئەنجامدا

---

[398]. ولاتگیری رەشەخاکی عێراق: مەلا جمیل ڕۆژبەیانی، ل١ پێشەکی.

[399]. ولاتگیری رەشەخاکی عێراق: مەلا جمیل ڕۆژبەیانی، ل٣٤.

[400]. ولاتگیری رەشەخاکی عێراق: مەلا جمیل ڕۆژبەیانی، ل٣٥.

[401]. ولاتگیری رەشەخاکی عێراق: مەلا جمیل ڕۆژبەیانی، ل٣٨.

ئەرجانووسە بە دیل دەگیرێ. (٢٥٠٠) کەسیان لە کورد بە دیل گرت، پاشان کەوتنە تالآن و راوڕوتی وڵات و ناو شاری سابڵاغ، خودی خالیدیش فەرمانی دا بە کوشتنی ئەو دیلانە و ئەرناجوسەیان بە دیلی هێنایە لای خالید، لە جوانی ئەو سەری سوڕما، کەوتە دڵدانەوەی و پێشنیاری کرد کە موسوڵمان بێت، ئەرجانوسە موسوڵمان بوو، ئەنجا خالیدیش سەرپشکی کرد لەناو سەردارانی ئیسلام یەکێك هەڵبژێرێ و شوی پێ بکات، ئەرجانوسە چاوی گێڕا قعقاعی هەڵبژارد و شوی پێ کرد.)[402]

لەم بڕگەیەدا ئەم قسانە هەیە:

أ – ساوجبلاغ ناوێکی تازەیە و سەردەمی هاتنی ئیسلام نەبوە، شای ئێران سابلاغی ناونا (مەهاباد) بە ناوی پێغەمبەرێکی کۆنەوە کە لەو ناوەدا بوە.

ب – برداس پاشای ئازربایجان بوە زۆر پێش ئیسلام، حەنزەلەی کوڕی سەفوان پێغەمبەرێك بوە بۆ گەلی ناوچەی ئەردەن هاتوە پێش میلاد. لەگەڵ برداس دا بوە بە شەڕیان و پێغەمبەریان کوشتوە ئەم روداوە لە سەردەمی ئیسلامدا نەبوە[403] مامۆستا رۆژبەیانی دەڵێ: ناوی بنەماڵەی وەهامان لە فەرهەنگەکانا و لە مێژوودا دەست نەکەوت.

ج– ئەرجانوسە وەکو رۆژبەیانی دەڵێ: لە فەرهەنگەکان و مێژوەکاندا پەیدا نەبوو، قەعقاعیش ژنی بەم ناوە وە نەبوە، جگە لەوەی کە قەعقاع نە گەیشتوەتە کوردستان، ئەم باسە دروست کراوە. وە لە کوردیشدا پاشا نەبوە بە ناوی ئەرجانوسەوە.

دوای ئەوە خالید کوردستان و ئازربایجانی داگیر کرد، سوپای ئیسلام هەموو لە ئورمانی – ئورمیە – کۆبونەوە، سوپای کورد و عەجەمیش لە

---

402. فتوح سواد العراق: واعظی، ص١٩٤–١٩٥. وڵاتگیری رەشەخاکی عێراق: رۆژبەیانی، ل٣٦–٣٧. کوردستان و ئاینی ئیسلام: مەلا رؤوف حوێزی، ل١٢١.

403. فتوح سواد العراق: ص٢٩٠.

دەوری (خۆش قەدەم)ی پاشای ئورمانی کۆبونەوە، ئەو سەردار و پاشاو پیاو ماقوڵانەی کە لە هەموو کوردستانەوە هەڵهاتبون خۆیان دابوە پەنای خۆش قەدەم، ئەم وتارێکی بۆ هەموویان دا، خالیدیش وتارێکی بۆ سوپای ئیسلام دا کە عەبدوڵڵا و مقداد و زرار و قەعقاعی تیابوو. کەوتنە رێ بۆ شەڕ پاشای مازندران بە چل هەزار سوارەوە گەیشتنە فریای خۆشقدم، ئەبوعوبەیدەش سوپایەکی نارده فریای خالید. شەڕ گەرم بوو ئەنەسی کوڕی مالك هەڵی کوتایە سەر خۆش قەدەم و کوشتی و سوپاکەی ورەیان بەرداو بڵاوەیان لێ کرد، سوپای ئیسلام وڵاتەکەیان تالان کرد)[404]

لەم بڕگەیەدا ئەم قسانە هەیە:

أ- لە هیچ سەرچاوەیەکدا خالید نەهاتوەتە کوردستان و ئازربایجان، بەڵکو سەرکردەی رزگارکردنی ئەو دوانە، ئەوانە بوون کە لە بەشەکانی پێشودا بە درێژی و بە بەڵگەو سەرچاوەی بڕوا پێ کراوە وە رونمان کردەوە.

ب - سەرکردەی فارسەکان لە ئازربایجان و ئورمیە ناوی خوشقەدەم نەبوو، ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ بەشەکانی پێشتر بە درێژی باسم کردوە.

ج- عەبدوڵڵا و مقداد و زرار و قعقاع لە هیچ سەرچاوەیەکدا نیە کە هاتبنە کوردستان جگە ئەم چیرۆکە دروست کراوەی واقدی و حوێزی و واعزی.

د- لە هیچ بسەرچاوەیەکدا باسی تالان و بڕو و کوشتنی خەڵکی بێ گوناحیان نەکردوە، بەڵکو هەموو خەلیفەکان داوایان لە سەربازان دەکرد خۆیان لەو جۆرە رەفتارانە بپارێزن و، لێ پرسینەوەی هەر سەربازێکیان کردوە کە شتی وایان کرد بێ!

ه- پاشای مازندران کە لە شەڕی (رەی) دا دەشکێ، ئیتر پەیمان دەدات بەرەنگاری سوپای ئیسلام نەبێت، نەك چل هەزار بنێرێ بۆ یارمەتی خۆش قەدەم. مێژوو باسی ئەو چل هەزارە و پاشایەتی خۆش قەدەم ناکات.

---

404. وڵاتگیری رەشەخاکی عێراق: ل٤٠. فتوح سواد العراق: ص٢٠٠-٢٠١. کوردستان و ئاینی ئیسلام: ل١٢٧

و- ئەنەس کوڕی مالك: لە سەرەتادا لە ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) دا کاری دەکرد، دە ساڵی ڕەبەق لەو ماڵەدا ژیا، دوای ئەوەی کە سنوری دەسەڵات فراوان دەبێ، کۆچ دەکات بۆ بەسرە و لەوێ دەمرێ. ئەم پیاوە هەروەکو ئەبوهورەیرە، بەوە ناسراوە کە فەرمودەکانی پێغەمبەر بۆ خەڵك بگێڕێتەوە، (٦) هەزار فەرمودەی لەبەر بوە، هەرگیز نەگەیشتوەتە کوردستان و داستانەکەی لە بنەڕەتدا درۆیە. لە جەنگی ئوحد و بیئریمەعونەو خەیبەر و هەوازندا بەشدار بوو.[405]

کەچی ڕۆژبەیانی دەڵێ ئەنەس پیاوی شیر و تیر نەبوو[406] . بەڵام ئەنەس یەکێك بوو لە تیرەندازەکان، ساڵی (٩٣)ی کۆچی مرد.[407]

## بانەیی ئەسحابە کوژ

دوا باسی ئەو سیپارە هەڵبەسراوە باس لە تاوانێکی تر دەکات کە دەرحەق بە خەڵکی بانە کراوە، کابرای خەتابارو بوختان چی لێ نەگەڕاوە هەتا دوو تاوانی تر بداتە پاڵ کورد، هەر وەك چۆن پێشتر کۆمەڵێك تاوانی دایە پاڵ سوپای ئیسلام، دەیەوێت کوردو ئیسلام لای یەکتری ناشرین بکات، هەتا لە ئایندەدا کورد و ئیسلام بە یەك نەخۆن، بەڵام درۆ پەتی کورتە ئەگەر سەدەیەکیشی بەسەردا بڕوات.

بە خەڵکی بانە دەڵێن (بانەیی ئەسحابە کوژ) تەمەنی ئەم قسەیە سەد ساڵێکە، دەنا خەڵکی پاك و خۆش ڕەفتاری بانە هی ئەوە نیە ئەو پەڵەیان پێوە بنرێ، من لە هەموو مێژوی هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان دا ناوی یەك سەحابەم نەدیوە کە لە کوردستاندا کوژرابێ، ئەگەر هەبوایە ون نەئەبوو یەکێك باسی دەکرد، بونی مەرقەدی ئەبوعوبەیدە لە دێی عەبابەیلێ لە نزیك هەڵەبجە و، بونی مەرقەدی ئەو هەموو شەخس و سەحابەو، ئەو هەموو

---

405. طبقات الكبير: ابن سعد، ج٧ص٧. صفة الصفوة: ابن جوزي: ج١ص٢٩٨.

406. ولاتگیری ڕەشەخاکی عێراق: مەلا جمیل ڕۆژبەیانی، ل٢٩.

407. صفة الصفوة: ابن جوزي، ج١ص٢٩٩.

قەبرسان و گردە بە ناوی دۆڵی شەهیدان و دۆڵی ئەسحابان و گردی سەحابان و ئەسحابە سپی ناو شاری سلێمانی و دەیانی تر لە کوردستاندا بڵاوە هیچیان هی کۆن و سەرەتای ئیسلام نییە، مێژوو هیچیان ناسەلمێنێ، کوردی سادەی‌چاخە تاریکەکانی کوردەواری خۆیان بۆ خۆیان دروستیان کردوە، یان مەرقەدی کەسێکی ئاینی یان ناوداری کورد بون وەکو بت و پیرۆزی بۆ خۆیان هەڵبەستووە لە تەنگانەدا بۆیان چونەتەوە و پەنایان بۆ بردون، هەمیشە خەیاڵ و ترس‌و پێویستی لەناو کۆمەڵگەی نەزان و نەخوێندەوار و سادەدا ئەو بابەتانە دروست دەکات، شتی بچوکیان تیا گەورە دەبێت، چیرۆك زۆرە لە بارەی شێوەی دروست بونی ئەم جۆرە ئەفسانانەوە قەبری کەسێك هەبوە، پێشتر خۆی لە ژیاندا بوە هیچی وای نەبوە، کە دەمرێ هەندێ کەرامات و سەخاوەت و رەفتاری سەیری بۆ دروست دەکەن، کەسە نەخوێندەوارەکان وردە وردە بۆ لایان دەکشێن پەنایان بۆ دەبەن و داوای منداڵ و چاری نەخۆشی و گرفت و قەرزاری سەریان لێ دەدەن، کە وردە وردە مێژووی دور دەکەوێتەوە، بە مروری زەمان دەیکەنە سەحابە یان وەلی و هەزار و یەك شتی بە دەوردا کۆ دەکەنەوە، کە خاوەنی ئەو مەرقەدانە لەو هەڵبەسراوانە بەرییە!

مێژوو باسی ئەوە ناکات، خەڵکی کوردستان داوایان لە موسوڵمانان کردبێ، بێنە کوردستان فێری رەوشتی ئاینیان بکەن و هاتبن و بە نهێنی کوشتبێتیان، لە عەرەبستان دوو حاڵەتی وا هەبوە کە یەکێکیان دەگێڕمەوە، مەلا حەویزی و واعزی کە بە درۆ لە واقیدیەوە هێناویانە، دوو روداوی لەو جۆرەشیان بۆ کورد دروست کردوە بۆ مێژوو، هەتا شایەت بێ، کە ئەی عەرەبەکان، هەر ئێوە نەبون واتان کردوە، بەڵکو کوردی براشتان لە ئێوە خراپتری کردوە، یەکێك لە روداوەکانی عەرەبستان کە ئیمامی تەبەری دەیگێڕێتەوە بەم جۆرەیە، جا بزانە چەند جیاوازە لەگەڵ ئەوەی لای خۆشمان:

ساڵی چوارەمی کۆچی خەڵکی (بیئرلمەعونە)، بەرائی کوڕی عامر کە گەورەی بەنی عامر بوو ناردیان بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ مدینە و دیاریشیان

بۆ هێنا بوو، پێغەمبەر فەرموی وەری ناگرم، من دیاری موشریك وەرناگرم، ئەگەر دەتەوێ وەری بگرم موسوڵمان ببە، پاشان باسی ئیسلامی بۆ کرد، ئەویش وتی ئەم قسانە جوانن، ئەگەر پیاوانێکت بناردایە بۆ لای خەڵکی (نەجد) بانگیان کردینایە، رەنگە وەڵاممان بدانایەتەوە، پێغەمبەر فەرموی ئاخر دەترسم توشی شتێك بن، ئەبوبەرا وتی خۆم پەنایان دەدەم و لای خۆم دەبن، پێغەمبەریش مونزیری کوڕی عەمر لەگەڵ چل کەسی هەڵبژاردەی نارد و گەیشتنە نزیك بیئرلمەعونە لەسەر ئاوێك هەڵیان داو (حەرام کوڕی ملحان) یان بە نامەی پێغەمبەرەوە نارد بۆ لای (عامر کوڕی توفەیل) کە هات سەیری نامەکەی نەکرد و صحابەکەی کوشت، خێڵەکانی تری کۆکردەوە و هاتن چوار دەوری سەحابەکانیان داو لەسەر کانیەکە هەموویان شەهید کردن، جگە یەکێکیان یان دوان کە بریندار بوون پێیان نەزانیبوو، دوو کەس لەوێوە رۆیشتن قەل و داڵێکی زۆریان بە ئاسمانەوە بینی وتیان ئەمە شتێکە کە نزیك بونەوە سەحابەکانیان بینی لە خوێنی خۆیاندا گەوزابوون، بە بریندارەکانیشیان زانی یەکێکیان کوشتن، ئەویان ناسراو بوو بەریان دا پاشان هەواڵەکە گەیشتە مەدینە.)[408]

ئەم روداوە دەتوانی لە سەد سەرچاوەوە بیهێنی و دەیان جۆر گێڕدراوەتەوە، هەر ئەوەندەیە لە هەندێکیاندا دێرێك یان دوو دێڕی زیاد بێ یان کەم بێت، بەڵام ئەو روداوەی کە لەم روداوە دەچێت بۆ شاری بانە هەڵبەسراوە و هیچ سەرچاوەیەك پاڵپشتی ناکات، جگە لەوەی واقیدی و حەوێزی، ئەو سەرکردانە هیچ سەرچاوەیەك نایسەلمێنێ کە ئەو سەحابانە هاتبنە کوردستان، جگە لەوە، ئەنەسی کوڕی مالك کە رۆژبەیانی دەڵێ: (ئەنەس پیاوی شیر و تیر نەبوە) [409] وانییە، بەڵکو یەکێك بوە لەوانەی کە چوە

---

[408]. تأريخ الطبري، المعروف بتأريخ الامم والملوك: للامام ابي جعفر محمد بن جرير الطبري، ج٢ص٢١٩، مؤسسة الاعلمي للمطبوعات، بيروت.

[409]. ولاتگیری رەشەخاکی عێراق: ل٢٩.

به دوای سۆراغی ئەم شەهیدانەدا گەڕاوە، جگە لەوەی لە جەنگی ئوحد دا چوار مانگ پێش ئەم روداوە بەشدار بوو، ئیتر بۆ پیاوی ئیرو تیر نەبوو!

**بانەیی ئەسحابەکوژ لە چییەوە هاتوە؟**

واعیزی لە لاپەڕە (٢٠٥) دا، رۆژبەیانی لە لاپەڕە (٤٠) دا بەکورتەیەك ئاوای دەگێڕنەوە: (شاری باینج) واتە (بانە) لەگەڵ سوپای ئیسلام رێك کەوتن، پاشان کوردان داوایان کرد بیست کەس لە یاران (ئەسحاب) بنێرن لەوێ بمێننەوە فێری ئاینی ئیسلامیان بکەن، کە گەیشتن خەڵکی بانە هەر بیست یارەکەیان کوشت، کە هەواڵ گەیشتە خالید غەمگین بوو، بەپەلە بەشێکی سوپاکەی لەگەڵ ئەنەسی کوڕی مالك لە نزیك ئورمیە بەجێهێشت و بەشەکەی تری بەرەو بانە نارد بە فەرماندەی (قەعقاع و عەبدوڵلا و مقداد و زرار) فەرمانی دا هەر هەموو خەڵکەکە بکوژن و ماڵەکانیان تالان بکەن، پاشان گەڕانەوە بۆ عەرەبستان بەسەر سماقوڵی دا رۆیشتن، خەڵکی سماقوڵی کە بیستیان سوپای عەرەب بەرەو سماقوڵی دێت، خۆیان لەناو باخ وباخات و دۆڵ و جەنگەڵەکاندا حەشاردا، هانی ژنانیان دا کە روت و قوت لەسەر رێیان بوەستن، چونکە بیستبویان کە موسوڵمانەکان خاوێن و دڵ و داوێن پاکن و لایان گوناهە و ناڕوایە کە ژنان بە روتی ببینن، کە سوپای ئیسلام گەیشتن و ئەوەیان بینی، چاوی خۆیان داپۆشی. خەڵکی سماقوڵی ئەوەیان بە هەل زانی، هێرشیان بردە سەریان و (١٥٠) موسوڵمانیان کوشت؟ سوپای ئیسلام ناچار بوون سەرپۆشیان لادا و کەوتنە بەرەنگاری (٣٠٠) کەس لە کوردەکان کوژرا و تۆڵەی سەردارەکانی خۆیان کردەوە، لەو جەنگەدا ئەمانە کوژران (زرار، قەعقاع، مقداد، واثیلە) زۆری تر. خالید لەم کارەساتە شڵەژا و کەوتە پاڕانەوە لە خوا کە هەرگیز کوردان پیرۆز نەکات و بە مەبەستیان نەگەیەنێت، ئەنجا لەوێوە نامەی نووسی بۆ سەرانی ئیسلام کە هەرگیز لە فروفێڵی کورد و عەجەم بێ ئاگا نەبن و نەخەڵەتێن.

ئەنجا خالید و عەبدوڵلا کوڕی عومەری کوڕی خەتاب بەم خەم و خەفەتەوە روویان کردە نەینەوا، لە نێوان و هەولێر و موسڵ دا تووشی روبارێك هاتن و

دەیانویست بپەڕنەوە، لەم کاتەدا پیرەژنێك لە کەناری روبارەکە دا مابوو، داوای لە عەبدوڵڵا کرد بیکاتە کۆڵ و بیپەڕێنێتەوە، عەبدوڵڵا سواری پشتی خۆی کرد کە گەیشتە ناوەڕاستی روبارەکە پیرەژنەکە تۆزێکی ژەهراوی کرد بە لوتی عەبدوڵڵا دا، کە گەیشتنە ئەوبەری ئاوەکە، عەبدوڵڵا رەنگی زەرد بوو مرد، خالید بە کارەساتەکەی زانی پیرەژنەکەی دایە بەر شمشێر و لەت و پەتی کرد. ئەنجا یاران کۆبوونەوە عەبدوڵڵایان نوێژ کرد و ناشتیان، پاشان چونەوە بەرەو شام پاش ئەوە خالید لە شاری حومس مرد، ئەمە ساڵی ۲۱ی کۆچی بوو، ئەو ساڵە کە ئیمامی عومەریش کۆچی دوایی کرد.)[410]

ئەمە ئەوەی مامۆستایان رۆژبەیانی و واعز بوو.

لەوەی حوێزی دا هەندێ جیاوازی هەیە:

(کە گەیشتنە دێی ئیسماعیل قوڵی کە ئێستا پێی دەڵێن سماقوڵیان.) باسی شەڕەکە دەکات، بەڵام باسی ئافرەتە روتەکان ناکات، پاشان دەڵێ: (خالید و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر زۆر دوعایان لە ئەهلی سماقوڵیان کرد، فەرمویان یا رەبی خۆم، هەقی ئەم شەهیدانە بکەیتەوە لەم خەڵکە. پاشان خالید نامەی بۆ سەرانی ئیسلام نوسی فەرمووی هەرگیز لە مەکر و حیلەی کوردان ئەمین نەبن وەکو دڕندە وان بۆ شەڕ) (پیرەژن وتی من موسوڵمانم ئەمەوێ لەم ئاوە بپەڕمەوە. پیرەژنی سەگ، چەقۆیەکی زلی لە باخەڵی دەرهێنا لەسەر دڵی عەبدوڵڵا رای کێشا و. عەبدوڵڵا مرد. خالید لە نزیك ئاوەکەوە تەسلیمی کرد، ئێستاش مەرقەدی عەبدوڵڵا مەشهورە بە سولتان عەبدوڵڵای عەرەبی.[411]

لەم برگەیەدا دەتوانین ئەم خاڵانە لێك بدەینەوە:

ا – رۆژبەیانی دەڵێ: لە کتێبە جوگرافی و مێژوویییە کۆنەکاندا ناوی (بانە)مان دەست نەکەوت، بێ گومان دامەزراندنی ئەم گوندە – ئەم

---

[410]. فتوح سواد العراق: ص. وڵاتگیری رەشەخاك، ل٤١.

[411]. کوردستان و ئاینی ئیسلام: ل١٣٠–١٣١.

شارۆچکەیە – نەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی حکومەتی ئەردەلان و موکریان.[412] واتە زۆر کۆن نییە.

ب – وەکو پێشتر باسمان کرد ئەنەسی کوڕی مالك نەگەیوۆتە کوردستان و لە بەسرەوە باتر نەهاتوەو لەوێ مردوە. وە هەرگیز ئورمیەی نەبینیوە و بۆی نەچوە.

ج – دەڵێ فەرمانی دا بەو چوار سەرکردەیە کە هەموو خەڵکی بانە بکوژن وماڵەکانیان تالان بکەن. لە بەشەکانی پێشودا بۆمان دەرکەوت کە خەلیفە عومەر چەند توندوتیژ بوە بەرامبەر ستەم و زوڵم کردن و کەس نەی وێراوە خوێنی بە ناهەق بڕێژێ، ئیتر هەرکەس بوو بێت.

د– دێی سماقوڵی: ئەم ناوە تورکی‌یە هی دەورانی پاش سەلجوقی‌یە و هی دەوڵەتی تورکمانەکانە.

هـ– دەڵێ لە شەڕی سماقوڵی دا زرار و قەعقاع و مقداد و وائلەی فەرماندە دەکوژرێن، بابزانین وایە:

١– قەعقاع کوڕی عەمر تەمیمی یەکێك بوو لە پاڵەوانەکانی ئیسلام لە یرموك و دمشق و شام و باشوری عێراق بەشدار بوو، پاشان هاتە جەلەولا و چوو بۆ خانەقین و نەهاوەند، ئیتر دوای ئەو خەتە گەڕایەوە لە کوفە دانیشت، هەتا جەنگی سەفینی سەردەمی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەستی پێ کرد، دایە پاڵ ئیمامی عەلی و نەهاتوەتە کوردستان هەر لە کوفە ساڵی (٤٠) کۆچی مرد.[413] نەك ساڵی ٢٥ی کۆچی لە بانە بکوژرێ وەکو ئەو کتێبە هەڵبەسراوانە باسی دەکەن.

٢– زرار کوڕی ئەزوەری کوڕی ئەوس کوڕی خەزیمە، لە شەڕی یەرموك دا بەشدار بوو، ئەویش نەهاتوەتە کوردستان سەیری (الاصابة) بکە دەڵێ ئەزوەر لە جەنگی یەمامەدا شەهید بوو، کە لە دژی موسەیلەمەی کەزاب

---

[412]. ولاتگیری رەشەخاکی عێراق: ل٤١ پەراوێز.

[413]. الاصابة في تميز الصحابة: ابن حجر العسقلاني، ج٣ص٢٣٩.

کردیان، ئیمامی بوخاری له (تأریخ الکبیر) دا دەڵێ زرار لە سەردەمی خەلافەتی ئەبوبەکردا شەهید بووە، واتە لە جەنگی هەڵگەڕاوەکاندا. نادر کریمیان له تعلیقاتی فتوح سواد العراقی فارسیەکەدا، ل٢٤٨ دا دەڵێ (تمام این اخبار مشوش و قابل تکذیب است، زیرا ضرار بن ازور به قول بیشتر محدثین و مؤرخین به سال ١١هجری قمری در واقعه یمامه به شهادت رسیده.)، ئەمە دوەم جارە لەم کتێبانەدا زراریان دا بە کوشت، بەڵکو خۆی پێش (١٣) ساڵ پێش ئەم روداوە شەهید بووە!

٣- مقداد کوڕی ئەسوەدی کەندی هاوڕێی پێغەمبەر(ﷺ) ساڵی ٣٧ پێش کۆچی ٥٨٧ی زاینی لە دایك بوە، پێغەمبەر بە کوڕی خۆی دای نا بوو، ئەم و ئەبوبەکر و عەمار و دایکی و سوهەیب و بیلال، بە پێغەمبەرەوە حەوت کەس بون کە ئیسلام بونی خۆیان بە ئاشکرا راگەیاند.[414] لە جەنگی بەدر پاڵەوانترین کەس بوو، ئەم بوو کە بە پێغەمبەری وت ئێمە وەکو گەلی موسا ناڵێین خۆت و خوا بڕۆن شەڕ بکەن ئێمە لێرەوە سەیر دەکەین، بەڵکو دەڵێین لە پێش و پاش و بەرو پشتەوە شەڕ دەکەین و دەت پارێزین. ئەم قسەیە دەم و چاوی شیرینی پێغەمبەری روخۆشی ئەوەندەی تر گەشاندەوە، بوخاری ئەم فەرموودەیەی لە سەحیحی خۆی لە ئەبونعیم هێناوە.[415] لە جەنگی مریسع و غابەو حودەیبیەو خەیبەر و قوبری بەشداری کرد. هاوڕێی معاویە بوو.[416] (٢٨) فەرمودەی ریوایەت کردوە، لە ساڵی ٣٣ی کۆچی ٦٥٣ی زاینی لە شاری مەدینە لە سەردەمی خەلیفە عوسمان دا وەفاتی کرد لە تەمەنی٧٠ساڵیدا. کەچی لەو کتێبە درۆینە هەڵبەسراوانەدا دەڵێ هاتوەتە کوردستان لە دۆڵی هیران و سماقوڵی و کەپکی حەمەد ئاغا شەهید بوە! بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە الاصابة: عسقلاني، ج٣ص٤٥٤. صفة الصفوة: ابن جوزي، ج١ص١٦٧. حلية الاولياء: ابن نعيم الاصفهاني، ج١ص١٧٢.

---

[414]. دلائل النبوة: البيهقي، ج١ص٢٧٤.

[415]. دلائل النبوة: البيهقي، ج٢ص٢٣٤.

[416]. فتوح البلدان: بلاذري، ص٢٢٣.

٤- وائله کوڕی عەمرو یەمەنی: کەسێك بەو ناوە لە هیچ کام لە کتێبی ژیان و مێژوو نەهاتوەو نیە جگە لە (اصابة[417])دا هاتوە بە ناوی وائله کوڕی عەبدوڵلا کوڕی عەمر لەیس کە باوکی ئەبی تفەیل عامر بوو، لە تایفەی کنانە و لەوە زیاتر هیچی لەبارەوە نیە، بەلام رۆژیەیانی دەڵێ: بە گوێرەی مێژوەکان ئەم کابرایە لە سەردەمی خەلیفەی سێیەم عوسماندا ژیاوەو ساڵی ۹۸-۱۰۵ی کۆچی لە شام مردوە، بەلام لە ساڵانی ۱۸-۲۵ دا لە شەڕەکانی کوردستاندا نەبوە.[418]

و- دوعای خالید لە کورد و خەڵکی بانە شتێکی راست نیە، خالید چی ویستبێ بەهێز کردویەتی، پێ ناچێ دوعای ناهەق لە خەڵکی بێ تاوان بکات و بەو جۆرە خراپ ناویان ببات، ئەوان وەك پیرو ژن و منداڵ و حەیوانیان نەکوشتوە و، دار و باخیان نەبڕیوەو، کانیان پڕ نەکردوەتەوە، دوعای خراپیشیان لێ نەکردون، ئەو نەهاتوەتە کوردستان، کە هاتوو هێنایان، چی بوختانی تریشە بۆیان هەڵدەبەستن.

ز- ئەگەر سوپایەك لە جەنگدا بێت، ئامادەیی هەموو فێڵ و تاکتیکێکی هەیە، نەك ئافرەتی روت ببینن بە سەرپۆش و چەفتە سەری خۆیان داپۆشن و ئەوانیش بێن وەکو مریشك بگرن ئاوا بیانکوژن. ئەمە بوختانێکی هەڵبەستراوە.

ح- کوژرانی عەبدوڵلا کوڕی عومەر لەو جێیەدا درۆیەکی روتە، عەبدوڵلا مردوە، شەهید نەبوە، لە مەدینە ناشتویانە نەك لە قەرەچۆغی کوردستان، ساڵی (٦٤)ی کۆچی نەك ساڵی ۲۵ی کۆچی لە سەردەمی ئەمەویەکاندا دا نەك لە سەردەمی عومەری باوکی دا. وە خەلیفە عومەر ساڵی ۲۳یکۆچی وەفاتی کرد نەك ۲۱ی کۆچی. ئەمە کوێی راست بوو.

لە بڕگەیەکدا ئەم هەموو هەڵەیە چۆن دەکرێ. دیارە ئەمە نووسینی کەسێکی ساکار و سادەیە، یان هی کەسێکی زۆرزانە ویستویەتی بۆ ماوەی سەدەیەکیش بوە خەڵکی بەو درۆ و دەلەسانە بخەڵەتێنێ، هەم دڵی کوردان لە

---

[417]. الاصابة في تميز الصحابة: ج۳ص٦٢٧.

[418]. ولاتگیری رەشەخاکی عێراق، ل۳۰.

سوپای ئیسلام ڕەش بکات کە ئەو هەموو کوردەیان قەتڵ و عام کردبێ و ماڵ و سامانیان تاڵان کرد بن، هەم دڵی موسوڵمانان لە کورد زویر بکات کە بۆچی نەهاتوون بە دەم سوپای ئیسلامەوە.

بەڕای من ئەم سپاردەیە دەستنووسە (فتوح سواد عیراق)، نووسراو بوختاننامەی سێ کەسە، سەرسەخترین دوژمنایەتی ئیسلامو فەتحی کوردستانیان کردووە لە لایەن سوپای ئیسلامەوە کە ئەوانیش ( مێجەرسۆنی بەریتانیو حسێن حوزنی موکریانیو مەلا سەعیدی سنەیی کە دواتر دەبێتە گاورو ناوی خۆی دەنێت میرزا سەعیدو پاشتر دەبێتە دکتۆر سەعیدو زاوای قەشە شەمعون لە هەمەدانو پاشتر شیعری هورمزگان دەنووسێتو دەڵێت ئەمە شیعری سەردەمی یەکەمی ئیسلامەو پاشتر بە یارمەتی حسێن حوزنی موکریانیو مێجەر سۆن کتێبی فتوح سواد عراق دەنووسنو بە ناوی واقدیەوە دەیخەنە دیوەخانی مەلا سەمەدی مەرگەییو لەسەر پەڕە کۆنی وا دەینووسن کە گومان نامێنێت ئەمە زۆر کۆن نەبێت، کاتێك ئەو کتێبە لەلایەن سێ کەسەوە وەردەگێڕدرێتە سەر زمانی عەرەبیو فارسیو کوردیو دەیان هەزاری لێ بڵاودەکرێتەوە، هەر خۆیان نوسخە ئەسڵیە سیپارەکەیماڵی مەلا سەمەد دەفەوتێنن، ئەو سێ کەسە کاری زۆریان دژی ئیسلام هەیەو لە یەك سەردەمدا ژیاون. بڕوانە مەلای خەتێ، حەسەن مەحمود حەمە کەریم، ل ٨٦ ـ ٨٩.

# بەشی هەشتــەم

أ- کوژرانی یەزدگورد پادشا و کۆتایی ئیمپراتۆریەتی فارس

* یەزدگورد بەرەو خۆراسان هەڵدێت
* شاری ئەستەخــڕ
* شاری کرمان
* هەرێمی خۆراسان
* شاری مـــەرۆ
* نامەی یەزدگورد بۆ خاقانی تورك و چین
* کۆتـایی پـاشای کلۆڵ

ب- شەهیدکردنی خەلیفە عومەر

* گێژەڵوکەی شەڕ و هەڕەشــە
* مـژدەی شـەهیدی
* پلانێکی سێ لایەنە
* چۆن لە خەلیفە عومەر درا
* سیاسەتێکی سەیر بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە

## یەزدگورد بەرەو خۆراســـان هەڵدێت

سەیرترین ژیانی پادشایەك ژیانی یەزگوردی پاشای ئێران بوو، منداڵێکی (٢١) ساڵە بوو کردیانە پادشا، بە مەرجێ سەدان پاشاو ئەمیر و پیاو ماقوڵ و سەرکردەی سوپای وەك رۆستەم و فەیرۆزان و هورمزانیان هەبوو، بەڵام ئەو سەرکردانە بە قسەی فارسەکان خوێنی خوایەتی لە رەگەکانیاندا نەئەسوڕایەوە، زۆر گەڕان، وەکو لە شوێنێکی تردا بە درێژی باسم کردوە[419].

زۆر گەڕان بۆ کوڕە پاشایەك، هەتا ژنە شایەك وتی من کوڕێکم هەیە لە خاڵوانی شاردومەتەوە، بەڵام منداڵە. وتیان بیهێنە قەیدی نیە، بە مەرجێ ئەو خوێنە لە رەگەکانیدا بسوڕێتەوە، هێنایان. کردیانە پادشای یەك ئیمپراتۆری حەوت مەملەکەتی. ئەو هەموو پیاو ماقوڵ و سەرکردە و ئەمیرانە کەڵکیان نەخوارد، (بان) بەسەر ئەم منداڵە عەقڵ منداڵەوە نیشتەوە، کە لە لەلە و رەحم و سۆزی باوك و دایکی دوور بوە، کەسێکی توڕە و کەللە شەق و خۆ فەرزکەر دەرچوە. ئەمەیان کردە پادشا، ئێستە شارە و شار رادەکات، چەند هەزار کەس و سەدان ماین و بارهەڵگری خەزێنە و زەخیرەیەکی زۆری مجوهرات و جل و بەرگ و کەلوپەلی پێیە، ماقوڵانی کۆشکی شا و پیاوە ئاینیەکان و ژنانی پادشایان و ماڵ و منداڵ و ئەمیر و خێزانەکانیانی لەگەڵە و دەیان پارێزێ و هیچ زەویەك لەخۆناگرێ. لە (مەدائن) بردنیە (حەلوان)، لە حەلوان هەڵهات بۆ (رەی) و پاشان (هەمەدان) و پاشان لە (ئەسفەهان) جێگیر بوو، هەموو راکردنێکی زۆری لەوانەی پێیەتی لەگەڵی بوو کەمی دەکرد. زۆر نیە لە ئەسفەهانەوە، لە شکستی جەنگی نەهاوەند (فتح الفتوح)دا هەڵهاتوە و، رای کردوە بۆ شاری ئاینی (ئەستەخڕ)[420] بەڵکو بیپارێزن.

---

[419] . سوپای ئیسلام دەگاتە سنووری کوردستان: حسن محمود حمەکریم. ل١٦. ١٩٩٧.

[420] . ئەستەخڕ: ئەم شارە ماڵێکی ئاگری تیا بوو سەدان ساڵ بوو نەکوژابویەوە، هەر ناوچە و شارێك ئاگری تایبەتی خۆی هەبوو، سەرەتای سەدەی سێیەمی میلادی وڵاتی فارس و میدیا لە فەوزاو شێوان و ئاژاوەدا بوو، هەر شوێنە و کەسێك دەیبرد بەڕێوە، گرنگترین ناوچە ئەمارەتی شاری ئەستەخڕ بوو،

## شاری ئەستەخر

شارە ئاینیەکان لە مێژوودا درەنگ دەگیران و خەڵکی خۆیان بۆ دەدا بە کوشت. فارسەکان زۆر زۆر بون موسوڵمانەکان (١٧) هەزار بون.

ئەبوموسای سەرکردە وتی: با هەموومان چەند جارێك بە دەنگی بەرز هاوار بکەین (الله اکبر)، هەر دووجار بوو، هەر ئەوەندەیان زانی ئەو سوپا زۆرە وردە وردە و تیپ تیپ خۆیان لە شاردا ون کردو لەو دیوی شارەوە هەڵهاتن. چی هەیە بەرامبەر الله اکبر بوەستێ.

## شاری کرمان

یەزگورد وتی: بەڕای من دوورترین شار (کرمانە). کەچی لەوێش خۆی نەگرت، بیری لە خۆراسان کردەوە.

ئیبن ئەعسەم دەڵێ: (کە لە کرمان بوو، یەکێك لە ماقوڵانی شار کە ناوی بندوە کوڕی سیاکوس بوو ناودارترین پیاوی شار بوو، هاتە لای یەزدگورد، سەلامی لێ کرد و دوو قسەی لەگەڵدا کرد، یەزدگورد وەڵامی نەدایەوە، لە خەفەتی گیرانی شاری ئەستەخر، بەڵام (بەندوە) پێی ناخۆش بوو، توڕە بوو،

---

خێزانێکی کۆن پاشایەتیان دەکرد. (ساسان) کە ژنێکی لە خێزانی پادشایان هێنا بوو، بویە پادشا، پاشان کوڕەکەی (بابك) هات، دوای خۆی (ئەردەشێری) کوڕی دانا بە پادشا، ئەمە ساڵی ٢١٢ی زاینی بوو، ئەردەشێر سنوری فراوان کرد، هەرێمی کرمانی فراوان کرد هەتا لێواری کەنداوی (عەرەب – فارس) هێنای، پاشان هێرشی کردەسەر خاکی (بابل) و (میدیا) و (همدان) ـ کوردستان ـ ی گرت، پاشان چوە سەر ئازربایجان و ئەرمینیا و میسان و حیرە، بەم جۆرە شاری (ئەستەخر) بویە پایتەختێکی ناودار و بەناوبانگ و خۆش بوو، بو بە شارێکی پیرۆز لە مێژووی ساسانی دا، بو بە ئیمپراتۆریەتێکی فراوان و بەرامبەر ئیمپراتۆریەتی رۆم (بیزنطی) وەستا، ئەستەخر دوور بوو، پایتەختیان گواستەوە بۆ شاری (مدائن)، سەرەتا وڵات چوار ویلایەت بوو، دوای سەدەی پێنجەم حاکمی ولایەتەکان نانونرا (مەرازبە) کە بە (شاە) ناو دەبران، هەمویان لە خێزانی شاهەنشاە بوون، تەنها شاهەنشاە دەیتوانی دایان نێ و لایان بات، وردە وردە ئەمیر و منداڵ و خێزانی ساسانیەکان بونە دەرەبەگ و مالیك و هەموو زەویە بەراو و ئاودارەکانیان دابەش کرد بەسەر خۆیاندا و، جوتیاران بونە وەرزێر و خزمەت کاری ئەوان.

وتی: ئەی پاشا، قسەت لەگەڵ دەکەم، وەڵامم نادەیتەوە، تۆ سەیر نیت، ئێمە سەیرین شتی وەك تۆمان کردوەتە پادشا، دەستی کێشا بە قاچی داو لەسەر کورسیەکەی رای کێشایە خوارەوە بۆ سەر زەوی. ئەمە یەزگورد و ئەوانەی دەورو بەر و خاوخێزانەکانی هێنایە گریان. یەزگورد وتی مەگرین گریان بۆ ژنە، موسیبەت تەنها توشی پیاو دەبێت، دەبێ سەبرمان هەبێ هەتا دەرومان لێ دەکرێتەوە. ئەنجا داوای کرد ماینەکەیان بۆ ئامادە کرد، هاواری کردە هاوڕێ و هاوکارەکانی و خزمانی و دەست وپێوەندی، سوار بوون و، دەرچوون بەرەو خۆراسان.[421]

(بروکلمان) دەڵێ (یەزدگورد) روی کردە کرمان، بەڵام چونکە مەرزبانەکەی لوت بەرز دەبێ، یەزدگورد خۆی تێناگەیەنێ. مەرزبانەکەش تورە دەبێ و فەرمان دەدات کە بە هەردوو قاچی رای کێشن و پێی وت: (تۆ هی ئەوەنیت کوێخایەتی دێیەکت بدەنێ، نەك پاشایەتی مەملەکەتێك. ئەگەر خوا بیزانیبایە چاکەت تیا هەیە، بەم دەردەی نەدەبردی.) یەزدگورد بە سوك سەیرکردنەکەی شاری (رەی) بیر کەوتەوە، بۆیە کەوتەڕێ بۆ (سجستان)[422] پاشای ئەوێ رێزی لێ گرت و خزمەتی کرد، کەچی لەوانیش داوای باج و خەراجی کرد، ئەویش نەیدایە و رقی هەڵسا. ناچار روی لە خۆراسان کرد.

## هەرێمی خۆراســـان

خەڵکی خۆراسان هەرچەندە بە خۆشیەوە پێشوازیان لێ کرد بەڵام یەك کەسیان وەڵامیان نەدایەوە بۆ جەنگ.[423] خۆراسان دورترین هەرێمی ئێرانە، بەرەو شاری (مەرو) رۆیشتن، خەڵکی خۆراسان هەندێ پێشوازیان لێ کرد،

---

[421]. كتاب الفتوح: ابي محمد احمد بن اعثم الكوفي،المتوفي سنة ٣١٤هـ. ج٢ص٧٤. بيروت، دارالندوة الجديدة.

[422]. سجستان: دەکەوێتە خواروی شاری هیرات لە ئەفغانستانی ئەمڕۆ. بۆ زانیاری زیاتر بروانە معجم البلدان. ج٥ص٣٧، و اثار البلاد واخبار العباد: القزويني، ص٢٠١.

[423]. تأريخ الشعوب الاسلامية: كارل بروكلمان. ص١٠٤، الطبعة السابعة، بيروت، دارالعلم للملايين ١٩٧٧.

بەڵام هەر زوو پشتیان بەردا. یەزدگورد ڕێك وپێك ئەو دەردەی بەسەر داهات کە (دارا)ی پاشای ئێران پێش نزیکەی هەزار ساڵ لە وەوبەر بە سەریدا هاتبوو. ئەویش (ئەسکەندەری مکدۆنی) شار بەشار هەر لە شامەوە ڕاوی نا هەتا لە نزیك خۆراسان بە کوشتی دا.[424]

ئێستا یەزدگورد چوار هەزار ئەسپ سواری لەگەڵدایە، بەڵام هیچیان بۆ جەنگ ناشێن. ناتوانن بەری کاروانێکی جەردە بگرن. هەموی نووسەر و چێشتکەر و نۆکەر و ژن و خێزان و منداڵ و پیرو گەورانی ساسانیەکان بوو، تەنانەت خواردنی تەواو و پێویستیان لەگەڵ نەبوو بەشیان بکات. هەرچی خەزێنە و مجوهرات و پول و پارەی هەزار ساڵەی پاشاکانی ساسانیە باری کردوە و ڕایان دەکرد، موسوڵمانەکانیش لە بەرەو پێش چون دان، لە شاری کرمان نزیك بونەتەوە.

### شاری مەرۆ

ئیبن ئەعسەم دەڵێ: یەزدگورد کرمانی بەجێ هێشت، ڕوی کردە خوراسان، بەرەو شاری (مەرۆ)ی پایتەخت کەوتەڕێ. (مەرۆ) و (شاهجان) دوو شاری گەورەی خۆراسانن و پایتەختی هاوین و زستانەن. کە خەڵکی شار ئەو هەواڵەیان بیست، هاتنە ڕێگەی، نەیان هێشت بێتە شار و پێیان وت: (تۆ شومیت. نەگبەتیت بە دواوەیە.) پاشان نامەیان بۆ پاشای (توران) کە ناوی (تەختاخ) بوو نووسی بەم جۆرە: (پاشای عەجەم هەڵهاتوە بۆ لامان بەڵام ئێمە پێویستمان پێی نیە، تۆمان لا بەڕێزترە، حەز دەکەین تۆ بێیت و بیکوژیت، بۆ تۆ باشترە لە کۆڵمان بکەیتەوە و وڵاتمان لێ بحەوێنیتەوە) تەختاخ بە سوپایەکی زۆرەوە هات بۆ (مەرۆ) " کە یەزدگورد ئەوەی بیست، بە تەنها بە شەوی تاریك هەڵهات و ماڵ و منداڵی هەڵنەساند. وتی با ئەوان بمێنن من تاوێ بۆ خۆیان بحەوێنەوە. کەسی نەبرد، خۆی گەیاندە ئاشێکی قەراغ چەمێکی خوڕ، پیاوێکی پیری لێ بوو، یەزدگورد کە گونیەیەکی پێ بوو،

---

[424]. شەڕەکانی ئەسکەندەری مکدۆنی: پلوتارك، وەرگێڕانی لە ڕوسیەوە جلال تەقی. ل١٢-٢٠، ١٩٧٣.

پێی وت: ئەمشەو دەمەوێت لات بمێنمەوە، بەڵکو بمشاریتەوە و نەهێڵی کەس پێم بزانێت، پارەت دەدەمێ، ئەو سوپایەی کە دەڵێن هاتوە، بە دوای مندا دەگەڕێن. ئاشەوان جێی کردەوە و بردیە ژوورێکی پشتەوە داینا. ماوەیەك بۆ خۆی خەوت.[425]

خزری بەگ دەڵێ: (یزدگورد چوو بۆ خۆراسان، لە مەرۆ جێگیر بوو ئاگری فارس مەجوسی و ئاگر پەرست، ئەو ئاگرەی کە لە شاری رەی لەگەڵ خۆی هێنابوی، بەردەوام شارە و شار دەی گێڕا، هێنایە مەرۆ، هەتا هەستی مەجوسیەکانی پێ بجوڵێنێ و شەڕی بۆ بکەن. لەوێوە نامەی نووسی بۆ ئەو پارچانەی کە ماون و تەسلیمی موسوڵمانەکان نەبوون، لە دەوری کۆببنەوە.)[426]

ئیبن مەسکویە دەڵێ: (عەبدوڵڵا کوڕی عامر لە بنکەی سەربازی سەرەوە دەرچوو بۆ رزگارکردنی خۆراسان، شاری نیسابور و طوس و نسای گرت و گەیشتە سرخس، پێشەنگی سوپاکەی ئەحنەف کوڕی قەیسە[427] تەبەری و ئیبن ئەسیر دەڵێن: ساڵی ۲۲ کۆچی خۆراسان فەتح کرا.[428] یەزدگورد دەگەیشتە هەر شارێك خانویەکی ئاگری دروست دەکرد، بەڵام تەواو نەئەبوو راویان دەنا ئێستە لە (مەرۆ) خەریکی دروست کردنی ئەو خانوەیە، نامەی نووسی بۆ خەڵکی فارس و قوهستان یان کوهستان پەیمان بشکێنن و بدەنە پاڵ ئەم.[429] کە بیستی سوپای ئیسلام نزیك بونەتەوە، شاری (مەرۆ)ی بەجێ هێشت و چوو بۆ (مروروز).

---

[425]. كتاب الفتوح: ابن اعثم الكوفي. ج۲ص۷۵.

[426]. محاضرات في تأريخ الامم الاسلامية: الشيخ محمد خضري بەگ. ج۱ ص۲۲٦. مصر ۱۹٦۹.

[427]. تجارب الامم: ابوعلي مسكوية الرازي. ج۱ص۲۵۳، حققه و قدم له الدكتور ابوالقاسم امامي. دار سروس للطباعة والنشر. طهران ۱۹۸۷.

[428]. تأريخ الامم والملوك: الطبري، ج۳ص۲٤٤، الكامل في التأريخ: ابن اثير. ج۳ص۱۲.

[429]. قادة فتح بلاد فارس: اللواء الركن محمود شيت خطاب، ص۲۲۱.

## نامەی یەزدگورد بۆ خاقانی تورك و چین

خزری بەگ دەڵێ: نامەی نووسی بۆ(خاقانی پاشای تورك و، پاشای مەسعەد و پاشای چین.) ئەحنەف کوڕی قەیس چوو بۆی ، یەزدگورد شاری (مروورون)ی جێ هێشت و هەڵهات بۆ (بەڵخ)، ئەحنەف تیپێکی لە سوپای بۆ ناردن لە قەراغ ئاوی (جەیحون) گەیشتن پێی، پەڕیەوە، ئەگەر سوپای کوفە زوو فریا بکەوتنایە دەیانگرت. ئەحنەف نامەی بۆ عومەر نووسی کە بپەڕێتەوە بۆی، عومەر رازی نەبوو، لەو سەرکەوتنانەدا وەسفی ئەحنەفی کرد کە بەبێ دەنگی زۆر چوەتە ناوەوە و وتی: (هو سید اهل المشرق، المسمی بغیر اسمه) عومەر نامەیەکی بۆ نووسی بەم جۆرە: (کتاب الی احنف بن قیس: اما بعد فلا تجوزن النهر، واقتصر علی ما دونه وقد عرفتهم بأي شئ دخلتم علی خراسان، فداوموا علی الذی دخلتم به خراسان، یدم لکم النصر، وایاکم ان تعبروا فتنفضوا.)[430] پاشان دوای فەتح کردنی تەواوی خۆراسان وتی: (لوددت انی لم اکن بعثت الی خراسان جنداً، ولوددت انه کان بیننا وبینها بحرا من نار.)[431] نامەی پێشوتر بۆ ئەوە بوو، ئەوەك لەزەتو خۆشی سەرکەوتن گێژیان بکات و بچنە ناوەوە بۆ پشتی وڵاتی فارس. ئەحنەف لە قەراغ روباری جەیحونەوە گەڕایەوە بۆ شاری (مەرۆ). عومەر ناهەقی نەکرد، ئەگەر سەیری نەخشە بکەیت زۆر رۆیشتون، هێڵی هاتوچۆ فراوان بوە، سوپا دابەش بوە بەسەر ناوچەیەکی دوور و فراواندا، شام وعێراق و قەوقاز و میسر بۆ سنوری چین و تورکمنستان. عومەریش دووربین بوو، دەیزانی ئەمە وا ناڕوات. یەزدگوردیش دەیویست جەنگ فراوان بکا و سنوری زیاد بکات، گەورە کردنی جەنگ ماوە بە یەزدگورد دەدا زیاتر بژی. دەیویست دەستی چەند میللەتێکی تریشی تێ بگلێنێ و لە موسوڵمانەکانی هان بدات، فارسەکان جەنگیان بۆ نەکرد، نەخوازەلا تورك و چین کە باوەڕیان بە جەنگەکە نەبوو،

---

[430]. رسائل الفاروق: عبدالطیف الجبوري. ص١٢٨، رسالة رقم ٢٣٠.

[431]. قادة فتح بلاد فارس. ص٢٢٣.

دواتر ڕووداوەکان دەری دەخات کە عومەر چەند زیرەك و ووردبین بوو، پشتی ئەم فراوان بونەی دەبینی، کە ئەگەر میللەت دانەمەزرێنێ چی بە دواوەیە! خاقان سوپای هێنا بۆ یاریدەی یەزدگورد، بەڵخیان بڕی و هاتنە ئەمبەری روبار، سوپای کوفە لە خۆراسان ناچار بوون بکشێنەوە بۆ (مروروز). خاقانی چین بە یەزدگوردی وتبوو لە نامەیەکدا. (پێویستی سەر شانی پاشایانە کە بەدەنگ هات و هاواری پاشایانەوە بچن، کاتێ کە پێ دەگیرێن. من وا لە تۆ تێ گەیشتوم کە باسی کەمی ئەوان و زۆری خۆتانم بۆ دەکەیت! ئەو کەمەی کە لە زۆریاندا ناگەنە نیوەی ئێوە!! لەوە دەچێ چاکی ئەوان و خراپی ئێوە بێت، بیستومە ئەوانە پەیمان بەجێ دەهێنن، بانگتان دەکەن بۆ یەکێك لەو سێ شتە یان چونە ناویان، یان باج و جزیە، یان شەڕ. ئەوانە دڵسۆزترین کەسن بۆ سەرکردەکانیان، ئەوانە گەلێکن هەرگیز لەناو ناچن، من دەتوانم سوپایەکت بۆ بنێرم، کە سەرێکی لە مەرۆ بێت، سەرێکی لە چین، بەڵام ڕەوشتی ئەو نەتەوەیە جۆرێکە، ئەگەر بیانەوێت کێویش لەبن دەهێنن و، ئەگەر دەستەیەکیان بێنەسەرم، منیش لە ناو دەبەن. لەبەرئەوە باشترین شت ئەوەیە لەگەڵیان ڕێك بکەویت، هەر بە ئاشتی لەگەڵیان بگونجێ. هێرش مەکە سەریان. با هێرش نەکەنە سەرت.)

لە بەڵخەوە سوپای چین و یەزدگورد بەرەو (مروروز) هاتن. ئەحنەف ناچار بوو بە سوپاکەوە لە شار دەرچێ و لەو دەشتە هەڵبدەن. بۆ بەیانی کۆی کردنەوە و پێی وتن: (ئێوە کەمن، وە دوژمنەکەتان زۆرن. ئەوە نەتان ترسێنێ. (کم من فئە قلیلة غلبت فئە کثیرة باذن الله والله مع الصابرین). چاك ئێرەش بەجێ بهێڵن و، بچن پشت بنێن بەو شاخەوە، با ئەم روبارە لە نێوان ئێوە و دوژمنەکەتاندا بێت. لەیەك رووەوە لێیان بدەن.)[432] ئەم فکرەیە لە شەوێکی گەرانی ئەحنەف بەناو سوپاکەی دا دەستی کەوت، کە گوێی لێ بوو دوو کەس لە سوپاکەی خەریکن ئالف و کاوجۆ دەدەن بە وڵاخەکان، یەکیان

---

[432]. طبري: ج٣ص٢٤٦، ابن اثير: ج٣ص١٤.

بەوی تریانی وت: (ئەگەر ئەمیر پشتی بەو کێوەوە قایم بکردینایە، ئەوسا روبار دەکەوێتە نێوان ئێمە و ئەوان، ئەوسا لە یەك روەوە شەڕمان بۆ دەکراو، لەو بڕوایە دام خوا سەرمان دەخات.) ئەحنەف گەڕایەوە و کاری بەو فکرەیە کرد. سوپای ئەحنەف (٢٠) هەزار بون، (دە) هەزاری کوفە و (دە) هەزاری بەسرە بوو، تورکەکان بە رۆژ وردە پەلاماریان دەدا و بە شەو دەگەڕانەوە، ئەحنەف خۆی و کەمینی تر دەردەچون بۆ دەوروبەری دوژمن و، وردە شەڕ و کوشتار دەبوو دەگەڕانەوە، زیانی گیانی زۆریان لە تورك دا. ئەحنەف گەڕایەوە سەربازگەکەی و، سوپاکەی، ئامادە کرد و، دابەشی کردن بۆ شەڕ، تورکەکان کە بەوەیان زانی، وایان بە چاك زانی کە بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان، جگە زەرەر هیچ قازانجێکیان نەکرد دەشیان زانی کە سەرکەوتن لەگەڵ ئەوانەدا گرانە. بە تایبەت کە بیستیان خەلیفەکەیان داوای لێ کردون نەپەڕنەوە بۆ وڵاتی ئەوبەر ئاو، واتە بۆ تورك و چین. ئەمە یەکەم شەڕە کە یەزدگورد هەردوو دەوڵەتی تورك و چین دەعوەت دەکا و، هەر لەم جەنگەشدا بەشداری دەکەن، پاشان وازی لێ دەهێنن.

## کۆتایی پاشای کلۆڵ

کە یەزدگورد بیستی خاقان گەڕاوەتەوە بۆ (بەلْخ) و نیازیەتی تەواو بکشێتەوە لە وڵاتی فارس بۆ وڵاتی خۆی. ویستی خەزێنەکانی هەڵگرێ و بگات بە (خاقان). ئەو کاتە خەزێنەکانی لەو نزیکانە بوو، بەڵام فارسەکان نەیان هێشت، وتیان دەتەوێ چی بکەیت؟ وتی: (دەمەوێ بگەم بە خاقان و بچم بۆ چین.) وتیان ئەوە رایەکی خراپە. وتیان: (دەچیت بۆ لای گەلێك لە وڵاتەکەیاندا و، واز لە خاك و گەلت دەهێنی.؟ ئەی بۆچی نامان بەیت بۆلای گەلێك لە وڵاتی خۆماندا، با لەگەڵیاندا رێك بکەوین.؟ دوژمنێك لە وڵاتی خۆماندا، چاکترە لە وڵاتێکی دوژمن، کە ئێمە بچینە وڵاتیان، ئاینیان نیە و، نازانین وەفایان چۆنە بۆمان).

نە یەزدگورد بە گوێی میللەتی کرد، نە میللەتیش چون لەگەڵیدا. میللەت وتیان خەزێنەکان بەجێ بهێڵە با لە وڵاتی خۆمان بێت، مەیبەرە

ولاتێکی تر. له ولات دەریان مەکه. یەزدگورد به گوێی نەکردن لەسەر رای خۆی سور بوو، ئەوانیش شۆڕشیان له دژی کرد، زۆریان له دەست و پێوەند و پارێزگارەکانی کوشت، زاڵ بون بەسەر خەزێنەکەدا، یەزدگورد رای کرد بۆ بەلَخ بگات به خاقان، بەلام نەگەیشت، ئەو زوتر گەڕابویەوە، ئەویش بەدوای دا چوو هەتا گەیشتە (مزغانه) پایتەختی تورکستان له پشتی روباری جەیحونەوە، موسولمانەکان وتیان دوای بکەوین، ئەحنەف وتی وازی لێ بهێنن ولێرە مەجولێن. خەلکی فارس و خۆراسان هەر هەموو رێکەوتن لەگەڵ موسولمانەکان هەموو خەزێنەکانی کسرایان تەسلیم کردن، ئەحنەف نامەی سەرکەوتنی بۆ عومەر نووسی.[433]

خەلیفە عومەر خەلکی مەدینەی کۆکردەوەو وتارێکی بۆ خوێندنەوە بەم جۆرە: (ئەوا خوا دەسەلات و مولکی مەجوسی لەناو برد، پەرت و بلاوی کردن، ئێستە له ولاتیان یەك بستیان به دەستەوە نەماوە که زەرەرمان پێ بگەیەنن، خوا ئێوەی کردۆتە وارسی خاك و مولك و مالیان، هەتا بزانن ئێوە چی پێ دەکەن.؟ خوا کاری خۆی دەکات، پەیمانی خۆی بەجێ دەهێنێ. له دین لا مەدەن، دەنا خوا ئێوەش هەلدەگەڕێنێتەوە، یان بارودۆختان لێ تێك دەدات، کەسانی ترتان بەسەردا زاڵ دەکات، من ترسی ئەوەم نیه هیچ کەس بتوانێ زەفەر به ئێوە بەرێت. بەلکو ترسی ئەوەم هەیە لای خۆتانەوە زەرەرتان پێ بگات.)[434] شیت خەتاب دەلێ: (له پەلامارێکدا ئەگەر یارمەتی کوفه زوو بگەیشتایە، یەزدگورد دەگیرا، که یەزدگورد چوە ئەوبەری روبار، یارمەتی زۆری بۆ هات، ویستیان مەرو بگرنەوە، ئەحنەف چوو بۆیان، هەموو ترسان و چونەوە ئەوبەری روباری جەیحون. دووبارە یەزدگوردیان بەجێ هێشتەوە).

عومەر نامەی نووسیەوە: (خۆزگە ئەوان وایان نەکردایە، خەلکانم نەناردایەتە سەر خۆراسان، خۆزگایە له نێوان ئێمە و ئەواندا دەریایەك له

---

433. قادة فتح بلاد فارس: ص٢٢٥.

434. طبري: ج٣ص٢٤٢، ابن اثير: ج٣ص١٣.

ئاگر هەبوایە.)[435] عومەر حەزی نەدەکرد ئەگەر یەزدگورد بیهێشتایە هەتا ئێرە بهاتایە. حەزی نەدەکرد لە عێراق تێپەڕ بێ، تەنانەت وەك بەلازەری[436] و مەسعودی[437] دەڵێن: لە جەنگی نەهاوەندا موسوڵمانەکان پرۆژەیەکی ئاشتەواییان خستە بەردەم یەزدگورد، بۆ ئەوەی جەنگی نەهاوەند روونەدات. بەڵام یەزدگـــورد وای ئەزانی ئەو داوایە لە کـــەمی موسوڵمـانان و زۆری ئەوانە بۆیە نەیکرد.

یەزدگورد زمانی گفتوگۆی نە ئەزانی. رازی نەبون. بەڵام کە شەڕ قەوما گەورەترین شکستیان بەسەردا هات، تەنانەت قەعقاع لە پشتەوە چوو بۆ هەمەدان و لە رێگە فیروزانی بینی هەڵدێت. بەری پێ گرت و داوای لێ کرد موسوڵمان ببێ. رازی نەبوو، قەعقاع ملی فیروزانی پەڕاند، کە سەرکردەی(١٥٠) هەزار سەربازی فارس بوو لە نەهاوەند.[438] بە ڕاستی جەنگی نەهاوەند چارەنووس ساز بوو، دوا رۆژی دەوڵەتی ساسانی دیاری کرد، ئەگەر یەزدگورد ژیر بوایە، بەوە وازی دەهێنا و، ئەم رۆژەی بەسەر نە دەهات، یەزدگورد هەمیشە ئاشتیەکانی موسوڵمانانی بە لاوازی دەزانی، بە عەقڵیەتی تاك رەوی خۆی بەرەنگاری دەبویەوە.

عومەر دەیزانی ئەگەر بپەڕنەوە ئەوبەری جەیحون، دەبێ هەمان شەڕوهەرا ئەمجارە لە نێوان (ئیسلام و چین) یان (ئیسلام وتورك) دەست پێ بکاتەوە، ئەوانیش بە هەمان شێوەی یەزدگورد خاوەنی هێز و سوپای زۆر و چەك و جبەخانە بوون، کە هێشتا بەکارنەهاتبون، ئەوان لە گەرمەی ژیان و گەنجی و دەوڵەت داری دا بون، سوپای چین و تورکیش بە قسەی پاشاکانیاندا دیارە ژیر بوون، موسوڵمانەکانیان ناسی بوو، حەزیان نەدەکرد خۆیانیان پێ تاقی

---

[435]. قادة فتح بلاد فارس: ص٢٤٣.

[436]. فتوح البلدان: بلاذري، ج١ص٢٩٥.

[437]. مروج الذهب: مسعودي. ج٢ ص٣٢٣.

[438]. البداية والنهاية: ابن اثير. ج٧ص١١٦.

بکەنەوە، هەرچەندە خاقان ماوەیەك وەك هاوڕێیەك و، برایەتی دوو میللەت و ماڵی دراوسێ هاتن بەدەم یەزدگوردەوە و، لە ئاوی جەیحونیش پەڕینەوە، بەڵام کە دۆخەکەیان هەڵسەنگاند، زانیان کاری یەزدگورد تەواو بوە و لەگیانەڵڵادایە، میللەتەکەی خۆیشی لەگەڵی نیە، تەنانەت ئەوەندە زۆر بوون، سوپای کوفە لەبەردەمیاندا کشانەوە بۆ شاری (مروروز)، بەڵام خاقان گەڕایەوە و، داوای لە یەزدگورد کرد چاك ترین و دواترین هەل لەبەردەمیدا ئەوەیە لەگەڵ موسوڵمانەکان ڕێك بکەوێت و لە دەستی نەدات. ئەو گەنجینە و زێڕانەی یەزدگورد لە مەرۆ و شاهجانەوە هێنابونی، سامانێکی زۆری مەزنی دانیشتوانی فارس بوو، یەزدگورد ویستی هەڵیان بگرێ و خۆی بگەیەنێتە خاقانی چین، لەوێ پێکەوە بەیەکەوە بژین، بەڵام ئەو فارسانەی کە لەگەڵی بوون وتیان: ڕازیمان نیە، ئەمە کارێکی باش نیە، باش وایە بچینە لای ئەو موسوڵمانانە و لەگەڵیان ڕێك بکەوین. ئەوانە خاوەنی ئاین و پەیمانن، بۆ وڵاتەکەمان باشترن، یەزدگورد ڕازی نەبوو، ئەوانیش چی گەنجینەی پێ بوو لێیان سەند و وتیان ڕازیمان نیە ئەم هەموو شتە بەریتە وڵاتێکی بێگانە، وازیان لە یەزدگورد هێنا، نامەیەکیان بۆ ئەحنەف سەرداری ئیسلامی ناوچەکە نووسی. ئەحنەف ڕازی بوو، ئەمان بە سەلامەت هاتنەوە و ئەحنەف پێشوازی لێ کردن. یەزدگورد لە ڕوبار پەڕیەوە و چوە (فرغانە). لە شاری (فرغانە) مایەوە و ژیانی پەناهەندەیی دەست پێ کرد لە خاکی چین دا، پاشان نوێنەری نارد بۆ لای (خاقانی چین).

ئیبن مەسکەویە دەڵێ: کە خاقان لە ڕوبار پەڕیەوە، هەموو دەوروبەر و خزمان و خێزانی پاشاکانی ئال کیسرای لەگەڵدا پەڕیەوە، نوێنەری یەزدگورد چوو بۆ لای پاشای چین، کە گەڕایەوە یەزدگورد وتی چیت کرد.

وتی: کە دیاری و نامەکەم پێش کەش کرد، ئەویش ئەم سوپایەی نارد کە دەیبینی. پاشان پێ‌ی وتم: پێویستە لەسەر پاشایان فریای پاشایانی هاوڕێیان بکەون لە کاتی تەنگانەدا، بەڵام بۆم باس بکە هەندێ لە ڕەوشتی ئەو گەلە کە هاتونە سەرتان و، دەریان کردوون لە وڵاتتاندا. من دەبینم باسی

زۆری خۆتان و کەمی ئەوان دەکەن، بەڵام ئەو کەمیەی ئەوان، دەگاتە ئاستی زۆری ئێوە و بە خێری ئەوان و زەرەری ئێوە تەواو دەبێ.

وتم: چی دەپرسی وەڵامت دەدەمەوە.

وتی: ئەگەر پەیمانێکیان داو بەستیان، وەفایان هەیە بۆی.؟

وتم: بەڵێ.

وتی: پێش ئەوەی پەلامارتان بدەن چیتان پێ دەڵێن.

وتم: بانگمان دەکەن بۆ یەکێك لەم سیانە: یان بچینە ناو ئاینیان، ئەگەر کردمان وەك ئەوانمان لێ دێ، یان جزیە دان و بمان پارێزن لە هەموو خراپەیەك. یان شەڕ.

وتی: ئایا گوێ رایەڵن بۆ سەرکردە و ئەمیریان.

وتم: گوێ رایەڵ ترین میللەتن بۆ سەرکردەکانیان.

وتی: حەرام وحەڵاڵیان چیە.؟

بۆم باس کرد هەمووی.

وتی: ئەو گەلە هەرگیز نافەوتێن. مەگەر خۆیان بگۆڕێن!

ئەنجا ئەم نامەیەی بۆ تۆ نووسی. واتە بۆ یەزدگورد.

(هیچ مەنعم ناکات لەوەی سوپایەك بنێرم بۆ یارمەتیت، ئەوەڵەکەی لە مەرۆ بێت و کۆتاییەکەی لە چین. بەڵام ئەو گەلەی نوێنەرەکەت بۆی باس کردم، ئەگەر لە کێو بنەون دەیدەن بە زەوی دا، کۆمەڵێکیان بێنە سەرم لە ناوم دەبەن، مادام لەسەر ئەو رەوشتانە بمێنن. لەگەڵیان رێك بکەوە، هێرش مەکە سەریان با هێرش نەکەنە سەرت.)[479]

یەزدگورد لەگەڵ ماڵ و منداڵی لە شاری (فرغانە) بوو (نیزك ترخان) پاشای (سجستان) رێزی زۆری لە یەزدگورد گرتبوو کاتی خۆی، نامەیەکی بۆ یەزدگورد نووسی و خوازبێنی کچەکەی لێ کرد. یەزدگورد بۆی نوسیەوە: تۆ کۆیلەیەکی لە کۆیلەکانی من، چۆن وێرات خوازبێنی کچەکەم لێ بکەیت.؟

---

479. تجارب الأمم: ابوعلي مسكوية الرازي. ج١ص٢٥٨.

پاشان یەزدگورد بە نهێنی گەڕایەوە بۆ دەوروبەری (مەرۆ)، هەوڵیدا یارمەتی ئەو لێپرسراو و ئەمیرو و سەرکردە و پاشا هەڵهاتوانە بدات کە لە دەوری کۆبونەتەوە، بەڵکو وڵاتەکەی بۆ بستێننەوە، ئەوانیش سەیریان لە بۆچوونی ئەم پاشایە دەهات، هەتا ئیمپراتۆرێکی بە دەستەوە بوو هیچی بۆ نەکرا، ئێستەکە بستێکی بە دەستەوە نەماوە بە تەمای چییە.؟ زۆر رقیان لێی هەستا. لەسەر ئەوە پێك هاتن بانگی بکەن وبیکوژن. سوکە سوپایەکیان کۆکردەوە، (نیزك ترخان) بۆ خۆی موسوڵمان دەبێ و پاشایەتیەکەی دەپارێزێ و لە یەزدگورد ئاقڵ تر دەبێ، شەوێك کلکی ئەسپەکەی یەزدگورد دەبڕن. تەواو شێت و هار دەبێ. لەگەڵ سوپای هەڵهاتوەکان و ئەوانەی خۆیدا هێرشێك دەکەن. زۆر خراپ تێك دەشکێن، لەپێشەوە هەڵگەڕاوەکانی هاوڕێی تیا دەچن. ئەوانەی دەوری خۆشی ئەوەندەی تر لاواز دەبن و دەوری چۆڵ دەکەن، یەزدگورد خۆی دەرباز دەکات. کەسی بە دەوردا نامێنێ. بەتاجە زێڕینەکەیەوە خۆی دەکات بە شاری مەروەدا بەڵام حاکمی شار (ماهویە) ڕازی نابێ کەس پێشوازی لێ بکات. ناچار تاجەکەی لا دەبات و دەیخاتە گونییەك و خۆی دەگەیەنێتە ئاشێکی ئاو لە قەراغ روبارێك. داوای خواردن لە ئاشەوانەکە دەکات و بایی (چوار) درهەمی دەداتێ، بەڵام بەشی پشیلەیەك دەکات. یەزدگورد بە ئاشەوانەکە دەڵێت: بە خوا راستیان کرد وتیان رۆژێك دێت خواردنەکەت بایی چوار درهەم دەبێ و بەشی پشیلەیەك دەخۆیت! ئاشەوانەکە بە بۆن و بەرامی دا زانی کە ئەمە کەسێکی ئاسایی نیە. بۆ شەوێ خۆی بە شەراب مڕ کرد، سەری وا گەرم ببوو بە ئاشەکەی وا دەزانی دیوەخانەکەی جاران و شاری مەدائنە. تاجەکەی لە گونیەکەدا دەرهێنا و نایە سەر سەری و دەستی کرد بە وڕێنە کردن. ئاشەوانەکە بەخەبەر هات، چوو لە پەنجەرەکەوەسەیری ژوری پشتەوەی کرد، دەبینێ کە شەوقی چراکە لە هەموو لایەکی تاجەکەوە بریق و باقی دێ. ئەو مجەوهراتە ئاشەوانەکەی هار کرد. ئارامی لێ برا. دەچێتە ژورێك و تەور و هەسانەکە دێنێ و چاك تیژی دەکات. تەورێك دەماڵێ بە گازەرەی پشتی ملی داو تاجەکە دەکەوێتە

خوارەوە. دەیشارێتەوە، لە تەمەنی (٣٨) ساڵیدا یەزدگورد دەکوژرێ. کە دەکاتە ساڵی ٣١ کۆچی ٦٧٢ زاین. لاشەکەی فرێ دەداتە ناو روبارەکەی پاڵ ئاشەکە و ئاو دەیبات! یەزدگورد دوو کوڕی لە دوا بەجێ دەمێنێ بە ناوی (بارام) و (فەیرۆز)، وە سێ کچی لە دوا بەجێ دەمێنێ بە ناوی (ئەدروج) و (شابانو) و (مەرداوەند)ەوە. هەر هەموویان لە چین دەمێننەوەو مێژوویان ون دەبێت.[440]

ئیبن ئەعسەم دەڵێ: (خەڵکی خۆراسان ناردیان بە شوێن تەختاخ پاشای تورکدا کە ئەو بێت یەزدگورد بکوژێ. تەختاخ بە سوپاکەیەوە هات. یەزدگورد کە خۆی شاردبویەوە لە ئاشێکی ئاودا، ئاشەوانەکە کوشتی، لاشەکەی فرێ دابویە ناو روبارەکە، سوپای تورک زۆر گەڕان نەیان دۆزیەوە، لە ئاشەوانەکەیان پرسی وتی نازانم، سەربازێك لە ئاوەکەدا لاشەیەکی بینی خەبەری دا دەبینن خۆیەتی. ئاشەکە گەڕان تاج و گونیە و هەندێ کەل وپەلیان دۆزیەوە، دوای لێکۆڵینەوە دەرکەوت ئاشەوانەکە کوشتویەتی، ئاشەوانەکەیان کوشت. پاشای تورکان بۆ یەزدگورد گریان، پاشای نیوەی جیهان پەنای بۆ ئاشەوانێك برد بێت، ئەوەشیان پێ رەوا نەبینی، شارێك کە جێی لە دایك بونی (ئاریە). شاری (مەرۆ). کەچی جێی پاشای ئاریان نەکردەوە. پاشای تورك داوای کرد، کفنی شاهانەیان بۆ هێنا، لە رێ و رەسمێکی بە شکۆدا، لە گۆڕستانی پاشایانی (مەرۆ) ناشتیان، هەواڵ گەیشتە خەلیفە عومەر _ رەزای خوای لەسەر بێت_ سوپاسی خوای کرد، نامەی نارد بۆ ئەبوموسا ئەشعەری و ئەحنەف، کە هەر لەو ناوەدا بوون. نامەی عومەر گەیشت تیا هاتبوو: بۆ ئەبوموسای ئەشعەری. نامەتان گەیشت، دەتەوێ دەرچن، بمێنەرەوە لە مەرۆ، جارێ خۆت دامەزرێنە، بۆ هەر وڵاتێك لەوانەی کە گرتوتە، پیاوێکی بڕوادار کە موسوڵمانان پێی رازی بن

---

[440]. مجلة (العربي) الكويتي. العدد ٢٦٤.

دابنێ و خۆت بگەڕێرەوە بۆ (بەسرە). واز لەو دیو خۆراسان[441] بهێنە، پێویستمان پێ ی نیە، خۆزگە لە نێوان ئێمە و خەڵکی بوخارا دا شاخێك هەبوایە لە ئاگر.)

عەلی کوڕی ئەبو تالیب وتی: بۆچی؟

عومەر فەرموی: (چونکە ئەو زەویانە دورن، ئێمە هیچ پێویستیمان پێیان نیە.)[442]

بروکلمان دەڵێ: (والیەکانی خۆراسان ئەمیری تورکیان لە یەزدگورد هان دا، بەم جۆرە دوا هیوای سەربازی لە دەست چوو، چوو بۆ مەرۆ ئەوانیش دەرگای شاریان لە روی دا داخست، ناچار پەنای بردەبەر ئاشەوانێك، پاشای خۆراسان[443] ئەوەشی پێ رەوا نەبینی، کابرایەکی بۆ نارد لە ئاشەکەدا کوشتی بەو کوشتنە ساڵی٦٥١ زاین سولالەی ساسانی لە رەگ هات.[444]

---

[441]. خۆراسان: یەکێکە لە هەرێمەکانی ئمپراتۆریەتی ساسانی (فارسی)، دەکەوێتە باکوری رۆژهەڵاتی وڵات.. لە مەڵبەندی ئمپراتۆر زۆر دوور بوو، چەند رێباز و کۆمەڵی ئاینی تیا هەبوو، کە لەسەر ئاینی رەسمی وڵات نەبوون، خۆراسان ناوچەیەکی بازرگانی پێش کەوتوو بوو، کاروانی بازرگانی لێوە دەچوو بۆ (مەرۆ) و هیرات و نیسابور و لەوانەوە بۆ هەموو جیهان. پیشەسازی چنین و رستن و چەك و ئەسڵەحەی تیا بوو، لەبەر پێش کەوتویی و دەوڵەمەندی، هێزی زۆر و سەربازگەی یەزدگورد لێرە بوو، زۆر لە سەرکردەو ماقوڵان و میرو پاشا و ئاینیەکان لە ترسی سوپای ئیسلام لێرە کۆبوبونەوە. ایران في عصور الاسلامیة الاولی:سیولر،ص٢٠٧. ادارة خراسان: صالح العلي، مجلة کلیة الآداب،ص٣١٥، ١٩٧٢

[442]. کتاب الفتوح: ابن اعثم الکوفي. ج٢ص٧٥.

[443]. کوردەکانی خۆراسان: ئێستا لە خۆراسان زیاد لە یەك ملیۆن کورد هەیە زمانی ئاخاوتنیان لە دەست نەداوە، بە کوردی کرمانجی زۆرو گفتوگۆ دەکەن، مەزهەبیان شیعەیە، لەم شارۆشارۆچکانە دەژین: بنجورد، نەیسابور، سەبزەوار، قوچان، شیروان، دەرگەز، جاجرەم. لە خۆراسان (١٦٠٠) گوندی کوردنشین هەیە، گەورەترین مەڵبەندی کۆبونەوەی کوردەکان مەشهەدە لە خۆراسان، (٥) هەزار خێزانی کوردی دەوارنشینن و بە کۆچەری دەژین. لە ناو ئەم کوردانەدا خەڵکی بە توانای وەك ئەبوموسلیمی خۆراسانی کورد هەڵکەوتوە، دەوڵەتی ئەمەوی روخاند و دەوڵەتی عەباسی دامەزراند کە پێنج سەدە و نیو دەسەڵاتی هەبوو. جگە لە ئەبومسلیم سەردار خودلوێردی خانی کورد کە لە سەرەتای بیستەکاندا دەنگ و هەرایەکی شۆڕشگێڕانەی دژ بە دەوڵەتی ناوەندی تاران بەرپا کرد و بە یارمەتی

هەندێ پاش وپێش و تێکەڵی لە روداوەکاندا دەبینی، بەڵام دەمەوێت هەموو لایەنی رووداوەکە لە هەموو دەقە مێژوییەکاندا کۆبکەمەوە تا ڕای هەموویان ئامادەبێتو زۆرتر سوودی هەبێت.

بەم جۆرە کۆتایی بە ئمپراتۆریەتی فارسی ساسانی هات. ئەمە دەبێ چ نهێنییەك بێت کە سوپایەکی ژمارە کەمی چەك ونان و بەرگ، زاڵ دەبن بەسەر ئمپراتۆریەتێکی یەك ملیۆن سەربازی خاوەن چەك و جبەخانە و ئیدارەو پارەو پوڵو تاکتیکی جەنگی دا، ناویان لەسەر مێژوو دەسڕنەوە. بەبێ گومان تەنها بڕوایە و هیچی تر، وەك وەسفی موسوڵمانانیان کرد بۆ هەرقل، وتی: ئەگەر وابن، ئەم جێ قاچانی منە دەگرن. کە وەسفی رەوشتی سەربازانی ئیسلامیان کرد بۆ خاقانی چینی. وتی: ئەو گەلە هەرگیز نافەوتێن، مەگەر خۆیان بگۆڕێن. ئەگەر لە کێو بنەون، دەیدەن بە زەوی دا. عومەر کە دەیناردن، جگە لەوەی کە دەیویست ئیسلام بگەیەنن زیاتر دەیویست نەگۆڕێن و لەسەر بیروڕای خۆیان بەردەوام بن، سەرکەوتن بەوەوەیە، ئێستە ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی لە ئمپراتۆریەتی فارس دووقات فراوانتر بووە، نهێنیەکەی هەر ناواخنی ئەم نامانەی عومەرە کە بۆ والیەکانی دەنارد: (اما بعد، فأني امرك ومن معك من الاجناد بتقوى الله على كل حال، فإن تقوى الله افضل العدة على العدو، واقوى المكيدة في الحرب، وامرك ومن معك ان تكونوا اشد احتراساً من المعاصي منكم من عدوكم، فإن ذنوب الجيش

---

بەلشەفیەکانی روسیا توانیان تەنگ بە دەوڵەت هەڵچنن، بەڵام ساڵی ١٩٢٠ کاربەدەستانی روسیا لەبەر بەرژەوەندی خۆیان لە یارمەتی شۆڕشەکە پەشیمان بونەوەو راپەڕینەکە شکستی خواردو لە کۆتایی دا خوداوێردی (ناسراو بە خدۆخان) و ئەلاوێردی برای لە(کودەسەنگی) مەشهەد لە سێدارە دران بە دەستی باوکی رەزا شای دیکتاتۆری تاران. ماڵ و منداڵەکەشی سەرگەردانی ئەورووپا بوون. کوردستانی نوێ: ژمارە ١٦١٩ لە ١٩٩٨/٥/٢٥. ئەم کوردانە چۆن کەوتنە ئەم وڵاتانە، یان ئەم وڵاتانەش لە سەردەمێکدا سەر بە خاکی کوردان و حکومەتی کوردی بوە، وەك سەردەمی دەوڵەتی میدیا.

[444]. تأريخ الشعوب الاسلامية: كارل بروكلمان. ص١٠٤.

اخوف عليهم من عدوهم، ولولا ذلك لم تكن لنا بهم قوة،لأن عدونا ليس كعدوهم، ولا عدتنا كعدتهم، فإن استوينا في المعصية، كان لهم الفضل علينا في القوة. وان ننصر عليهم بفضلنا، لم نغلبهم بقوتنا. فأعلموا ان عليكم حفظة من الله، يعلمون ما تفعلون، فاستحيوا منهم، ولا تعلوا بمعاصي الله وانتم في سبيل الله، ولا تقولوا ان عدونا شرّ منا، فلن يسلط علينا، فرب قوم سلط عليهم شرّ منهم، كما سلط على بني اسرائيل لما عملوا بمساخط الله كفار المجوس (فجاسوا خلال الديار وكان وعداً مفعولاً) واسألوا الله العون على انفسكم كما تسألوه النصر على عدوكم، اسأل الله ذلك لنا ولكم.)[445] کۆمەڵێ وتەی جوان. خاقانی چین و هەرقلی رۆم و سەرکردەکانی فارس و رۆستەم بەم شێوە موسڵمانەکانیان ناسیبوو بۆیە گومانیان نەبوو لەسەرکەوتن و شکستی خۆیان.

هەمیشە کەمی چاك بەسەر زۆر و بۆردا سەردەکەوێت، خەلیفە عومەر _ رەزای خوای لەسەر بێت _ کەمێکی هەبوو لە هەموو شتێ، بەڵام فارس و رۆم زۆرێکیان هەبوو پڕ بە چەك و سوپا و پارە و توانا و سیاسەت و ئیدارە و هەموو شتێکی تر، کەمی عومەر پاك و تەواو و چاك بوون، بەڵام ئەو زۆرانە لە هەموو شتێك نوقسان بوون.

## شەهیدکردنی خەلیفە عومەر

ئەحنەف وەسیەتەکەی خەلیفە عومەری جێبەجێ کرد، لێپرسراوی بڕواداری دانا بۆ ئەو ناوچانەی خۆراسان کە رزگاری کردوە. کەسێك بوون کە موسوڵمانان پێی رازی بوون. ئەبوموسای ئەشعەری ئەمیری بەسرە کە بە (دە) هەزار سەربازی بەسرەوە لە خۆراسان بوو گەڕایەوە بەسرە. سوپای کوفەش کە (دە) هەزار کەس بوون گەڕانەوە بۆ لای (عەماری کوڕی یاسر)ی ئەمیری کوفە. ئەبوموسا هەتا شەهیدبونی خەلیفە عومەر لە بەسرە مایەوە،

---

[445]. الخلفاء الراشدون: اعمال و احداث، د. امين القضاة، ص٥٣. مكتبة المنار، اردن، الطبعة الثانية ١٩٨٩.

بەڵام عەماری کوڕی یاسری لا برد و (موغەیرەی کوڕی شوعبە)ی خستە جێی. عومەر لە یاسری پرسی: پێت ناخۆش نەبوو لامان بردی.؟ عەمار وتی: سوێند بەخوا، نە دانانەکەم بە ئەمیر دڵخۆشی کردم، نە لا بردنەکەم خەفەتباری کردم!

موغەیرە سێ ساڵ لە کوفە مایەوە، وڵات گیری زۆری کرد، پاشان لابراو کەسێکی تر خرایە جێی، مغیرە گەڕایەوە مەدینە، غوڵامێکی سنعەتکار و دەست ڕەنگینی مەجوسی لەگەڵ بوو، ناوی (فەیروز) بوو، لەقەبەکەی ئەبولوئلوئە بوو، کۆن بازرگانێکی شارەزا بوو، ئێستە ئاسنگەرێکی دەست ڕەنگین[446]. عومەر بڕیاری دابوو، کە نابێ (سەبایا و ئەهلی زیمە) کە لەسەر ئاینی ئیسلام نین بێنە مەدینە پایتەختی ئیسلام و تیا نیشتەجێ بین. بەڵام موغەیرە کە لە فەتح گەڕایەوە ئەبولوئلوئە لەگەڵ بوو. مغیرە چوە لای خەلیفەی موسوڵمانان عومەر و تەکلیف و ئلحاحی زۆری کرد کە ئەبولوئلوئە لە مەدینە بمێنێتەوە و ئیشی بۆ بکات، چونکە زۆر شارەزا و دەست ڕەنگینە و هەموو سنعەتێکی ئاسنگەری و دارتاشی دەزانێ و سودی زۆر بە موسوڵمانان دەگەیەنێ[447]. عومەر موغەیرەی خۆش دەویست چونکە پێشینەیەکی چاکی هەبو لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبوبەکردا. سەرەتا ڕازی نەبوو، ئەوەندەی وتەوە عومەر ڕازی بوو، وردە وردە ئەم ڕەچەیە شکا، بە تەکلیفی ئەم و داوای ئەو، چەند کەسانێك کە موسوڵمان نەبوون، لای ئەم و ئەو جێگیر بون و، کاریان بۆ دەکردن[448]. ڕۆژان تێپەڕی ئەبولوئلوئە خەریکی سنعەتکاری بوو بۆموغەیرەو مانگانە شتێکی دەدا بە خاوەنەکەی. ڕۆژێك

---

[446]. طبقات ابن سعد: ج٧ص١٠.

[447]. تأريخ الخلفاء: السيوطي. ص١٣٢.

[448]. دکتور ئەمین القضاة: لە کتێبی الخلفاء الراشدون. ص٥٦ دا لەوەدا بە هەڵە چووە دەڵێ: ئەو کاتەی کە مغیرە لە کوفە والی بوو، ئەبولۆلۆ لەوێ بوو کاری بۆ دەکرد و مانگانە (١٠٠) درهەمی خستبوە سەری، ئەویش لای عومەر شکاتی کرد. ڕاستیەکەی ئەوەیە کە (مغیرە) لە مدینە بوو لە والیەتی عەزل کرا بوو، ئەبولۆلۆی هێنا بوو بۆ مدینە کاری پێ دەکرد.

ئەبولوئلوئە هاتە لای خەلیفە عومەر و شکاتی کرد لە (موغەیرە) کە پارەی زۆری لە سەر داناوە و، مانگانە (سەد) درهەمی لیٚ دەسەنیٚ. وتی: من ناتوانم و بۆم هەڵ ناسوڕیٚ. بەڵکو پیٚی بڵیٚی لەسەرم سوك بکات. عومەر (موغەیرە)ی بانگ کرد و پیٚی وت لە خوا بترسە. بارێکی مەخەرە سەر کە لە توانایدا نەبێت، با بیٚ بڕواش بێت! چونکە لای من شکاتی لیٚ کردویت. موغەیرە وتی باشە وادەکەم.[449]

## گێژەڵوکەی شەڕ و هەڕەشە

ئەبولوئلوئەی فەیروزی، دووسیٚ جاری تر شکاتەکەی چەند جارە کردەوە، عومەر وتی پێم وتوە. تۆش لە خوا بترسە و گویٚ رایەڵی مەولات بکە. ئەبولوئلوئە بێدەنگ بوو هیچی نەوت. خەریك بوو بڕوات. عومەر بانگی کردەوە و لیٚی پرسی: چ کارێکی زۆر گرنگ دەزانی.؟

ئەبولوئلوئە وتی: ئاشی هەوا.

عومەر وتی: بۆچی ئاشێکی هەوا دروست ناکەیت، زۆر پێویستە بۆ ئەم ناوچەیە.

ئەبولوئلوئە کە رقی عومەر و موسوڵمانان و شکستی دەوڵەتی فارسی لە دڵدا بوو وتی: باشە ئەیکەم. ئاشێکی وات بۆ دروست دەکەم، کە لە رۆژهەڵات و رۆژئاوادا دەنگ بداتەوە!

عومەر رۆیشت. بەڵام بە هاوڕێکانی وت، ئەو کابرایە هەڕەشەی لیٚ کردم و. دەم و چاوی شەڕی لیٚ دەباری.[450]

هیچ خەلیفەیەك هێندەی عومەر شکستی بە کوفری جیهانی نەهێناو ئەوەندەی خەلیفە عومەر وڵاتی ئیسلامی فراوان نە کرد و، میللەتانی موسوڵمان نەکرد، عێراق وشام و ئێران هەتا ئەفغانستان و چین و هەندی رزگار

---

[449]. کتاب الفتوح: ابن اعثم الکوفي. ج٢ ص٨٣.

[450]. الکامل في التأریخ: عزالدین ابي الحسن علي بن ابي الکرم الشیباني المعروف بأبن اثیر. ج٢ص٢٠٩، حققه علي شیري. بیروت ١٩٨٩.

کرد، میسر و ئەرمینیا و ئازربایجان و کوردستان و تورکیای ئەمڕۆی پاك کردەوە، دەسەڵاتی گەیشتە ئەودیو رووبار و تەرابلوس و بەرقە. عەبدوڵڵا کوڕی مەسعود دەڵێ: (رەحمەت لە عومەر، ئیسلام بونی فەتح بوو، کۆچی سەرکەوتن بوو، خەلافەتی رەحمەت بوو.)

پێغەمبەر (ﷺ) دەستی بۆ عومەر راکێشا و فەرموی: (هذا غلق الفتنة. ثم قال: لایزال بینکم وبین الفتنة باب، شد الغلق، ماعاش هذا بین أظهرکم.) واتە (بەردەوام لە نێوان ئێوە و فیتنەدا دەرگایەکی داخراو هەیە، توند داخراوە، هەتا ئەوە لە ناوتاندا بێت.) واتە هەر کە مرد ئەو دەرگای فیتنەیە لە ئومەتی ئیسلام دەکرێتەوە. دوای (بیست) ساڵ ئەو دەرگایە شکا. ئەوانەی دەیان ناسی ئاوا وەسفیان دەکرد: ناوەوەی چاکترە لە دەرەوەی.[451] ئەبوبەکر دەیوت: (ئەوەی رقی لە عومەر بێت، ئەوە رقی لە خێر و چاکەیە.). عەبدوڵڵا کوڕی مەسعود دەیگوت: (ئەگەر بزانم عمر سەگی خۆش دەوێ، منیش خۆشم دەوێ.)[452] پێغەمبەر دەفەرموێ:

(ان الشیطان لیخاف منك یا عمر.) یان دەیفەرموو (ان الله غیور یحب الغیور. وان عمر غیور.) یان دەیفەرموو (لو کان بعدی نبیاً، لکان عمر بن الخطاب.).

## مژدەی شەهیدی

پێغەمبەر پێشتر مژدەی دابوو بە عومەر کە شەهید دەبێ. ئەو رۆژەی کە پێغەمبەر و ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان لەسەر کێوی ئوحد بوون. کێوەکە هاتە لەرزەو شۆکێن، پێغەمبەر بە قاچی لێی داو فەرموی: (ئەی ئوحد دامەزرێ و مەجوڵێ چونکە پێغەمبەرێك و راستگۆیەك و دوو شەهیدت بە سەرەوەیە.)[453]

---

[451]. عبقریة عمر: عباس محمود العقاد. ص٢٢٦، بیروت.

[452]. صفة الصفوة: ابن جوزي، بتحقیق فاخوري. ج١ص٢٦٨.

[453]. الخلفاء الراشدون: دكتور صلاح عبدالفتاح الخالدي. ص٨٠-٨٥، دارالقلم، دمشق ١٩٩٥.

ساڵی (٢٣) كۆچی عومەر لە حەج بوو، لە (مینا) دانیشتبوو، كۆمەڵێ پوشی كۆكردەوە، جلەكانی دا بەسەریدا و، لە سەری دانیشت و، دەستی بەرزكردەوە بۆ ئاسمان و وتی: (خوایە گیان: تەمەنم زۆر بوە، هێزم لاواز بوە، رەعیەتم بڵاوەی كردوە، حەز دەكەم بمبەیتەوە بۆ لای خۆت بە چاكی، خوایە داوای شەهیدیت لێ دەكەم لە پێناوی خۆت داو، مردن لە شاری مەدینەی پێغەمبەردا.)

خوای گەورە وەڵامی دایەوە، دیاری شەهادەتی پێشكەش كرد، دوای دوو هەفتە كەمتر شەهید بوو. ئەبوموسای ئەشعەری كە لە عێراق دەبێ. خەوێك دەبینێ بە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەبوبەكری لەگەڵ دەبێت، بە عومەر دەفەرموێ: (وەرە بۆ لامان.) كە ئەبوموسا لە عێراقەوە لە خەو هەڵدەستێ. هاوار دەكات عومەر مرد!

عومەر كە لە حەج گەڕایەوە. لە دوا وتاری رۆژی هەینی دا فەرموی: (من خەوێكم بینی، وا دەزانم ئەجەلم نزیك بوەتەوە. بینیم كەڵەشێرێك دوو دەنوكی لێ دام! خەڵكیش پێم دەڵێن كە جێنیشینێ دیاری بكەم بۆ دوای خۆم. بەڵام خوا ئاینی خۆی زایە ناكات. ئەگەر لەپڕ شتێكم لێ بەسەر هات، ئەوا شورا بكەن لە نێوان ئەو شەش كەسەدا، كە پێغەمبەر وەفاتی كرد و لە هەر شەشیان رازی بوو.) ٠

## پلانێكی سێ لایەنە

عومەر رازی نەبوو، وە مۆڵەتی نەئەدا كە (سەبایا) لە ناوچە رزگاركراوەكانەوە بهێننە شاری مەدینەی پایتەختی دەوڵەتی خەلافەت، رێی دەگرت مجوسی عێراقی و فارس و گاوری شام و میسر نیشتەجێ بن لە مدینە، مەگەر موسوڵمان بن، ئەوە هەڵوێستێكی زۆر گرنگ و ژیرانەی عومەر بوو، چونكە دەیزانی ئەو تێك شكاو و روخاو و ژێردەستانە، رق و قینیان لە ئیسلام و موسوڵمانان دەبێت، لە دڵیاندا هەیە تۆڵە لە موسوڵمانان بكەنەوە و فێڵ لە ئیسلام بكەن. بەڵام هەندێ لە یارانی پێغەمبەر، عەبید و رەقیق و سەبایای گاور و جولەكە و مەجوسیان هەبوو، داوای زۆریان لە عومەر دەكرد،

مۆڵەت بە عبید و رەقیقەکانیان بدات لە مدینە بمێننەوە و کار و فرمانیان پێ بکەن، عومەریش ناچار دەبوو دڵیان نەشکێنێ و مۆڵەت بە هەندێکیان بدات، هەرچەندە پێشی ناخۆش بوو، هەتا ئەوە روی دا کە روی دا! هەندێك لەو کەسە هێنراوانە بۆ مەدینە، دەمیان دەگەیشتە یەك و داخ و خەفەتی خۆیان بۆ یەکتری دەرشت و رێدەکەوتن کە فێڵ و فیتنە و بوختان بۆ موسوڵمانان بنێنەوە، بە یارمەتی دووڕوەکان و جولەکەکانی مدینە، یان تەڵەیەك بۆ عومەر بنێنەوەو بیکوژن. چونکە عومەر وڵات و ئمپراتۆریەتی هەزار ساڵەی مەجوسی روخاند و رەورەوەی مێژووی وەستاندن و هێزیانی لە رەگ دەرهێنا. شەهیدکردنی عومەر هەرچەندە دوعای خۆی بوو، لە خوای داواکرد! بەڵام خیانەتێکی نەگریس‌و غادرانە بوو، کە سێ لایەنی جولەکە و گاور و مەجوسی تیایدا بەشداربوون، بەڵام دەوری دوو روەکان دیار نیە، رەنگە لەبەر بێ سقەیی وگرنگی کارەکە پێ یان نەوتبێ! خراپەکاران چوار کەس بووون:

١- هورمزان: فارسێکی مەجوسی بوو، پاشای کۆنی ئەهواز بوو، یەکێك بوو لە سەرکردە ئازاکانی فارس، کە لە زۆربەی جەنگە گەورەکاندا بەشدار دەبوو، لە قادسیە وجلولادا یەکێك بوو لەسەرکردەکان. لەجەنگی (تستر و ئەهوان) دا شکاو دەستگیرکرا و بە داوای خۆی بە خاوخێزانەوە هێنرایە مەدینە و، موسوڵمان بوو لە مەدینە دانیشت.

٢- کەعبی ئەحبار: یەکێك بووو لە زاناکانی جولەکە، خەڵکی یەمەن بوو، زانا بوو لە تەورات دا، لە سەردەمی عومەردا موسڵمان بوو، لە یەمەنەوە باری کرد و هاتە مەدینە و تیا مایەوە.

٣- ئەبولوئلوئی فەیروزی: بەندەیەکی (موغەیرەی کوری شوعبە) بوو لە جەنگی نەهاوەنددا دەستی کەوت، فارسێکی مەجوسی بوو، ئەم پیاوە ئاسنگەر و دەست رەنگینێکی شارەزا بوو، وردەکاری و شارەزایی لە ئامێری ئاسنیندا دەکرد، مغیرە داوای لە عومەر کرد کە ئەبولوئلوئە مەدینە بمێنێتەوە

و كاری بۆبكا و سود به موسڵمانان بگەیەنێت، عومەر لەبەر موغەیرە مۆڵەتیدا، سودی كاسبی لیٚ دەبینی.

٤- جوفینە: بەندەیەكی گاوری ڕۆم بوو، لە سەبایای ڕۆم بوو ڕزگار كراو كەوتە دەست یەكێك لە موسڵمانەكان.

ئەم چوار كەسە بە نهێنی كۆبونەوە بۆ لە ناوبردنی حەزرەتی عومەر _ خوای لیٚ ڕازی بێت _.

جارێك كەعبی ئەحبار هەواڵی دا كە ئەجەلی عومەر نزیك بوەتەوە و، بەم زوانە دەمریٚ، وتبوی كە لە تەورات دا شتی وا هەیە، (ئوم كەلسوم) كچی ئیمامی عەلی كە ژنی حەزرەتی عومەر بوو، دەستی كرد بە گریان، كە عومەر هاتەوە پرسیاری لە ئوم كەلسوم كرد كە بۆچی دەگریت.؟ وتی: كەعبی ئەحباری جولەكە وتویەتی عومەر لە بەردەم یەكێك لە دەرگاكانی جەهەنم دا وەستاوە، عومەر وتی چۆن، خۆ من بە تەمام لە خوا، كە خوا بە دڵخۆشی دروستی كردبم، عومەر ناردی بە شوێن كەعبدا. هات. یەكسەر وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران پەلەم لیٚ مەكە. بەوەی گیانی منی بە دەستە، ئەم مانگی زیلحەجەیە تەواو نابێت، تۆ دەچیتە بەهەشت.عومەر وتی: ئەوە چیەیە، جاریٚ دەمخەیتە ئاگری جەهەنم و، جاریٚ دەمخەیتە بەهەشت، كەعبی ئەحبار وتی: سوێند بە خوا ئێمە تۆمان دیوە لە تەورات دا كە لەسەر دەرگایەكی جەهەنم وەستاویت و نامێڵی خەڵك بچنە جەهەنم، بەڵام كە مردی، ئەو دەرگایە دەشكیٚ و هەموو دەكەونە ناوی. ئەنجا وتی: ئەی ئەمیری بڕوادلران، چی وەسێتێكت هەیە بیكە و، چی پەیمان هەیە بەجیٚی بهێنە، تۆ دوای سیٚ ڕۆژی تر دەمریت، عومەر بە سەرسوڕمانەوە وتی: چۆن دەزانی.؟ كەعب وتی: لە تەورات دا بینیومە. عومەر وتی: ئەڵڵا ئەڵڵا ئایا ناوی عومەر لە تەورات دا هەیە.؟ كەعب وتی: نەخێر. بەڵام كار و كردەوەتم لە تەوراتدا بینیوە، بینیومە تیایدا كە تەمەنت لێرە دا تەواو دەبێت و، ئەجەلت هاتوە. بۆ ڕۆژی دواتر كەعب هاتەوە و وتی: ئەی ئەمیری بڕواداران، ڕۆژێكت ڕۆیشتوە و دوو ڕۆژت ماوە، ڕۆژی دواتر وتبوی دوو ڕۆژت ڕۆیشتوە و یەك ڕۆژت ماوە، بۆ نوێژی

بەیانی چوار شەممە، درایەبەر خەنجەر، لە کاتی نوێژدا و لە میحرابی پێغەمبەرداو مرد.[454]

مێژوونوسان دەڵێن: ئەم زانینە وردەی (کەعب) نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە ئاگای لە تەنینی ئەوداوە هەبوە بۆ کوشتنی عومەر، واتە ئەویش دەستی بوە و بەشدارە، تەنانەت سەعاتی سفرو جێبەجێ کردنیشی زانیوە. دەیەوێ وای لە عومەر و موسوڵمانان بشێوێنێ کە لە تەورات هەیە. جارێکی تر پێش موئامەرەکە ئەبولوئلوئە هات بۆ لای عومەر و شکاتی لە (موغەیرە)ی گەورەی کرد بوو کە رۆژانە چوار درهەمی لێ دەوێت بەرامبەر بەو شتانەی کە دروستی دەکات لە دەساڕ و ئارد هاڕ و ئامێری تر، داوای لە عومەر کردبوو کە پێی بڵێ لە سەری قورس نەکات، عومەر وتی: چی دروست دەکەیت، ئەبولوئلوئە وتی: ئاسنگەری و دارتاشی و نەخش کاری. عومەر وتی: بە موغەیرە دەڵێم داوای پارەی زۆرت لێ نەکات، تۆش لە خوا بترسە و لەگەڵیان باش بە. عومەر بە تەما بوو بە موغەیرە بڵێ ئاگای لێی بێت، بەڵام ئەبولوئلوئە بە تووڕەییەوە رۆیشت و وتی: دادپەروەری عومەر هەموو کەسی گرتۆتەوە جگە من. لەگەڵ مندا دادپەروەر نەبوو!

ئەبولوئلوئە زۆر حاقد و دڵ بە کینە بوو، بە تایبەت بۆ عومەر، چونکە لە سەردەمی ئەمدا ئیمپراتۆریەتی هەزار ساڵەی فارس روخا، لێی دەگێڕنەوە کە ئەبولوئلوئە کاتێك کە  بە منداڵی بەندکراو و گیراو و بەندە و کویلە و سەبایا فارسەکانی مەجوسی ناو مەدینە دەگەیشت، دەستی دەهێنا بە سەریاندا و دەگریا و دەیگوت: عومەر جەرگی خواردم!

دوای ئەو وتووێژەی لەگەڵ عومەردا، بڕیاری کوشتنی دەدات. لەوانەیە لەوە و پێش جولەکەکان زۆر هانیان دابێ. ئەبولوئلوئە خەنجەرێکی دوو سەرەی دروست کرد، زۆر تیژ بوو، رۆژێك چوو بۆ لای هورمزان و،

---

[454]. الكامل في التأريخ: ج٢ص٢١٥-٢٢٨، تأريخ الامم الاسلامية، خضري بەگ. ج٢ص٢٠-٢٤. عبقرية عمر: العقاد، ص٢٢٧. عمر نظرة عصرية جديدة: بقلم د.محمد الطيب النجار، ص١٧١، ١٩٧٨.

خەنجەرەکەی نیشان دابوو، لێی پرسی بوو: ئەم خەنجەرە چۆن دەبینی.؟ هورمزان وتبوی: بەمە لە هەر کەس بدەیت لە گیانی دەخەیت!

رۆژێك عومەر بە مەدینە دا دەگەڕا، ئەبولوئلوئەی بینی و پێی وت:(بیستومە وتوتە ئەگەر بمەوێ ئاشێکی باراش دروست دەکەم، بە ئاو ئیش بکات.) ئەبولوئلوئە بە قینەوە وتبووی: ئاشێکت بۆ دروست دەکەم عالەم باسی بکات!

عومەر بە هاوڕێکانی وت: ئەو بەندە، هەڕەشەی کوشتنی لێ کردم.

رۆژێك ئەو سیانە، هورمزان و ئەبولوئلوئە و جفینە[455] لە جێیەك دانیشتبون، مشاوەرەیان دەکرد، ئەو خەنجەرە بە دەستی ئەبولوئلوئە بوو، عەبدوڕڕەحمان کوڕی ئەبوبکری سدیق، بەویا تێپەڕی، کە بینیان، ترسان و پەشۆکان و هەڵسانەوە و خەنجەرەکە لە دەستیان کەوتە خوارەوە، ئەو خەنجەرە دوو سەری هەبوو لە ناوەڕاستدا دەگیرا، هەر ئەو خەنجەرە بوو کە درا لە عومەر. وا دیارە پێشتر بیستبویان کە عومەر باسی کرد بون و، قسەی ئەحبار و خەوەکانیان گێرابویەوە. بەیانی رۆژی چوار شەممە ٢٦ی زیلحەجە٢٣ کۆچی لێی درا.[456]

## چۆن لە خەلیفـــە عومەر درا!

عەمری کوڕی مەیمونی ئەودی) دەڵێ: نوێژی بەیانی بوو، لە ترسی هەیبەتی عومەر نەمدەوێرا لە ریزی یەکەمی پشتی عومەرەوە نوێژ بکەم، دەچومە ریزی دووەم، رێك لە پشتی عومەرەوە و، تەنها (ئیبن عباس) لە پێشمەوە بوو، نوێژی بەیانی دەستی پێ کرد، عومەر پێش نوێژ لای دەکردەوە و خەڵکی رێك دەکرد و، لارەکانی ئاگادار دەکردەوە، کە رێك بوەستن لە رکاتی یەکەم دا سورەتی (یوسف) یان (نەحلی)ی دەخوێند، هەتا کۆ دەبونەوە. ئەو رۆژە (عەبدوڵڵا کوڕی عەباس) و (عەبدوڕڕەحمان کوڕی

---

[455]. جفینە: خەڵکی ئەنبار بوو، گاور بوو، مەیلی بۆ فارسەکان هەبوو. لە جەنگێکی شام دا گیرا.

[456]. عبقرية عمر: عباس محمود العقاد. ص٢٢٨.

عەوف) لە پشتیەوە بوون، ئەبولوئلوئە لە ناوەڕاستی ریزەکانەوە هات سێ خەنجەری بەهێزوتوندی لێ دا، یەکێکیان لە شانی و دوانیش لە ناوك و سکی، ئەوانەی سکی جێی خراپیان گرتبوو، عومەر وتی (ئەو سەگە کوشتمی) یان وتی (ئەو سەگە خواردمی).

لە توند لێدانەکە، عومەر کەوتە سەر زەوی، بە لێشاو خوێنی لێ دەهات، ئەو کاتە لە سورەتەکەدا گەیشتبوە (وکان امر اللە قدراً مقدوراً). دوای لێدانی عومەر، ئەبو لوئلوئە ویستبوی دەربچێ، بە راست و چەپدا بە خەنجەر (سیانزە) کەسی تری پێکا، کە پاشان (حەوتیان) شەهید بوون. کە عەبدوڕڕەحمان ئەوەی بینی، زیرەکانە بورنوسێکی بۆ هەڵدا و ئەبولۆلۆ کەوتە ناوی و گیرا و ناچار بە خەنجەرەکە خۆی کوشت و، یەکسەر مرد. عومەر دەستی برد بۆ عبدالرحمن پێش کەوێ و نوێژەکە تەواو بکات، ئەویش پێش کەوت و ئەوانەی پشتەوە نوێژەکەیان بڕی، بەڵام دوورەکان نەیان زانیبوو چی روی داوە،، زوو زوو دەیان وت (سبحانە اللە)، (سبحانە اللە) واتە هەڵە کراوە. عەبدوڕڕەحمان پێش کەوت، نوێژێکی زۆر کورتی بۆ کردن. عومەر بورایەوە و خەریك بوو خۆر دەکەوت، وایان زانی مردوە، یەکێك وتی نوێژت کردوە. عومەر هاتەوە هۆش و وتی: (نعم الصلاة واللە، ولاحق ولاحظ لمن ترکها.) ئەنجا روی تێ کردن و فەرموی: نوێژتان کرد؟ وتی: بەڵێ. وتی: (لا إسلامَ لمن ترك الصلاة.) ئاویان بۆ هێنا لە میحرابەکەدا دەست نوێژی گرت، نوێژی کرد، هەر خوێنی لێ دەچۆڕا، بە (ئیبن عباس) ی وت: بچۆ بزانە کێ بوو منی کوشت.؟ وتی: (دوژمنی خوا ئەبو لوئلوئی مەجوسی لێ ی دایت و خۆی کوشت) وتی: خوا بیکوژێ، خۆ من چاکەم لەگەڵدا کرد. سوپاس بۆ ئەو خوایەی مردنی منی نەخستە دەستی یەکێکی موسوڵمان و سوپاس بۆ خوا بکوژم ناتوانێ لە قیامەتدا بە سوجدەیەکی بەربەرەکانیم بکات کە بۆ خوای بردبێ! ئەنجا بە ئیبن عەباسی وت: تۆ و باوکت زۆر هەوڵتان دا ئەو فارس و رۆمە سەبایانە بێنە ناو مەدینەوە! وتی: ئەگەر بفەرمویت هەر هەموویان دەکوژین.

وتی: جا ئێستە دەیان کوژن، دوای ئەوەی کە بە زمانی خۆتان قسە دەکەن، نوێژی ئێوە دەکەن و، حەجی ئێوە دەکەن. ئەنجا بردیانەوە بۆ ماڵەوە. عەبدوڵڵا کوڕی عومەر وتی: باوکم دەترسا ئەوە موسوڵمانێك بێت و لە داخی تاوانێکی باوکم وای کردبێت، هەموو موسوڵمانەکان دەگریان و دەیان وت: خۆزگە خوا لە تەمەنی ئێمەی بخستایەتە سەر تەمەنی عومەر. وایان دەزانی تا ئێستە مصیبەتی وایان بەسەر نەهاتوە، دکتۆرێکیان بانگ کرد. دەنکە خورمای نەرم کراوی لەگەڵ شیردا دەدایە، لە ریخۆڵەکانیەوە دەهاتە دەرەوە، دکتۆر زانی خەنجەرەکان کاری خۆیان کردوە، وتی: ئەی ئەمیری موسوڵمانان چیت بڕیار داوە بیکە، چونکە دەمریت، عومەر وتی: دکتۆر راستی لە گەڵمدا کرد، کە ئەوەیان بیست دەست کرایە گریان. عومەر وتی: هەر کەس دەگری بچێتە دەرەوە.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر کە هەواڵەکەی بیست، شڵەژا، وەك شێر دەرپەڕیە دەرەوە، کە قسەکەی عەبدوڕڕەحمان کوڕی ئەبوبەکری بیست، ئەو سێ تاوانبارەم پێکەوە بینی بوو، بەو خەنجەرەوە، زانی پلانێکی مەجوسی مەسیحی جولەکەیە و ئەوسیانە جێبەجێیان کردوە، ئەبولوئلوئە خۆی کوشت، بڕیاری دا ئەو دوانەی تر بکوژێ. شمشێرەکەی هەڵگرت و رای کرد بۆ ماڵی (هورمزان)و کوشتی، چو بۆ ماڵی (جفینە) و ئەویشی کوشت، چو بۆ ماڵی ئەبولؤلؤ، کچێکی بچوکی لە ماڵ بوو ئەویشی کوشت. ویستی بکەوێتە هەموو فارسەکان و رۆمەکانی ناو مدینە. بەڵام موسوڵمانەکان لێی کۆبونەوە، شمشێرەکەی خوێنی لێ دەتکا. عومەری کوڕی عاص هات، ئەوەندەی قسەی بۆ کرد، بە نەرمی دواندی هەتا شمشێرەکەی لێ سەند، پاشان عەبدوڵڵایان گرت لە هەقی ئەوەی دوو پیاو و کچێکی کوشتوە، تەنانەت ئەگەر دەرکەوێ دەستیان تیا هەیە، نابێ کاری وا بکات، چونکە ئەوە مافی خەلیفەیە و، ئەو مافی خەلیفەی زەوت کردوە. هەندێ سەحابە وتیان: دەبێ بکوژرێتەوە، هەندێ تر وتیان: دەبێ عەفو بکرێ، هەندێ وتیان: بۆ هورمزان و جفینە نەفرەتی خوایان لێ بێ قەینا کات، بەڵام بۆ ئەو کچە منداڵە دەبێ تۆڵەی لێ

بسەنرێتەوە، هەندێ تر وتیان: دوێنێ باوکی کوژراوە، دەتانەوێ ئەمڕۆ ئەمیش بکوژن. رێکەوتن لەسەر ئەوەی بهێڵرێتەوە لە بەندیخانەدا هەتا خەلیفەی نوێ هەڵدەبژێرن. کە خەلیفە عوسمان هەڵبژێرا، (عەمری کوڕی عاس) وتی: کە عەبدوڵڵا ئەو سیانەی کوشت تۆ خەلیفە نەبویت و، لە سەردەمی تۆدا نەبوەو تۆ ئەێی بەرپرسیار نیت. چاك وایە عەفوی بکەیت. (عوسمان) بڕیاری دا بەری بدات. بڕیاری دا لە ماڵی تایبەتی خۆی پارەی کوژرانی ئەو سیانە بدات.

عومەر عەبدوڵڵای کوڕی بانگ کرد، وتی: قەرزەکانم بژمێرن بزانن چەندە.؟ کۆیان کردەوە دەبینن (٨٦) هەزار درهەمە، پاشان وتی ئەگەر مردم ئەو قەرزانە لە ماڵی (ئال عومەر) بدەرەوە، ئەگەر تەواوی نەکرد، لە ماڵی (ئال عدی) ئەگەر هەر تەواوی نەکرد لە ماڵی (قورەیش). (عەبدوڕڕەحمان کوڕی عەوف) وتی: ئەی بۆچی لە بەیتولمال نەیداتەوە، عومەر وتی: پەنا بە خوا ئەگەر شتی وا بکەم. هەتا تۆ و هاورێکانت نەیکەنە بڕوبیانووی قسەوباس و دەلیل بۆ شتی تر.

بەلام (عەبدوڵڵا) وتی: من خۆم زامنم و دەیدەمەوە، کە عومەر ئەسپەردە کرا، عەبدوڵڵا لە بەردەم شورا و موهاجرین و ئەنساردا ئاشکرای کرد کە هەموو قەرزەکان دەخاتە ئەستۆی خۆی و ئەو دەیداتەوە، دوای هەفتەیەك هەموو قەرزەکانی دایەوە و عوسمانیش شایەتی دانەوەی بوو.

## سیاسەتێکی سەیر بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە

زۆر داوایان لە خەلیفە کرد جێنشینێك دیاری بکات، عومەر وتی: دەبینم هاورێکانم لەسەر شتێکی خراپ سورن، من جێ نیشین جێ دەهێڵم بۆ ئەو شەش کەسە کە پێغەمبەر مرد، ئەێیان رازی بوو.

ئەگەر یەکێك لەو دوو پیاوە بمایە: (سالم مەولای ئەبی حوزەیفە) و (ئەبوعوبەیدەی جەراح) دەمکردنە جێنشینی خۆم،ئەم بارەم دنایە سەرشانیان، ئەگەر خوای گەورەش پرسیاری لێ بکردمایە بۆ (ئەبوعبیدە) دەمگوت: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (إنه أمين هذه الامة)، لە بارەی

(سالم)یشەوە دەمگوت: لە پێغەمبەرم بیست دەفەرموو (ان سالماً شدید الحب للـه).

بۆ رۆژی دوایی کۆمەڵێك هاتن، لە ناویان دا (موغەیرەی کوڕی شوعبە)ی تیابوو، موغەیرە وتی: عەبدوڵلای کوڕت بکە بە جێنشین، عومەر فەرمووی: خوا بتکوژێ، سوێند بە خوا لەبەر خوا ئەو قسەیە ناکەیت، ئەگەر خەلافەت چاك بێ، ئەوا پێوەی بوین، ئەگەر شەڕ بێت با هەر من لە سەری محاسبە بکرێم.

عومەر کاری خەلافەتی دا بە شورا، شورا ئەو شەش کەسە بوون کە مژدەی بەهەشتیان پێ درابوو کە بریتی بوون لە: (عثمان کوڕی عەفان، عەلی کوڕی ئەبوتالیب، عەبدوڕڕەحمان کوڕی عەوف، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس، تەلحە کوڕی عەبدوڵلا، زوبێر کوڕی عەوام) بەڵام حەوتەم کەسی تێنەخست کە مژدەی بەهەشتی پێ دراوە و ناوی (سەعید کوڕی زەید)ە، چونکە خزمی خۆی بوو، بۆ ئەوەی ئەمارەت لە خزمانی خۆی دوور بخاتەوە، عومەر ئەو هەڵبژێراوانەی کۆکردەوە، چون بۆ لای پێی وتن:

(سەیری خەڵکیم کرد ناکۆکیم تیا نەبینین، ئەگەر ببێت ئەوە لە ئێوەوەیە) خێڵەکانتان حەز دەکەن یەکێ لەو سیانە (عوسمانو عەلیو عەبدوڕڕەحمان) ببێتە جێنشین، ئەگەر بوون، هیچ کەس لە عەشیرەت و خزمانتان دامەنێن بەسەر گەردنی خەڵکەوە.

پاشان وتی: ئەو شەشەتان کۆببنەوە، بۆ ئەوەی یەکێکتان هەڵبژێرن،با عەبدوڵلای کوڕی عومەریش ئامادەبێت، بەڵام هیچی بە دەست نەبێت، ئەگەر (سەعد)تان کرد، ئەوا باشە، دەنا مشاوەرە بە خەلیفە بکەن، من لەبەر لاوازی و خیانەت عەزلم نەکردوە لە سەرکردایەتی سوپای عێراق، با (سوهەیب کوڕی سفان) واتە صهیبی رۆمی. نوێژتان پێ بکات ئەو سێ رۆژە. ئەنجا بە تەلحەی ئەنساری وت: بە خۆت و (٥٠) کەس لە گەلەکەت واتە (ئەنسار) لەگەڵ ئەو شەش کەسە بن (خاوەنانی شورا)، پاشان لە ماڵێکدا سێ رۆژ کۆدەبنەوە، بۆ ئەوەی لە نێوان خۆیاندا یەك کەس هەڵبژێرن، خۆت و ئەو پەنجا کەسە لە بەر

دەرگاکەیان دا بوەستن، سێ ڕۆژ مەهێڵن کەس بچێتە ژورەوە بۆ لایان، نەهێڵن ئەو شەش ڕۆژە تێبپەڕێ یەکێکتان هەڵبژاردبێ بە ئەمیری خۆتان.

ئەنجا بە (میقدادی کوڕی ئەسوەد) ناسراو بە (فارس رسول الله)ی وت: سێ ڕۆژ بەسەر سەری ئەو شەش کەسەوە لە ئەهلی شوراوە بوەستە، چاودێریان بکە، ئەگەر پێنجیان ڕازی بون بە یەکێکیان، دانەیەکیان ڕازی نەبوو، بدە لە ملی ئەو دانەیە. ئەگەر چواریان ڕێکەوتن و بە یەکێکیان ڕازی بون، دوانیان ڕازی نەبوو، بە شمشێر بدە لە سەری ئەو دوانە. ئەگەر سیان ڕازی بوون بە یەکێکیان و، سیان بە یەکێکی تریان ڕازی بوون، لەوێدا (عەبدوڵڵا کوری عومەر) بکە بە حەکەم. با لایەکیان هەڵبژێرێ، ئەگەر بە حوکمی عەبدوڵڵا ڕازی نەبوون، لەگەڵ ئەوانەیان بە کە عبدالرحمن کوڕی عەوفیان تیایە و ئەوانی تر بکوژە. مادام ڕازی نین بەوەی کە خەڵکی پێی ڕازیە. ئەگەر سێ ڕۆژەکە تەواو بوو، بۆ ڕۆژی چوارەم کەسیان هەڵنەبژارد بوو هەر شەشیان بکوژە. ئەنجا عومەر وەسیەتی بۆ جێنشینی دوای خۆی کرد کە هێشتا هەڵنەبژێردرابوو بەم جۆرە: (وەسیەت بۆ جێنشینی دوای خۆم دەکەم کە لەگەڵ موهاجرین و یەکەمەکاندا، ئەوانەی سەرەتا موسوڵمان بوون. مافی خۆیان بداتێ و کاروباریان بپارێزێ، لەگەڵ ئەنسار دا باش بێت، ئەوان بون ماڵ و ئیمان و بڕوایان بۆ مسۆگەر کردن و بۆیان دابین کردن، چاکەکانیان وەربگیرێ و، لە خراپەکانیان ببورن، لەگەڵ خەڵکی ئەنساردا چاك بن، ئەوانەیپشت و پەنای ئیسلام بوون لە تەنگانەدا، ئەوان دارایییان بۆ ئیسلام کۆکردەوەو، چقڵی چاوی دوژمن بوون.

لەگەڵ ئەعراب کە ڕەگەزی عەرەبن باش بن، ئەوان مادەی ئیسلامن، لەگەڵ ئەهلی زیمە باش بن، ئەوانە لە پەنای خواو پێغەمبەردان، پەیمانەکانیان بپارێزن زیاد لە توانای خۆیان تەکلیفیان لێ مەکەن.)

عومەر سێ ڕۆژ مایەوە، چوار شەممە ٢٦ زیلحەجە ساڵی ٢٣ کۆچی لە نوێژی بەیانی ای ێ درا، پێنج شەممە و هەینیو شەممە مایەوە، لەو ڕۆژانەدا

سوههیبی رۆمی نوێژی به موسوڵمانان دهکرد، بۆ شهوی یهك شهممه حهزرهتی عومهر وهفاتی کرد که دهکاته یهکهمی موحهرهم ساڵی ٢٤ کۆچی.

وهسیهتی بۆ عهبدوڵڵای کوڕی کرد: (ئهگهر مردم وهرم گێڕه رووه و قیبله، چاوهکانم بنوقێنه، دهست به کفنهوه بگرن، دهست به قهبرهوه بگرن. با ژن لهگهڵ جهنازهکهمدا نهیهت، به قسهیهك باسم مهکهن که تیامدا نهبێ، خوا چاکتر دهمناسێ، که ههڵتان گرتم خێرا بم بهن.)

له کاتی گیان دان دا عوسمانیان بانگ کرد، دهبینێ سهری له باوهشی عهبدوڵڵای کوڕی دایه، عومهر وتی سهرم بخهنه سهر زهوی، که خستیان گوێیان لێ بوو وتی: (وهیل بۆ خۆم و دایکم ئهگهر پێم خۆش نهبێت خوایه گیان.) ئهنجا گیانی پیرۆزی دهرچوو _ رهزا و رهحمهتی خوای لێ بێت _ ههر ئهو شهوه عهبدوڵڵای کوڕی شۆردی به (ئاوی سیدر)، به سێ بهرگ کفنیان کرد، دوای نوێژی بهیانی به ئیمامهتی سوههیبی رۆمی نوێژیان لهسهر کرد، ئهنجا بردیان بۆ ماڵی عائشه و له پاڵ پێغهمبهر و ئهبوبهکر دا ئهسپهردهیان کرد.

عائیشه دهفهرموێ: پێش ئهوهی عومهر بهێنن، سهرپۆشم لادهبرد و جلی ههروام لهبهر دهکرد دهم وت مێردهکهم و باوکمه. بهڵام که عومهر دفن کرا خۆم دهپاراست سهرپۆشم دهکرد و جلی تهواوم لهبهر دهکرد، چونکه عومهریان لهگهڵ بوو.

تهمهنی عومهر ٦٣ ساڵ بوو، ههر وهك تهمهنی پێغهمبهر و ئهبوبهکر _ خوا له ههموویان رازی بێت _، عومهر ١٠ ساڵ و شهش مانگ و چهند رۆژێك خهلیفه بوو.

که عومهر مرد فیتنه هاته ناو میللهتی ئیسلام و، ههتا ئهمڕۆ ههر بهردهوامه. جێ نشینی عومهر بهربهستێکی بههێز بوو، عومهر دهرگایهکی داخراو بوو بهرامبهر فیتنه، له ژیانی خۆی دا تۆندوتۆڵی باروودۆخی راگرت و فیتنه ئاسهواری نهبوو، که عومهر شههید کرا ئهو بهربهسته نهما و دهرگا شکا و دوای ئهو فیتنه وهکو لافاو هات.

(حوزەیفە یەمانی) دەڵێ: ڕۆژێك عومەر وتی. کێ فەرموودەکەی پێغەمبەری لەبەرە لە بارەی فیتنەوە؟ وتم: من، وتی: تۆ ئازای ئادەی بیڵێ. من فەرموودەیەکم وت. عومەر وتی ئەوەنا، ئەو فەرمودەیەی کە باسی فیتنە دەکات کە وەك دەریا شەپۆل و مەوج دەدات. عومەر وتی: لەویا دەرگاکە دەشکێ یان دەکرێتەوە. حوزەیفە وتی: دەشکێ. عومەر وتی: مادام دەشکێ کەواتە داناخرێ هەتا ڕۆژی قیامەت!

عومەر دەیزانی ئەو دەرگایە خۆیەتی و دەشکێ، دەرگایەکی داخراوی بەهێزە بەرامبەر فیتنە، کە شکا فیتنە لافاو دەکاتە ناو کومەڵگەی ئیسلامی تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێ. عومەر دەیزانی کە مادام دەرگاکە دەشکێ، کەواتە عومەر دەکوژرێ.[457]

خەلیفە عومەر لە لەش و لاردا و، لە سروشتی دەرونی و، راوبۆچووندا زۆر لە خەلیفەی پێشوو (ئەبوبەکر) _ ڕەزای خوای ای بێت _ جیاواز بوو. عومەر باڵابەرز بوو، چوار شانە و، دەفەی ناوشانی پان و سروشتی دەرونی توند بوو، سەری چاکسازی بوو، چەپ لەر بوو، ریشی رەش و، بۆیەی دەکرد، لە هەموو ڕووداو و ئەزمونێك شتێکی وەردەگرت، جگە لەوەی کە ئیسلام و دوو مامۆستاکەی پێشووی زۆر شتیان فێر کرد بوو، نەیدەهێشت هیچ رووداوێکی بەبێ وانە و لێ فێر بوون بەسەردا تێ بپەڕێ، تێکەڵیەکی سەیری هەبوو لە وردی زەین و، تیژی سروشت و، توانای بەسەر دەسەڵاتی حوکم دا، لە هەمان کاتدا لەبەردەم میللەت و ڕووداوەکاندا هێمن و لەسەرخۆ بوو، سەیری هەموو لایەکی دەکرد ئەوسا بڕیاری دەدا، زۆر بەسرا بوو بە ئاینەوە، ئایەتەکان و رووداوەکان دەیانگریاند، داوای دەکرد کە نابێ ئەوەندەی تاڵە موویەك ببینم یان ببیستم کەس لە ئاین لابدات، هەمیشە دارێکی پێ بوو، هەر کەس لای دایە بەوە لێی دەدا، کوڕەکەی عارەقی خوارد بوو، بانگی کرد و لەبەردەم خەڵکیدا جەڵدی لێدا، کراسێکی هەبوو، لەگەڵ سەرجلێکی پینەداردا،

---

457. الخلفاء الراشدون: دکتور صلاح عبدالفتاح، ص٧٥-١٠٢.

زۆربەی جار خورما و زەیت و نانی جۆ خواردنی بوو، هەموو مەبەستی بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام و ئاشتی بوو نەك شەڕ.[458] پێغەمبەر دەیفەرموو: (ما طلعت الشمس على رجل خير من عمر.)[459]

ئازایەتیەکی سەیری هەبوو، چیرۆکی موسوڵمان بوونی مەشهورە، یەکسەر ئاشکرای کرد، کۆچ کردنی وەکو کۆچ کردنی کەسی تر نەبوو، کە موسوڵمان بوو، ئیسلام ئاشکرا بوو. عەبدوڵڵا کوڕی مەسعود دەڵێ: لەوڕۆژەوە عومەر موسڵمان بوو بەردەوام سەربەرزین، لە جێیەکی تردا دەڵێ: (عومەر یەکەم کەس بوو، بە ئاشکرا باسی ئیسلامی کرد و، رایگەیاند.) لە بازاڕی عوکازدا پاڵەوانی دەکرد، لاشەی گەورە و باڵای بەرز بوو، بەخۆوە بوو، لە کاتی رۆیشتندا خێرا بوو، سوارچاکێکی شارەزا بوو، بە تەواوی ماناوە سەربازێکی تەواو بوو، هەمیشە وای هەست دەکرد، بارێکی قورسی بەسەر شانەوەیە، ئەوەندە هەستی بە لێپرسراوێتی دەکرد، بە ئاشکرا رای خۆی دەوت، کە بوو بە خەلیفە یەکسەر خالیدی لابرد، کە سەرکردەی سوپای شام بوو، کە باس هەر باسی خالید بوو، لە گەرمەی شەڕدا نامەیەکی نارد و لای برد، وتیان بۆچی؟ فەرمووی با خەڵك نەزانێ سەرکەوتنەکان لە خالیدەوەیە. با بزانن لە خواوەیە! خالیدیش ئەوەندەی غیرەتی عومەر بە غیرەت بوو، شەهامەتی وا بوو، یەکسەر خۆی خستە ژێر سەرەپەرشتیو بڕیارەکانی ئەبوعوبەیدەوە، هەرگیز وای نیشان نەئەدا ای‌ێی کەم کراوەتەوە، فەرموی من سەربازم لە هەر جێیەکدا بێت، حیکمەتی ئەبوعبیدەش وابوو لە هەموو بچوك و گەورەیەکدا مشاوەرەی پێ دەکرد و بە گوێی دەکرد، ڕا، ڕای خالید بوو، ئەبوعبیدە جێبەجێی دەکرد! وەلای نەنا، هەتا بچوك ببێتەوەو نەبێتە مونافسی وەك ئەمڕۆ باوە!

زۆرجار قورئان پاڵپشتی لە راکانی عومەر دەکرد، لەبەرئەوە خەڵکی زۆر بە گوێیان دەکرد، خەڵکی دەوری حوشترێکی نەخۆشیان دابوو،

---

[458]. قصة الحضارة: ول ديورانت. ج١٣ص٧٥.

[459]. الترمذي: باب (١٧) ص٤٦.

**نەخۆشیەکەی دیاری بوو، بەڵام لە ناوەوەی بوو، عومەر دەستی کرد بە سکیا لە دواوەوەی و وتی: دەترسم خوا لێم بپرسێ ئەوەچی بوو لە ناو سکیدا!**

**عەبدوڵڵا کوڕی مەسعود دەیوت: (کان اسلام عمر فتحاً، وهجرته نصراً، وامارته رحمة) ئەوەندەی حەز لە شورا و راوێژ بوو، پرس و ڕای بە دۆست و دوژمن دەکرد، منداڵی دەبینی پرسی پێ دەکردن و دەیفەرموو ئەمانە بیریان تیژە، لە مەسەلەیەکی جەنگیدا پرسی کرد بە (هورمزان) پاشای ئەهواز کە تازە گیرا بوو. بە گوێشی کرد و سەرکەوتنی لە ئەسفەهان بە دەست هانی. پێیان دەوت: ئەوە چیتە ئەو گەورە سەحابانە ناکەیتە والی.؟ دەیفەرموو: حەز ناکەم ئەوانە بەو کارانە پیس بێن.[460]**

**وەرزی حەجی کردبوە کاتی پرس‌و راو لێپێچینەوەی ئەمیرە دوورەکان و، وەرزی بەخۆداچوونەوەی بوو، داوای کرد بوو لە کاتی حەجەکاندا هەموو والی و لێپرسراوان و ئەوانەی گلەییان، یان شکاتیان هەیە بگەنە مەککە و، هەواڵی ویلایەتەکان‌و والی‌و لێپرسراوەکانی لە حاجیەکان دەپرسی، ئەو چاودێرانەش بە ڕاپۆرتەکانیانەوە دەهاتن کە بڵاوی کردبونەوە بە هەموو ویلایەتەکاندا بۆ چاودێری کردنی والی و ئەمیر و فەرمانبەرەکان.**

**زۆر سوور بوو لەسەر نویشت و چارەنووسی سوپای ئیسلام، دەیپاراستن، دەترسا خوا لە هەموو نکوڵیەکی بپرسێتەوە، هەر بۆیە ئەمیش محاسبەی هەموو نکوڵیەکی دەکرد و لە هیچ کەس نەئەترسا. لە غەمی میللەت و، ترسی محاسبەی خوادا دەیگوت: سوێند بەخوا لەو ڕۆژەوە ئەم بارەم دراوە بە شاندا. ناتوانم نوێژ بکەم و سوجدە بەرم، دەست بە سورەتێك قورئان دەکەم، نازانم لە سەرەتادام یان لە کۆتایی دا لە لە غەمو خەفەتی خەڵکدام.[461]**

---

[460]. طبقات ابن سعد: ج٣ص٢٨٣.

[461]. تأريخ عمر: ابن جوزي. ص٥٢.

که شەڕێك دەبوو، دنیای لێ دەهاتەوە یەك، هەتا دەکەوت بە بارێکدا، کەسێکی زۆر پاك بوو، پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: (قد کان یکون في الأمم قبلکم محدثون، فإن یکون في أمتي منهم احد، فإن عمر بن الخطاب منهم) محدثون واتە ملهمون.[462] واتە خاوەن ئیلهامو دڵی خەبەری دەدا.

که عومەر رایەکی دەبوو، لەسەر ئەو رایەی ئەو، ئایەت دەهاتە خوارەوە، هەمیشە راوبۆچوونەکانی راست دەردەچوو، موافقی قورئان بووە. لە بۆچونی هەموو یەکێکی تر لە قورئانەوە نزیکتر بوو، فیراسەیەکی سەیری هەبوو، کە هەمیشە خۆی پشتی پێ دەبەست و دەیپێکا. دەیگوت: (من لم ینفعه ظنه، لم تنفعه عینه.)، نمونەی زۆرە، لەو بارەیەوە ناوی دەرکردبوو، خەڵکی باسیان دەکرد، شتی زۆریان لێ بینی بوو. یەکێك لە بۆچونەکانی و، دووربینی و بیرتیژیەکانی ئەوە بوو کە خاکی (سەواد) رەشە خاکی عێراقی دابەش نەکردبوو، خەراجیشی لەسەر دانا بوو بە هونەرێکی سەیر. وە خاکی میسریشی دابەش نەکردبوو، هەتا خەراجەکەی بۆ عامەی خەڵك بێ نەك بۆ ئەفرادی تاك. ئەوە لە بەرژەوەندی جوتیاران بوو. نامەی نووسی بۆ عەمری کوڕی عاسی والی میسر و فەرموی: (لا تقسمها وذرهم یکون خراجاً و فیئاً للمسلمین و قوة لهم علی جهاد عدوهم.) بەو کارە وای کرد بوو کە خەراجی زەوی وزار و (جزیە) و ئەوانی تر کە لەو شێوەیەن، بوو بویە مەواریدی نەگۆڕ و بەردەوام بۆ دەوڵەت، ئەمیش خەرجی دەکرد لە خزمەتی ئاین و بەرژەوەندی گشتی دا، لەوە معاشی والیەکان و قازیەکان و ئەهلی فتواو زانایان و سوپا و چاکردنی ڕێگا و مزگەوت کردنەوەو خۆ ئامادەکردن بۆ جیهاد و پردو ڕێکخستنی روبارەکان.

بەوە پارەی بڕی بویەوە بۆ سوپا. سەرباز کە لە دوور وڵاتەوە جیهادی دەکرد، ئەگەر ژیانی خاوخێزانی بە باشی مسۆگەر نەکرایە، غەمی ماڵ و منداڵ نەیدەهێشت جیهاد بکات. ئەوەی بۆ دەبڕینەوە، زۆر چاك پێی دەژیان و لێیان دەمایەوە.

---

462. صحیح مسلم: ج٧ص١٠٥. فتح الباري بشرح البخاري: ج٧ص٤٠.

نەخشەیەکی بۆ داهاتوو هەبوو ئەگەر بمایە دەنگێکی گەورەی دەدایەوە، بەڵام مەرگ رێگەی نەدا. دەیفەرموو (ئەگەر مام. زیادەی پارەی دەوڵەمەندەکانم کۆدەکردەوەو دابەشم دەکرد بەسەر هەژاران و کۆچ کەراندا.) [463] واتە هەژارەکانم دەبردە ریزی دەوڵەمەندەکان و دەستیانم دەخستە ئیش، هەتا هەموو میللەت لە کار و ئیشدا بن.

لە جێیەکدا دەفەرموێ: (ئەگەر بم زانیبایە کەسێکی تر لە من باشترە بۆ ئەم کارە، داوام لێ دەکرد، بدات لە ملم پێم باشتر بوو هەتا من والی ئەوان بم)[464]

---

[463]. المحلي: ابن حزم. ج٦ص١٥٨.

[464]. تأريخ عمر: ص٤١.

# بەشی نــــۆیــــەم

* شێوازی دەوڵەتداری لە شارستانیەتی ئیسلامیدا
* بنچینەکانی دەسەڵاتی سیاسی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا
* رواڵەتە گشتیەکانی سیستەمی سیاسی ئیسلامیی
* شێوازی دەوڵەتداری لە سەردەمی خولەفادا
* دەوڵەتی عــومــەر

١- بەردەوامی لە فتوحاتی ئیسلامیدا

٢- بنیات نانی دەسەڵاتی حوکم

أ- خەلیفایەتی

ب- ولایەت

ج- بەیتولمال (مالیە)

د- جزیە و ئەهلی زیمە

٣- گەشە پێکردنی زانستو زانیاریو بڵاوکردنەوەی زانایان

* عومەر لەبەردەم گرفتەکاندا
* دروست بوون و روخانی شارستانیەکان
* هۆی روخانی ئیمپراتۆریەتی فارس و رۆم
* هۆی شکستی شارستانیەتی فارس و رۆم

## بنچینەکانی دەسەڵاتی سیاسی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا

پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) هەندێ بنچینە و بناغەی پتەوی بۆ حوکم دانا، کە نەك لە رژێمی سیاسی شارستانیەکانی پێشو (فارس و رۆم) نە ئەچوو، بەڵکو لە وانیش لە پێشتر بوو، گەورەترین ویست و مەبەستی دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامی ئەوە بوو کە خۆشبەختی و خۆش گوزەرانی زۆرینەی خەڵکانی میللەتەکەی بهێنێتە دی. لەو بنچینانە:

١. بەیعەت کردن: پێغەمبەر ئەم شێوازەی بەکار دەهێنا بۆ دوو کات:

أ- بۆ کۆمەڵگەیەك کە موسوڵمان بوونایە، بەیعەتی لێ وەردەگرتن، کە گوێ رایەڵی خواو پێغەمبەر بن، بڕوا بە تاکی خوا، پێغەمبەرایەتی محمد، قورئان، واز هێنان لە خورەوشتی نەفامی پێشوو، دەست گرتن بە رەوشتی جوان. ئەمە لە بەیعەی یەکەم دا لەو کۆمەڵەی وەرگرت کە لە دەوری کۆبونەوە، بۆ ساڵی داهاتوو کە دوبارە کۆبونەوە، هەندێك خاڵی تری بۆ زیاد کردن، بە گوێرەی فراوانبوونی سنوورو بەرەوپێش چوونی دەعوە و زیادبونی ئەندامانیان وەکو: پشت گرتنی پێغەمبەر لە شەڕ و ئاشتی دا لە دژی دوژمنانی ئاین، گوێڕایەڵی لە چاکەدا، هەق وتن.[465]

ب - بەیعەی دووەم بۆ کاری سیاسی بوو، کە حکومەتی ئیسلامی دروست بوو، واتە بەیعەت دان بۆ هەڵبژاردنی کەسێك بۆ سەرکردایەتی و بەیعەت دان بە گوێ رایەڵی کردن بۆ دەسەڵاتی ئیسلامی و پشت گرتنی.

٢. شورا: خەلیفە دوای پێغەمبەر بە شورا هەڵدەبژێردرا، شێوازێکە کە موسوڵمانان بۆ ئەنجام دان و بڕیاردانی هەموو کارێك بۆی دەگەڕێنەوەو بیروڕای تیا دەگۆڕنەوە و دوعای خێر بۆ یەکتری دەکەن. (وشاورهم في الامر)، (وامرهم شورى بينهم).

٣. ئازادی بیروڕاو ڕاگۆڕینەوە رادەربڕین، بەبێ ئەمە نرخ بۆ شورا نامێنێ. کەس ئەوەندەی پێغەمبەر رێزی رای بەرامبەری نەگرتووە، هەرچەندە

465 سيرة ابن هشام: ج٢ص٣٥. تاريخ الأمم الأسلامية: خضري بك. ج١ ص٧٩.

پێویستی بە رای کەس نەبوو چونکە (وەحی) پاڵپشتی بوو، بەڵام جیاوازی لە نێوان کاری خۆی وەك مرۆڤێكو کاری پێغەمبەرایەتی دای دەکرد، ئەوەی خوا فێری دەکرد بە ناوی خواوە رای دەگەیاند، ئازادی بیروڕاو راگۆڕینەوەشی سەرپشك کردبون و گوێی لە هەموو کەس دەگرت.[466]

٤. دادپەروەری (عەدالەت). قورئان خاڵەکانی دادپەروەری هەموو دیاری کردبوو، موسوڵمانان لە نێو خۆیان و لە دەسەڵاتی سیاسی دا جێبەجێیان دەکرد، ئایەت و فەرمووده لەو بارەیەوە زۆرە. (احب الخلق الى الله، الامام العادل).

٥. کامڵی و تەواوی رژێمی ئیسلامی دینی و دنیایی: پێغەمبەر یەکەم دەوڵەتی لە مەدینە دروست کرد، دەسەڵاتی دینی و سیاسی (دنیایی) پێکەوە گرێ داو کۆی کردنەوە، مەبەستی ئەوە بوو ئاینی ئیسلام ئاینی دنیا و، قیامەتە.

## رواڵەتە گشتییەکانی سیستەمی سیاسی ئیسلامیی

ئیسلام بەوەی کە تەواوکەری ئاینە ئاسمانیەکانی پێش خۆیەتی و، هاتووە بۆ راستکردنەوەی گەلانو میللەتانو لەڕووی بیروڕاو رەوشتەوە راست کەرەوەی هەڵەی میللەتانە. کۆمەڵێ سیما و رەوشتی تایبەتی هەیە:

١ـ نامەی ئیسلام جیهانیە، ناوەرۆکەکەی مرۆڤایەتیە، ئیسلام سنوری رەگەز و رەنگ و زمانی تێپەڕاندوەو، هیچ جیاوازیەك نابینێ لە نێوان تاکەکاندا و وەك یەك بۆ هەموان هاتوە (يا أيها الناس اني رسول الله اليكم جميعاً)[467] (و ما ارسلناك الا رحمه للعالمين)[468] بەڵام یاسا ئەورووپیەکان دوای چەرخی (١٨) بە پلەی یەکەم رەگەزو و زمان و مێژووی هاوبەش دەخوێننەوە.

---

466. مفاهيم اسلامية حول الدين والدولة: ابوالاعلى المودودي. ص٩٧، الكويت ١٩٧٧

[467]. القرآن الكريم: سورة اعراف، آية ١٥٨.

[468]. القرآن الكريم: سورة انبياء، آية ١٠٧.

٢- له ئیسلامدا دەسەڵاتی یەكەم بۆ خواو قورئان و پێغەمبەرو سوننەتەكانییەتی، هەتا ئەمر و نەهی و بڕیاری ئەوان هەبێ، كە دەسەڵاتی بەرز و پیرۆزن و له سەروی بڕیاری مرۆڤەوەن كە دەبێت له ژێر سێبەری بڕیاره بەرز و پیرۆزەكاندا كاروباری دنیایی خۆیان ڕێك بخەن.

بەڵام له دەستوره دانراوه زەمینیەكاندا كه تەنها بەرهەمی عەقڵ و زەینی مرۆڤه و، نرخ بۆ دەسەڵاتی باڵا دانانێ. بڕیاری چەسپاوو نەگۆڕیان نیه، هەر بۆیه ساڵانه له گۆڕانكاری و كەمو زیادكردنو دەستكاریكردنیدان.

٣- گونجاندن و پەیوەست كردنی بیروڕای ئیسلامی به قیەم و ڕەوشتی مرۆڤەوه، واته سستەمی سیاسی ئیسلامی پایەیەكی بەرزی بۆ ڕەوشتو دابو نەریتی مەردم داناوەو، جگه هەندێكی نەشیا و و نەگونجاو، ئەوانی تر ڕێز دەگرێ و دەیهێڵێتەوه.

٤- یەكسانی: ئیسلام به یەك چاو سەیری هەموو كەسێك دەكات له دەوڵەتی ئیسلامیدا جیاوازی له نێوان تاك و كۆدا نیه، هەر ڕەنگ و زمان و پله و پایەیەكی هەبێت، بەرز لای خوا هەرئەوەیه كه خۆی دەفەرموێت (ان اكرمكم عند الله اتقاكم)[469]، (و اذا حكمتم بين الناس ان تحكموا بالعدل)[470]

٥- دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامی كەفالەتی ئازادی تاك مسۆگەر بكات، به مەرجێ له شەرع لا نەدات و بگونجێ، دەبێ سەرو ماڵو ناموسیان پارێزراو بێتو جێو گوزەرانیان دابین بكات، به گومان كاری تاوان نەدات بەسەر كەسدا، مافی هەموو كەس بپارێزێ، تاكەكان ئازاد بن له عەقیده و بیروباوەڕیاندا[471]. (لا اكراه في الدين).[472]

---

[469]. القرآن الكريم: سورة حجرات، آية ١٣.

[470]. القرآن الكريم: سورة نساء، آية ٥٨.

[471]. الثقافة الاسلامية: د.محمد محمود ربيع، ص٤٥٥. ط١، ١٩٨٩ الكويت.

[472]. سورة (بقرة) آية ٢٥٦.

## شـێوازی دەوڵەتداری لە سەردەمی خەلیفەکانی راشدیندا

ئیسلام (چواردە) سەدە حوکمی زۆرترین خەڵکی سەر زەوی کرد. ئەم ماوە دورو درێژە بێ گومانێ کە باش و خراپی تێ دەکەوێت. ئینساف نییە کە خاڵێکی لار و خراپ لەو هەموو ساڵانەدا هەڵ گۆزی و بیخەیتەڕوو هەزار و چوار سەد ساڵی پێ ناشرین بکەیت!

ئەگەر یەکێك خراپەی چواردە سەدە کۆبکاتەوە لە مێژووی نەتەوەی ئیسلامدا و بیەوێت موسوڵمانانی پێ ناشرین‌و تاوانبار بکات، ئەوە دەتوانێت و زۆریشی بۆ کۆدەبێتەوە. تەنها ساویلکەکانی پێ دەخەڵەتێ، بەڵام مرۆڤی ژیر با بێبڕواش بێ وەکو (ویل دیورانت) و (کارل بروکلمان) و دەیانی تر بە شکۆوە چەند بەرگی هەزار لاپەڕەییان لەسەر شارستانی و دادپەروەری سەردەمەکانی ئیسلام تۆمار کردوە، هەندێ لاوازی باس دەکەن، بەڵام بە ئینسافەوە وەك ویل دیورانت مێژوونوس و لێکۆڵەرەوەی ئەمریکی لە باسە درێژە (۳۳) بەرگەکەیدا بە ناوی (قصة الحضارة)دا دەڵێ: (. لەگەڵ ئەوانەدا، ناچارین تەسلیمی ئەوە بین و بڵێین، کە خەلیفە سەرەتاییەکانی ئیسلام، لە ئەبوبەکرەوە هەتا مەئمون. یاسای چاك و رێك وپێکیان داناوە، کە بە ئاسانی بگونجێ بۆ ژیانی مرۆڤایەتی لە پارچەیەکی فراوانی ئەم جیهانەدا. ئەوانە لە بەڕێزترین و بە تواناترین دەسەڵاتدارانی هەموو مێژووی سەر زەوین. ئەوانە دەیان توانی هەموو شت بەرن بۆ خۆیان، یان هەموو شت کاول بکەن، وەك هێرشە دڕندەکانی تەتەر و مەغۆل و مەجەر و ئەوانەی باکوری ئەوروپا کردیان. بەڵام هیچ خراپ کاریەکیان نەکرد، جگە ئەوەندە کە باج‌و خەراجیان لەسەر خەڵك دانا. لە سەردەمی عومەردا کە میسر رزگار کرا، (زوبێر) وتی با هەموو زەویە بەپیتەکان دابەش بکەین بەسەر ئەو سەربازانەی رزگاریان کرد. عومەر وتی با هەر بە دەست میللەتەوە بێت و بەرهەم بدات. لە سەردەمی خولەفای راشدین دا زەوی دابەش کرا دەوڵەت تۆمارگەکانی خۆی پاراست، رێگاوبانێکی زۆر کرایەوە، جۆگە ئاودێریەکان چاك کران، پردو

بەنداوی گەورە دروست کران بۆ گلدانەوە و بەربەست کردنی ئاوو لافاوی روبارەکان بۆ کشتوکاڵ.

عێراق پێش فەتحی ئیسلامی بیابانێکی روت و قوت و ووشك بوو، دوای فەتح بوو بە باخ و باخات و شینایی فراوان، زۆر لە خاکی فەلەستین پێش فەتح لم و چەو و بەرد و چۆڵ بوو، پاشان گۆڕا بە خاکی بە پیت و بەرەکەت و دەوڵەمەند و قەرەباڵغ و پڕ لە خەڵك، حکومەتی ئیسلام سودی لە شارەزا و بەهێز و پسپۆڕەکانی وەرگرت، میللەتانیان ئەمین کردەوە و ژیانی ئارامیان بۆ رەخساندن و هانیان دان بەرهەمی دەستی خۆیان بچننەوە، باری رەخساند بۆ خاوەن داهێنانەکان و خێروخۆشیان بلاوکردەوە، بۆ ماوەی شەش سەدە میللەتانیان لە بەستەڵەك و نەهامەتی پێشو رزگار کرد، هیچ سەردەمێك ئەو میللەتانە ئەوەندە خێروخۆشی و ئاوەدانی وایان نەدیبوو، ئەمەش بە هاندان و یارمەتیدان و دەست گیرۆیی کردن بوو، زانست بلاوەی کرد و گەشایەوە، زانست و ئەدەب و فەلسەفە و کارە هونەریەکان پێش کەوتن بە جۆرێك کە ئاسیای رۆژئاوا بۆ ماوەی پێنج سەدە، پێشکەوتوترین هەرێمەکانی جیهان بوو لە رووی شارستانیەوە.[473]

ئەوانەن فەیلەسوفی شارەزا و بە ئەمەك کە لە بەرامبەر راستیەکاندا بە شانازیەوە وەستاون و چەند بەرگیان لە مێژوویان هۆنیوەتەوە.

مێژووی موسوڵمانان ئەو ژیانەیە کە رایان بواردوە، ئەو روداوانەیە کە دروستیان کردوە، بە تاك بێ یان بە کۆمەڵ، دەوڵەت بێ یان حکومەت، حاکم بێ یان مەحکوم.

ئەو چواردە سەدەیەی مێژووی ئیسلام، خێر و شەڕ و هەڵە وپێکان و تاریك و رونی تیایە. تیایەتی پیاو شەرم دەکات باسی بکات، لاپەڕەی سپی وایشی تیایە کە سەربەرز دەکاتەوە، غیرەت دەهێنێتەجۆش، روداوی وای تیایە کە مرۆڤ ناتوانێ خۆی بگرێ و نەگری و موی راست نەبێتەوە. لە هەمان

---

473. قصة الحضارة – ول ديورانت – ج١٣ص٢٧٥.

کاتدا لاوازی و سەری نەوی و ترس و بیم و گوێ پێنەدانیشی تیایە. ئا ئەم ژیانەی ئەمڕۆ گەلانی موسوڵمانانی جیهانی تێ کەوتوە و توشیان هاتوە، لاپەڕەیەکی رەش و تاریك و نزمیە و مێژوش شایەتە. موسوڵمانانیش مرۆڤن وەك هەموو مرۆڤێکی تر، چاك دەکەن و خراپ دەکەن، راست دەکەن و هەڵە دەکەن، لا دەدەن و دێنەوە سەر رێ، لاواز دەبن و بەهێز دەبن.

توندوتۆڵی خەڵك بە ئیسلامەوە مێژویانە. گەر لاواز بون، ئەوا مێژویان لاواز بوە. مێژوی ئیسلام هەموی هی موسوڵمانانە، بە چاك و خراپ و بەهێز و لاوازیانەوە.

ئەگەر یەکێك دەستی دایە قەڵەم، وەفا بۆ قەڵەم وایە کە لەسەر چاك و خراپ بنوسێ و بە تەنها هیچیانی لێ هەڵنەبژێرێ، دەبێ هەردووکیان باس بکات و هەڵبسەنگێنرێ و شی بکرێنەوە، هەموو مێژووی موسوڵمانان پیرۆز نیە و مەقبول نیە، هەروەکو چۆن هەموو کردەوەکانی مرۆڤێك پیرۆز و وەرگیراو نیە!

سەردەمی خولەفای راشدین، زێڕینترین سەردەمەکانی ئیسلامە. فتوحات، بڵاوبونەوەیەکی فراوانی بە خۆیەوە بینی، لە کەمترین ماوەدا زۆرترین خاك و، گەلانی ناوچەکەیان گێڕایەوە ژێر سایەی ئیسلام، لەبەرئەوە بە پیرۆزترین قۆناغەکانی حوکمی ئیسلامی دادەنرێت، ئەوەی ئەنجامیان دا، نمونەی ئاوێنەیەکی بەرز و پاکە بۆ نەوەکانی دوای خۆیان. پێشەنگن بۆ موسوڵمانان هەتا زەوی لە خولانەوە دابێت!

خولەفای راشدین (٣٠) ساڵ حوکمیان کرد[474]، ئەوەندەیان تیا ئەنجام دا، کە زۆرتر لە کاری موعجیزەو ئەفسانە دەچێت.

| | |
|---|---|
| ئەبوبەکر | دوو ساڵ و هەشت مانگ و سێ رۆژ حوکمەیکرد. |
| عومـــەر | دە ساڵ و شەش مانگ و نیو بوو. |
| عوسمان | دوانزە ساڵ و دە رۆژ بوو. |

474 . فتوح الاسلام: ابن حزم. ص٣٥٢.

عەلی کوڕی ئەبی تالب پێنج ساڵ بوو.

به ماوەی هەموویانەوە پێشبینی فەرمودەکەی پێغەمبەریان هێنایە دی کە فەرموی (الخلفاء بعدی ثلاثون سنة، ثم تکون ملکاً.) واتە: (خەلیفایەتی جێنیشینی دوای من سی ساڵە و پاشان دەبێتە پاشایەتی.) یان لە جێیەکی تردا فەرموی (خلافة النبوة ثلاثون سنة ثم یؤتی الله الملك او ملکة من یشاء.)[475]

ئەوە بوو رێك وا دەرچوو، بەڵکو دوای خولەفا دەسەلات کەوتە دەست (بەنی ئومەییە) و بە زۆر پچڕاندیان بۆ خۆیان و، پایتەختیان لە مەدینەوە گواستەوە بۆ (دیمەشق)، وە سستەمی شورا کە ئایەتی لەسەر بوو، گۆڕیان بۆ پشتاوپشت بەڵکو لە باوکەوە دەمایەوە بۆ کوڕ و برا. دوای سی ساڵەکە (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان) بویە پاشا. وەك خۆی هەموو جارێك دەیگوت: (أنا أخر الخلفاء واول الملوك)[476].

ئەوەی لەو سی ساڵە دا کرا مێژونوسان و لێکۆڵەرەوان دەستەوسانن لەبەردەمیدا. دوو ئیمپراتۆریەتی زلهێزی جیهانی ئەو کاتەیان بە چۆکا هێنا. دەوڵەتی ئیسلامی سوپایەکی جەربەزەی هەبوو، سوار چاکێکی شارەزا بوون، فارس و رۆم نەیدەگرتنەوە، هیچ کەس بەرگەی ناڵە و نرکە و نەعرەتە و دەنگ وهەرای نەدەگرتن. هاتوچۆی خێرا و جوڵە سەیرەکانیان، بەرامبەرەکانی هێنا بویە لەرزە و گەشکەو حەشۆکە، زۆرجار حەزیان دەکرد، لە دورەوە سەیری جوڵەو بزاوتی موسوڵمانان بکەن. سوپای ئیسلامیش زۆر تامەزروی ئەوە بوون دابەزنە مەیدانی جەنگ و، خۆیان بۆ بێبرواکان بنوێنن و، دڵسۆزیان بۆ خوا دەربخەن. کارەکانیان خێرا بوو، زەوی لە ژێر قاچیاندا دەهاتەوە یەك. ساڵی ٦٣٥ زاینی دیمەشق و ساڵی ٦٣٦ ئەنتاکیە و ساڵی ٦٣٨ شاری

---

475. رواه ابوداود في سننه، رقم الحديث (٤٦٤٦). رواه الترمذي في سننه، رقم الحديث (٢٢٢٦).

476. الخلفاء الراشدون بين الاستخلاف والاستشهاد: د.صلاح عبدالفتاح الخالدي. ص٢٩٤. دارالقلم، دمشق١٩٩٥

قودس رزگار کرا، هێشتا ساڵی٦٤٠ نەهاتبوو، کە هەموو شام ئازاد کرا، کە گەیشتە ٦٤٠ ئیمپراتۆریەتی فارس روخا و، وڵاتی میسریش ئازاد کرا، بەتریارکی قودس (سفرو نیوس) وتی کلیل نادەم هەتا خەلیفەتان نەیەت، عومەر هات، سادەیی پێوە دیار بوو، ئەوە فەخرتر بوو لە فەخامەت و گەورەیی و دەست و پێوەند، کیسەیەك خورما و دۆڵیانێك ئاوی پێ بوو، کە خالید و ئەبوعوبەیدە چوونە پێشوازی، تورە بوو کە جل و بەرگە سەیرەکان و، گوڵنك و شاخ شاخە و کورتان و زینی عەجایەبی ولاخە رازاوەکانی بینین! مشتێ قوڕ و خۆڵی بۆ هەڵدان. وتی: ئا بەم جۆرە پێشوازیم لیّ دەکەن. بەڵام کە قسەی لەگەڵ (سفرونیوس) کرد، پڕ بوو لە لوتف و موجامەلەی شیرین، جگە جزیەیەکی زۆر کەم، هیچی لەسەر ئەو هێزە شکاوە فەرز نەکرد. ئەمینی کردن کە کەنیسەکانیان پارێزراوە و ناڕوخێ و، داگیر ناکرێ، بێ ترس بەندایەتی خۆتان بکەن، مێژوونووسە گاورەکان دەڵێن: لەگەڵ بەتریارکی قودس دا بە شاردا گەڕان، دە رۆژ مایەوە، جێگەی مزگەوتێکی دۆزیەوە، پاشتر بە ناوی خۆیەوە ناونرا. خەڵکی مەدینە ترسان عومەر قودس بکاتە پایتەخت و نەگەڕێتەوە! کە عومەر هەستی کرد، دەست بەجێ خۆی پێچایەوە و گەڕایەوە پایتەختە بچکۆلەکەی ناو بیابان. عومەر نەیدە هێشت عەرەبەکان کۆچ بکەن بۆ دەرەوەی نیوەدورگە و زەوی بکڕن. لەگەڵ ئەوەشدا هەتا ساڵی ٦٤٢ زاینی نیو ملیون کەس لە نیوەدورگەوە کۆچیان کرد بۆ دەرەوە، عومەر حەزی دەکرد لە دەرەوەی نیوە دورگە کۆمەڵێك سەباز هەبێت، دەوڵەت یارمەتیان بۆ بنێرێ و پێویستیان دابین بکات، رەوشتی سەربازی خۆیان بپارێزن. بەڵام دوای مردنی پشت گوێ خرا، عومەر ٥\١ ی داهاتی لە سوپادا خەرج دەکرد.[477]

[477]. قصة الحضارة: ول ديورانت، ترجمة محمد بدران. ج١٣ص٧٦-٨٠. الادارة الثقافة في جامعة الدول العربية.

ئەبوبەکر لەسەر ڕێ و ڕەسمی پێغەمبەر دەچوو بەڕێوە و، وەسیەتەکانی ئەوی جێبەجێ دەکرد، بەڵام خەلیفە عومەر برەوی دایە دەقەکانی ئەوان و بەشێوەیەکی پێشکەوتوتر کاری کرد کە لەگەڵ واقعی سەردەمەکەیدا و فراوانی سنورەکەیدا بگونجێ، مەبەستەکانی ئەوانی دابەش کرد و بەڕێوەبەرایەتی تری لێ جیا کردەوە.

## دەوڵەتی عومەر

لە نێو خولەفای راشدین دا خەلیفە عومەر زۆرترین ماوەی حوکمی برد و، گەورەترین کاری تیا ئەنجام دا دەوڵەتێکی یاسای پڕ لە دام ودەزگای پێك هێنا کە دۆست و دوژمن باسی دەکەن. خەلیفە عومەر کارەکانی کرد بوو بە سێ بەشەوە بەم جۆرە:

۱- **بەردەوامی لە فتوحاتی ئیسلامیدا:**

أ – بەرەی جەنگی فارس، کە پاشان کردیە حەوت بەرەی جەنگی، بەرەو قارەی ئاسیا.

ب– بەرەی جەنگی رۆم، بەرەو قارەی ئەوروپا.

ج– بەرەی جەنگی میسر بەرەو قارەی ئەفریقیا.

ئەم بەرانەی بە گەرمی ئیدامە دەدا و، دەسەڵاتێکی تەواوی کردبوو بەسەریاندا و سەرپەرشتی هەموویانی دەکرد، نامەو نوێنەر بە گەرم و گوڕی لە هێنان وبردنی هەواڵ دا بوو، بەردەوام خەریکی ناردنی یارمەتی و داڕشتنی نەخشە و دابەش کردنیان بوو، کەموکورتی لایەکی بەوی تر پڕدەکردەوە، پارسەنگی تەواویانی راگیر کرد بوو، هەمیشە لە هەر سێ بەرە کەدا بە گەرمی جەنگ هەبوو. دوو ئیمپراتۆریەتی زلهێزی جیهانی ئەو کاتەی (فارس و رۆم)ی شپرزە کردبوو.

۲- **دامەزراندنی سیستەمی دەسەڵات:**

رێکخستنی کاروباری دەوڵەت و میللەت، سیاسەتی کارکردن و تەگبیر، هەر لەخۆوە دروست نابێت. بەڵکو پێویستی ژیان و گوزەران، ئەو جۆرە شێوازی سیاسەت و بەڕێوەبردنو رێکخستنانە دەهێنێتە بەرهەم، هەر کات

ئیشێك هاته پێشێ، دەبێ سیاسەتێکی بۆ ڕێك بخرێت بۆ ڕاپەڕاندنی، ئەو دەوڵەتداریەی لە سەردەمی عومەردا گۆڕێکی بەهێزتری پێ درا لە پڕ پەیدا نەبوو، بەڵکو لە پێویستاتی ڕۆژ و هاتنە پێشی ڕوداوەکانەوە، وەبەرهەم هات کە لەسەر ئەم بناغەیە بەڕێوە دەچوو:

أ – خەلیفایەتی: یەکەم کەس کە ناونرا خەلیفە ئەبوبەکر بوو دوای پرس وڕا بە سەحابە و ئەهلی (حەل و عەقد) بڕیاری دەدا. بەڵام عومەر شتی نوێ تری داهێنا. کار و سنوری دەست ڕۆیشتنی خەلیفەی دیاری کرد، چۆنیەتی پەیوەندی نێوان خەلیفە و ڕەعیەی ڕێکخست، کە ئەوانەشی لە سیرە و سونەتی پێغەمبەر و ئەبوبەکرەوە وەرگرتبوو، گرنگترین ئەو دەسەڵات و یاسایانە ئەمانە بوون:[478]

خەلیفە سوڵتەی دینی و دنیایی بە دەستەوە بوو، واتە ئەمارە و ئیمامەی کۆکردبویەوە.

سوڵتەی خەلیفە لە گەل و ئومەی ئیسلامیەوە وەردەگیرێ، چونکە نوێنەریانە، لەبەرئەوە پێویستە میللەت لە خەلیفە ڕازی بن، ئەوسا بەیعەتی بدەنێ. پێویستە میللەت هەڵەی خەلیفە دیاری بکات و ئاگاداری بکاتەوە، خەلیفەش پرس وڕا و مشوەرە بە میللەت بکات.

خەلیفایەتی پشتاوپشت نییە، بەڵکو ساڵح ترین و گونجاوترین و چاکترین و لەبارترین کەس بۆ بەرژەوەندی دین و میللەت، ئەوە دەکرێتە خەلیفە.

ب– ولایــەت: عومەر یاسای ولایەت (ئەمارەت)ی داهێنا بۆ سەرپەرشتی کردنی هەرێمەکان، بەڵام ئەبوبەکر ئەو کارەی بەو سەرکردانە دەسپارد کە هەرێمەکانیان فەتح دەکرد، هەر ئەوان سەرپەرشتی ناوچەکەیان دەکرد و کاروباریان ڕێك دەخست.

---

478. بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە کتێبی: کتاب الدولة الاموية " د.يوسف العش. ص٧. مطبعة جامعة، دمشق.

عومەر دەوڵەتی ئیسلامی دابەش کرد، سەرپەرشتیاری ناوچەکانی ناونا (ئەمیر) پاشان کردیە (والی) پاشتر کردیە (عامل). یەکەم کەس کە ناوی (ئەمیر)ی نا (مغیرەی کوڕی شعبە) بوو، کە سەردەمێك والی (کوفە) بوو، یەکەم کەس کە خەلیفەی ناونا (ئەمیرولموئمنین) ئەبوموسای ئەشعەری بوو کە نامەیەکی بۆخەلیفە عومەر نووسی و ناوی نابوو (امیر المؤمنین) ئیتر لەوێوە وشەی امیر المؤمنین داهات.

لە سەرەتاوە (ئەمیر) یان (والی) دەسەڵاتی خەلیفەی هەبوو، واتە هەر سێ دەسەڵاتەکەی هەبوو، (تەشریعی) و (تەنفیزی) (قەزایی).بەڵام خەلیفە عومەر ئەو سیانەی لەیەك جوێ کردەوە. تەنها دەسەڵاتی تەنفیزی و ئیمامەتی نوێژی مزگەوتی دا بە ئەمیر، سوڵتەی قەزایی لێ سەندەوەو، قازی تایبەتی دانا بۆ هەرێمەکان، پاشان باج و خەراجیشی لێ جیا کردەوە و فەرمانبەرێکی تایبەتی دانا بۆ وەرگرتنی.

والی و قازی و فەرمانبەرەکان لە دەوڵەتی عومەردا، دەبوایە مەرجەع و گەڕانەوەیان خەلیفە بوایە. هەر ئەو دای ئەنان ولایدەبردن، ئەم یاسایە هەتا دوا خەلیفەی راشدین بەردەوام بوو، ئەم رژێمە عومەریە، چاکە و ئیجابیاتی هەردوو رژێمە ناسراوەکانی کۆکردبویەوە کە وڵاتانی ئەمڕۆ کاریان پێ دەکەن، واتە حکومەتی عومەر ئیجابیاتی هەردوو رژێمی (مرکزی) و (لامرکزی) تیابوو.

عومەر ئەو شێوازە نوێیەی داهێنا، هەتا هەندێ دەسەڵاتی والی بگێڕێتەوە و ستەمی پێ نەکات، لە هەمان کاتدا هەندێ سەربەخۆیی لە سنوری خۆی دا بداتێ و تەنها هەر شتی بەسەردا فەرز نەکرێ، بەو کارە یەکێتی سیاسی و سەربازی و کۆمەڵایەتی وڵات دەپارێزێ.

عومەر وڵاتی کردە، چوار ولایەت، بۆ هەر ولایەتێك ئەمیرێك عامل – والی یەکی دانا، راستەوخۆ پرسیان بە خەلیفە دەکرد. عومەر وتارێکیدا فەرمووی: (ئەی خەڵکینە، سوێند بە خوا من عامل نانێرم لێتان بدات، دارکاریتان بکات، باج و خەراجتان لێ بسەنن، من دەیان نێرم هەتا ئاین و سوننەتتان فێر بکەن،

هەر کەس جگە لەمانەی کرد، خەبەرم بدەنێ، بەو کەسەی گیانی عومەری بە دەستە، تۆڵەی لێ دەکەمەوە.)

کە خەڵکی هەرێمەکان دەهاتن بۆ حەج – عومەر حەجی کردبوە جێی وتوێژ و کۆبونەوەی والیەکان و ئەوانەی شکات و داواکاریان هەیە، عومەر لێ ی دەپرسین ئەمیرەکەتان چۆنە.؟ لەگەڵ لاوازتان دادەنیشێ و گوێیان لێ دەگرێ.؟[479]

ئەگەر عاملێکی دابنایە بە والی هەرێمێك، پەیمان نامەی (تعهد)ی پێ پڕدەکردەوە، کە راستگۆو دادپەروەر بێت، هەتا کۆمەڵێك لە موهاجرین و ئەنسار بۆیان مۆر نەکردایە، نەیدەکردە والی. مەرجی بۆیان ئەوە بوو: سواری کەر ببێت، خۆی بەشت نەزانێت، زۆر نەخوات، خۆش خۆر نەبێت، نەرم لەبەر نەکات، دەرگا بۆ ئەوانە بکاتەوە کە پێویستیان هەیە، تەنانەت ساڵێك پێش وەفاتی فەرموی: (ئەگەر مام، ساڵێکی تر دەچم بۆ بەدواداچوون و گەڕان بەسەر ویلایەت و هەرێمەکاندا، من دەزانم خەڵکانێك هەیە پێویستیان بە ڕۆیشتنی خۆم هەیە. بە خۆم نەبێت کاریان جێبەجێ نابێت، دەزانم عاملەکانم پێم ناگەیەنن! دەچم بۆ شام، بۆ جزیرە کوردستان، بۆ میسر، بۆ کوفە، بۆ بەسرە. هەر یەکە دوو مانگ دەمێنمەوە، چاکترین حولە ئا ئەو متابعە کردن و گەڕانەیە.)

میللەتان، گەل و هۆزە کورد و فارس و بلوچ و ئازەر و ئەرمەن و تورك و ئالانی و قبتیەکان، ئەو قسانەیان دەبیست، رەفتار و کردەوەکانیشیان دەبینی، بەراوردیان دەکرد و رایان دەگۆڕا، بە تایبەت کە ستەمی سەختی فارس و رۆمیان بینی بوو[480] ، ئەو گەل و هۆزانەی پێشتر خاوەنی هیچ نەبون، خاوەنی خۆیان و ماڵ و منداڵ و ناموس و سامان و خاك و ئاو و وڵاتیان نەبوون، کە ئیسلام هات بە تەواوی مانا ئازاد بوون، بوونە خاوەنی هەموو

---

[479]. تأريخ الطبري: ابن جرير الطبري. ج٥ص٢٠.

[480]. الاحكام السلطانية: الماوردي. ص١٢٥.

شتێك، سروشتی مرۆڤ وەهایە ئولفەت لەگەڵ خۆشیەکدا دەگرێ کە دڵی بیگرێ، بە تایبەت کە سێبەری ئیسلام فێنك بوو، مافی هەموو کەسی دەدا بەبێ جیاوازی. کە (شابانو) کچی یەزدگوردی پاشا، لە جەنگی جەلەولادا گیرا، مارەیان کرد لە (حوسێنی کوڕی عەلی) هەتا ببێتە بوکی کچەزای پێغەمبەر (ﷺ). نەك بیدەن بە سەربازێك و بچێتە ماڵی کەسێکی دور و بێ حاڵ، هەتا لە نزیك ماڵی سەرکردەکانەوە بژی و، زۆر لێی نەشێوێ. ئەم دەستور و یاسایانەی عومەر، هەموو کەسی دەگرتەوە و، مافی کەسی ون نەئەکرد.

کە والیەکی دادەنا، لە پێشەوە سەرژمێری موڵك و ماڵی دەکرد، بۆ ئەوەی بزانێت پاشتر چی زیاد دەکات! چاودێری بە سەرەوە دادەنا، تا هەواڵی بۆ بهێنێتەوە، تەنانەت والیەك لە هەرێمێك بوایە، لە نزیکترین کەسی خۆی دەترسا، لەبەرئەوە نەیدەوێرا زوڵم و ستەم بکات. عومەر داوای کردبوو، ئەگەر والیەك لە هەرێمی خۆیەوە، بۆ سەردان و کاری رەسمی بگەڕایەتەوە، دەبوایە بە رۆژی نیوەڕۆ بهاتایەوە بۆ شار و ماڵی، نەك بە شەو! هەتا خەڵك چاوی لێی بێت و بزانێ چیان پێیە! عومەر چاودێری لەسەر رێگاکان دانا بوو، هەتا لێپرسراوەکان ببینن. لە وەرزی حەج دا هەموو والیەکانی بانگ دەکرد بۆ لێپرسینەوە، شایەت و شکات کەری بانگ دەکرد. هونەرێکی بەکاردەهێنا بۆ دۆزینەوەی تاوانبار، کە (معاویە) منداڵ بوو، بانگی کردو وتی: دوێنێ باوکت (ئەبوسوفیان) گەڕایەوە، چی هێنایەوە بۆ ماڵەوە.؟ معاویە وتی: دە (١٠) هەزار درهەم. پاشان ئەبوسوفیانی بانگ کرد، وتی مستیلەکەت داکەنە و بمدەرێ. پاشان یەکێکی بانگ کردو وتی ئێستە بچۆ بۆ ماڵی ئەبوسوفیان و بە (هیند)ی ژنی بڵێ ئەبوسوفیان دەڵێ ئەمە مستیلەکەمە، چیم هێنایەوە ئێوارە، هەر هەمویم بۆ بنێرە. ئەویش شتەکان و (دە) هەزار درهەمەکەی بۆ نارد، عومەر خستیە بەیتولمال. میللەتەکان ئەمانەیان دەبیست، دەیانگوت ئەمانە داگیرکەر نین. بەڵگو رزگارکەرن،

پیاوانی دین و دنیان، پەیامێکیان بۆ هاتووە بڵاوی دەکەنەوە. هەر بۆیە زۆربەی جار موسوڵمان دەبون بێ شەڕ.

عومەر جارێکیان بە هاوڕێکانی وت: دەست نیشانی کەسێکم بۆ بکەن بیکەم بە والی (عامل). وتیان شەرتت چییە؟ فەرموی (کەسێك بێت، ئەگەر لەناو کۆمەڵێکدا بێت، ئەمیریان نەبێت، بەڵام وا خۆی راگیر کردبێ و رێزی خۆی پاراستبێ، وەك ئەمیر سەیری بکەن و پرس و رای پێ بکەن. وە ئەگەر ئەمیریان بوو، ئەوا خۆی وەك یەکێك لەوان نیشان بدات.) کێ بوە شەرتی وردو دروستی وای بوبێت؟ پرسی بە هەموو کەس دەکرد، هەتا رای جوان و دروستی دەست بکەوێت، پرسی بە منداڵ و گەنج دەکرد و دەیگوت ئەمانە بیریان تیژە و شت دەپێکن. نەك هەر ئەوە بەڵکو بۆ جەنگی نەهاوەند کە گەورەترین جەنگی موسوڵمانان بوو پرسی بە بێ بڕوا کرد، پرسی بە (هورمزان) پاشای هەرێمی ئەهواز کرد کە ئەسیر کرابوو وتی: لە پێشەوە پەلاماری کام لەم سێ جێیە بدەین. ئەویش راستی وت! ئەمانە هەمووی هۆ بون بۆ ئەوەی کە دەوڵەتی ئیسلام نمونەیی بێ و گەلان چاوەڕوانی بکەن. لە هەموو رویەکەوە لە دەوڵەتانی ئەوسا جیاواز بوو بە شێوازێکی سادە و ساکار کارەکانی ئەنجام دەدا، عەقیدەیەکی ئاسان و دوور لە ئاڵۆزی هەبوو.

ج- بەیتولمال(مالیە): یەکەم کەس کە ماڵێکی دانا بۆ کۆکردنەوە و سەرپەرشتیکردنی پول و پارە و داهات.عومەر بوو. ئەوەی کە دەهات، لە زەکات و جزیەی ئەهلی (زیمە) و (خومس)ی غەنائم و، میراتی ئەو مردوانەی کە کەسیان نەبوو، عومەر سجیلی (تۆمارگە)ی داهێنا بۆ ناونوسی ئەوانە و، دابەش کردنی داهات بەسەر موستەحەقدا، یان بۆ ئەوانەی یارمەتیان بۆ دابین کرابوو[481] (وەك دیاری دەدرا بە هەندێ کەس بۆ رێزلێ نانیان)

---

[481]. طبقات ابن سعد: ج٣ص٢٩٦. ابن اثیر: الکامل في التأریخ " ج٢ص٥٠٢، مطبعة الازهرية. مصر ١٣٠١ه

د- جزیه و ئەهلی زیمە: جزیه لەسەر پیاو دانرا بوو، منداڵ و ژن عەفو کرابون، دەبێ ئازاد و باڵق و عاقڵ بێت، لەسەر جولەکە و گاور و مەجوسی و سائبە و سامرە دانرابوو[482]. لە هەژار و دانیشتوو و نابیناو کەمئەندامو بێکار و عابید و راهیب و زێوان و خادمی پەرستگاکان وەرنەدەگیرا.[483] ئەم کارانە کاریگەریان هەبوو، میللەتان هەستیان هەبوو، دەسەڵاتەکانی پێشویان بینی بوو، لەگەڵ سەردەمی نوێدا بەراوردیان دەکرد.

لە سەردەمی ئیسلامدا ئازادی بیروڕا و ئاین هەبوو، دەستیان نەدا لە ئاگردان و پەرستگاکانیان، بەڵکو دەیان پاراستن، ئەمە لە بەرامبەر پارەیەکی کەمی رەمزی بە ناوی (جزیە)، کە تەنها لەو کەسانە دەسەنرا کە توانای جەنگیان هەبوایە و رازی نەبونایە ببنە موسوڵمان، لە هەژار و نەدار و ژن و منداڵ و نەخۆش و پیر و زێوان و زانا ئاینیەکان وەرنەئەگیرا، ئەمە بەرامبەر ئەوە بوو کە نەدەچوون بۆ خزمەتی سەربازی (بەدەل سەربازی) کە موسوڵمان دەبون، ئەوەشیان لەسەر لادەچوو.

(ویل دیورانت) پرۆفیسۆری ئەمریکی هەرچەندە بڕوایەکی سەیری بە بونی خوا و بونەوەر هەبوو بەڵام راست گۆیانە دەڵێت:(ئیسلام یەکەم ئاین و رژێمە لە مێژوودا کە مرۆڤ و میللەتانی لە نێوان سێ خاڵدا سەر پشك کردبێ، لە نێوان موسوڵمان بون، یان جزیە دان، یان شەڕ). پێش ئیسلام و ئێستەش کە هێزێکی زەبەلاح پەلاماری هێزێکی لاواز دەدات، هەموو داواکاریەکی خۆی بەسەردا فەرز دەکرد، بە ژێردەست خستن و، باج لەسەر دانان سەرشۆڕیان دەکردن، بە جۆرێك کە هەموو هێزێکی سەربازی و ئابوریان لێ دەچنین، هەتا جارێکی تر هەڵ نەدەنەوە. بەڵام سوپای ئیسلام وانە بوو، کە چونەتە بەردەم دوژمن، سەرپشکیان کردون لە نێوان سێ شتدا یان موسوڵمان بن و وەك ئەمانیان لێ دێ، هەموو مافێکیان پارێزراوە یان نابنە موسوڵمان دەبێ جزیە

---

[482]. الاحكام السلطانية: الماوردي، ص١٣٧.

[483]. كتاب الام: الامام الشافعي. ج٤ص٩٧، كتاب الخراج: ابويوسف، ص١٤٦.

بدەن و، لەسەر ئاین و رەوشتی خۆیان بمێننەوە و سوپای ئیسلام دەیان پارێزێ، یان شەڕ. کە خالیدی کوڕی وەلید چوە حیرە، خەڵکەکەی وتیان ئێمە موسوڵمان نابین، خالید وتی کەیفی خۆتانە، سەرۆکی وەفدی حیرە ناوی (ئیاس کوڕی قبسەی تائی) بوو، خالید وتی: (من بانگتان دەکەم بۆ لای خوا و بۆ ئیسلام، ئەگەر وەڵامتان دامەوە، ئەوا ئێوەش وەك ئێمە موسوڵمانن، چی بۆ ئێمە هەیە، بۆ ئێوەش هەیە، ئەگەر نەتان کرد، دەبێ جزیە بدەن، ئەگەر نەتان دا، ئەوا گەلێکم بۆ هێناون، سورن لەسەر مردن، وەك چۆن ئێوە سورن لەسەر ژیان، شەڕ دەکەین هەتا خوا دەیخات بە لایەکدا.[484] ئیاس وتی: ئێمە پێویستیمان بە جەنگ نیە، لەسەر ئاینی خۆمان دەمێنینەوە و جزیە دەدەین. خالید رازی بوو.) کە جزیەیان دەدا دەبونە (ئەهلی زیمە) پێغەمبەر (ﷺ) لە حەجی ماڵئاوایدا فەرموی (احفظوني في ذمتي) یان فەرموی: (ليس في أموال اهل الذمة الا العفوا) ئەوان زەکات و سەدەقە نادەن، تەنها ئەو جزیەیە دەدەن، کە لە چاو زەکات و خێر و سەدەقەی موسوڵمانان هەر هیچ نیە. لەوان زەکات وەرناگیرێ، چونکە باوەڕیان پێ ی نیە، جزیە قەرز نیە، ئەگەر زیمیەك مرد، قەرزار بوو، لێی ناسەنرێ و لە وەرەسەی داوا ناکرێت، جزیە لەسەر عاقڵ و ئازادی لەش ساغە، کە بتوانێ بیدا، لە کوێر و شێت و. وەرناگیرێ. جزیە لە جەزاوە هاتوە، واتە لێیان دەسەنرێ لە جەزای ئەوەی بیان پارێزن و سەربازی نەکەن، جەزای سەربازی نەکردنە، عومەر چوو بە کۆڵانێکدا، سواڵکەرێکی بینی، لە پشتەوە دەستی خستە سەرشانی و وتی: لە چ ئاینێکی؟ وتی: جولەکەم. وتی: بۆ سواڵ دەکەیت.؟ وتی بۆ(جزیە).عومەر بردیە ماڵی خۆیان و شتێکی دایە و ناردی بۆ لای بەیتولمال کە پارەی بۆ ببڕنەوە!

ئەو کاتەی کە خەریك بوو جەنگی قادسیە روبدات عومەر داوای لە سەعد کرد وەفدێك بنێرێ بۆ لای (یەزدگورد)ی پاشا، هەندێ وتووێژ بکەن، وەك

---

[484]. كتاب الخراج: ابويوسف. ص١٧.

پێشەکیەك بەڵکو رودانێکی تر روبدات و نەرمی و رێکەوتنێك و هودنەیەك و ئەو جەنگە رونەدات، سەرۆکی وەفدەکە ناوی (نیعمان کوڕی موقرین) بوو، (١٨) نەفەر بوون. یەزدگورد وتی: بۆچی هاتونەتە سەرمان.؟ نیعمان وتی: (خوا پێغەمبەرێك و ئاینێکی بۆ ناردوین، داوای لێ کردوین بیگەیەنین بە هەموو گەلانی تریش، لەبەرئەوە ئێمە بانگتان دەکەین بۆ ئیسلام، کە ئیسلام داوا دەکات چاکە بکەین و خراپە نەکەین، ئەگەر موسوڵمان بون، ئەوا نوسراوی خواتان بۆ بەجێدەهێڵین حوکمی پێ بکەن، ئێمە لاتان چۆڵ دەکەین و دەچین بۆ جێیەکی تر. ئەگەر نەتان کرد ئەوا لە شەڕ باشتر ئەوەیە جزیە بدەن، دەتان پارێزین و لەسەر ئاینی خۆتان بمێننەوە، ئەگەر نەتان کرد شەڕ دەکەین.) یەزدگورد زۆری پێ ناخۆش بوو، چونکە پاشای دووەم ئمپراتۆریەتی جیهان بوو بەلایەوە قورس بوو، توڕە بوو، هەڕەشەی کرد.

هەموو سەرکردە موسوڵمانەکان پێش شەڕکردن، ئەو گەل و خێڵ و سوپایانەیان سەرپشك دەکرد کە بە کەیفی خۆیان یەکێك لەو سیانە هەڵبژێرن. ئەنجا دوو رۆژ یان زیاتر ماوەیان دەدانێ و لێیان دووبارەو سێ بارە دەکردنەوە، ئەوسا ئەوەی دەکرا بڕیار ئەدرا.

تەبەری لە مێژووەکەی بەرگی ٣ لاپەڕە ٢٣٥ دەڵێت: ئەو کاتەی کە عوتبەی کوڕی فەرقەد چوە سنوری ئازربایجان. سەرپشکیان کردن لە نێوان ئەو سیانەدا، ئەوانیش وتیان لەسەر ئاینی خۆمان دەمێنینەوە و جزیە دەدەین، عوتبەش بانگی کردن و رێکەوتنیان مۆر کرد کە زۆر لوتف و سۆز و رێزی بۆ بەرامبەر تێدا بوو، وەکو دوژمن سەیریان نەدەکردن، ئەمەش دەقی رێکەوتنەکەیە (بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان. ئەمە ئەوەیە کە عوتبەی کوڕی فەرقەد فەرمانبەری عومەر کوڕی خەتاب ئەمیری بڕواداران بەخشیە خەڵکی ئازربایجان، بە دانیشتوانی شاخ و دەشت و دەر و سنورەکانی، بە هەموو میللەتەکانیەوە، هەر هەموو ئەمین بن لە خۆیان و ماڵ و گەل و ئاینیان، لەسەرئەوە جزیە بدەن بە گوێرەی بون و توانایان، وە لەسەر منداڵ و ژن و نەخۆشی بەردەوام نیە پارە بدەن ئەوانەش کە هیچیان نیە و، ئەوانەش

خەریکی خوا پەرستین و کاسبیان نیە و، ئەوانەش کە لەگەڵیان دەژین نایان گرێتەوە.)

خالید کوڕی وەلید دوای ڕێکەوتنەکەی لەگەڵ خەڵکی حیرە، لە وەڵامی پرسیارێکدا دەڵێ:(کە چومە حیرە نوێنەر لە ماقوڵان هاتن بۆ لام. یەکەم جار بانگم کردن بۆ ئیسلام و بۆ لای خوا. نەهاتن. پاشان وتم دەبێ جزیە بدەن. یان شەڕ. وتیان شەڕمان ناوێ، بەڵام وەك چۆن لەگەڵ خاوەن نامە ئاسمانیەکاندا ڕێکەوتی، ئاواش لەگەڵ ئێمە ڕێك بکەوە و جزیە دەدەین. منیش سەرژمێرم کردن دەبینم حەوت هەزار کەسن لە پیاوان، جیام کردنەوە، دەبینم هەزاریان نەخۆش و پەك کەوتەن، لەو حیسابە لام بردن و شەش هەزاریان جزیەیان کەوتەسەر، لەسەر شەش هەزار ڕێکەوتین، پەیمان و وەفام لێ وەرگرتن کە پەیمان شکێنی نەکەن، یارمەتی دوژمنمان نەدەن، هەواڵو نکوڵی ئێمە نەبەن بۆ ئەوان و جاسوسیمان لەسەر نەکەن، ئەگەر مخالەفەیان کرد ئەوا (زیمە) یان لەسەر نامێنێ و نایان پارێزین. ئەگەر دوای ئەوەش پیاوێك پیر بوو یان دەوڵەمەندێك هەژار کەوت، ئەوانەش جزیەیان لەسەر نامێنێ بەڵکو لە بەیتولمالی موسوڵمانان یارمەتییان بۆ دەبڕینەوە، هەتا لە سنوری دارلئیسلامدا بن، ئەگەر لە خاکی ئیسلام دەرچون بۆ جێیەکی تر ئیتر ئێمە جزیەیان لێ وەرناگرین، بەڵام نەفەقەی ماڵ و منداڵیان دەکێشین.) پێغەمبەر لەسەر دەمی خۆی دا جزیەی لەسەر خەڵکی (ئەکیدەر) و (دومەتولجەندەل) و مەجوس (هجر) و هەندێ لە (یەمەن) وەردەگرت. بەڵام هەندێ لە ڕۆژهەڵات ناسە گومان دروست کەرەکان وا بڵاودەکەنەوە کە گوایە جزیە لەسەرەتاوە نەبوو، بەڵکو لە ناوەڕاستی سەدەی دووەم دا داهات، گوایە موسوڵمانان بۆ کۆکردنەوەی پارەوپول و سەرانە دایان هێناوە. بەڵام وا نیە، ئەوەتە پێغەمبەر (ﷺ) لە سەردەمی خۆی دا کردویەتی. (دانیل دینت) لە کتێبی (الجزية في الاسلام) دا لاپەڕە (٢٩)دا بوختانەکانی (فلهاون) و (بیکر) و (جروهمان) و (کاتیان)ی هێناوە بۆ ناشرین کردن، بەڵام نەچوە ئایەت و فەرمووده بهێنێت بزانێ چی دەڵێن. خوای گەورە لە چەندین جێداو،

پێغەمبەری ئازیز لە چەندین فەرمودەدا باسی جزیەیان کردووە. پێش ئیسلام جزیە بۆ ژێردەستەو شکاوی جەنگی دەبوو، کە بۆ تۆڵە و دژایەتی و خۆفەرزکردن دەسەنرا. بەڵام ئیسلام ئەو بیرۆکەیەی لابرد و، دای نا بۆ پاراستن و پارێزگاری و پاراستنی گیان و کەرامەت و پارە و ماڵ و عەقیدە و خاکیان، کە پێکەوە لەگەڵ موسوڵمانان بژین وەك یەك لە ئازادی بیروڕاو کاسبی و هەڵس و کەوت دا، ئەویش پارەیەکی کەم بوو.

د. مستەفا سەباعی دەڵێ: (دەوڵەمەندەکان ٤٨ درهەمیان دەدا، چینی ناوەڕاست ٢٤درهەم، کرێکار و دەست ڕەنگینەکان ١٢درهەم یان دەدا، کە هەر ٢٤درهەم یەك دیناری عێراقی دەکرد، کە لە چاو زەکات دا هەر هیچ نەبوو، کە دەبوایە موسوڵمان بیدایە. زەکات هەر لە چل دینار دینارێك دەدرا بۆ ساڵێك، ئەوان هەر سەری ساڵانە ئەوەیان دەدا، لەگەڵ ئەوەی موسوڵمان پارەبەخشین و خێر و قوربانیشی هەبوو، ئەمان هەر ئەوە بوو)[485]

پێش ئیسلام (جزیە) لە میللەتە ژێردەستەکان و شکاوەکان دەسەنراو، بە زۆر ڕاپێچی جەنگیشیان دەکردن و لە پێناوی خۆیاندا دەیاندان بە کوشت، بەڵام ئیسلام نەی دەبردن و لە شەڕی خۆی و لە خزمەتی سەربازی عەفوی دەکردن. بەڵام ئەگەر بچونایە بۆ شەڕ بە کەیفی خۆیان، ئەوا جزیەیان لەسەر لائەچوو.

پێغەمبەر (ﷺ) کە عەبدوڵلای کوڕی ئەرقەمی کرد بە والی بەسەر ئەهلی زیمەوە پێ‌ی فەرموو: (هەر کەس ستەم لە پەیمان دارێك بکات، یان کارێکی بدات بەسەردا توانای نەبێت، یان شتێکی لێوەربگرێ پێ‌ی ناخۆش بێ، یان بە کەم سەیری بکات، من لە قیامەتدا یەخەی دەگرم.)

عومەر دەیگوت: (ئامۆژگاریتان دەکەم کە دوای خۆم لەگەڵ زیمە باش بن، وەفاتان بۆ پەیمانەکانیان هەبێ، لە دوای ناوچەی ئەوانەوە جەنگ بکەن، شتێك مەدەن بەسەریاندا لە توانایاندا نەبێت.)

---

[485]. نظام السلم والحرب في الاسلام: د.مصطفى السباعي، ص٣٥.

ئەوان لەسەر ئەو ڕێڕەوانە حکومەتی خۆیان دەبرد بەڕێوە، (زیمە)شیان بە یەکێك لە یەکە یەکەی دەوڵەتەکەیان ناونووس کرد بوو، عومەر حکومەتێکی هاوچەرخی دامەزراند، جگە دیوانی قەزاو و دیوانیتۆمارو سەرژمێری و خەراج و لێپرسینەوەکە پێش خۆی نەبوون، بەرید و بەیتولمال و مەرابیتو سغور و کارگەی سکە لێدانی پارە و گرتوخانەی بۆ حکومەتی ئیسلامی دروست کرد، هەتا هەموو شت لە جێی خۆیدا بێ و کار بە ڕێکی بڕواو تێکەڵی و بێ سەروبەری روونەدات، لێپرسراویەتی وڵاتە رزگارکراوەکانی دەدا بە خەڵکی خۆیان، خۆیان فەرمانبەر بن، بە زمانی خۆیان، نەیدەهێشت خەڵکی عەرەبیان بەسەرەوە بێت، یاسای (جزیە)ی دانا، بە گوێرەی وڵات و میللەتان دەیگۆڕی (بنی تغلب) لە شام ئازاد کران کە جزیە نەدەن، نەوەك بچنە لای رۆم، لە باتی جزیە شتێکی تری لەسەر دانان وەك سەدەقە. زەوی دەدا بە خاوەنە بنەڕەتیەکانیان، لە دەرەبەگ و میرە زۆردارەکانی دەسەندەوە، تەنانەت نەشی دەهێشت موسوڵمانەکان دەست بگرن بە سەریاندا، زەوی دابەش دەکرد بەسەر خەڵکی ناوچەی خۆیاندا، بۆ ئەوەی بەروبومی خۆیان بۆ خۆیان بێ و پێی بژین و سەرقاڵی کاری خۆیان بن. رەشە خاك (السواد)ی عێراقی دایەوە بە خاوەنە ئەسڵەکان، کە ماوەیەکی زۆر بوو میرە فارسەکان زەوتیان کرد بوون، خاوەنەکانیان کردبوە وەرزێر و سەپان و خزمەتکار. هەوڵی دەدا هەژار نەمێنێ. دەیوت ئەگەر مام، چی زیادەی خەڵکە لای دەوڵەمەندەکان، لێیان دەسەنمەوەو دەیدەم بە هەژارەکان.[486]

زەوی وزار لە دەرەبەگ و میرو ستەمکاران دەسێنرایەوە، دەدرا بە وانەی کە توانای کێڵانیان هەبوایە، هەر کەس بوایە. خۆی دەیوت: زەوی بۆ ئەو کەسەیە کە دەیکێڵێ. ئەمە وتەیەکی ناسراوو بڵاوی عومەرە.

عومەر یەکەم کەس بوو رژێمی سیاسی بۆ دەوڵەتی ئیسلامی دانا، ئەگەر خەلیفە عومەر زیاتر بمایە، کەسێتیەکی بە ویقار و لێهاتووی وابوو، کە

---

[486] - عبقرية عمر: عباس محمود العقاد، ص١١٤. دار الفكر، بغداد.

دەیتوانییەکیەتی گەلانی ئیسلامی بەهێز بکات و ئەو جەنگە ناوخۆییانەی دوای خۆی ئاوا بە ئاسان دروست نەبێت.

٣- گەشەسەندنی زانست و زانیاری و بڵاوکردنەوەی زانایان؛

عومەر هەوڵی دا زانست و زانیاری بە هەموو هەرێمەکاندا بڵاو بکاتەوە، بە تایبەتی زانستە قورئانی و فقهیەکان. بۆ ئەو مەبەستە زانایانی بۆ هەرێمەکان نارد.

داوای کرد لە ئەبوموسای ئەشعەری کە خەڵکی بەسرە فێری قورئان بکات، ئەویش رۆیشت و کۆی کردنەوە و پێی وتن: ئەی خەڵکی بەسرە، عومەر ناردومی هەتا کتێبی خوا و سونەتی پێغەمبەرتان فێر بکەم.[487]

(ئیبن سەعد) لە (ئەبی ئەسوەدەی دەئولی)یەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ چومە بەسرە، دەبینم (عمرانی کوڕی حسین) لەوێیە کە عومەر ناردبوی خەڵکی بەسرە فێری فقە بکات.[488]

(قەیسی کوڕی ئەبی عاس)ی کردە قازی و ناردی بۆ میسر، ئەمە یەکەم قازیە کە قەزاوەتی کرد لە ئیسلام دا.

شەریح کوڕی حارسی کەندی کردە قازی و ناردی بۆ کوفە. ئەم زانایە ٧٥ساڵ بەردەوام قازی بوو.

ئەبودەردائی کردە قازی شاری مدینە.[489]

(ویلز) دەڵێ: (ئیسلام خاڵی بوو لە تەعقیدات و قورسی و ئاڵۆزی، لەبەر ئەوە زاڵ بوو بەسەر گیانی گاورێتی داو هێزی لێ بڕی و چوە دڵی زۆربەی

---

[487]. حليـة الاوليـاء و طبقـات الاصـفياء: الاصـفهاني، ص٢٥٦. مدرسـة الحـديث في بصـرة: د.امين القضاة، رسالة الدكتوراه في الحديث، ص٣٦.

[488]. طبقات ابن سعد، ج٧ص١٠. الخلفاء الراشدون، اعمال واحداث: د.امين القضاة،ص٤٨-٥٧، اردن، زرقاء ١٩٨٩.

[489]. تأريخ الامم الاسلامية: الشيخ محمد خضري بەگ، ج٢ص٩، مصر ١٩٦٩.

خەڵکەوە.) (میۆر) دەڵێ: (پێغەمبەری ئیسلام قسەی رون و، دینی ئاسان بوو، لەبەرئەوە بوو، ئەو کودەتا رەوشتیەی کرد کە لە مێژودا کەس نەیکردوە.) [490]

ئیسلام فکرەیەکی جهانگیری هەبوو، هەرچەند (وا یور) لە جێیەکی تردا دەڵێ: (فکرەی عالەمیەت دوای پێغەمبەر دروست بوو، ئەگینا پێغەمبەری ئیسلام هەر بۆ عەرەب نێررا بوو) نازانم ئەم نووسەر و بیریارە رۆژئاواییانە چۆن دەوێرن قسەی وا دەنوسن، بە مەرجێك دەیان ئایەت و فەرمودەی پێغەمبەر باسی عالەمیەتی ئاینی ئیسلام دەکەن. ئەو لێکۆڵەرەوەیە چی دەکات لەم هەموو ئایەتە (ان هو الا ذكر للعالمين)[491] (لينذر من كان حياً)[492] (ليكن للعالمين نذيراً)[493] (و ما ارسلناك الا كافة)[494] (قل يا أيها الناس أني رسول الله اليكم جميعاً)[495] (ومن يبتغ غير الاسلام ديناً فلن يقبل منه)[496] و دەیانی تر. دەیان فەرموودەش لەو بارەیەوە هەیە بڕوانە. ئیبن هشام[497] و یەعقوبی[498] و تەبەری[499].

ئەو رۆژهەڵاتناس و مسیۆنێرە رۆژئاواییانە سەیرن و زۆریش سەیرن، بە شان و باڵی هەردوو ئمپراتۆریەتی فارس و رۆم دا دێن، کە دنیایان داگیر کرد بوو بەبێ فکرە، میللەتانیان لە ژێر تیر و شیر و قامچیدا داڕزاند بوو، بە ئارەزووکاری پاشا حوکمیان دەکرد، بەلام باسی ئاینی محمد و دەوڵەتی

---

[490]. تأريخ الاسلام: حسن ابراهيم حسن، ص٢٠٤.

[491]. سورة (ص)، آية ٨٧.

[492]. سورة (يس)، آية ٦٩.

[493]. سورة (فرقان)، آية –١–.

[494]. سورة (سبأ)، آية ٣٨.

[495]. سورة (أعراف)، آية ١٥٨.

[496]. سورة (آل عمران)، آية ٨٥.

[497]. سيرة ابن هشام. ج٤ص٢٩٧.

[498]. يعقوبي. ج٤ص٢٧٩.

[499]. تأريخ الطبري. ج٢ص٨٣.

ئیسلام ناکەن کە جیهانی رزگار کرد و میللەتانیان حەواندەوەو، زەویان پاك کردەوە لە زۆر و ستەم و بەد ڕەوشتی.

(ولیم میور) لە جێیەکی تردا دەڵێ: (موحەممەد لە غەیری نیوەدورگەی عەرەب شوێنی تری نەدیوەو نەدەناسی و بیری لێ نەدەکردەوە، ئاینی ئیسلام هەر بۆ سنوری نیوەدورگە ئامادە کراوە.) ئەمە هەمووی کەم زانیاری‌و بەدگومانی نیشان دەدات. پێغەمبەر لە ژیانی خۆیدا دوو جار دەچێتە شام، هەردوو جارەکە مەبەست بازرگانی دەبێ. لە ژیانی خۆی دا زۆر باسی فارس و رۆم و پاشایان و، باسی قوستەنتنیەو مەدائن و رۆمای کردووە، دەفەرموێ لە ئایندە دا ئیسلامیان دەگاتێ مەدائن و قوستەنتنیە رزگار کرا، (رۆما)ماوە. لە ژیانی مەککەدا هاوڕێکانی بە نهێنی دەنێرێ بۆ حەبەشە، دەیان نامەو نوێنەر دەنێرێ بۆ پاشایانی جیهان و داوای موسوڵمان بونیان لێ دەکات و زۆری تر. لە قورئانەکەی دا باسی هەموو شتێکی تیایە، ئیسلام تەنها پەیوەست نیە بە نیوەدورگەوە (ونزلنا علیك الکتاب تبیاناً لکل شئ)[500] (ما فرطنا فی الکتابَ من شئ)[501] (وما کان الناس الا أمة واحدة)[502] (کان الناس أمة واحدة)[503] ئەو رۆژهەڵات ناسانە، یان بە شێوازێکی تر، ئەو بوختان هەڵبەسانە بۆ میللەتە رۆژهەڵاتیەکان دەڵێن: ئیسلام ئاینی شارستانی و زانستی نیە، بەمەرجێ سەدان ئایەت باس لە زانست و زانیاری و زانایان و شارستانی دەکات. یان دەڵێن ئیسلام ئاینی توندوتیژیە، کە هەر هەموو باس لە رەحمەت و بەزەیی و سۆز دەکات. ئیسلام عەرەبی یەك خست، یەك باوەڕ و یەك مەبەست و یەك قسەی کردن، پاشان نیەتیان هێنا بیبەنە دەرەوەی نیوەدورگە، بۆ ئەوەی جیهانیش، میللەتانی تریش وا لێ بکەن. میللەتان کە

---

[500]. سورة (النحل)، آیة ۸۹.

[501]. سورة (انعام)، آیة ۳۸.

[502]. سورة (یونس)، آیة ۱۹.

[503]. سورة (بقرة)، آیة ۲۱۳.

بینیان ئەم ئاینە تەواوکەری ئاینەکانی پێشوە و هێنانە دی مژدەکانی نامە ئاسمانیەکانی پێشوە، دوای کەوتن. ئەو کاتە هیچ گەل و هۆزێك پیروورایەك و ئایینێکی رێك وپێکی نەما بوو، هەر هەموو خەڵکی زەوی لە بۆشدا دەخولانەوە، بە ئارەزوی هەواوهەوەسیان ژیانیان رایی دەکرد، کە ئیسلام هات هەموو شتێکی چاکی بۆ هێنان، تەپوتۆزی سەر دڵ و مێشك و دەماغ و ناخیانی تەکاند و ئامادەی کردن بۆ وەرگرتنی ئاینی نوێ، کە بینیان ئەم ئاینە نوێیە موافقی عەقڵ و هەست و نەست و ویژدانیانە. دوای کەوتن! هەستیان دەکرد ئەم ئاینە کوشتن و عارەق و دزی و قومار و سوو و تەماعی خراپی یاساغ کردەوە و، هانیان دەدا بۆ برایەتی و خۆشەویستی و کاسبی کردن و ژن هێنان و یەکێتی و یەك خوایی، کۆیلە ئازاد دەکا و دەستی زۆردار و دز دەگرێ و زەویان پێ ئاوەدان دەکاتەوە. نوێژ و رۆژو و حەج و زەکاتی لەسەر خەڵك فەرز کرد، هەتا دڵ و دەرون و نێوانیانی پێ پاك بکاتەوە، ئاینی نوێ فکریەك بوو عەقڵ دەیبڕی، دەیوت چاك بکە و خراپ مەکە، لەبەرئەوە میللەتان چونە سایە و سێبەری.

بەڵێ: دەوڵەتی ئیسلام لە سەردەمی خولەفادا دەوڵەتێکی سستەمی و دیومکراتی بوو، هەروەکو ویل دیورانت بروفیسۆری ئەمریکی دەڵێ: (حکومەتی ئیسلامی لەو سی ساڵەی دوای پێغەمبەر ﷺ کۆمارێکی دیموکراتی بوو.)[504]

لە جێیەکی تردا لە باسی بەهێزی سستەم و عەقیدەی ئیسلامی و کاریگەرییەوە دەڵێ:

(ئا ئەوە ـ بەبێ ریایی ـ دەڵێم عەقیدەیەکی پاك و بێگەرد و بەهێزی وا بوو کە کۆمەڵێك گەلانی بڵاو وجیاواز لە هەموو رووبەکەوەی کردەیەك، کە هەریەکەی لە قارەیەکی ئەم سەر زەویەدا بوون، لە هەر هەموویان یەك میللەت

---

[504]. قصة الحضارة: ول ديورانت. ترجمة محمد بدران، ج١٣-١٤ ص١٤٥.

و گەلی پتەو و مەزنی دروست کرد، کە ئەمە لە حەقیقەتدا یەك موعجیزە بوو)[505]

ئەمە قسەی کەسێك نیە کە بۆ ئیسلام مرد بێ، بەڵکو کەسێکە پرۆفیسۆرە و بڕوای بە ئیسلام نییە و بۆچونێکی تایبەت و نامۆی لە بارەی بونی خواوە هەیە کە لە بێ بڕواییەوە سەرچاوەی گرتوە!

ئەوە دەوڵەتێك بوو، پیاوانی خوا، پاکانی خوا، سەربازانی نهێنی و ئاشکرای خوا دەیانبرد بەڕێوە، خۆیان دادەگیرسان هەتا میللەتان بەرچاویان رۆشن بێت، خۆیان دەتاواندەوە هەتا مرۆڤەکان بەختەوەر بن، خۆیان شەهید دەکرد هەتا هەر هەموو ئازاد بن و ستەمیان لەسەر بڕەوێتەوە. هۆی سەرکەوتنی ئەو دەوڵەتە بەسەر هەموو دەوڵەتەکاندا، ئەو سوپایە، بەسەر هەموو سوپاکاندا هەروا بە سەربوردێك باس ناکرێت. ئەوە یەکەم جار بوو جوتیارەکان ببینن، بەڵکو لە پێش (بابل و نینوی)وە، خەڵکی ناوچەی رەشەخاکی عێراق (سواد) نەیان دیوە، خاك و منداڵ و شەرەف و کەرامەتیان پارێزراو بێت، یان گوێ لە شکایەتیان بگیرێ.

کە ئەبوبەکر سوپاکەی نارد بە (ئوسامە)ی سەرکردەی وت: (لا تمثلوا، لا تقتلوا طفلاً صغيراً، ولا شيخاً كبيراً، ولا أمرأة) بۆ رووەك وتی: (ولا تعقروا نخلاً، ولا تقطعوا شجرة مثمرة) بۆ گیانداران وتی: (ولا تذبحوا شاة ولا بقرة ولا بعيراً الا لمأكله) ئەمە بۆ پارچەکانی لاشەیان، ئەنجا بە ناخ و نەفس و دەرونیانی وت: (ولا تخونوا ولا تغلوا ولا تغدروا)[506].لە سەرچاوەیەکی تردا ئەم زیادەیەشی بۆ هاتووە (و سوف تمرون بأقوام قد فرغوا انفسهم في الصوامع، فدعوهم وما فرغوا انفسهم له)[507]

---

505. هەمان سەرچاوە، ص٦٦.

506. من ذاكرة التأريخ الاسلامي: محىالدين اللباد، ص١٥. جنيف " دار الياس العصرية للطباعة.

507. تأريخ الاسلام: د.حسن ابراهيم حسن، ج١ص٢١٦.

بۆ سوپاکەی بەسۆز و میهرەبان بوو، وەك سەرکردەکانی تر نەبوون، سەربازی داماو بدەن بە هەموو چاڵ و چۆڵ و ئاگر و ئاسن و دەریا و رووبارێکدا و، نرخی سەربازەکانیان ئەزانی. عومەر بە نیعمانی وت، کە ناردی بۆ جەنگی نەهاوەند: (کە نامەم گەیشتە دەستت، بە پشتی خوا برۆ، بەڵام موسوڵمان مەدە لە قوڕ و لیتە و چاڵ و چۆڵ و، مافیان مەفەوتێنە، چونکە یەك پیاو لە موسوڵمانان لای من لە سەد هەزار دینار خۆشەویست ترە.)[508]

مشوری سەربازەکانی دەخوارد، لەیان ورد دەبویەوە، کە بینی رەنگیان تێك چوەو گۆڕاوە، بە پەلە نامەی نووسی بۆ سەعد: (وەڵامم بدەرەوە بزانم بۆچی رەنگی سەربازەکان گۆڕاوە.)، زانی خەتای هاڵاوی دجلە و فوراتە، بە پەلە نامەی بۆ سەعد نووسی کە شاری مەدائن بەجێ بهێڵن و لە جێیەکی تردا شارێك دروست بکەن. ئەوە بوو (کوفە) دروست کرا، کە ئاووهەوای وەك حجاز وا بوو.

پاشایانی فارس و رۆم داوایان دەکرد کە سەری فلان و فیساریان بۆ بهێنن، بەڵام جارێك سەری مشرکێکیان بۆ (ئەبوبەکر) هێنا. توڕە بوو، هەر خێرا بڕیارێکی دەرکرد بۆ هەموو سەرکردەکان و فەرموی: (لا یحمل اليَّ رأس، و الا بغیتم – اي جاوزتم الحد – ولكن يكفيني الكتاب والخبر). ئیمامی عەلیش وەسیەتی بۆ سەربازەکانی کرد، وتی: (اذا هزمتموهم، فلا تقتلوا مدبراً، ولا تجهزوا على جريح، ولا تكشفوا عورة، ولا تمثلوا بقتيل، ولا تهتكوا ستراً، ولا تدخلوا داراً الا بأذن، ولا تأخذوا من اموالهم شيئاً، ولا تعذبوا النساء بأذى وإن شتمنكم و شتمن امراءكم، واذكروا الله لعلكم ترحمون).

عومەر نامەی نووسی بۆ ئەبو موسا لە عێراق بەم جۆرە: (ئەگەر سەرپشك کران لە نێوان دوو کاردا یەکیان دنیایی بوو، ئەویان قیامەتی، ئێوە

---

[508]. تأريخ الطبري: ج٤،ص٢٣٤.

قیامەتیەکە هەڵبژێرن، چونکە دنیا فانیە و هەر قیامەتە دەمێنێتەوە و نافەوتێ.)[509]

بەلازەری دەگێڕێتەوە: (خەڵکی وڵاتی سەمەرقەند هاتن بۆ شکات بۆ لای عومەری کوڕی عەبدولعەزیز که شکاتیان له قوتەیبەی کوڕی موسلمی باهلی کرد بوو هاتوەتە شارەکەمان بە غەدر و بێ ئەوەی ئاگادارمان بکات و پرسمان پێ بکات و سوپای ئیسلامی تیا دامەزراندوە، عومەریش نامەی نووسی بۆ والی ئەو ناوچەیە کە دراوسێی بوو، داوای کرد شکاتی ئەوانە بەرز بکاتەوە بۆ قازی، ئەگەر بێ ئاگادارکردن چونەتە شاریان، ئەوا سوپای ئیسلام دەر بکەن له سەمەرقەند، قازی دادگای دامەزراند و نوێنەری هەموو لایەکی بانگ کرد، جمیعی کوڕی خاتری باجی نارد لێکۆڵینەوە بکات، دەرکەوت کە موسوڵمانەکان بێ ئاگادارکردنەوە و وتووێژ چونەتە شاری سەمەرقەند. لەبەرئەوە داوای کرد دەست بەجێ شارەکە بەجێبهێڵن! کە خەڵکی سەمەرقەند ئەوەیان بینی، بۆیان دەرکەوت، ئەگەر ئەمانە داگیرکەربونایە چۆڵیان نەئەکرد! ئەم جارە سوپای ئیسلام چونەوە قەراغ شار و سەرپشکیان کردن و، سێ ڕۆژ مۆڵەتیان دان، لەبەر ئەو حەقیقەتە خەڵکی شار موسوڵمان بوون.

کە قودس ڕزگار کرا، عومەر بۆ گاورەکانی نووسی، کە خۆیان و ماڵ و منداڵ و ژن و پول و پارەیان سەلامەتە و، کەنیسەکانیان کراوەیە و ناڕوخێ و داگیر ناکرێ!

ئەمە کاری موسوڵمانەکان بووە، هەرگیز بار نەبوون بەسەر میللەتانەوە، ڕەمزی دکتاتۆری نەبوون، وەك فیرعەونەکانی میسر ئەهرامیان بە خوێنی مەردم و بە کەڵەکەکردنی کەللە سەری کرێکار دروست نەکردوە، لە پاڵ ئەهرامەکاندا دۆڵ هەیە پڕە لە کەللەسەری ئەو سەدان هەزار کرێکارەی کە بوون بە ژێر تاشە بەردو دیواری بەرزی ئەهرامەکانەوە، بەڵام ئیسلام

---

509. رسائل الفاروق: رسالة رقم (١٥٨)، ص٩٥.

ئاسەوارێکی ئاوای لەبەردی تاشراو جێنەهێشتوە، بەڵام سەدان شوێنەواری زانستی‌و رەوشتی‌و شارستانی جێهێشتووە. بەڵکو بێ بڕواکان لە خاکی ئیسلامدا ئازاد بوون عارەق بخۆنەوە، بت پەرستی و خوا پەرستی و شێوازی خۆیان بە پێی ئاینی خۆیان بکەن و زەرەری بۆ موسوڵمانان نەبێ.

جارێك (عومەیر کوڕی ئەسعەد)ی فەرماندە لە خوێندنەوەی راپۆرتی چالاکیەکانی خۆی لە بەردەم خەلیفە عومەر دا – رەزای خوای لێ بێت – ئاگاداری کرد کە لە نێوان سوپای ئیسلام و رۆم دا شارۆچکەیەك هەیە بە ناوی (عەرەب سوس) کە هەواڵ و جموجوڵ و نهێنی ئێمە دەبەن بۆ دوژمنەکەمان کە (رۆم)ە، خیانەتیان لێ دەرکەوتوە. عومەری کوڕی خەتاب بە عومەیری وت: کە گەڕایتەوە سەرپشکیان بکە لەوەی کە بیان دەیتێ لە جێگەی مەڕێك دوو مەڕ، لە جێگەی مانگایەك دوو مانگا، هەر شتێك دوو قاتیان بدەرێ، ئەگەر رازی بوون ئەوا بیان دەرێ و، بیان گوازەرەوە، ئەگەر نەیان کرد بچۆ بۆ لایان و مۆڵەتی یەك ساڵیان بدەرێ، پاشان جەنگیان لەگەڵ بکە.)

لە جیهانی ئەمڕۆی خۆمان دا خیانەت توندترین سزای هەیە و، دێیەکی وا بە یەك موشەك سەرەوژێر دەکەن! بەڵام عومەر تەعویز و مۆڵەتیان بۆ ئامادە دەکات.

لیوا روکن مەحمود شیت خەتاب دەڵێ: (ئەوەی لەمانە روی داوە، هیچ یاسایەکی تر بە یاسا نێو دەوڵەتیەکانیشەوە نەیان گەیشتوەتێ. ئەمانەی ئەمڕۆ ئەگەر شتێکی واشیان نووسی بێ، هەر مەرەکەبی سەر کاغەز بووە.

خەڵکی کوفە شکاتیان لە سەعدی کوڕی ئەبی وقاس کرد کە والی عێراق بوو، عومەر (موحەممەدی کوڕی سەلمە)ی نارد کە سەعد بهێنێ. هەرچەندە لەو کاتەدا سەرگەرمی جەنگێکی قورس بوون. بە عومەریان وت با دوای جەنگ بێت، فەرمووی: ئەگەر بە غیابی ئەو دوژمن دێتە سەرتان، دەبێ بێت، ئەوە بوو هێنای و دادگایی کرد.

نامەیەکی بۆ (ئەبو موسای ئەشعەری) والی بەسرە نووسی: (سەر بدە لە نەخۆشیان، لەگەڵ جەنازەیان برۆ، با دەرگات هەمیشە کراوە بێت، بچۆ بەدەمیانەوە، تۆش یەکێکیت لەوان، بەڵام چییە. بارەکەت قورس ترە. بیستومە ماڵ و خێزان و جل و خواردن و سواریەکەت وەکو هی موسوڵمانان نیە و، جیاوازە. (ئەی ئەبو عەبدوڵڵا) رجات لێ دەکەم نەچیتە ئاستی وڵاخەوە. کە دەگاتە هەر چەم و دۆڵێکی سەوز و پاراو، خۆی تێ هەڵدەسوێ و ورگی لێ پڕ دەکات. وڵاخ تەنها بۆ قەڵەوی دروست کراوە، نرخی ئەو لە قەڵەوی دایە. بەڵام ئەی ئەمیر بزانە ئەگەر غەل و غەشت تێ کەوت، ئەوا رەعیەتەکەشت وای لێ دێ و لە تۆوە توشی خراپە دەبن. وە خراپترین کەس ئەوەیە، کە گەلەکەی لە ئەمیرەکەیەوە فێری خراپە ببن.)[510]

---

510. کنـز العمال: ج٨ ص٢٠٩.

## عومـــەر لەبـــــەردەم گرفتەكاندا

### چارەسەری عومـــەر بۆ گرفتەكان: بێ بارانی و برسیەتی

عومەر كە بیری لە چارەسەركردنەوەی گرفتێك دەكردەوە، هەموو گیانی بۆی دەهەژا ئێی نەدەگەڕا هەتا چارەسەرێكی بنچینەیی بۆ دەدۆزیەوە، ئەمە نمونەیەكی بەرزە كە عەقڵیەتی خەلیفە عومەر نیشانەدا كە چۆن بەرامبەر گرفتەكان دەوەستا.

ساڵ (١٨)ی كۆچییە. ناوچە حیجاز و دەوروبەری شاری مەدینەیە، گرفت برسێتییە. ساڵەكەی نەهات بوو، باران نە ئەباری، هەموو شت روو لە كزی و لاوازی و وشك بوون بوو ئەو ساڵەیان ناونا بە ساڵی رەمادە

ئیمامی تەبەری ئاوا وەسفی دەكات: (ان الارض كانت تسفی إذا ريحت تراباً كالرماد، فسمىً ذلك العام عام الرمادة.)، پاشان دەڵێ: (رمادە - برسێتی‌یەك بوو توشی خەڵك بوو لە شاری مەدینە و دەوروپشتی، وای پێكردن، تەنانەت دڕندەكانی كێو و بیابانیەكان خۆیان خزانە دەوروپشتی شارەكان، پیاو مەڕێكی سەر دەبڕی و لە پیسایی ناوسكی خۆیان تێر دەكرد). (ئیبن سەعد) لە (طبقات الكبری)دا دەڵێ: (لە ساڵی ١٨ كۆچی‌دا كە یەكەم ساڵی قات وقڕی بوو، خەڵكی توشی برسێتی و نەهامەتی بوو، بۆ ماوەی نۆ مانگ.) پاشان دەڵێ: (خەڵك تەنگەتاو بوون، وڵات وشك بوو، مەڕوماڵات تیاچوون، خەڵكی بە دوای كونی مشك و جرج و قرژانگدا دەگەڕاو هەڵی دەكەند و سودی لێ دەبینی. زەوی رەش داگەڕا، وەكو خۆڵەمێشێكی لێ هات.)، (زەوی وشك بوو، خواردن كەمی كرد، كشت وكاڵ نەما، هۆیەكانی پەیداكردنی رزق و رۆزی تیاچوو، پارە نەما. مردن زۆر بوو، نەخۆشی تەشەنەی كرد، هەژاری باڵی رەشی بەسەر ناوچەكەدا كێشا، خەڵكی دەرەوە رویان كردە شار و جێگە و رێگە نەما).

لێكۆڵەرەوان هۆی برسیەتیەكە بۆ چەند خاڵێك دەگێڕنەوە.

١- ئەو ساڵە باران نەباری.

٢- موسوڵمانان ناوچەکانیان جێهێشت، رویان کردە دەرەوە بۆ جیهاد لە عێراق و وڵاتی فارس و شام و میسر. کەس نەما گوێ بدات بە کشت وکاڵ و ئاودێری و حەیوانداری و لەوەڕگا.

٣- عومەر جولەکەکانی دورخستەوە لە نیوە دورگەی عەرەب، بە تایبەتی جولەکەکانی خەیبەر، کە بەروبومی کشت وکاڵی زۆریان بەرهەم دەهێنا و، ناوچەیەکی بە پیت و فراوان بوو، بە تایبەت بۆ گەنم و جۆو خورما، کە زۆر ناوچەی نیوەدورگە پشتیان پێ دەبەست، کە دورخرانەوە بوو بە هۆی کەمی بەرهەم هێنان.

٤- ئەم قات وقڕیە رێك لەگەڵ بڵاوبونەوەی نەخۆشی تاعونی شام دا یەکی گرتەوە، هەردووکیان لە یەك ساڵ دا بوون.

خەلیفە عومەر هەستی بەوە کرد کە ئەم کاریسەیە ئاسەواری خراپی دەبێت لە داهاتودا، بۆیە دەم ودەست کۆمەڵێك چاکسازی ئابوری ئەنجام دا:

١- عومەر خۆی پێشەنگی موسوڵمانان بوو، کۆمەڵێك کاری لەسەرخۆی ئەنجام دا. لە کاتی خواردنیدا هەمیشە چەند کەسێکی بانگ دەکرد لەگەڵیدا نان بخوات،، کابرایەك وتی: من رۆن زەیتم لە زوەوە نەخواردوە، عومەر دەست بەجێ سوێندی خوارد، کە نابێ گۆشت و چەوری بخوات، هەتا خەڵك دەبوژێتەوە و خواردنی تەواویان دەست دەکەوێت. دەیوت: من چۆن هەست بە ئازاریان دەکەم، ئەگەر ئەوەی توشی ئەوان هاتوە توشی منیش نەبێت! لەبەرئەوە خواردنێکی دەخوارد کە عامەی خەڵك بیخواردایە. زۆربەی خواردنی زەیت و نان بوو، تەنانەت کاری کردە سەر تەندروستی و، سکی کەوتە قوڕە قوڕ. ئەویش دەستی دەدا لە ورگی و دەیوت: (بێ دەنگ دەبی، یان بێ دەنگ نابی. سوێند بە خوا گۆشت و چەوری ناخۆیت هەتا منداڵی موسوڵمانان تێر نەخۆن.) یان لە جێیەکی تردا دەڵێ: (کەم بقوڕێنە، لەوە زیاترمان لا نیە، هەتا موسوڵمانان دەبوژێنەوە.) ئەو جۆرە خواردنەشی فەرز کرد بەسەر خاو وخێزانی دا. هەتا هەست بە ئازاری خەڵکی بکەن. جارێك

کاڵەکی بینی بە دەست منداڵێکی خۆیەوە وتی: بەخ بەخ ئەی کوڕی ئەمیری بڕواداران، میوە دەخۆن و میللەتی محمد خەریکە تیا دەچن.

٢ـ بە پەلە نامەی نووسی بۆ هەموو ویلایەتەکان کە فریای خەڵکی مەدینە و دەوروبەری بکەون، ئەوانیش دەست بەجێ ئەم کارانەیان ئەنجام دا:

ا – کەل و پەل و خواردەمەنی و یارمەتی لە شامەوە هات، کە معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان ناردبوی.

ب – یارمەتی خواردەمەنی لە میسرەوە هات، کە عەمری کوڕی عاس ناردبوی.

ج– والی کوفەش خواردەمەنی لە عێراقەوە نارد.

٣ـ عومەریش یەکێك بوو لەوانەی کە لە ناو لیژنەی دابەش کردنی خواردەمەنی دا بوو، بە کۆڵ خواردنی دەگەیاندە برسیەکانی(بەنی مەحاریب) ئەسلەمی مەولاشی لەگەڵدا بوو.

٤ـ لیژنەی زۆری دروست کرد بۆ گەیاندنی یارمەتی و خواردەمەنی بۆ خێڵ و هۆزەکانی دەرەوەی مەدینە.

٥ـ عومەر خۆی روی کردە خواو دەستی دوعاو نزای بەرز کردەوە. داوای کرد لە خەڵکیش بەشداری بکەن، لە خوا دەپاڕایەوە: (خوایە بە قاتو قڕیو برسیەتی لەناومان نەبەی، ئەم بەڵایەمان لەسەر لابەرە). بە خەڵکی دەوت: (تەوبە بکەنو خێرا دەست بەرزبکەنەوەو داوا لە خوا بکەن دڵمان چاك بکاتو یەکمانن بخاتو بەزەیی پێماندا بێتەوەو ئەو بەڵایەمان لەسەر لابەرێت)

٦ـ نامەی نارد بۆ هەموو ولایەتەکان کە لە یەك کاتی دیاری کراودا پێکەوە نوێژی باران بارین بکەن. خۆی هەڵسا و بە هاوڕێیەتی عباس کوڕی عەبدولموتەلیب مامی پێغەمبەر، دەستی گرت و بەرزی کردەوە، وتی: (خوای گەورە لەبەر خاتری مامەی پێغەمبەرمان ئەم بەڵایەمان لەسەرلابەرەو بارانمان بۆ ببارێنە) هێشتا نەگەڕابونەوە، کە هەور هەڵی کردو باران داباری و چەند رۆژ درێژەی کێشا.

٧ـ ئەو قات و قڕیە چەند ئەنجامێکی چاکی دا بە دەستەوە و، موسوڵمانان بینیان کە سیاسەتی شەرعی لە کاتی پێویستدا دەگۆڕێ:

أ ـ لە کاتی برسیەتی دا، چەند دزیەك کرا، عومەر دەستی نەبڕین. بڕیارێکی حەکیمانە بوو.

ب ـ ئەو کاتە زەکاتی دواخست و لیێ ی وەرنەگرتن، بەڵام ساڵی داهاتوو باران و بەروبوم زۆر بوو، دوو قاتی لیێ وەرگرتن. بۆچوونێکی زیرەکانە بوو.

ج ـ دوای داوا لە خوا، داوای لە هەرێمەکان کرد بگەنە فریای بۆ یارمەتی.

د ـ دیوانی عەتا(الجند)ی دروست کرد، لە مانگی محرەم ساڵی ٢٠ کۆچی دا کە ڕێکخستنێکی مالیەی زۆر سەیر بوو بۆ دەوڵەتی ئیسلامی.

هـ ـ دوای ئەوەی داوای کرد لە عەمری کوڕی عاسی والی میسر کەناڵێك هەڵبکەنێ، ئاوی نیل بگەیەنێ بە دەریای سور، عەمرو هەڵی کەندو ناونرا (کەناڵی ئەمیرولموئمنین) کە دەستکەوتێکی ئابوری زۆر بەهێز بوو.[511]

تەبەری دەڵێ لە دوعاکەدا وتی:(اللهم اياك نعبد واياك نستعين، اللهم اغفر لنا وارحمنا وارض عنا، اللهم عجزت عنا انصارنا و عجز عنا حولنا و قوتنا وعجزت عنا انفسنا ولا حول ولا قوة الا بك، اللهم اسقنا واحي العباد والبلاد)[512]

ئیبن جەوزی دەڵێ: (ئەو ساڵە خەلیفە عومەر ماست و گۆشت و چەوری و خواردنی خۆشی لە خۆی گرتەوە.)[513]

عومەر بیستی کە (فیروزی دەیلەمی) ئەمیری یەمەن بوو خووی داوەتە خواردنی هەنگوین بە نانی سپیەوە (لیباب) دەست بەجێ نامەیەکی بۆ نووسی بەم جۆرە: (اما بعد فقد بلغني انه قد شغلك اكل اللباب بالعسل، فاذا اتاك كتابي هذا، فاقدم على بركة الله فاغز في سبيل الله.)[514]

---

511. مجلة المستقبل الاسلامي: العدد٧٦. زيد محمد الرماني.

512. تأريخ الطبري: ج٤ص٢٢٤.

513. تأريخ عمر: ابن جوزي، ص٥٠.

514. رسائل الفاروق: عبداللطيف الجبوري، ص١٣٦، رسالة رقم (٢٤٢).

(فیروز) یەکێك بوو لە ئەمیرە فارسەکان کە حوکمی یەمەنی دەکرد، پاشان موسوڵمان بوو (ئەسوەدی عەنسی) کە داوای پێغەمبەرایەتی دەکرد، فیروز شەوێك هەڵساو چوو کوشتی ،، پێغەمبەر (ﷺ) لە مەدینەوە فەرمووی (قتل اللیلة الاسود العنسي الكذاب، قتله العبد الصالح فیروز الدیلمی).

## دروستبوون و رووخانی شارستانیەکان

مێژوونووس و لێکۆڵەرەوان، لە مێژووی مرۆڤایەتیدا (٢١) شارستانی زۆر مەزنیان ژماردەکردووە، لەوانە (١٥) دانەیان لەناوچوون‌و تووشی خۆکوشتن بوون، ئەوانی تر بە هۆی ترەوە لەناوچوون‌و داڕوخاون.

دروست بوونی شارستانی هۆی زۆرە. هەروەك هۆی روخاندنیان زۆرە. شارستانی بوە نەهامەتی و برسیەتی و قات وقڕی بناغەی دروستبوون. هەیان بوە بیرۆکەیەك ناوك بوە و پاشان قاڵب و دەوڵەت و شارستانی بۆ دروست بوە. هەیە وای بۆ دەچێت کە پەیوەندی بە جۆری سروشت و ژینگە و بیئە و جۆری زەویەوە هەیە، هەندێکیش دەڵێن پەیوەندی بە هێزی رەگەز (توخم)ەوە هەیە، واتە هەموو رەگەزێك ناتوانێ شارستانی بنیات بنێ. بەڵکو بە پێچەوانەوە هەموو رەگەزێك بۆی هەیە دیواری شارستانی هەڵچنێ، چونکە لە دنیادا رەگەز نیە بەرز بێ و رەگەز نیە هیچ و نزم بێت![515] هەیە بەلایەوە وایە تەنها ئابوری دەستی هەیە لە سازدانی شارستانیەکاندا. ئەگەر رەگەز و ژینگە تەنها هۆ بونایە، عەرەب لەو بیابانە وشکەدا نەیدەتوانی لەو کاتی نەهامەتی خاك و روشنبیریەوە هەنگاو بۆ شارستانی ئیسلام بنێ و، توخمی عەرەب بۆی نەبوو ریادەی عالەم بکات. بەڵام کە بیرۆکەی ئیسلام هەڵدەگرن، سنوری توخم و بیئە و جۆری زەوی دەشکێنن و هەردوو ئیمپراتۆریەتی فارس و رۆم لەسەر زەوی واقیع دەسڕنەوە. شارستانی بوە لە خاکێکی نشێوی وەك عێراق (میزوپوتامیا) و میسری فرعەونی دا دروست بوە. شارستانی ئیسلام لە بیابانی نیوە دورگەوە تۆقی‌و ترۆقی دا بە ژیان، شارستانی هیتیەکان و مەکسیك لە بان و گردۆڵکەکانی ئەنادۆڵ و مەکسیکەوە سەرچاوەیان گرت، شارستانی ژاپۆن و یونان دوورگە بوون و چوار دەوریان ئاو بوو، وە هۆیەکی سروشتی لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی جوێ

---

515. التأريخ و كيف يفسرونه من كونفوشيوس الى توينبي: البان. ج. ويدجري، ترجمة عبدالعزيز توفيق، ص٢٣١، قاهرة ١٩٧٢.

دەکەنەوە. کەواتە بنیات نانی شارستانی پەیوەست نیە تەنها بە خاك و جۆری زەوی و ئابوری یان توخم (رەگەز)ی مرۆڤ و سروشتی شوێن و مرۆڤەکانەوە. بەڵکو پەیوەستە بەو هەلەوە کە بۆ ئەو ـەیە دەرەخسێ.

لێکۆڵەرەوان، هەمان ئەو هۆیانە و زیاد لەوانەشیان کردوەتە هۆ بۆ لەناوبردنی شارستانیەکان، (توینبی) دەیگێڕێتەوە بۆ هۆی لە ناوچونی وزەی داهێنەری ئەو شارستانیە و لای وایە هەر کات داهێنان و دروست کردن نەما، ئیتر کاری چاولێکردن و دواکەوتنیش نامێنێ، داهێنەران کەسانێکن یاخود چەند دەستەیەکن، ناتوانن بەرەو پێشەوە برۆن ئەگەر خەڵکی دەوروبەریان لەگەڵ خۆیان نەبەن. تاکیش بونەوەرێکی کۆمەڵایەتیە ناتوانێ ئاواتەکانی بە تاکی بهێنێتەدی، هەتا لە چوارچێوەی دەوڵەت دا پەیوەندی بەخەڵکەوە نەبەستێت، دەوڵەت تاك و کۆمەڵ دەپارێزێت، ئامانجە رەواکانیان دەهێنێتە دی.[516]

کاتێك سەرکردەکان لە داهێنان دەکەون، ناچارن ئەو هێزەی بە دەستیانەوەیە بەخراپە بەکاری بهێنن، ئەوسا جەماوەر دەستەوسان نابێ بەرامبەر ئەو دەست خاڵی و هیچ پێنەماوانە، بەڵکو دەبێتە ئۆپۆزسیون و، راپەڕین دەکاو شۆڕش هەڵدەگیرسێنێت.

شارستانیەك کە کۆن و پتورکاو بوو، پینە ناکرێ، هەموو دەست تێوەردانێکی ماندوکردنیەتی و لەناوچونی خێراتر دەکات! توینبی دەڵێ عیسا وتویەتی: (کەس لە ئێوە پینەیەکی نوێ لە کراسێکی کۆن نەدات، چونکە نوێیەکە کۆنەکە زیاتر دادەڕزێنێ)[517]

توینبی لای وایە کۆمەڵگا حاڵەتی هەرەس هێنانی بەم شێوەیە دەبێت:

١. کەمینەیەکی کاربەدەست توانای داهێنانی نەماوە و، بە زەبروزەنگ کار دەگێڕێ.

---

[516]. بحث في التأريخ: ارنولد جوزيف توينبي، دى. سى. سمرفل كورتى كردوەتەوەو طه باقى وەرى گێڕاوە بۆ عەرەبی، ج١ص٤٠٢.

[517]. انجيل متي ـ ٩: ١٦–١٧، توينبي: ج١ص٤٠٥.

٢. چینی خوارەوەی رەش و روت (پرۆلیتاریا)، کە هەست دەکەن بەشیان دەخورێ " شۆڕش و راپەڕین دەکەن لە دژی ئەو کەمینەیە.

٣. پرۆلیتاریایەکی دەرەوەی دەسەلات لە کۆمەڵگا بچڕاوە و بەرهەڵستی پێوەست بوون دەکات و چاوەڕوانی هەلی پەلاماردانە.[518]

بەلام هاتنی شارستانی ئیسلامی و سەرهەلدانی لەو کاتە گرنگەدا، زەرورەتی وەخت بوو، وەلام دانەوەیەك بوو بۆ داڕوخان و ئیفلاسی شارستانی فارسن و رۆم ، بۆ هێرشەکەی ئەسکەندەری مکدۆنی (٣٣٠ – ٣٢٥پ.ز) کە پێش هەزار ساڵ لەوەوبەر کردی، ئەسکەندەر هەموو ئاسەواری فەرهەنگ و رۆشنبیری و ئایدۆلۆژی و دینی گەلانی ناوچەکەی سوتاند، بۆشاییەکی گەورەی لە فکر و عەقلیەتی خەلکی ناوچەکەدا دروست کرد. ئیسلام کە هات ئەو بۆشاییە ئاینی و رۆشنبیری و فەرهەنگیەی پڕ کردەوە، نەك هەر ئەوەندە بەلکو بە شێوەیەکی پاکتر و چاکتر و، بەهێز و بە پێزتر و، لە شێوەیەکی نوێ تردا، کە بە عەقلیەتی سەردەم بخوات، دای رشت و بە فراوانتر بۆشایی هەموو لایەنەکانی ژیانی مرۆڤایەتی پڕکردەوە و، مەزنایەتی بۆ رۆژهەلات و زەمین رۆشنی بۆ کۆمەلگای مرۆڤایەتی سەر زەوی سەندەوە.

حکومەتی ئیسلامی وەکو حکومەتە خەیالاویەکەی ئەفلاتون (کۆماری ئەفلاتون) نەبوو، کە هەتا خۆی لە ژیاندا بوو، جێبەجێ نەبوو، ئەوە بۆ زیاتر لە دوو هەزار ساڵە ئەفلاتون مردوەو تیورەکەی بەردەوام مرەکەبی سەر کاغەزە و تەنها لە بەرگی کتێبەکاندایە.

ئیسلام بە خەیاڵ نەژیاوە، ئەوەی باوەڕی پێ‌ی بوە، پێش ئەوەی لەسەر روپەڕی کاغەز و دەفەی چەرم بینوسێ، لە تەرزی واقیعدا جێبەجێی کردوە، خوای گەورە تیۆرێکی مردوی ناوێت کە بە مرۆڤ جێبەجێ نەکرێت و لە بەشی مستەحیلات بێت، تیۆرو بیرۆکەیەك کەلکی چ‌یە کە لە چوار دیواری ژورێکی بچوکدا بنوسرێ و توانای هاتنە دەرەوەی ناو خەلکی نەبێت!

---

518. گۆڤاری رۆشنبیری نوێ. ژمارە () ل١٣، د.محسن محمد حسین.

شارستانی ئیسلامی شۆڕشی برسیەکان نیە وەك هەندێ بۆی دەچن.
شارستانی ئیسلامی بە رێکەوت دروست نەبوە، وەك (توینبی) رەخنەی لە کردار یان تیۆری رێکەوت دەگرت و دەیوت: (تیۆری رێ [illegible] ، لە نرخی کردار و ویستی مرۆڤانە کەم دەکاتەوە).

## هۆکانی روخانی ئیمپراتۆریەتی فارس و رۆم

لە ژیانی مرۆڤایەتیدا شارستانی زۆر هەبووە، ماوەیەك ژیاون پاشان ون بوون. یان یەکتریان خواردوە. یان خۆیان کوشتوە.

شارستانی ئیسلامی لە کاتێکدا هاتە ژیانەوە، کە هەردوو شارستانی فارس و رۆم بەربووبونە خۆیان، یەکیان دەخوارد و یەکیان کەلەپاچە و شپرزە کردبوو، ماندو بووبون، هیچ بیرۆکەیەکیان لە مەخزدا نەمابوو لە سەری بوەستن، بوو بونە بار بەسەر گەلانەوە. لە گەرمەی ئەو روداوانەدا (محمد) لە بیابانی نیوە دورگە و، هەرێمی وشك و بێ ئاو و بێ رۆشنبیری و شارستانییەوە لە دایك بوو، گەورە بوو، جەنگی فارس و رۆمیش گەورەتر دەبوو، ئایەت و قورئانی بۆ دەبارایە خوارەوە، کە گەلێکی نمونەیی لەو خاکە وشکەدا پەروەردە بکات، توانای ئەوەی هەبێت، ئەو ئاشە گەلان هاڕە بوەستێنێ و، دەستێك بەسەر میللەتانی ماندو و سەرلێ شێواودا بهێنێ. قورئان دابەزی گرۆیەگی زۆری نمونەیی لە دەوروبەری مەککە و مەدینە دا دروست کرد، بەبێ پرسی موحەممەد و ئاینەکەیان دەستیان بە ئاودا نەئەکرد، بەچییاندا بدات ئامادەبوون، نیوە دورگەی تەواو کرد، بریاری دا ئاینی نوێ بگەیەنێتە گەلانی دراوسێش، بەلام ئەو دوو زۆردارە ناهێڵن.

سەرەتا لە خۆیانەوە دەستی پێ کرد (١٥) نامەی نارد بۆ پانزە پاشا و خستیە ناو کۆشك وماڵەکانیانەوە، (٥٠) نوێنەری نارد بۆ لای سەرەك خێڵ و عەشیرەت و ناودارانی دەرەوەی نیوە دورگە، نیازی بوو ئیسلام کە خوا داوای لێ کردوە، دەبێ بیدات بە گوێی هەموو میللەتانی جیهاندا. بە ئاشتی و نامە و نوێنەر و رون کردنەوە و شێوازی پاك و شیرین بلاو بکاتەوە، هەمیشە ئەو شێوازە جێگە زۆرتر دەگرێ و، دامەزراوتر و بەرهەمی باشتر دەدات، قەناعەت کردن بە بەرامبەر، وەك کێو بناغە دادەکوتێ. بەلام ئەوەی بە شمشێر بیدەیتە بەرامبەر و بە زۆر بیچەسپێنی. بەبێ شمشێر دەیدەنەوە. نامەکانیان هەڵدا و رۆیشت و گەیشتن و وەلامەکان جیاواز بوون، هەبوو دەیخستە سەر چاوی و

خۆی و گەلی موسوڵمان دەبون، هەبوو نامەی وەڵامی دەنوسیەوە و دیاری و پێشکەشی زۆری دەنارد، هەبوو نامەکەی دەدڕاند و دەیدا بە سەر و چاوی نوێنەردا و بە جنێو دەری دەکرد، هەبوو نوێنەرەکانیان دەکوشت. بەڵام بە هەمویەوە هەنگاوێکی سەرکەوتوو بوو، حوجەی چاکی دەدایە بەرامبەر، هەرچەندە لەگەڵ ئەو قەبارە زۆرەدا بەرهەمی کەم بوو، دابەزین لەسەر کورسی زەحمەتە و، هاتنەوە ئاستی رەعیەت زەحمەت ترە بۆ هەندێك. وایان دەزانی ئیسلام ئەوان نەوی دەکا و دەسەڵاتیان لێ دەستێنێتەوە.، هەرچەند لە نامەکاندا هاتبوو، ئەگەر باوەڕ بهێنن، خۆتان حوکمی خۆتان بکەن و ئێمە نایەین بەلاتاندا. بەڵام سودی نەبوو، وا وردە وردە خەریکە فارسەکان دەست دەخەنە کاروباری نیوە دورگە و فتنەیی دەنێنەوە و سەرەك خێڵەکان لە موسوڵمانان هان دەدەن، هەرقلی رۆمیش سوپایەکی گەورەی کۆکردبویەوە بێتە سەر مەککە و مەدینە. پێغەمبەری خوا دەست پێشکەری کرد و لەسەر شێوازی سەربازی، (کێ یەکەم جار دەستی وەشاند جەنگەکە دەباتەوە.).

دکتور یوسف قەرزاوی لە دیمانەکەیدا لەگەڵ کەناڵی ئەلجەزیرە وتی: (ئەو نامە و نوێنەرانە بۆ ئەوە بوو کە میر و مەلیك و پاشاکان رێگە بدەن گەلەکانیان گوێ لە پەیامی خوا بگرن. کە ئەوان نەیانهێشتوە شەڕیان لەگەڵدا کراوە، ئەوان قفڵیان دابوو لە دەمی میللەت نەیان دەهێشت کەس وەڵام بداتەوە. موسوڵمانان دەیان وت: ئەرێ خەڵکینە ئێمە گەلێکین پەیامێکمان پێیە، داواتان لێ دەکەین گوێمان لێ بگرن و لێمان وەرگرن، داوا لە دەسەڵات داران دەکەین رێگریمان نەکەن ئەگەر بە گوێیان کردین ئەوا باشە، دەنا دەبێ بە هەر شێوازێکی تر بوە بگەیەنرێ، ئەمەش پاراستنی سەروەرێتی بەرامبەرە کە پرسی پێ دەکەیت. (ئەرنۆڵد) کە نووسەرێکی ناسراوە بابەتێکی نوسیوە لە بارەی فتوحاتی ئیسلامیەوە دەڵێت: هەرگیز روی نەداوە موسوڵمانەکان بە زۆر دینی خەڵکی بگۆڕن بۆ دینی خۆیان و، بە زۆر خەڵکی موسوڵمان بکەن).

موسوڵمانەکان ناچار بوون ئەو دەستە لابەن کە بەری ئاینی خوا دەگرێت. ئەو بەر گرتنە فیتنەیە، (وقاتلوهم حتى لا تكون فتنة)، بۆ رزگار کردنی ئەو

گەلانەیە کە چاوەڕوانن مژدەکانی ئنجیل و تەورات و ئاوێستا بێتە دی، ئەوا هاتوە و دەسەڵات دارەکانیان ڕێگە نادەن پێیان شاد بن. لەبەرئەوە بوو کە حیوار و وتووێژی هێمنانە شکستی هێنا، سوپا کۆکرایەوە و نێررا، لە ماوەی (٢٥) ساڵدا هەردوو ئمپراتۆریەتی فارس و ڕۆم کە دوو شارستانی بون و بەرەو خۆکوشتن و خۆخواردن و پوکان دەچون لە ناو بران و، شارستانیەکی تر، بە هێز و گوڕ و بیر و ئاینێکی نوێ وە هاتە گۆڕێ، کە هیچی لەوانەی پێشو نە ئەچوو.

(ویل دیورانت) فەیلەسوفی ئەمریکی دەڵێ: (بە ڕاستی سوپای ئیسلام چاکتر بوو لە سوپای فارس و ڕۆم، لە روی ڕێکخستنەوە و، باشترین سەرکردایەتیشی هەبوو. ڕاهاتبون لەگەڵ زەحمەت و نارەحەتی و خۆگرتندا. دەیانتوانی بە سکی خاڵی بجەنگێن و پشت بە سەرکەوتن ببەستن، هەرگیز لە جەنگەکاندا درەندە نەبوون.)[519]

ئەم روخان و دروست بونانە، ئەم پوکان و ناو نەمان و سەرهەڵدانانە، هۆیان زۆرە و هەریەکە بە جۆرێك باسی کردوە.

---

[519]. قصة الحضارة: ول ديورانت، ج١٣ص٦٦.

## هۆی شکستی شارستانیەتی فارس و رۆم:

١. بێ بڕوایی.

٢. تێك چونی کاروباری بەڕێوەبردن.

٣. نەبونی سەرکردایەتیەکی ژیر کە بتوانێ وەڵامی ئەو هەموو هەلە لەبارو نامە و نوێنەر و ئاشتی و دەست پێشخەریانەیان بدایەتەوە.

٤. رۆ چون لە هەموو کارێکی خراپ دا.

٥. ئاڵۆزی کار و فرمان و یەك نەگرتنی راو بۆچوونی پاشاو سەرکردەکان

٦. لە خۆبایی بوون و گاڵتەکردن بە موسوڵمانەکان، یەزدگورد پاشای فارس بە وەفدی ئیسلامی دەگوت: هیچ گەلێك لە ئێوە نەزان و دواکەوتوتر نیە بۆیە وازمان لێ هێنا بوون، ئەوەبوو بە کەم سەیریان دەکردن و هێزی سەرکەوتنیان تیا نەدەبینین.

٧. هەندێ لە هۆزە عەرەبەکانی شام، رازی نەبون ببن بە گاور و، بچنە ژێر رکێفی رۆمەکانەوە، ئەوەبوو بەرەنگاری سوپای رۆم بونەوە، نوێنەریان نارد، داوای یارمەتیان کرد لە موسوڵمانەکان، ئەبوبەکر یارمەتی بۆ ناردن، ئەمە یەکیەتی و، کۆبونەوەی هۆزە عەرەبەکانی پێك هێنا. بۆ دوژمنایەتی و رق لێ بوونی رۆم و سەرخستنی ئیسلام.

٨. باج و پیتاك و سەرانە کۆڵی میللەتانی ئەوکاتەی کوتا بوو، بێزار بوو بون لە فارس و رۆم و چاوەڕوانی رزگارکەرێك بوون.

٩. گرۆیەکی گاوری کەم لەسەر حوکمی رۆم، گرۆهە گاورەکانی تری دەچەوساندەوەو، بە ئەشکەنجە و راونان و لەناوبردن بێزاریان کرد بوو، بە نزیك بونەوەی سوپای ئیسلام مژدەکانی ئنجیل و تەوراتیان دەهێنایەوە دی و لە رقی رۆم موسوڵمان دەبوون.

۱۰. گەرم و گوڕی سوپای ئیسلام و، بەرزی گیانی جیهاد و تێکۆشان و فیداکاریان لە پێناوی سەرخستنی ئاینی ئیسلامدا، ئەو ورەیە تەکانی پێدەدان بۆ پەلاماردان و چوونە پێشەوە.

۱۱. رەوشت و خوی فارس و رۆم داڕوخا بوو هیچ بەهایەکی مرۆڤی تیا نەمابوو، لەناو سوپای ئیسلامیشدا خۆشەویستی و برایەتی و بۆ یەك ژیان و سەرخستنی یەکتر بە ئاشکرا دەبینرا.

۱۲. روونی ئاینی ئیسلام و سادە و ساکاری و دەرو ناو پاکی موسوڵمانان و، ئاڵۆزی و دەستکاری کردنی ئاینی گاور و تێك چونی باری دەرونی و رەوشتی گاورەکان هۆیەکی گرنگ بوو.

۱۳. موسوڵمانەکان سەرپشکیان دەکردن لە نێوان سێ خاڵ دا: موسوڵمان بون، جزیەدان، شمشێر کە لە داگیرکردن نەئەچوو، بەڵکو بە رزگارکەریان دەزانین.

۱٤. هەموو فتوحاتێك داوای فتوحات و سەرکەوتنی تری دەکرد، هەموو ناوچەیەك ناوچەیەکی تری فراوان تر و بە پیت تر و، وڵات و میللەتی نوێ تری رادەکێشا. لەبەرئەوە فتوحاتی ئیسلامی لە هەموو فتوحاتەکانی تری مێژووی مرۆڤایەتی خێراتر و دامەزراوتر بوو، لەبەرئەوە فتوحاتی ئیسلامی بە مەزنترین کاری سەرسوڕمان دادەنرێ لە مێژووی جەنگیدا.

۱۵. سوارچاکی سوپای ئیسلام و، خێرایی جوڵەی سەیریان لە هێرش و راونان و پەلاماردا، لەبەرئەوە هەر لە یەکەم پەلاماردا، ورەی بەرامبەریان دەڕوخاند، هیچ جەنگێك نیە سوپای ئیسلام دەست پێش خەری نەکرد بێ.

ول دیورانت دەڵێ: جولەکە دڵخۆش بوون کە موسوڵمانان لە دەستی حاکمە زۆردارەکان ڕزگاریان کردن، لە سەردەمی مەئموندا (۱۱) هەزار کەنیسە هەبوو، ژمارەیە کی زۆر لە هەیکەلی جولەکە و ئاگردانی ئاگرپەرستی هەبوو، جەژنەکانی خۆیان بەدڵخۆشیەوە دەگێڕا. بە هەزاران دەهاتن بۆ حەج بۆ فەلەستین. ئەو کەنیسانەی لەژێر دەستی بەتریارکی قوستەنتنیە وئورشەلیم و ئەسکەندەریە و ئەنتاکیادا دەچەوسێنرانەوە، ئێستە لای موسڵمانان

ئازادن. زیاد لەوەش لێپرسراوی ئەنتاکیا پاسەوانی دانا بۆ گاورەکان هەتا لەناو خۆیاندا شەڕ نەکەن لەسەر کەنیسە، کە پێشتر شەڕێك بوو بوو، تەنانەت (سرجیوس) و (دا لقدیس یوحەننا دمشقی) خەزێنەداری بەیتولمال بوو لە سەردەمی عەبدولمەلیك کوڕی مەرواندا. لەبەر ئەو رەفتار نەرمیە و لەخۆبوردنە، زۆربەی گاورەکانی سەر زەوی موسڵمان بوون، ژمارەی موسڵمانان لە ماوەی کەمتر لە نیو سەدەدا بوو بە (٣٥٠) ملیۆن کەس. لە ماوەی سێ ساڵ دوای پێغەمبەر حکومەتێکی کۆماری دیمکراتی پێك هات کە هەموو نێر و مێیەك دەستی لە کاردا بوو و، کاری خۆی دەزانی، شارەکانی شام ئاوەدان بونەوە، گەورە بوون، حەلەب و حومس و شەقامی گەورە و پڕ لە دار و درەخت و ئاو گەیشتبوە هەموو ماڵێك.)[520]

بەڵام لە سەردەمی فارسی ساسانیدا (گاورەکان لە سەردەمی شاپوری دووەم دا، یارمەتی رۆم یان دا، لە دژی فارس، لەبەرئەوە شاپور بڕیاری دا هەرچی گاور لە خاکی فارس دا هەیە سەر ببڕێت، ساڵی ٢٤١ زاینی تەنها لە زاناکان (١٦) هەزار زانا و راهب و قسیسی گاوریان سەر بڕی. جوتیار زۆر داماو بون، ئارامی گیانیان عیبادەت بوو کە کەمێك دەرونیانی دەحەواندەوە، چونکە ئەوەندەیان دەچەوساندنەوە و کاریان پێ دەکردن، هەر کۆمەڵێك ئەمیر و دەرەبەگێکیان بەسەردا زاڵ کردبوو، جگە لە باج و خەراج و دیاری و شتی تر. هەر یەکەیان دەبوایە ٦\١ یان ٣/١ی بەرهەمیان بدایە بە ئاغاکەیان، چەندین سوپاو فەیلەقیان لە جوتیار و وەرزێر و پاڵە و کرێ گرتەکانیان ئامادە کردبوو بۆ کاتی شەڕ. خەزێنەکانی دەوڵەتی فارسی هەمیشە پڕ بون لە پارەی باج و خەراج و سەرانە و نەورۆزانە و میرگان، لە رۆمەکان زیاتریان کۆکردبویەوە، ساڵی ٦٢٦ زاینی لە خەزێنەی کسرای تەبروێزدا (٤٦٠) ملیون دۆلاری بە پارەی ئەمڕۆ تیا بوو. (مۆسیقا و گۆرانی تێکەڵ بە نان و ئاهەنگ و پێشوازیان بوو بوو، مۆسیقای قیسارە و نای و مزمار و قرن و

---

[520]. هەمان سەرچاوە. ج١٢، ص١٣١.

تەپڵ. (برباد) گۆرانی بێژی تایبەتی کسرای تەبرویزی بوو، (٣٦٠) گۆرانی دانا بوو، هەر شەوە گۆرانیەکی بۆ دەوت بۆ ماوەی ساڵێك.

پاشاکان دەیانوت ئێمە هێز لە خواوە وەرئەگرین، ئێمە جێگری ئەوانین، دەیانوت خوێنی خوایەتی لە رەگی ئێمەدا دەسوڕێتەوە، ئێمە وەك خەڵکی ترنین، دەبێت کڕنوش بۆ ئێمە ببرێتو خزمەتکاری بۆ ئێمە بکرێت، خۆیان ناو نابوو پاشای پاشاکان، پاشای ئاری و غەیرە ئاری، گەورەی بونەوەر، کوڕی خوا.) شاپوری دووەم ئەوەی بۆ زیاد کرد کە (برای مانگ و خۆر و هاوڕێی ئەستێرەکانن.[521]

فارس و رۆم دوو پیر بوون، پەکیان کەوتبوو، ئەوەندەیان پەلاماری یەك دابوو، یەکیان لە پەل وپۆ خستبوو، کە ئیسلام وەك گەنجێکی پێ کەوتە هاتە مەیدان. لە بەردەمیدا دوو پیر و نەخۆش هەبوون. بوو بونە بار بەسەر میللەتانەوە، نە ئەوە بوون بمرن، نە ئەوە بوو چاك ببنەوە، ئیسلام پەلی گرتن و، لەسەر میللەتانی ناوچەکان لایبردن، ئەگەر خوا کارێکی بوێت هەل دەڕەخسێنێ، ئەو دوو شارستانیەتە فاسدە و پیر و بارە قورسەی سەر گەردنی میللەتانی بە یەکتر تەنك کرد، یەکیان ماندو کرد ئەوسا ئیسلامیان لێ پەیدا بوو، لەگەڵ ئەوەدا، هێشتا فارس و رۆم یەك ملیون سەربازی بێ تاقەت و بێ حەوسەڵە و بێزاریان هەبوو رەنگە یەکی چەند جار فێراریان کردبێ و بەر رەشبگیر کەوتنو هاتنەوە، ئەوانە بەرامبەر (٥٠) هەزار کەسی بێ چەك و بێ بەرگ و خواردن و جبەخانە وەستان و شکان و لە ناوچون. گەنجێك بەرەو پێگەین و گەشە دەڕوا و، دوو پیر بەرە و کلۆر بون و داڕوخان و پوکانەوە و مردن دەڕۆن، هەرچەندە لە چەند جەنگێکدا بونە یەك و، بەرامبەر ئیسلام وەستان، بەڵام هەر شکان. بۆ نمونە لە جەنگی فیرازدا لە نزیك رومادی فارس و رۆم بونە یەك و لە بەرەیەکی جەنگیدا نەخشەیەکیان داڕێژا. بەڵام مێژوونووسان دەڵێن گەمارۆدران و یەك نەفەریان دەرنەچوو کە هەواڵی ئەو

---

[521]. قصة الحضارة: ول وايريل ديورانت. مجلد٦، بەرگ ١١-١٢، ص٢٧٥-٢٨٢. دارالفكر، بيروت.

نەخشە دوو سەریەیان بگێڕنتەوە [522]، ئەوانەی لە شارستانیەتەکانیان کۆڵیوەتەوە دەڵێن: هەموو شارستانیەك لە مانایەکی سەرەتایی رۆحی پاکەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ، کە سەرەتا کەم بایەخی بە دەرەوەی خۆی دەدا و ناخی پاکە. پاشان کۆتایی دێت بە رواڵەتێکی گەورە و پڕ لە دیکۆرات و نەخش ونیگار، بەڵام ناخی ئاڵۆز و پوچ و تێك چوە، هیچ مانایەکی رۆحی تیا نەماوە، دوای پاشا بەهێزەکانی فارس، کوڕە لاوەزەکانیان هاتنە سەر دەور، بە شتی زۆر لاواز و هیچەوە خۆیان خەریك دەکرد، فیتنە و شەڕو فەسادیان دەنایەوە، ساڵی وا هەبوو سێ پاشایان دەکوشت و دەگۆڕا، جاری وا هەبوو منداڵی بیست ساڵە حوکمی ئەو ئیمپراتۆرەی دەکرد، کوڕ باوك و، باوك کوڕانی خۆی دەکوشت، پەرویز هات، ئەردەشێری کوڕی کوشتی، پەروێز (٣٦) کوڕ و برای خۆی کوشت، نەبا تەماع بکەنە کورسیەکەی. ئەردەشێریشیان کوشت، کوڕیان نەما کچیان کردە پاشا، دوا پاشایان یەزدگورد بوو کە منداڵێکی ١٩-٢٠ ساڵە بوو، ئەمە لە ناو کۆشك دا. لە خوارەوە سوپای ئیسلام نزیك بوو بویەوە، لە رۆژئاواشەوە رۆمەکان هێرشیان هێنا بوو. شەلەل و هەژاری و فەسادی ئیداریو رەوشتیو شەڕوەمرا چۆکی پێ دادابون، کوڕە زادەکان لە رابواردن و ئارەزوبازی و راووشکار و کەیف و سەفای خۆیان نە دەکەوتن.

رۆمەکانیش بە هەمان شێوە لە جەنگی ناوخۆیی خەستی مەزهەبیدا بوون، کە بەردەوام خوێنیان لێ دەچۆڕا، عەرەبەکانی شام هەمیشە راپەڕین و شۆڕشیان لە دژی رۆم دەکرد، متمانەیان بە فارس و رۆم نەما بوو، لە لایەکیشەوە دڵیان بۆ ئیسلامی برا عەرەبەکانی حجازیان لێی دەدا، لە نامەکەی (مجیتیوس)دا لە زانستی جەنگیدا نووسیبوی دەڵێ: یاسای جەنگی رۆمان پێش محمد بە دوو سەد ساڵ خەلەل و نکولی روی تێ کردبوو، عەرەبەکانی خواروی شامیان لێ هەڵگەڕا بوونەوە و دڵیان لای عەرەبەکانی هاوزمانیان بوون. رۆمەکان شارێکیان دەگرت ماڵ و منداڵ و کەل وپەلیان

---

[522]. لە مدینەوە بۆ مدائن: حسن محمود حمه کریم، ل٤٢.

دەدزی و، دەست درێژیان دەکردە سەر ئافرەتانیان، سەرکردەیەکی رۆم وەسفی موسوڵمانانی دەکرد بۆ هەرقل و دەیگوت: (ئەوانە بە شەو خوا پەرستی دەکەن و، بە رۆژ سوار چاکن، ئەگەر کوڕی پاشاکەیان دزی بکات دەستی دەبڕن و زینا بکات رەجمو بەردبارانی دەکەن.) قەیسەر هەرقل وتی (ئەگەر راست بکەیت ناوسکی زەوی – مردن – چاکترە بۆ ئێمە، هەتا بەرامبەر بە ئەوان بوەستین.) سەرکردەکانی فارس و رۆم هەستیان کرد بوو کە نهێنیەك هەیە لە سەرکەوتنی موسوڵمانەکاندا و باسیان دەکرد، بەڵام رۆژێك پاشای فارس بیری نەکردەوە لەو نهێنیە بکۆڵێتەوە!

هەندێ لە عەرەبە قەومیەکان دەڵێن، هۆی گرنگی دروست بونی ئمپراتۆریەتی ئیسلامی ئەوە بوو کە عەرەب بوون. خۆ لە خاکی ئەو دوو ئمپراتۆرەدا (فارس و رۆم) عەرەبێکی زۆر هەبوو، هەر یەکە بە هەوای لایەك دەشەکانەوە و، زانیاریانْ چاکتر بوو، چەك و جیەخانەیان لەوانەی حجاز زۆرتر بوو، وە نزیکتریش بوون لە شام و عێراقەوە هەتا موسوڵمانانی حجاز. بەڵکو ئەو عەرەبانە بە پشت و پەنای فارس و رۆمەوە پەیتا پەیتا لەبەردەم موسوڵمانەکاندا دەشکان، بەڵکو هۆی سەرکەوتنی موسوڵمانان تەنها پاك و پتەوی عەقیدە و یەکیەتی و یەکڕیزییان بوو.

سەرکردەیەکی رۆم بە ناوی (جۆرج) بە خالیدی وت: راستە دەڵێن خوا لە ئاسمانەوە شمشێرێکی دابەزاندووە بۆ سەر پێغەمبەرتان و داویەتی بە تۆ، بۆ هەر گەلێکی بەرز بکەیتەوە دەشکێ؟

وتی: نەخێر، جۆرج وتی ئەی بۆ ناونراوی شمشێری خوا؟

خالید وتی: (من دوای کەوتم، واتە دوای پێغەمبەر (ﷺ)، رۆژێك پێی وتم تۆ شمشێرێکی هەڵکێشراوی خوایت بۆ سەر بت پەرستەکان. پاشان دوعای سەرکەوتنی بۆ کردم. لەوەوە ناونرام شمشێری خوا. ئێستە من توندترین موسوڵمانم بۆ بت پەرستان. بەم جۆرە بە هەڵە هەواڵی سەرکردەیەکی موسوڵمانان گەیشتبوە هەموو ناوچەیەك، ئەفسانەی ئاوایان بۆ دروست

**کردبوو.[523] خالید خۆی هەڵنەنا بەو قسەیە، بەڵکو راست و رۆشن و بۆی راست کردەوە حەقیقەتەکەی پێ وت، کۆمەڵێك حەقیقەتی ئاوا بویە بناغە بۆ شارستانی ئیسلامی و سەری خستن!**

[523]. عبقرية خالد: عباس محمود العقاد، ص١٣٠. دارالهلال، قاهرة ١٩٥٢.

# بەشی دەیەم

* مەزاری ئەسحابان لە کوردستاندا
* وتەیەك
* گۆڕی ئەبودوجانە لە رانیە
* گۆڕی عوکاشە لە کامیاران
* گۆڕی میقداد لە رانیە و شارەبان
* گۆڕی ئەباعوبەیدە لە عەبابەیلێ
* گۆڕی ئەسحابەدرێژ لە دێلێژە
* گۆڕی ئەسحابە عەبدوڵلا لە سەرچنار
* گۆڕی عەبدوڵلا کوڕی عومەر لە زۆر جێگە
* مزگەوتەکانی عەبدوڵلا کوڕی عومەر لە کوردستان

## وتەیەك

خاك وخەڵكی كورد پێكهاتەیەكی هێندە بە نرخ ودەوڵەمەندو مەزنە، هەڵدەگرێت لە هەموو ڕویەكیەوە چەندین لێكۆڵینەوەو بەدواداچونی لەسەر بكرێت و، توێژەر پەكی نەكەوێت لەنەبونی كەرەستەو سەرچاوەو پێویستیەكانی، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مێژوە كۆن و دورو درێژەی كە لە سەرخاكەكەی بەسەر بەرزانە ڕاببواردوەو جێ وڕێی خۆی كردوەتەو خۆی سەلماندوە.. یەكێك لەولایەنەگرنگانەی كە دەكرێت بخرێتە بەر توێژینەوە، ئەو هەموو گۆڕومەزارو مەرقەدوشەخسانەیە، كە بەناوی گۆڕی ئەسحابان سەراپای خاكی كوردستانی گرتوەو، هیچ ناوچەو شارو لادێ ودەشت و شاخێك نیە یەكێك یان چەند دانەیەك لەومەرقەدانەی بە ناوی كەسێكی ناودار یان سەحابە بەلاّم لە ڕاستی دا نادیارو ئەفسانەیی بەسەرەوە نەبێت. بەدوادا چونی ئەو كارە لە هەندێ لایەوە ئاسانە، چونكە سەرچاوەیەكی زۆر و زەبەندەمان لە بەردەست دایە و، ناوی سەحابەكانیش هەتا ئاستێكی باش هەیە، دەتوانرێت گەڕان بەدوایاندا بكرێت، بزانرێ ئایا سەد دەرسەد تەواوە ئەو سەحابانە هاتونەتە كوردستان ولە سەرخاكەكەی تێكۆشاون ولەناوچون ولاشەكەیان جێماوە و، پاشتر بوەتە گۆڕو بە پیرۆز ڕاگیراوەو پارێزراوە.. یان نا؟ دوای خوێندنەوەی زۆری سەرچاوە ئیسلامیەكان لەسەر فەتحی كوردستان، دەركەوت كە گۆڕی هیچ سەحابەیەك لەو ناودارەوناسراوو دیارانە ـ ئەوانە ناڵێم كەناویان نیەو ڕەنگە لە شەڕیان لە گەڵ فارس كوژرابن وبێناونیشان ئەسپەردە كرابن ـ لە خاكی كوردستاندا نیە، چ بە مردن بێت یان كوژران، وەكو بە هەڵە مەلا ڕەئوف سەلیم حوێزی لە كتێبەكەیدا باسی دەكات[524]، كە گوایە كۆمەڵێك سەحابە هاتونەتە كوردستان وشە هید بون، دوای لێكۆڵینەوە دەركەوت ڕاستی تیانیەو هەڵبەستراوە، لەوانە ناوی فەزلی كوڕی عباس وعەبدوڵلای كوڕی عومەرو زوبێری كوڕی عەوام و عەبدوڵلای

---

[524] كوردستان‌و ئاییتی ئیسلام ـ مەلا ڕەئوف سەلیم حوێزی ـ ١٩٧٠ـ بەغداد.

کوڕی جەندل ووائلەی کوڕی ئەسعەل وقەعقاع کوڕی عەمر وزۆری تری بردوە. کە دەکرێو ئاسانە بەدواداچونی لەسەر بکرێت، بەلاّم لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدات، داخۆ پێمان خۆش بێت گ ەحابەیەك لە ناو خاکی کوردا هەبێت؟ یاخود بترسین و بەرگری بکەین و بڵێین نەخێر، سەد شکور بۆ خودا کە دەستی هیچ کوردێك لە باپیرانمان، لە خوێنیسەحابەکاندا نیەو، دەستی کورد پاکەوخاکمان پاکتر، کەخوێنی سەحابەکانی پێغەمبەری تیا نەڕژاوەو! بەڕاستی خەڵکی کارێکیان کردوە نەوێرین هەندێك شت بڵێین، بەمەرجیّ گەر باپیرانی ئێمە بەرگرییان کردبێت و، هەزاران سەحابەشیان کوشتبێت، چاکەو خراپە بۆ ئەوان نوسراوەو، بەهیچ جۆرێك ئێمە بەر پرس نین لە هەڵوێست وکارو کردەوەی ئەوان، تەنها بۆمان هەیە بخوێنینەوەو بنووسین ولەمێژومان بکوڵینەوە، بڕوانە ئێمە چ فەخرو شانازیەك دەکەین کە خودا لە قورئاندا دەفەرموێت کەشتیەکەی نوح پێغەمبەر سەلامی خوای لێبێت، لەسەر شاخی جودی لە کوردستان نیشتوەتەوە، بریا لەو دیاریە خوداییانەمان زۆر دەبو، سەدبریا پاشماوەی کەشتیەکە ئەمڕۆ لەکوردستاندا بمایە و، کەناڵەکان وگەشتیاران ڕۆژانە بهاتنایەتە سەیریو زیارەتی ئاسەواری باپیرە گەورەیانو، ماوەیەك لە گەل ّچیرۆکی ئەو تۆفانە مەزنەدا بژیانایە، خۆزگە کوردستان ببوایەتە عەنتیکەخانەی شوێنە پیرۆزەکان، جا بزانە ئەمڕۆ چ سودێکمان دەبینی، بڕوانە میسر چ شانازی دەکات کە گۆڕی ئەسکەندەری مەکدۆنی لەخاکیاندا هەیە و، ملیۆنان دۆلاری خەرج کرد هەتا لە کەناری دەریا لە ئەسکەندەریە دۆزیانەوە، ئەسکەندەر لەشارەزوری کوردستان توشی نەخۆشی مەلاریا بوو، چوە بابل لێی پیس کردو مردو ناشتیان، پاشان سەرکردەکانی گواستیانەوە بۆ شاری ئەسکەندەریەی میسر، ئێستە بوەتە خێرێکی ئابوری بۆ میسر، بە مەرجیّ کەئەسکەندەر دەیان هەزار کەسی لە خەڵکی شام ومیسر کوشت، شاری سورو غەزەی لەگەلّ خاکدا یەکسان کرد، خەڵکەکەی کوشتن یان کردنیە کۆیلە، ئەوان ئەو بونەیان پیّ خۆشە وشانازی پێوەدەکەن، بەمەرجیّ ئەسکەندەر ساڵی ٣٣٢پ.ز بوە

هۆی لەناو بردنی دەوڵەتی فیرعەونی تەمەن سێ هەزار ساڵەی میسرو، دەوڵەتی بابلی دوو هەزار ساڵە لە عێراق و، ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشینی فارسی‌و، دەوڵەتی باکتیری لە ئەفغان و، ئیمپراتۆریەتی هیندی، وە بە گوێرەی سەرچاوە مێژوییەکان یەك ملیۆن ونیو لە خەڵکی ئاسیای کوشت، پانزە هەزار وڵاخی بارکرد بە سێ جار لە ئاڵتون ومجەوهەرات ونەختینەی پاشایان وکۆشکەکانی فارس و میدیا وناردنیەوە بۆ مەکدۆنیاو یۆنان، بەقسەی خۆی تۆڵەی سەدان ساڵەی جەنگی (تەروادە) ی نێوان ئاسیاو ئەوروپادەکاتەوە، بەڵام ئەگەر گۆڕی سەحابەیەك لەخاکی کوردا دەربکەوێ، لێمان دەکەنە هەرا، گوایە ئەوانە هاتون بۆتاڵانی وکوشتن وئەنفال کردن ولەناو بردنی دەوڵەتی کورد، گۆڕی بیست وپێنج هەزار سەحابە لە وڵاتی سوریە دایەو، دەیان شەڕی قورس رویداوە، هەر جێی شانازیانە، بڕوانە شاری مەککەومەدینە چ شان و شەوکەتێکیان هەیە لەجیهانی ئیسلامیدا بە هۆی شوێنە پیرۆزەکانیەوە، ساڵانە دەیان ملیۆن حاجی سەردانی دەکەن، ئەوە قودسی پیرۆز و، مەرقەدەکانی پێغەمبەران ئیبراهیم وموساو یەعقوب وسلێمان و زۆری تر، سەلامی خوایان لێ بێت، لەئاستی‌ئیسلام و گاورو جولەکەی جیهاندا ناوی هەیە، ئیمامی عەلی وئیمام حوسەین لە نیوە دورگەوە دەرچون ولە نەجەف وکەربەلا ئەسپەردە کراون، ئەمڕۆ بە گەورەترین ئاسەواری ئیسلامی دادەنرێن لە عێراق داو ڕۆژانە هەزاران کەس سەردانی دەکەن، بەمەرجێك لەجەنگی جەمەل وسەفیندا کە ئەوان کردیان حەفتا هەزار کەس کوژراوە، پاشان بە ستەمێك سەری ئیمام حوسەینیان بردە دیمەشق وئەسپەردەکرا، ئەوکارەساتە دڵتەزێنە بوەتە خێروبێر بۆئەمڕۆی سوریەو ساڵانە سەدان هەزار سەردانی دەکەن، بڕوانە شاری موسڵ، بەهۆی نەبی شیت ونەبی یونسەوە چەند ناودارو مەزن بوە، ئەمڕۆ ئێمە لەکوردستاندا قەبرستان وگۆڕی سەحابەی زۆرو زەبەندە دەبینین، دۆڵی سەحابان، دۆڵی شەهیدان، ئەسحابە سپی وئەسحابە درێژو ئەباعوبەیدەو بانەیی ئەسحابە کوژو زۆری تر، وا دەردەخەن ئاسەواری شەڕێکی قورس ودژوار بوبێ

لەناوچەکەدا، گومانی نیە شەڕو هەرای زۆر بوەولە شەڕیشدا هەرخراپە دە کەوێتەوە، لە گەڵ ئەوەدا خۆزگە گۆڕی دەیان سەرکردەوسەحابە لە سەر خاکی کوردا دەبو، هەتا زوتر ناوی شارو ناوچە کوردیەکان دەچوە ناومعجەمی بولدانو مونجیدو قاموسی موحیتەوە، ئیسابە فی تەمیز سەحابەو ئوسدولغابەو ئەوانی تردا ناوی شوێنە کوردیەکان دەبراو، ئێمە ئەمڕۆ مێژوویەکی کۆنتریمان دەزانی، زوتروزیاتر گوێ بەشارو ناوچە کوردیەکان دەدرا، مێژویان نادیار نەدەبوو، جگە لەوەی کە ڕەنگە مزگەوتی گەورە بەسەرگۆڕی ئەو سەحابانەوە بکرایە، ئاسەواری گرنگ بۆ ئەمڕۆی کورد جێدەماو کوردستان ئاواچۆڵ و خاڵی نەدەبو لە کارو هونەری پێشینەکانمان.

پیرۆکەی ئەم نوسینە لەوەوە سەرچاوەی گرت، لەم شەوانەدا چومە ماڵی زانایەکی ئاینی، بۆی گێڕامەوە لەم ڕۆژانەدا چون بۆ تەعزیە بۆ قەرەداغ، لە ڕێگە لایان داوەتەسەر مەرقەدی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس لە نێزیك ئاوایی دێلێژەو فاتیحایان داداوەو زیارەتێکی پڕ بەدڵی خۆیان کردوە، مامۆستاکە وتی هەست وسۆزێکی بەرز دڵ ودەرونی داگرتم، کە بەخزمەت ئەو سەحابە ناودارەو خۆشەویستی پێغەمبەری ئازیزمان گەیشتم..بەڵام ئەو زانا دڵسۆزە لە بیری نەبوە کە سەعد خاڵی پێغەمبەر بوە، دەنا زیاتر دەتاوایەوەو دەیلاواندەوەو هەستی دەجۆشا، ئەوە مافێکی پیرۆزی خۆیەتی، خوای گەورە بەنیەت ودڵی خۆی ئەیێ قبوڵدەکات، ئەگەر ئەوە گۆڕیئەو خۆشەویستەش نەبێت، بریا خاکی کوردی ئێمەش ببوایەتە بێشکەو جێنزرگەی گۆڕی دەیان سەحابەی ناودارو بەرز، ئیتر کەیفی خۆیان بوو ناحەزان چیان دەچنی ودەوت! بابەتەکە هەڵدەگرێت بۆچونی تایبەتی لەسەربوترێت ولەشوێنی خۆیدا بە سانایی قسەی لەسەر بکرێت، هەتا لای خوێنەری کورد ئاشکرابێت کە ئەو پیرۆزیانەی بەدەورو پشتیەوە هەیە چین وکێن و، چۆن ئەو ئەفسانەو ناوەیان بۆ هەڵبەستراوە؟ بۆ نمونە زۆر هەوڵم دا بزانم شەخسی ئەسحابە سپی لە شاری سولەیمانی هی کێیە، کەس نەبو بزانێ. ئەسحابە درێژی

دێلێژه له قەرەداغ، گۆڕەکەی چوارده مەتر درێژه، که له گۆڕی سەردەمی ئیسلام وپێشتریش ناچێت، ئەسحابه درێژیش له دێی دەرەشیش له هەڵەبجه و، له سەنگاو لەدێی سێگۆمەتان هەیه چوار پێنج مەتر درێژه، هەر لەوێ شێخ زەردو شێخ ڕەشیش هەیه خەڵکی ناوچەکه نازانن هی کێن. زۆرچیرۆك وئەفسانەی سەیر دەوری هەندێ لەم شەخسانەی داوه، که سەری له گوناهەوه دەردەچێ، ئیسلام پیرۆزیەکانی پێش خۆی هەڵوەشاندوەتەوه ئیتر هەرچیەك بێت، بۆ نمونه قازی بەنێ له دێی نەوتی له نزیك دێی میر یاسی له قەرەداغ شەخسێکەو ڕون نەبوەتەوه چ کەسێکه، دەڵێن جۆرێکی لەخۆگرتوه، ئەو ژنەی دەچێته سەری بۆ داوای منداڵ، دەبێ له گەڵ پیاوێکی نامەحرەم دا بچێت، نابێ مەحرەم بێت، دەنا نیازی حاسڵ نابێت ومنداڵی ناداتێ! هەفتانه ژمارەیەکی زۆر سەری لێ دەدەن.. مەرقەدی ئەبوعوبەیده له هەڵەبجەو، ئەسحابه سپی له سلیمانی و، ئەبودوجانەی ئەنساری لەڕانیەو ناوچەی قەسری شیرین و، ئەسحابه عەبدولاّ له سەرچیاو، میقدادی ئەسوەد له شارەبان ومیقدادیەو، عوکاشه له کامیاران و، ئەنەس له تەبرێز و، عەبدولاّی کوڕی عومەر له ناوچەی ڕانیەو نێوان هەولێرو موسڵ و، زۆری تر گۆڕو مەرقەدیان هەیه، ئەمەجگه له گۆڕەکانی سوڵتانی ساق وپیرداودو پیر ئەلیاس وپیر خدرو پیرانی تەریقەت وپیری شەوکێل وپیر وەتێ وپیرەمەگرون و پیرنەوەزوکۆسەی هەجیج و زۆری تر که ڕەنگه زانایان وپیرانی ئاینی زەردەشتی بوبن که ئاینی پێش ئیسلامی کوردەکان بوەو گۆڕەکانیان تائەمڕۆ بەپیرۆزی ڕاگیراوەو ماونەتەوه.

لێرەدا مەبەستمان نیه تەشەر لەگۆڕی ئەو سەحابەو پیرانه بدەین و له نرخیان کەم بکەینەوه، یان سەردان وزیارەتکردنیان بەهیچ بزانین ودوعاگۆییان لێ داوانەکرێت، ئەوه هەموو کەس ئازادەو کەیفی خۆیەتی چۆن و چی دەکات و چۆن بیردەکاتەوه، بەڵکو دەمانەوێ بزانین ئەم گۆڕانه چین وکێن وچۆن پەیدابون وچۆن باس و ناویان هاتوەته کوردوستان ومێژوی ژیانیان چۆن بوەو بۆچی مردون یان کوژراون و پیرۆز ڕاگیراون، که بەمه

چمکێکی باش له مێژووی ونی کورد ئاشکرا دەبێت و، خزمەتێك به مێژووی شەخس وگۆڕەکان و ژیانی کورد دەکەین، هەتا بزانین ئەم پیرۆزیانه کێن که کورد لەتەنگانەدا پشتیان پێدەبەستێ و داوایان لێدەکات. بریا لیستێکی تەواو لەناوی شەخس ومەرقەدو گۆڕو قەبرستانی ئەسحابان له کوردستاندا هەبوایه، شوێنی جوگرافیای، له کوێوه نزیکه، چ چیرۆك وئەفسانەیەکی لەسەر هەیه، هەتا بەدوادا چونی لەسەر بکرێت بگەینه ئەنجامێك که سود بەمێژووی کوردی ئیسلامیمان بگەیەنێت....

واچاکه ژیانی کەسەکان بەدورو درێژی بگێڕرێتەوه، هەتا لای خوێنەر ڕون بێت چۆن ژیانی گوزەراندوه، هیچ گومانێك نەمێنێ له ژیان ومردنی‌و ڕاستی گێڕانەوەکه.. واچاکه گۆڕی هەندێ ئەسحابه_له ئەسحابێکی زۆر که له کوردستاندا ناویان هەیه_ هەڵبدەینەوه، بزانین ڕاسته هی ئەوانه، چونکه ئێمه له باسی فەتحی کوردوستاندا‌پێشتر سەلماندمان که شەڕله نێوانی کوردو سوپای ئیسلامدا ڕوی نەداوه، بەتایبەت مەزاری ئەسحابان ودۆڵی ئەسحابان ودۆڵی شەهیدان له شوێنێکدان لەکوردوستاندا که هەرگیز شەڕ تیایاندا نەقەوماوه و، باسیان له هیچ سەرچاوەیەکی بڕواپێکراودا نەهاتوه.

من وادەزانم ئیتر ئەو قەبرستان‌و گۆڕانه بوونەته ئەفسانه‌و له ناخ ومێژوی کوردا چەسپیوه‌و ڕەگی داکوتاوه، چاك نیه به باس و بەکردەوه هەوڵی‌له بەینبردنیان بدرێت، چونکه میللەتانی تر له هیچی خۆڕایی مێژوو ئەفسانه بۆ خۆیان دەتاشن، ئێمەی کورد کەشتێکمان هەیه، بۆ له خۆڕا له بەینیان بەرین وله مێژومانیان دابڕنین، هیوادارم بگەینه ئەنجامێك وکەس لەم توێژینەوانه پەست ونیگەران نەبێت..

## گۆڕی ئەبودوجانەی ئەنساری لەناوچەی ڕانیە

پێشتر لە ڕۆژنامەکاندا ڕاگەیاندنێکی بڵاوکردەوە داوام کردبوو کە هەرکەس لەناوچەی خۆی لە سنووری کوردستان گۆڕو مەرقەدی سەحابەیەك شك دەبات با ناوی تەواوو چیرۆك‌و ڕوداوو شوێنەکەیم بۆ ڕەوانە بکات تا لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی بۆ بکەم، هەر بەو دواییە نامەیەکم بۆ هات لە قەزای ڕانیەوە باس لە گۆڕی سەحابەیەك دەکات و دەڵێ:(خەڵکی ناوچەکەو دەورو بەر و، بگرە زۆر وتار خوێن لە وتارەکانیاندا بڕوایان پێیەتی و باس دەکەن و، لە لای خەڵکی (متەواتر)ی وەرگرتوە و، دەڵێن فلان گۆڕ گۆڕی (ئەبو دوجانە)یە، دەڵێن کاتێ لە شکری ئیسلام هاتە کوردستان و گەیشتە (کێلەبۆڕێ) کە دەکەوێتە خوار ناحیەی چوارقوڕنەی سەر بەقەزای ڕانیە، گوندەکە ئێستە بوە بە ژێر ئاوی دەریاچەی دوکانەوە، ئەوکاتە لە شکرەکە ڕێگەی لێ دەگیرێ بە هۆی بە فرێکی زۆرەوە، لە کاتێکدا ئەوان دەیانەوێ شەڕلەگەڵ (فەروخی مەرگەیی) بکەن، بۆیە وەفدێك دەنێرن بۆلای فەروخ بۆ مەرگە، بەڵام لە ڕێگا دوو کەس ڕێی دەگەن وشەهیدی دەکەن، ئەویش ناوی (ئەبودوجانەی ئەنساریە).دەڵێن پێش ئەوەی بگاتە سنجان واتە سێناجیانی ئێستا لە سەر زێی دەربەندی بیتوێن شەهیدی دەکەن)[525]. پاشان نوسەری نامەکە داوا دەکات لێکۆڵینەوەیەك لە سەر (دۆڵی ئەسحابان)و(دۆڵی کافران)بکرێت کە هەر لەو ناوچەدایە.

ئەم چیرۆکانە لە کتێبەکەی مەلا ڕەئوفی حوێزیەوە سەرچاوەی گرتوە، دەنا لە واقیع دا هیچ بنەڕەتێکی لە ڕوداوو سەرچاوەکاندا نەبوە، مەلا ڕەئوف بەکورتە ئاوای داڕشتوە:(کاتێك سەحابەکان وڵاتی شام وئەرمەن ڕزگار دەکەن، ئەبوعوبەیدە نامە دەنوسێ بۆ خەلیفە عومەر داوا دەکات بەرەو کوێ بڕۆین، ئەویش وەڵام دەداتەوە کە خالید بنێرێ بەرەو ڕۆژ هەڵات بۆ وڵاتی

---

[525] دەقی ئەو نامەیە لەلایەن کاك ئیبراهیم ئەحمەد بەرزنجیەوە لە بەرواری (٢٠٠٢/١/٨) پێم گەیشتووە بۆ لێکۆڵینەوە لە بنەڕەتی گۆڕی ئەبودوجانەی ئەنساری.

کوردان، به چوار هەزار جەنگاوەرەوە کەوتنە ڕێ بە کۆمەڵێك سەرکردەوە کە ئەبو دوجانەش لە ناویاندابوو، هەولێریان گرت وچونە هەرمۆتەو دێی ڕۆستەم وخەڵکەکە موسوڵمان بون، بەفرێکی زۆر باریبوو شەولەویٚ مانەوە بەیانی چونە سەر زێی بچوك لە ڕۆژ هەلاٚتی میرزاڕۆستەم، خالید بانگی ئەبو دوجانەی کرد فەرموی بڕۆ بۆلای پادشای مەرجێن (مەرگە)و بانگی بکە بۆ سەر ئیسلام، ئەبو دوجانە سواری ولاٚخ بوو ڕۆشت، لە چاو ون نەبووبوو، دیتیان لە ولاٚخ کەوتە خوارەوە، زراری کوڕی ئەزوەر لەو وەختەدا چاوی لیٚ بوو، چوو بۆلای خالید فەرموی بینیم ئەبو دوجانە لە ولاٚخ کەوتە خوارەوە، وابزانم سەرما زۆر کاری تێکردوە، خالید فەرموی بڕۆ بزانە چیە، کەڕۆیشت دەبینیٚ خوێن لە لاشەی دەڕوات، ئەبو دوجانە وتی تیرێکیان ایٚدام، تەواو لە قسە نەبوەوە وەفاتی کرد.. ئەبو دوجانەیان بە بەرگی خۆیەوە تەسلیمی خاك کرد)[٥٢٦]. ئەمە کورتەی نوسینەکەی مەلا ڕەئوفە، بابزانێن سەر سەرچاوەکانی فتوحات و پیاوناسان (الرجال) چۆن باسی ژیان وهەوڵ ومردنیئەبو دوجانە بەساڵ وبەروار دەکەن.

## ژیاننامەی ئەبودوجانە

ناوی سەمماك کوڕی ئەوس کوڕی خرشە کوڕی لوزان نازناوی زی مەشهەری ئەنساری سەر بەهۆزی بەنی ساعیدە، یەکێکە لە یارانی پێغەمبەر، لە جەنگی بەدرو ئوحدو غەزاکانی تری لە گەڵ پێغەمبەردا بەشدار بوە، لە جەنگی ئوحددا پێغەمبەر شمشێرێکی بەو بەخشی، کە جێی فەخری بوو، هەرگیز لە پێغەمبەر جویٚ نەدەبویەوە، لە بەر ئەوە پێغەمبەر دوعای خەیری بۆ کرد[٥٢٧]، مەحمود شاکر دەڵیٚ: سەرکردەیەکی جەنگی ئوحد بوو، پێغەمبەر شمشێرەکەی دەرهێناو فەرموی کیٚ ئەم شمشێرە هەڵدەگرێت، چەند پیاوێك

---

526 کوردستان وئاینی ئیسلام، مەلا ڕەئوف سەلیم حوێزی لا ٧٧ـ٩٠ چاپخانەی جامعە ١٩٧٠ بەغداد.

527 فتوح سواد العراق، روایتی محمد واقدی، ترجمة عبدالعزیز واعظی پیاچونەوەی نادری کریمیان، ص١٥٦ـ١٥٩ وص٢٤٨ تهران ١٩٩٥ مرکز پخش.

هەستان، لەوانە زوبێرو عومەری کوڕی خەتاب وعەلی کوڕی ئەبوتالیب، بەڵام نەیدانێ، هەتا ئەبو دوجانە هەستاو وتی من، وەری گرت، وتی هەقی ئەم شمشێرە چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی پێی بدە لە دوژمن هەتا دەچەمێتەوە، ئەبو دوجانە وتی من هەقی خۆی دەدەمێ، ئەبو دوجانە پیاوێکی ئازابوو، لە جەنگدا گەرم دەبوو، کە شمشێرەکەی وەرگرت پارچە قوماشێکی سوری دەرهێناو بەستی بە سەریەوە، لە نێوان دوو ڕیزەکەدا خۆی پێوە هەڵدەکێشا، پێغەمبەر فەرموی ئەم خۆهەڵکێشانە ڕەوشتێکە خوا ڕقی لێیەتی ئەگەر لەم جێگایەدا نەبێت، کە جەنگ گەرم بوو ئەبو دوجانە چاك دەجەنگا، کەسێکی ئازای بینی بەرگی جەنگی پۆشیبوو، خەریك بوو لێی بدات، کەسەکە پاڕایەوە، دەبینێ ژنە، شمشێرەکەی بەسەریەوە لابرد[528].
پارەزانی دەڵێ: بینی یەکێك خەریکە بەناو کوژراوو بریندارەکاندا ئەگەڕێو لەتیان دەکات، بۆی کشاو هەڵی کوتایە سەری، کە چاوی پێیکەوت قیژاندیو هاواری کرد، بینی هیندی ژنی ئەبوسوفیانە، گەڕایەوە وپێی ناخۆش بوو بە شمشێری پێغەمبەر بدات لە ژن[529]. کە تێك هەڵپرژان دروست بوو، زوو زوو پەلاماری پێغەمبەردەدرا، ئەوە هەر ئەبودوجانە بوو کە پشتی کردبویە سوپەر و دەیدایە بەر ڕمی بێپروایان کە دەیان گرتە پێغەمبەر، بە پشتی خۆی پێغەمبەری دەپاراست[530]. بەشداری جەنگی یەرموکی کرد، دوای وەفاتی پێغەمبەریش هەمان گوێ ڕایەڵی بۆ ئەبوبەکر نواند، کە بڕواکزەکان لە دین هەڵگەڕانەوە، ئەبوبەکر ١١ سوپای بۆ ئامادەکردن. خالید وئەبودوجانەی ناردە سەر هەڵگەڕاوەکانی یەمامە کە موسەیلەمەی درۆزن پێشەوایەتی

---

[528] التاريخ الاسلامي، محمود شاكر ج١-٢ ص٢٣٠- ٢٤٢ المكتب الاسلامي طبع ٧ بيروت ١٩٩١.

[529] ژیانی پێغەمبەر، عزیز ئەمین پارەزانی، ل٢٣٦ چاپخانەی کامەرانی سلیمانی ١٩٧٣.

[530] التاريخ الاسلامي ص٢٤٠.

دەکردن[531]، کە موسەیلیمە شکاو پەنای بردە ناو شورای باخەکەوە، ئەبودوجانە ئازایانە موسوڵمانەکانی لێهاندا، بەو هۆیەوە سوپای ئیسلام چونە ناو باخەکەوە، دەڵێن ئەو موسەیلیمەی بریندار کرد، ئەوەندەش جەنگا تا شەهید بوو، هەندێکیش دەڵێن موسەیلیمە ئەوی شەهید کرد، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ کتێبەکان، بە تایبەت کتێبی (در الصحابە)ی شەوکانی ـ ص٥٢٢ـ٥٢٣) و، واقیدی لە (الردە ـ ص ٧٤) و، ئیبن سەعد لە (الطبقات الکبری ـ ج٣ ص٥٥٧) دا، هەموو یەك قسە دەکەن ودەڵێن: ئەبودوجانەی ئەنساری لە ساڵی ١١ـ١٢ی کۆچیدا لە جەنگی(الردە) هەڵگەڕاوەکاندا شەهید بوە، هەروەها بڕوانە (الاصابە فی تمیز الصحابە)ی ئیبن حەجەر ـ ج٤ص٥٨) و، (الاستیعاب فی معرفە الاصحاب)ی ئیبن عەبدولبەر ئەلقورتوبی ـ هامش ج٤ ص٥٨) و، (اسد الغابە) ی ئیبن ئەسیری کوردی ـ ج٢ص٢٥٢)و (ثمار القلوب ـ ص٦٨) و، (الاعلام)ی (زەرکەلی ـ ج٣ ص١٣٨ـ١٣٩)و زۆری تر)

[532]. یەعقوبی دەڵێ: موسەیلەمەی درۆزن سەرەتا موسوڵمان بووبوو، بەڵام لەساڵی ١٠ی کۆچی دا هەڵگەڕابویەوەو دیعایەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، زیاد لە چل هەزار چەکداری بۆ دژایەتی موسوڵمانان ئامادەکردبوو، ئەبوبەکر خالیدی بۆ نارد، دوای چەند شەڕێکی قورس موسەیلەمەیان خزاندە ناو شورایەك و شەڕی قورس قەوما، هەزاران کەس کوژرا، ئەبودوجانەی ئەنساری شمشێری لە موسەیلەمەدا، موسەیلەمە بە برینداری پەلاماری ئەبودوجانەی داو شەهیدی کرد، بەڵام دواتر (وەحشی) ئەوەی کە لەجەنگی

---

[531] ڕێژیەیانی نەبیێکاوە کەدەڵێ ئەبودوجانە لەو هێزەدابوو کە پێغەمبەر ناردبوی بۆ سەر موسەیلیمەی درۆزن، چونکە ئەبوبەکر سوپای ناردە سەر هەڵگەڕاوەکان نەك پێغەمبەر، ئەو کاتە پێغەمبەر وەفاتی کردبوو.-بڕوانەسیپارەکەی جەمیل ڕێژیەیانی لا٢٢٧ پەراوێز (وڵاتگیری ڕەشە خاکی عێراق چاپی یەکەم ١٩٩٧ سلیمانی).

[532] فتوح سواد العراق ص١٥٦.

ئوحددا حەمزەی مامی پێغەمبەری شەهید کرد، دای لە موسەیلەمەو کوشتی ناویان نا(ئەوەی چاکترین کەس و خراپترین کەسی کوشت)[533].

ئەعسەمی کوفی دەڵێ: هۆزی ئەبوحەنیفەو موسەیلەمەی سەرۆکیان، لە ئاین هەڵگەڕانەوە، موسوڵمانەکان هاتن بۆیان وشەڕگەرم بوو، ئەبو دوجانە راپەڕی، جەنگی قورس دەستی پێکرد ئەبو دوجانەی ئەنساری پێشکەوت (لە بنەڕەتدا ناوی حرشنەیە)لە کتێبی(التجرید . ج۱ص۲٥٦)دا ناوی (سەمماك کوڕی خرشە)یە و، دەڵێن ناوی (سەمماك کوڕی خەرشەی خەزرەجی ساعیدی ئەبو دوجانەیە (بڕوانە پەراوێزی الفتوح ـ ج۱ ص۳٤) پاشان ئەعسەمی دەڵێ: ئەبو دوجانە هێرشی کردەوە، یەکێك لە ماقوڵانی بەنی حەنیفە پەلاماری داو شمشێری بۆ ڕاست کردەوە، بەڵام بەری نەکەوت، ئەبو دوجانە هەڵی کوتایە سەری‌و کوشتی‌و پاشان هێرشی کردە سەر کەسێکی تر، لە بەردەستیا هەڵهات، ئەبو دوجانە دوای کەوت لێی داو ئەویشی کوشت،، پاشان پەلاماری لای ڕاست وچەپی دان وخراپی پێکردن، پەلاماری کەسێکی تری دا ئەویش لە حەیبەتان خۆی بە ملی ئەبو دوجانەوە هەڵواسی، ئەبو دوجانە لە خۆی کردەوەوکوشتی، ئەنجا هاواری کرد ئەی ئەهلی ئاین و ئیسلام بۆ لای من وەرن دایك وباوکم بە قوربانتان بێت، هەموو هاتنە لای وپێکەوە پەلاماری موسەیلەمەیان داو زۆریان لێکوشتن، بەڕاستی بەنی حەنیفە خۆگرو ئازابوون، سەحابەی زۆر کوژرا..بەڵام هەر ڕایان فڕاندنە ناو باخەکەوە، کە شورایەکی سەختی هەبوو، ئەبو دوجانە هاواری کرد ئەی خەڵکی ئەنسار بەرزم بکەنەوە، خستیانە سەر ڕمەکانیان و بەرزیان کردەوە هەتا خۆی هەڵدایە بۆشاییەکەی ناو باخەکەوە، وەك شێری تورە پەلاماری برد وبەردەوام دەجەنگا هەتا کوژرا. هەر لەو کتێبەدا لا۱۲ دەڵێ: ئەبو دوجانە بە هاوڕێکانی وت من بخەنە سەر قەڵغانەکانتان و ڕمەکان بەملاو لادا قایم بکەن و بە یەك دەست بەرزم بکەنەوە

---

[533] تاريخ اليعقوبي، احمد بن ابى يعقوب، موسسة الاعلمى للمطبوعات، ، تحقيق عبد الامير مهنا، ج۲ ص١٦ بيروت ١٩٩٩.

بۆ سەر دیواری باخەکە، وایان کرد، ئەبو دوجانە خۆی هەڵدایە ناو باخەکە و شمشێری هەڵکێشا و بە تەنها دەجەنگا هەتا کوژرا[534].

ئەبودوجانە لە نیوەدورگەی عەرەب کوژراوە لەساڵی ١١ ی کۆچی لە شەڕی هەڵگەڕاوەکاندا، وەك هەموو سەرچاوە کان باسی دەکەن، بەڵام مەلا ڕەئوف حوێزی دەڵێ لە کوردستان لە ساڵی ٢٠ ی کۆچی کوژرا[535]، موحەممەدی واقیدی لە ڕیوایەتەکەی دا کە مەلا عەزیزی واعزی سەردەشتی تەحقیقی بۆ کردوە دەڵێ ساڵی ٢٥ی کۆچی لە کوردستان کوژراوە[536]، کتێبەکەی مەلا ڕەوف و مەلا واعزی لە یەك دەست نوس وەر گیراوە کە لە ماڵی مەلا سەمەدی مەرگەیی بووە.

بەلازەری دەڵێ: موسەیلەمەی درۆزن کوژرا لە باخەکەدا، هەندێك دەڵێن خەداش کوڕی بەشیر کوشتی، یان ئەبودوجانەی سەماك کوڕی خرشە، یان عەبدوڵاکوڕی زەیدی عاسیم، یان وەحشی کوڕی حەربی حەبەشی، یان معاویە کوڕی ئەبو سوفیان، زۆربەی مێژوونوسان لەسەر ئەوەن کە هەموویان پێکەوە کوشتیان، بەلازەری ناوی دەیان کەسی بردوە کەسەرکردەبون لەو شەڕەدا دژی یەمامەو موسەیلەمە جەنگاون، دەڵێ یەکێك لەوانە ئەبو دوجانە سەمماك کوڕی ئەوس کوڕی خرشە کوڕی لوزانی ساعیدی لە خەزرەجیەکان بەشداربوەو لەوێ کوژرا[537].

مەحمود شاکر دەڵێ: موسەیلەمەی کەزاب ساڵی ١١ ی کۆچی کوژرا[538].

---

534 كتاب الفتوح، للعلامة ابن محمد احمد بن اعثم الكوفي ج١ ص٣٤ـ٣٦ دار الندوة الجديدة، بيروت يوليو ١٩٦٨.

535 کوردستانو ئاینی ئیسلام، ل٨٠.

536 فتوح سواد العراق، ص١٥٦.

537 فتوح البلدان، امام ابى الحسن البلازرى، مراجعة رضوان محمد رضوان، ص ٩٨ـــ ١٠١دار الكتب العلمية، بيروت ١٩٧٨.

538 ـ التاريخ الاسلامى، محمود شاكر المكتب الاسلامى، تبع ٧ج ٣ ص٧٢ بيروت ١٩٩١.

جگە لە گۆڕەکەی ناوچەی ڕانیە، گۆڕێکی تر هەیە لە ناوچەی قەزوێن لە باکوری ئێران، هەرهەمان ناوی ئەبو دوجانەی ئەنساری بە سەرەوەیە، گوایە لە جەنگی دەیلەم دا کوژراوەو لە نزیك شاری ماوشانسی دەشتی قەزوێن ئەسپەردەکراوەو زیارەتگای هەیە، ئەوەش هەرهەڵەیەو ڕاستی تیانیە، ئیبن ئەسیری کوردی لە (الكامل في التاريخ) دا دەڵێ: ئەو سماك کوڕی خەرشەیە کە چوەتە شەڕی دەیلەم، کابرایەکی ترە سەحابە نیە، لەقەبی ئەبو دوجانە نیە و، ئەبودوجانەی یاری پێغەمبەر نیە، ئەبو دوجانە نەگەیشتوەتە کوردستان وئێران، وە ئەو نوشتە چوارمەتریانەی هەندێ کەس بەناوی ئەبو دوجانەی کوردستانەوە دەیکەن بۆخانەە دووگیانەکان و بۆ پاراستنیان لەجنۆکە ودێوودرنج، کەمنداڵەکانیان لە زگدا نەخنکێنن ولەبار نەبەن، دورە لە کارو هەوڵ ودوعای ئەبودوجانە[539] موحەممەد کوڕی جەریری تەبەری هەواڵێك لە باسی فتوحاتی سەردەمی خەلیفە عومەر دەگێڕێتەوەو دەڵێ سەیفی کوڕی عومەری تەمیمی باسی کەسێك دەکات بەناوی سەماك کوڕی خرشەی ئەنساری کە لە فەتحی هەندێ ناوچەی ئێراندا بەشدار بوە[540]، بەلاَم ئەم سەماك کوڕی خرشەیە، نازناوی ئەبو دوجانەی نیەو، ڕیوایەتەکەی سەیفی کوڕی عومەر زۆر لاوازە ودەکرێ بەدرۆ لە قەڵەم بدرێ[541] هەروەها لە شەهادەتی خەلیفە عوسمان و فیتنەی سەردەمی ئیمامی عەلی دا کەسێکی تر هەیە بە ناوی سەماك کوڕی مخرەمەی ئەسەدی، کە خۆی پەنا داوە لەو فیتنەیە، بە شداری کەسیانی نەکردوە، سەیری بەلازەری بکە[542] یان سماك کوڕی خرشەی جعفی کە (ئەسر کوڕی موزاحیم منقری) لە ڕوداوی (سەفین ل٣٧٥)

---

539 ولاَتگیری ڕەشەخاکیعێراق، مەلا جمیل ڕۆژبەیانیکردویە بە کوردی وپەراوێزی بۆداناوە، ٢٣٧ سلیمانی١٩٩٧چاپی یەکەم.

540 التاريخ الرسل والملوك، محمد بن جرير الطبري - ج٣ ص٥٨٣، ج٤ ص١٤٨.

541 ئەمە ڕای نادری کەریمیانە

542 لە کتێبی(فتوح البلدان ج٢ ص٣٤٨)و (دارقطنى لة المؤتلف والمختلف ج١ ص٣١٢-٣١٤).

دا ناوی ئەوی بردوە، ئەوە بوە هۆی ئەوەی کەهەندێ گومان بەرن کە ئەو لە جەنگی سەفین دا بەشداری کردوە، دەنا لە مێژودا شتی وا ڕوی نەداو![543] ئەم ناوانەی باسمان کرد هیچیان نازناوی ئەبودوجانە وئەنساریان پێوەنیەو، هاوڕێی پێغەمبەر نەبون..درودی خوای لە سەر بێت..گۆڕێکی تر بەناوی ئەبودوجانەی سەحابی لە دێی ڕێژاوە لە ناوچەی ئەنزل لە سەرپێڵی زەهاو گومان وایە ئەبودوجانەی سەحابیە، بەلاّم وەك وتمان ئەبودوجانە پێش فەتحی عێراق وشام ئەو لەسەردەمی خەلیفە ئەبوبەکردا لە نیوە دورگە شەهیدبووە.

بەمانەدا دەر دەکەوێت کە گۆڕی هیچ کەسێك بەناوی ئەبو دوجانە لە کوردوستاندا نیە، ئەوەی لە ڕانیەیە شتێکی دروست کراوە.

دەبێ هەمیشە لە سەر دەرخستنی ڕاستی مێژومان سوربین، نەهێڵین ڕاستیەکان بچن بەژێرەوە، ئەگەر بۆ ماوەیەك تارمایی لەسەر شتیك هەبوو، مانای وانیە کە نییەو بەو تاریکیەوە سەردەنێینەوە، کەس نیە هێندەی کورد هەق پەرست وشەیدای ڕاستیەکان بێت، با لە سەر خۆشیان بکەوێ، کورد هەمیشە ئالودەی ڕاستیەو پێچ وپەنای لاقورسە، لە تارمایی بێزارەودەیەوێ دونیای ڕۆشن بێت.. بۆ فەتح کردنی کوردستان لە لایەن سوپای ئیسلامەوە باسی زۆر هەڵبەستراوە، کە هیچ ڕەگ وریشەیەکی مێژویی نیە..مەرقەد وگۆڕی ئەسحابان سەرخاکی کوردی داپۆشیوە، ئەمانە هەموی لە دڵپاکی ودڵسوزی کوردی شەیدای پیرۆزیەکان دەچێت، تەنانەت چیرۆك وئەفسانەشیان بۆ دروست کردون، بێئەوەی لاشەی کەسێك لەوانە هاتبێتە سەر خاکی کورد، کورد بەسادەیی یان نەزانی ماوەیەکی زۆرە لە پەرستش و زیارەت و بەرزڕاگرتنی ئەو مەرقەدانەدا بوە، داوای دوعاو جێبە جێکردنی پێویستیەکانی لێکردوە، لە تەنگانەدا پەنای بۆ بردوە، بێ ئەوەی گیان ولاشەو هیمەتی ئەو مەردانە (سەحابان)ە لەوێدا حازربوبن، زۆر چاکە ئەگەر

---

543 فتوح سواد العراق، واعظي، ل٢٤٧.

ئێمه به شوێن ئەسڵ وفەسڵ و ژیان وتێکۆشانی ئەوانەدا بگەڕێین، هەتا لێمان ڕون ببێتەوه که ئایا ئەوانه هاتونەته کوردستان یان نا، بۆچی له خۆڕا مەرقەد وگۆڕیان بۆبونیاد ناون؟ ئایا کورد ساویلکه بوەو خەڵکی بۆ بەرژەوەندی خۆیان خەڵەتاندویانن؟ یان دڵپاك ومەزڵوم وبێپەنا بوەو حەزی کردوە لاشەی پیرۆزێك لەیارانی پێغەمبەرەکەی لێوەی نێزیك بووبێت؟ یان مەرقەدی پیرۆزان وموغ وموبەزان وزانایانی زەردەشتین و، له ترسی لەناوبردن و لەبیرچونەوەیان ناوی ئەو سەرکردانەیان پێوه لکاندبن، تا پیرۆز بمێنن ومانەوەیان مسۆگەر بێت!

## گۆڕی عوکاشه له کامیاران

شارۆچکەی کامیاران دەکەوێتە نێوان شاری کرماشان و شاری سنه (سنندج)، بڕواناکەم هیچ کوردێکی عێراقی هەبێت ناوی ئۆردوگای (شەهرەك و وەرمەهەنگ)ی نەبیستبێت، که بەردەوام لەکاتی ڕاونان و دەربەدەریدا پەناگاو لانەی حەوانەوەو خۆپەنادانیان بوە، له نزیك ئەو شارەوە گۆڕێك هەیه وا نابراوە که گۆڕی سەحابەی پێغەمبەر عوکاشەیە..جێی خۆیەتی لێکۆڵینەوە لەسەر ژیان وجیهاد ومردنی بکرێت، هەتا دەربکەوێت ئەو کەنەهاتوەتە عێراق وکوردستان، دەبێ ئەوەگۆڕی کێبێت وچۆن بەو ناوە ناونراوە!

عوکاشه کوڕی موحسن کوڕی حورسان کوڕی قەیس کوڕی موڕە کوڕی کبیر کوڕی غەنەم کوڕی دودان کوڕی خوزەیمەی ئەسەدیە، کونیەی (ئەبا میحسەن)ە، هاوپەیمانی بەنی عەبد شەمس بوو لەبەنی ئومەیەیە له گەورەکانی ئەوانه له (سابقین الاولین)ی ئیسلامە[٥٤٤]، عوکاشه له گەڵ کۆچبەرانی خزمی له بەنی غەنەم کۆچی کرد له مەککەوە بۆ مەدینە[٥٤٥]، له مەدینه نیشتەجێ بوو، پێغەمبەر کردیه برا له گەڵ مەجدەر کوڕی زیادی بلوی هاوپەیمانی ئەنسار[٥٤٦]، یەکێك بوو له سریەکەی عەبدوڵا کوڕی جحشی ئەسدی)[٥٤٧]، یەکەم سریه بوو له ئیسلامدا که دەست کەوت وئەسیرو

---

[544] (اسد الغابة، عزالدين ابوالحسن ابن الاثيرو ج٤ص٢، تهران ١٣٧٧ ه)(الاصابة فى تميز الصحابة، ابن حجر العسقلانى، ج٤ص٢٥٦، القاهرة ١٣٢٥ ه) (الاستيعاب فى معرفة الاصحاب، ج٣ص١٠٨٠تحقيق على محمد البجاوى، القاهرة)(طبقات ابن سعد ج٣ص٥٢ القاهرة)

[545] (سيرة ابن هشام، ابو محمد ابن هشام، ج٢ص٨٠ تحقيق محمد محى الدين، القاهرة ١٣٥٦ ه)، (جوامع السيرة، تحقيق الدكتور احسان عباس والدكتورناصرالدين الاسد، مراجعة محمود محمد شاكر، القاهرة).

[546] (الدرر فى اختصار المغازى والسير، ابو عمر يوسف ابن عبد البر، ص١٠٠ تحقيق الدكتور شوقى ضيف القاهرة ١٣٨٦)

[547] (كتاب المغازى، محمد بن عمر الواقدى، ج١ص١٩و تحقيق الدكتور مارسدن جونس، لوكسفورد ١٩٦٦).

کوشتاریان له دوژمن کرد[548]، بەشداری غەزای بەدری کرد، شمشێرێك له دەستی دا شکا پێغەمبەر شمشێرێکی تری دایە، فەرماندەیی دوو سریەی پێغەمبەری کردوە[549]، بەشداری غەزای ئوحدی کردوە، سەرەتا ڕمی هەڵدەدا پاشان تیروکەوانێکی هەڵگرت وتی تیرەکانی ناگات، پێغەمبەر فەرموی ماوەی بدەریێ دەگات[550]، لەگەڵ پێغەمبەر بەشداری خەندەق وغەزاکانی تری کرد[551]، له غەزای بەنی قورەیزە و زی قیرەد له ڕێی مەدینە بۆشام نزیك به خەیبەر بەشداری کرد، یەکێك بوو لەوانەی که بەدەم داواکەوە چوو بۆ سەندنەوەی حوشترە ئاوسەکەی پێغەمبەر که بردبویان[552]، هەمیشە له پێشی سوپای ئیسلامەوەبوو بۆ هەواڵزانینی دوژمن، پێغەمبەر عوکاشەو چل سواری نارد بۆ غەمەر له سەر ڕێی مەدینە بۆ سەر ئاوی بەنی ئەسەد، که گەیشتن دەبینن خەڵکەکەی هەڵهاتون، ئەمە له مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی شەشەمی کۆچی دا بوو، داواکانی پێغەمبەریان جێبەجێ کرد و، بەسەلامەت گەڕانەوە به دەسکەوتی زۆرو ترساندنی دوژمنەکەیان[553]، ساڵی شەشەمی کۆچی به سریەیەکەوە به سەرکردایەتی عوکاشە چون بۆ ئەجناب له بەنی قوزاعە ڕەنگە بۆ کەش و هەوا سازدانی بانگەوازەکەیان بوبێ، که ساڵی١١ی کۆچیدوای وەفاتی پێغەمبەر هۆزەکانی نیوە دورگە جگە قورەیش وسەقیف هەموو هەڵگەڕانەوە، خەلیفە ئەبو بەکر ١١ لیوا وسوپای دروست کردو ناردیە سەریان، لیواکەی خالید کەبۆ سەر تەلیحە ی کوڕی خوەیلد له هۆزی (تەی) وئەسەد بوو له نەجد له نیوە دورگە، عوکاشە لەو سوپایەدابوو، خالید

---

548 سیرة ابن هشام ج١ص٢٣٨.

549 (انساب الاشراف، احمد بن یحی البلاذری، ج١ص٣٠١ تحقیق الدکتورمحمد حمید اللة القاهرة ١٩٥٩).

550 مغازی الواقدی ج١ص١٥٢.

551 (تهذیب الاسما واللغات، ابو زکریا محی الدین النووی، ج١ص٣٣٨ دمشق).

552 الدرر ص١٩.

553 طبقات ابن سعد ج١ص٨٤.

عوكاشەو سابیتی کوڕی ئەقرەمی لەبەنی تەی لە قوزاعە نارد وەك چاوساغ، لەوناوەدا چاویان کەوت بە حبال برای تەلیحەو کوشتیان، کە تەلیحە ئەوەی بیست خۆی و سەلمەی برای چون بۆیان وعوکاشەو سابتیان کوشت و هەواڵەکەیان بلاوکردەوە[554]، پێشەنگی سوپای خالید بە ۲۰۰ سوارەوە گەیشت بە سەرکردایەتی زەیدی کوڕی خەتاب، کە لاشەی عوکاشەو سابتیان بینی تێك چون، پاشان خالیدیش بە سوپاکەیەوە گەیشت، ڕوداوەکەیان بینی ناڕەحەت بون، خالید داوای کرد هەردوکیان بە جل وبەرگی خوێناویەوە لەجێی خۆیان ئەسپەردەکرد[555]، خراپ بە لاشەی عوکاشە کرابوو[556]، سوپای خالید بەو دڵگەرمیەوە هێرشێکی تۆڵە ئامێزیان کرد، زیانی گیانی ومالی گەورەیان لێدان، تەلیحە هەرئەوەندەی پیکرا ئەواری خێزانی خستە پاشکۆی ئەسپەکەی و تێی تەقاند بەرەو شام غاریداو پشتی لە هۆزەکەی کرد، خۆی گەیاندە بەنی کەلب، پاشتر کەبینی هۆزەکەی لە ئەسەدو غەتەفان موسوڵمان بون، ئەمیش موسوڵمان بونی خۆی ڕاگەیاند، لەوێمایەوە هەتا ئەبو بەکر مرد وعومەر بویە خەلیفە، ئەنجاهاتە مەدینە وبەیعەتی دایە خەلیفە عومەر، عومەر وتی، مادام تۆ بکوژی عوکاشەو سابیت بیت من هەرگیز تۆم خۆش ناوێت..تەلیحە وتی ئەی خەلیفەی موسوڵمانان، بۆ خەفەت بۆ دوو کەس دەخۆیت کە خودا بە دەستی من ڕێزو فەزلی گەورەی بەوان بەخشی، وەمنی سەرشۆڕنەکرد وبەدەستی ئەوان نەیکوشتم، واتە گەر ئەوان ئەوکاتە بیان کوشتمایە من بەکافری دەچوم، عومەر بەیعەتی لێ وەرگرت..ئەویش گەڕایەوە ناو هۆزو کەس وکاری، مایەوە هەتا لەگەڵ هۆزەکەیدا پێکەوە چون بۆ جیهادی عێراق[557]. شەهید بونی عوکاشە ساڵی ۱۱ی کۆچی بوو(بەرامبەر

---

554 (اسد الغابة، ابن اثیر ج۲ص۳٤٦).

555 (طبقات ابن سعد ج۳ص۹۳ ـ اسد الغابة ج٤ص۳ ـ الاصابة ج٤ص۲٥٦ ـ تهذیب الاسمأواللغات ج۱ص۳۳۸).

556 الکامل فی التاریخ ابن اثیر ج۲ص۳٤۷ بیروت ۱۳۸٥ ه).

557 ابن اثیر ج۲ص۳٤۸.

٦٣٢ی زاینی)[558]، پێغەمبەر باسی حەفتا هەزار کەس دەکات کەبەبێحیساب دەچنە بەهەشت، عوکاشە داوای لە پێغەمبەر کرد دوعای بۆ بکات لەوانەبێت، ئەویش فەرموی لەوانیت..! کەسی تریش داوایان کرد دوعایان بۆ بکات، فەرموی عوکاشە پێشتان کەوت، ئەوەیە بوەتەمەسەل بۆ یەکێك داوای شتێك بکات دەڵێن(سبقك بها عكاشه)[559] کە پێغەمبە وەفاتی کرد عوکاشە ٤٤ ساڵان بوو، دوای ئەو بە چەند مانگێك شەهید بوو، واتە ڕۆژی بوزاخە ساڵی ١١ی کۆچی، هەر لەو ساڵەدا مرد کە پێغەمبەری تیا وەفاتی کرد، واتە تەمەنی ٤٥ ساڵان بوو دوای پێغەمبەر بەچەند مانگێك کوژرا، کە هێشتا نیوە دورگەی عەرەب ڕزگار نەکرابوو، وەهێشتا فتوحاتی شام وعێراق باسی نەبوو، ئیتر چۆن هاتە کوردستان وتیا شەهید بوو! ! ئەباسەنانی برای کە دوو ساڵ لە عوکاشە گەورەتر بوو، لە گەمارۆی بەنی قورەیزەدا مرد ساڵی پێنجەمی کۆچی. وە سەنان کوڕی ئەبی سەنان کوڕی محسن، کە عوکاشە مامی بوو، لەنێوان سنان وباوکی دا ٢٠ ساڵ هەبوو، سنان غەزای بەدرو ئوحدو خەندق وحودەیبەی بینی، یەکەم کەس بوولە ڕۆژی بەیعەی ڕیزواندا بەیعەتی بە پێغەمبەردا، ساڵی٢٣ ی کۆچی مرد[560]، ئوم قەیس کچی محصن خوشکی عوکاشە یەکێ بوو لەو ژنانەی کە بەیعەتیان دا بە پێغەمبەر[561].

---

558 (العبر وديوان المبتدا والخبر، عبدالرحمن بن خلدون ابن خلدون ج١ص١٣ القاهرة١٣٨٤) (تاريخ خليفة، ابن خياط ج١ص٦٧).

559 (الاصابة ج٤ص٢٥٦ـ الاستيعاب ج٣ص١٠٨١).

560 طبقات ابن سعد ج٣ص٩٤

561 (المحبر، ابو جعفر محمد ابن حبيب البغدادي ص ٤٠٨ تحقيق الدكتورة ايلزة ليختن شتيتر بيروت ١٣٦١) (قادة النبي، اللواْ الركن محمود شيت خطاب، ص٢٤٢ـ٢٥١ دار القلم دمشق ١٩٩٩).

## گۆڕی میقداد لە ڕانیەو شارەبان

هەندێ سەرچاوە وانیشان دەدەن، کە میقداد کوڕی ئەسوەد هاوڕێی پێغەمبەرمان - درودی خوای لە سەربێت - لە ـی فەتحی عێراق وکوردوستاندا بەشداربوە، لە چەند جەنگ وڕوداوێکی گرنگدا ناوی هاتوە، پاشتر لەخاکی کوردوستان کوژراوە، دوو مەرقەدی بۆ کراوە، یەکیان لە ڕانیەو ئەوی تریان لە شارەبان، ئەوەبوو حکومەتی عێراقی لە پرۆسەی پاکسازی نەژادی وپیادەکردنی هەڵمەتی بە عەرەبکردنی ناوچە کوردیەکاندا، شاری شارەبانی کوردی ناونا مقدادیە.. گوایە مقداد هاتوەتە عێراق وشاری مقدادیەی دروست کردووە یان لەوێ ئەسپەردە کراوە..

### گۆڕی میقداد لە ڕانیە

ڕانیە یەکێکە لە شارەکانی کوردوستان، دەکەوێتە ناوەند دەشتی بیتوین وزنجیرە چیای کێوەڕەش لەڕۆژهەڵاتی کوردستانی بەشی عێراق، نزیك بە سنوری ئێران، یەکێکە لە قەزاکانی سلیمانی.. ناوچەی ڕانیە مێژویەکی کۆنی هەیە، هەرچەند فتوحاتی ئیسلامی ڕوی لەم ناوە نەکردوە، بەڵام لە هەڵبەسراوێکدا زۆربەوردی باسی کراوە.

مەلا ڕەئوف حوێزی لە کتێبەکەیداو مەلا جەمیل ڕۆژبەیانیلە سیپارەکەیدا و، مەلا عەبدولعەزیزی واعیزی سەردەشتی لە وەرگێڕاو بۆفارسیەکەیدا، وا دەردەخەن کە هەرسێکیان لە دەست نوسێکی واقیدیان وەرگرتووە، باسی تەواوی هێرشی سوپای ئیسلام دەکەن بۆکوردستان بەهەموو وردەکاریەکیەوە، کە تەنانەت لەگەڵ دوری و ونی و ئاڵۆزی شوێنەکەیدا، ناوی زۆر لە دێهات وشاخ وملە ودۆڵ وکانیاوو چەم وپاشا و زانا و شوان و باخەوانی کوردیان بردوە، هەر ئەوە جێی گومانە، ئەو وردەکاریە نابینیلە باسیفەتحی شام و عێراق و تەنانەت یەمەن و نیوە دورگەی عەرەبیشدا.

لێرەدا کورتەی ئەو بەشداریانەی میقداد دەگێڕینەوە کە لەکتێبەکەی مەلا ڕەئوف داهاتوە، ڕۆژبەیانی ومەلا واعیزیش هەر بەوجۆرەیان باس کردووە:

دوای فەتحی شام و ئەرمینیەو دیاربەکر لەلایەن سوپای ئیسلامەوە، ئەبوعوبەیدەی جەراح سەرکردەی سوپای شام، نامە بۆ خەلیفە عمر دەنوسێ، داوا دەکات دوای ئەوە چی بکەن؟ خەلیفە وەڵامی دایەوە: لازمە چوار هەزار کەس تەسلیم بە خالید بکەی وبەرەو قەومی کوردان بەرێیان بکەی، زوبێر وفەزڵ ومقدادی کوڕی ئەسوەد وچەند سەرکردەی تر بە شار و دێهات و شاخی کوردانا بڵاوبکەنەوە. سوپای خالید گەیشتە هەولێر، مقدادی ناردە سەر دێی شەهرێن(شەهرستێن) گرتی وگەڕایەوە مەرگە، هێرشی کردە سەر فەروخ پاشای مەرگە و شکاندی. پاشان عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو میقداد چوونە سەرکێوی دەربەندی پشتدەر وحەملەیان بردە سەر مەلیك فەروخ کە بەتەمابوو هەڵبێت بۆلای پاشای دۆگمان، مقداد فەروخی کوشت و، تا پشتی مەرگە سوپاکەی ڕاونان، پەلاماری ئەو کوردەیدا کە عەمری کوڕی عودەیەی شەهید کردبوو، کوردە ڕای کردە پاڵ بەردێك، میقداد لە هەر لاوە بۆی دەچوو، ئەو بەدەوری بەردەکەدا هەڵدەسوڕا، میقداد ماندو بوو بەشمشێرەکەی وت: ئەی شمشێر بە خوای گەورەت سوێند دەدەم لەو بەردەت ڕادەکێشم دەبێ بیبڕیت دەنا لای خوا شکاتت لێدەکەم، ئەنجا وەك هەوری بەهار گرماندی وشیری لەبەردا، بەردەکە وپاڵەوانە کوردەکەی لەودیو بەردەکەوە شەقار کرد، ئەنجا چوە باخێك پیرە مێردێکی پیری لێبوو، میقداد وتی چی دەکەیت؟ کابرا وتی پاسەوانی باغی مەلیك فەروخم، میقداد وتی من فروخم کوشتوە، تۆ بەرامبەر ئاینی ئیسلام چی دەڵێیت؟ کابرا ئاهێکی ساردی هەڵکێشاو وتی ئەگەر قوەتی گەنجیم دەبوو، هەزاری وەك تۆم لە تۆڵەی مەلیك فەروخدا دەکوشت، هانای بۆ ڕۆژ بردو وتی من ئەو نورە دەپەرستم و دینی خۆم تەرك ناکەم. میقداد ئەمری کرد پیرە کوردەیان کوشت. ئەنجا لاشەی پێنج شەهیدەکەیان هەر لەوێدابە خاك سپارد کە ناویان عەمری کوڕی عەدی وسالم وعەبدولقادرو وائلی عەمری یەمەنیو سەعدی ساعیدی قورەیشیو جەندەلەی عەبدولای عەلی مەککی بوو. خالید داوای کرد هێرش بکەنە سەر مەلیك دانیکوری پاشای پشدەر، میقدادو فەزڵی کوڕی

**عەباس سوپایان بردو شەڕ قەوما، میقداد پەلاماری دانیکۆری دا، دوای ماندوبون دانیکۆر هەڵهات وسوپاکەیان شکا، پاشتر دانیکور کوژرا، ناوچەکە موسوڵمان بون.. پاشان چونە سەر شەهبارە کە پاشاکەیان ناوی جاسومە بوو، میقداد کوشتی وشاری شەهبار گیرا.. پاشای ڕەزائیە ناوی خۆش قەدەم بوو، سوپای ئیسلام ڕوی کردە وڵاتەکەی، میقداد فەرماندەیەك بوو، شەڕی قورس قەوما وچل هەزار لە سوپای مازیندەران هاتن بەدەم خۆش قەدەمەوە، ئەنەس کوڕی مالیك خۆش قەدەمی کوشت، سوپاکەی هەڵهات وڕەزائیە گیرا..ئەنەس کوڕی مالیك لە ڕەزائیە وەفاتی کرد٠، ئێستە مەرقەدی لە وێ یە[562]_ئەم بۆچونە هەڵەیە_[563]. پاشان میقداد وفەرماندەکان گەمارۆی شاری بانەیان دا گرتیان..دوای ئەوە بەرەو عەرەبستان گەڕانەوە بە ڕێی دۆگماندا دەچون، نزیك دێی‌ئیسماعیل قولی (سماقوڵیان) نزیك شاری کۆیە، لە ناو دارو بەردو دەوەنەکانی ئەو ناوەدا کوردەکان خۆیان حەشاردا بوو، لە هەرچوارلاوە پەلاماری سوپای ئیسلامیاندا و سەدوپەنجا سەحابەیان کوشت کە ئەغلەبیان سپەسالار بوو وەك میقدادکوڕی ئەسوەدی کەندیو وائیلەی ئەسقەفیو قەعقاع وزرارو زۆری تر[564].**

---

562 کوردستان وئاینی ئیسلام، مەلا ڕەئوف سلیم حویزی.لا ٧٩_١١٥چاپخانەی جامعە بغداد ١٩٧٠..ئەمە قسەی مەلا ڕەئوفە، ڕاستی تیا نیە، ئەنەسی کوڕی مالیك دە ساڵ لە خزمەتی پێغەمبەردا لە ماڵیان ژیا وکاری دەکرد، لە جەنگی ئوحد وبیئر مەعونەو خەیبەر وهەوازن دا بەشدار بوو، پاشان کۆچ دەکات بۆ بەسرە وتیا دەمێنێتەوە وتیا دەمرێت، شەش هەزار فەرمودەی گێڕاوەتەوە، هەرگیز نەگەیشتوەتە کوردوستان وئێران.

563 (طبقات ابن سعد ج٧ص٧)(صفة الصفوة.ابو الفرج عبد الرحمن ابن جوزی.ج١ ص١٦٧ وص٢٩٨الهند، حیدر اباد ١٣٥٥قمری)(مجمع الزوائد.ابن حجر هیثمی.ج٩ص٣٠٦ سنة ١٣٥٢قمری).

564 کوردستان وئاینی ئیسلام، مەلا ڕەئوف حویزی.لا ١٢٩_١٣٠..فتوح سواد العراق ڕوایتی محمد عومەری واقیدی، ترجمە بۆ فارسی لە لایەن مەلا عەبدولعەزیز واعزی سردشتی تهران ١٣٧٤ هەتاوی.مرکز پخش تهران نادرکریمیان پێشەکی وتەعلیقاتی بۆ نوسیوە، لا ٢١٩، ٢٠٢، ٢٠٦)(ولاتگێری ڕەشەخاکی عێراق، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، لا ٤٣).

## گۆڕی میقداد له شارەبان

شارەبان مەڵبەندی قەزای میقدادیەیە لە پارێزگای دیالە، شارەبان ناوێکی مرەکەبە لە دوو وشە پێك هاتوە(، شار یان شەهر)واتە شار وە(بان یان بانو)واتە ژن یان دروستکەر یان گردو بان، لای هەولێر بە ژنی ماڵەوە دەڵێن کابانی ماڵەوە، لە سلیمانی دەڵێن کەیبانوی ماڵەوە، بە هەموی واتە شاری ژن، کە دور نیە ناوی ئەمیرەیەك یان شاژنێکی بە ناوبانگ بێت، هەندێك دەڵێن بەناوی ئەو شیرینە جوانەوە بوە کە کیسرای پەروێزعەشقی بوەو لەوێ کۆشکی بۆکردوە، ڕۆژبەیانی دەڵێ مەبەست شهریانو کچی یەزگوردە کە لە جەنگی جەلەولادا کەوتە دەستی سوپای ئیسلام وئیمام حوسەین مارەی کردو زەینولعابدەینی لێ بوو، یان ڕەنگە لەبەر زۆری گرد لە ناوچەکەدا ناونرابێت شەهرەبان، ڕاستیەکەی ئەو شارە هەبوە لە پێش یەزدگورد، لە سەردەمی ساسانیەکانداناوی شهرەبان بوە، یان گەڕاوەتەوە بۆ خوای ڕزق ورۆزی کە ناوچەکە زۆر ناودارە بەرزق ورۆزی[٥٦٥] تۆفیق وەهبی دەڵێ وشەکە ئاویستاییە مەبەست پارێزگاری شاران ولادێکانە، پاشتر ناونرا میقدادیە بەناوی میقداد کوڕی ئەسوەدی کندی یاری پێغەمبەر گوایە گەیشتوەتە ئەوێ لە کاتی فتوحات داو ڕەنگە گۆڕی لەوێ بێت، یەکێ تر دەڵێ شارەبان گۆڕا بە میقدادیە چونکە گۆڕی سەرکردە میقداد لەوێیە[٥٦٦]، یەکێتر دەڵێ ناوی شارەبان لە دوو وشە پێك هاتوەشەهر واتە شار، بان واتە پارێزگار، واتە حاکمی شار وپارێزگاری شاران، یاقوتی حەمەوی ومستەوفی باسیان کردوە، ئەمیرە کل ـ بان دروستی کردوە، ٤٢ کیلومەتر لە بەعقوبەوە دورە، دەڵێن دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەکەدی ٢٤٠٠پ.ز، لە کتێبێکدا هاتوە کە مەرقەدی

---

565 مذكرات مامون بيك.ترجمة رۆژبيانى وشكورمصطفى.مطبعةالمجمع العلمى العراقى.ص٥٠.

566 رحلة المنشىء البغدادى. محمد السيد احمد الحسينىج٦ص٤، ١٩٤٨ شركة التجارة والطباعة بغداد.

میقدادی لێیە[٥٦٧]، یەکێ تر دەڵێ مقدادیە مەڵبەندی قەزایە سەربەپارێزگای دیالەیە، ناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ هاوڕێی پێغەمبەر مقدادی کوڕی ئەسوەدی کندی کە ساڵی ٣٣ی کۆچی مرد[٥٦٨]، لە مونشییە بغدادی داهاتوە شارەبان بە ناوبانگە بە قرە مختار. عەباس عەزاوی دەڵێ نەزانراوە کە میقداد لە عێراق وەفاتی کردبێت، کەچی ئەو ناوە لەو ناوچەیەدا هەیە[٥٦٩]. پێشتر شارەبان بە ناوبانگ بوو بە چاکترین جۆری هەنار[٥٧٠].

لەجێیەکی تردا هاتوە هەبوونی گۆڕی ئەسحابان وپیاوچاکان لە شاری شارەبان زۆر دەبینرێت وەك گۆڕی میقدادو ئیمام وەیس، بەو مەبەستە حکومەت ناوی شارەبانی گۆڕی بەناوی میقدادیە، شارەبان ڕوباری سیروانی پیادەڕوات نزیك زنجیرە چیای حەمرین، لە کۆنداشارەبان هاوینە هەواری پاشایانی ساسانی بوە، ئەمڕۆ ناوەندی قەزای میقدادیەیە ٤٠ کیلۆمەترلە باکوری شاریبەعقوبەوەیە، تا جەنگی جیهانی یەکەم زۆربەی دانیشتوانی کورد بون،، پاشتر بەعەرەبکراوە، ئێستەش نیوە زیاتری شارکوردن یان باوو باپیرانیان ناویان کوردی بوە، بەڵاّم ئێستە لە ترسدا هەموو بەعەرەبی قسە دەکەن، هۆزی سورەمیری و زەرگوشی وباجەلان وخەتاوی وخەیلان وگۆران وزەنگەنەو عەنتەر، هەموو هۆزی کوردن لەو شارە ژیاون..حکومەت ناوی گەڕەکە کوردیەکانی گۆڕیوە بە عەرەبی، لە سەرەتای جەنگی عێراق ئێرانەوە بەمەبەستی کەم کردنەوەی ژمارەی کورد نزیك بە هەزارو پێنجسەدکوردی فەیلی ئاوارەی ئێران کرد[٥٧١]. مێژوونوسان تەنانەت گەورەکانیش وەك

---

567 العراق الشمالي، ص١٢٨ محمد هادي الدفتر وعبدالله حسن، بغداد ١٩٥٥ مطبعة شفيق.

568 اصول اسمآ المدن والمواقع العراقية، المحامي جمال بابان ج١ص١٨٦ بغداد، مطبعة الاجيال١٩٨٩ الطبعة الثانية ص١٨٦.

569 رحلة المنشيء البغدادي. محمد السيد احمد الحسينيج٦ص٤، ١٩٤٨ شركة التجارة والطباعة بغداد.

570 اصول اسمآ المدن.ص٢٨٢.

571 ڕۆژنامەی دەنگی میللەت ژمارە ١١٥ (شارەبان لە نیو سەدەدا)عەباس سلیمان سمایل.

بینیمان بێنەوەی لێکۆڵینەوە لە ژیان وناوی میقداد بکەن، کەوتونەتە ئەم هەڵە زەقانەوە تەنانەت لە بنەڕەتی ناوی شارەبانیشدا، بە زۆر میقدادیان گەیاندوەتە کوردوستان وداویانە بە کوشت، لێنەگەڕاون لە جێیەك، بەڵکو لە دوو جێدا گۆڕیان بۆ هەڵبەستوە، لە بەر زیادە ڕێزیش لە بەختی کورد شارێکی کوریان بەناوەوە ناو ناوە. بەڵام کە دەچینە بنج وبنەوان و ژیان وگوزەرانی ڕاست ودروستی میقداد، دەبینین ئەوانە هەر هەموو بوختان وهەڵەن ودژایەتی کوردیان پێکردووە، جگە لەوەی ستەمێك دەرهەق بەو سەحابە بەڕێزە کراوە، دەیخەنە هاوکێشەیەکەوە کە هەرگیز ئەو نەیکردوە، میقداد نەهاتوەتە عێراق وکوردوستان وناوچەی فارس و تیدا شەهید نەکراوە!

### ژیانی میقداد

میقداد کوڕی ئەسوەدی کەندی کوڕی عەمرو کوڕی سەعلەبە کوڕی مالیك کوڕی ڕەبیعە کوڕی عامر کوڕی مەترود بەهرانی حەزرەموتیە. میقداد لە هۆزی حیمەیر قوزاعەیە، کونیەی ئەبو مەعبەد یان ئەبو عەمرە بوو. ساڵی ۳۷ی پێش کۆچی بەرامبەر ۵۸۷ ی زاینی لە یەمەن لە دایك بوە، پێش ئیسلام لە حەزرەموت لە یەمەن دەژیا، کێشەیەك لە نێوان میقدادو ئیبن شەمری کندی سەرەك خێڵدا ڕوی دا، میقداد بە شمشێر لەوی دا و ڕای کرد بۆمەککە، کە ئیسلام سەری هەڵدا، میقداد موسوڵمان بوو، یەکێك بوو لەو حەوت کەسەی کە ئیسلامبونی خۆیان ئاشکرا کرد، کە بریتیبون لە ئەبوبەکرو عومەرو عەممارو سومەیەی دایکیوسوهەیب و بیلال ومیقداد[572]. پێغەمبەر زۆری خۆش دەویست کچێکی ئامۆزای خۆی دایە[573]. میقداد لە

572 الفصول الفخرية-جمال الدين احمد بن عتبة-ص٤٥-تهران-شركت انتشارات علمى وفرهنگى ١٣٦٣شمسى، ودلائل النبوة-البيهقى ج١ص٢٧٤.

573 ولاتگیری ڕەشە خاکی عێراق، ڕۆژیەیانی، ٨٧ ١٨ پەراوێز، چاپی یەکەم سلیمانی ١٩٩٧.

جەنگی بەدردا بەشدار بوو، ئازایەتی زۆری نواند[٥٧٤]. میقداد بوو لە جەنگی بەدردا بە پێغەمبەری فەرموو: ئێمە بۆ تۆ وەك گەلی موسا نابین کە پێیان وت تۆو خوات بچن بۆشەڕو ئێمەش لێرە دانیشتوین، بەڵکو دەڵێین تۆو خوات برۆن بجەنگن ئێمەش لە ڕاست و چەپ وپێش وپاشتانەوە دەجەنگێین، ئەم وتەیە ڕوی پێغەمبەری گەشاندەوە.لە ساڵی پێنجەمی کۆچیدا لە غەزوەی مورەیسیع دابەشدار بوو. لەجەنگی غابەدا ساڵی شەشەمی کۆچی بەشدار بوو. لە غەزای حودەیبییەدا خۆی وبیست نەفەر بونە پێشەنگ وڕێیان بۆ سوپای پێغەمبەر پاك دەکردەوە.لە جەنگی خەیبەردا هاوکاری گەرمی هەبوو.ساڵی ٢٨ یان ٢٩ی کۆچی لە جەنگی قوبروسدا هاوڕێی معاویەی سەرکردەبوو. لە سحاحدا ٤٨ فەرمودەی ئەوی تیایە کە لە پێغەمبەرەوەی گێڕاوەتەوە، بە کۆی هەموو شارەزایان لە ژیانی ئەلرجالدا واتە (پیاوناسان) ومێژوونوسان دەڵێن میقداد ساڵی ٣٣ی کۆچی بەرامبەر ٦٥٣ی زاینی لە شاری مەدینە لە سەردەمی خەلیفە عوسماندا وەفاتی کردو هەرلەوێ ئەسپەردەکرا[٥٧٥]. ڕۆژبەیانی دەڵێ میقداد لە سەردەمی خەلیفەی سێیەم عوسمانی کوڕی عەفاندا هەبوەولە جەنگی میسردا هاوبەشی کردوەو لەوێ مردوە، تەرمەکەیان هێناوەتەوەبۆ مەدینەو خەلیفە عوسمان نوێژی لە سەرکردوە، ئەمە ساڵی ٣٣ی کۆچی بوو، ئەو گۆڕەی کە لە شاری شارەبانەو بەوهۆیەوە ناوی شارەبان گۆڕاوە بە میقدادیە، ئەو گۆڕە هی کابرایەکی شێخ میقداد ناوە لەم ساڵانەی دوایدا ژیاوە، دەنا میقدادی ئەسوەدی سەحابی

---

574 دلائل النبوة.ابو بكر احمد بن حسين البيهقى، ج٢ ص٢٢٤ـ٢٣٠تهران انتشارات علمى وفرهنكى ١٣٦١شمسى.

575 (فتوح سواد العراق.محمد عمر الواقدى، ترجمة بۆ فارسى عبد العزيز الواعظى سردشتى.ص٢٥٦)(الاصابة فى تميز الصحابة.شهاب الدين ابن حجر العسقلانى. ج٣ ص٤٥٥ بيروت.دار احياءالتراث العربى ١٣٢٨ قمرى) (در السحابة فى مناقب القرابة والصحابة.محمد بن على شوكانى.لمام الشوكانى.فى مناقب مقداد بن اسود.ص٢٨١ دمشق دار الفكر ١٩٨٤).

نەهاتوەتە کوردوستان[٥٧٦] ئەی دەبیٚ ئەم هەموو گۆڕو مەرقەدانە هی کێبن کە شارو دیٚو چەم ودۆڵی کوردستانی گرتوە؟ یان کورد هەر بۆ پیرۆزی سەحابەکان بە خەیاڵ پیرۆزی بۆخۆیان داتاشیوە، کورد بەهۆی نەهامەتیەکانی ژیانیەوە.چونکە پاڵپشت وپەنایەکی جگە لە خوا نەبوە، پیرۆزی زۆری بۆخۆی چاندوە، هەتا پەنای بۆ بەرێت و هانایان بەخوا بگەیەنیٚوناخی پیٚئارام بکات.. یان جێی بڕوایە کە گۆڕی زاناومەزنانی زەردەشتی بوون و لەترسی ئەوەی نەبادا گۆڕەکانیان لە ناوبەرن ناوی ئەو سەحابانەیان لێناوە تا پارێزراوبن وبە پیرۆزی بمێننەوە!

576 ولاتگیری رەشەخاکی عێراق، مەلا جەمیل رۆژبەیانی.لا١٨ پەراوێز.چاپی یەکەم، سلیمانی ١٩٩٧).

## گۆڕی ئەبوعوبەیدە لە دێی عەبابەیلیٚ لە هەڵەبجەی شەهید

مەگەر خوا بزانێت، خەڵکی هەڵەبجەو شارەزوورو هەورامان، چەندە شانازی بە بونی گۆڕو مەرقەدی عەبابەیلیٚ وە دەکەن، کەگوایە گۆڕی سەحابەیەکی پیرۆز لە خاکی ئەواندا هەیە، نێزیك وموشەڕەفن بەو بەرەکەتە مەزنە، لەزۆر کۆنەوە ئەو مەرقەدە

جیٚ زیارەتگاهی خەڵکانی نەخۆش وکەساسە، ژنی نەزۆك داوای منالٚ و، کچان داوای مێردکردن وبەخت بەربون وشتی تر دەکەن، زیارەتکردن چوار شەموان وهەینی بوە، بەرد لکاندن بەکێلەوە باوبوو، کەلابەردێکی گەورە هەبوو لەسەر بەردێکی تر دەخولێنرایەوە، پێنج شەش بەردی شێوە جۆراوجۆر هەبوو هەرکەس بیخستنایەتە سەر یەکتر گوایە مەقسەدی حاسلٚ دەکرد، ژنان بەتانی وپەڕۆو گونێیان بە مێلوە دەگرتەوە لەژێردارەکاندا دەمانەوە، هەتا مێروو زیندە جانەوەرێك، یان هیچ نەبێت پەڕیٚ ڕیقنەیەکی تێبکەوتایە، دەبوو بیخۆن و بەمەیلی خۆیان دەیانگوت نیازی دڵمان جێبەجیٚ بووە و منداڵمان دەبێت، ئەوەی نیەتی زیارەتیناو مەرقەدی هەبایە، دەبوو ڕوبەڕو بچوایەتە ژورەوەو بەپشتا بهاتایەتە دەرەوە، منداڵ نەبوو لە هەڵەبجەدا پەڕۆیەکی سەوزی عەبابەیلیٚ بۆ تەبەرك بە مەچەك و یەخەوە نەبێت، یان خۆڵی عەبابەیلیٚ نەخواردبیٚ، لەزۆر دورو لە دەرەوەی وڵاتیش خەڵکی دەهاتنە زیارەت و چەند شەو دەمانەوە، وەقفە دارێکی زۆر و کانیاوی ساردو سازگار، ئەو سەیرانگاو زیارەتگایەی خۆشکردبوو، لەبیرمە لەسەرەتای شەستەکانەوە هەتا ناوەڕاستیحەفتاکان دەیان جار بەماڵەوە دەچوین و سەیران وزیارەتی خۆمان دەکرد، ئەولاپالٚ وبەرکێوی شنرویٚ و زەلەکێیە لێوان دەبوو لەخەڵك، هەتا دەمی ئێوارە دەماینەوە، لە سەروی مەرقەدەکەوە گۆڕێکی تر هەیە بەناوی ئیمام قاسم ولە ڕۆژئاواشیەوە گۆڕێکی نەناسراوی تر هەیە، ئیمام قاسم یەکاویەکە بۆ کۆکەڕەشەو شێتی، نەخۆشیان لە خسنەکەیدا دەبەستەوە دەخەوت کەبەیانی هەڵدەستا عەلەمی تیا نەدەما و

دەبوو بە گوێزی ساغ، لەزوەوە خەڵکی سەر لەوە دەکەنەوە کەداخۆ ئەو مەرقەدە کێبێت، زانایان وخەڵکی تر دەیانزانی کەئەوە ئەبوعوبەیدەی جەڕاح نیە، دودڵ بون نەیان دەویست ناوی سەحابەیەك کە چەندین سەدەیە لە ناوچەکەدا هەیە دابڕنن، لە نێوان جەڕاح و ئەبوعوبەیدەی سەقەفی ئەنساری هێشتویانەتەوە. لەسەر ڕێگەی هەڵەبجە بۆ عەبابەیلێ کۆمەڵە بەرد دانراوەو هەرچی لەوێوە گوزەر دەکات بۆ زیارەتی عەبابەیلێ، وایان ڕاهێناون کە دەبێ بەردێك هەڵبدەنە ناو کۆمەڵەخڕکە بەردەکەوە، هەندێ واپاگەندە دەکەن کە ئەوە گۆڕە جولەکەو کافرانەو دەبێ بەرد باران وڕەجم بکرێن، بێئەوەی ئاسەواری قەبرستان ولاشەیەك لەوناوەدا هەبێت، بەڵکو ئەوە هەر فێڵێکی جوتیاران‌و خەڵکی ئەو دەڤەرەیە بۆ کۆکردنەوەی خڕکە بەردی ئەو ڕێ وبانەیە کە ناوچەکەی گرتوەوکاری زیارەتکەران وجوتیارانی شپرزکردوە، ناوچەی جێڵەو عەبابەیلێ بەناوبانگە بە خڕکە بەرد، ئەوە هۆیەکی چاکە بۆ کۆکردنەوەیان، ئەو شێوازە لەزۆر ناوچەی بەردەڵانی کوردستاندا هەیەو مەبەست تەنها کۆکردنەوەو ڕزگاربونە لێیان، حەکیمان وزانایانی ناوچەکە ئەو شێوازەیان داهێناوە بەجۆرێك ئەوەی دەچێت بۆ زیارەت بۆ هێنانەدی نیازی دڵی وای پێ باشە ئەو داوایە جێبەجێ بکات، دەڵێن گوایە ڕێگەی بۆ نزیك دەبێتەوە.

لە ناو کوردا لە سەر عەبابەیلێ و مەرقەدەکەی ئەم باسانە هاتووە:

١ـ خەڵکی ناوچەکە بە ئەفسانەیەك دەگێڕنەوە کەلە دێرزەماندا شەڕێکی قورس لە نێزیك دێی عەنەب لە شانی خوارەوەی شاخی شنروێ کە بیست دەقیقەیەك لە عەبابەیلێوە دورە، لە نێوان سوپای ئیسلام وکافراندا ڕوی داوە، موسوڵمانەکان شکاون وئەبوعوبەیدەی سەرکردەیان ملی پەڕیوە، سەرولاشە بەجیا بەلنگە فرتە گەیشتونەتە عەبابەیلێ، لەوێ ئەسپەردە کراوەو بوەتەمەرقەد، دێ کۆنەکە بەناوی ئەو سەحابەوە بەمروری زەمەن لەئەبوعوبەیدەوە کەبۆ زمانی کوردی قورسە بوەتە عەبابەیلێ.

٢ـ مەردۆخی لە کتێبەکەیدا باسێکی هێناوە ناوی سەرچاوەیەکەی نەبردوە دەڵێ ( ساڵی ١٨ی کۆچی سوپای ئیسلام بە فەرمانی خەلیفەی دوەم و لە ژێر فەرمانداری ئیمام حەسەن وعەبدوڵای کوڕی عومەر لە عێراقەوە بەرەو ئێران دەڕۆن عەبدوڵای کوڕی عومەرو ئەبوعوبەیدوڵڵای ئەنساری لەگەڵ پێنج هەزار سواردا بەرەو شارەزور ئەکەونە ڕێ وچەند شەڕ ڕوودەدات، ئەبوعوبەیدولا دەکوژرێ ولە دێی عەبابەیلێ دەنێژرێ.ئەوانەی مانەوە بونە موسوڵمان و وازیان لێ هێنان، عەبدولا مانگێك لەو ناوچانەمایەوە، تاوەکو لە جێگای پەرستگاکان چەند مزگەوتێکی دروستکرد یاساو فەرمانەکانی ئیسلامی لە خەڵکەکە گەیاند، پاشان ڕوەو هەورامان کەوتنە ڕێ و لەنزیك پاوە شەڕو کوشتار ڕویدا، عەبدوڵای کوڕی عومەر لە شاری پاوە مزگەوتێکی دروستکرد، پاشماوەیەکی کەم توانی هەموو وڵاتی کورد بخاتە ژێر چاودێری ئیسلامەوە، لەبری ئاگرو پەرستگاکان مزگەوتی دروستکردیاساو فەرمانی خوای بڵاو کردەوە[٥٧٧]. لێرەدا مەردۆخی لە ئەبوعوبەیدەوە کردیە ئەبو عوبەیدولا وە دوو هاوڕێی تری بۆ زیاد کرد یەکەم: ئیمام حەسەنە کە هەتا ئیستە باسی نەبوە کە ئەو لە فتوحات وجەنگەکانی نەك کوردوستان بەڵکو لە دواتریشدا بەشداری کردبێ، ئەو پیاوی سوڵح وئاشتی بوە درێژکراوەی جەنگی سەردەمی باوکی لە گەڵ معاویەدا کۆتایی پێهێنا، دوەم: عەبدوڵای کوڕی عومەر دواتر لە باسی دا بە درێژی ڕونی دەکەینەوە کە ئەویش هەرگیز نەهاتوەتە کوردوستان وهیچ مزگەوت وگۆڕێکی لە کوردوستاندا نیە، کەچی دوو گۆڕو سیانزە مزگەوتی لە کوردوستاندا بە ناوەوە بۆ هەڵبەستراوە..

---

577 مێژوی کوردو کوردوستان.محمد مەردۆخی کوردوستانی، وەرگێر لە فارسیەوە عەبدولکەریم محمد سەعید. لا ١٨٦ بغداد ١٩٩١.

٣ـ هەروەها هەمان هەواڵ لە دەستنوسێکدا هاتوە..لەو دەست نوسەشدا نەهاتوە کەلەچ سەرچاوەیەك وەرگیراوە، ڕەنگە هەر ئەوەی مەردۆخی بێت[578].

٤ـ مەرحومی مامۆستا مەلا عوسمان چەند جار فەرمویەتی لە حاشیەی کتێبێکی گەورەدا باسی شەهید بوونیم لەم دێیەدا دیوە، منیش زۆر هەوڵم داو پرسیارم کرد ئەوەم دەست نەکەوت. ڕەنگە ئەویش هەر ئەم کتێبەی مەردۆخی بوبێت[579].

٥ـ جارێکی تر لە هەڵەبجە لە باسی گۆڕی ئەو سەحابانەو ئەبو عوبەیدە باس وخواسمان بوو، حاجی محمد کۆکۆیی وتی ساڵی ١٩٦٥لە کەرکوك سەرباز بوین لە سەردەمی عەبدوسەلام عارفدا، ئەو کاتە قائد فرقەی دوو ناوی ئیبراهیم فەیسەڵ بوو، هاتە هەڵەبجەو لە گەڵ قوێخا عەلی کۆکۆیی وتی بابچینە زیارەتی باپیرمان لە عەبابەیلێ، ئێمە ئەنساریین لە نەوەی ئەم شەخسەین، ئەمە جەراح نیە ئەنساریە، تابیعی تابیعیە..نازانم ئەویش ئەم باسەی لە چ سەرچاوەو شەجەرەی نەسەبێك هێناوە[580].

٦ـ برادەرێك وتی فلاَن مامۆستا لەهەڵەبجە گێڕانەوەیەکی لەسەر ئەبوعوبەیدەی سەقەفی لەلایە دەیسەلمێنێ کە مەرقەدی عەبابەیلێ خۆیەتی. منیش چومە هەڵەبجە بۆخزمەتی، چیرۆکەکەی بۆ گێڕامەوە وتی: ئەو سەحابەیە لە جەنگی جسردا لەسەر فورات لەباشوری عێراق شەهید بوە، لاشەکەیان بردوە نیشانی پاشای فارسی بدەن، پاشان سوپای ئیسلامی چوە ناوچەکەی گرتوەو لاشەکەیان لە دێی عەبابەیلێ ئەسپەردە کردوە، وتم سەرچاوەت چیە؟ فەرموی هیچم نیە هەرخۆم دەڵیم، مادام ئەم قەبرە هەیەو

578 بەناوی (القضية الكردية من منظور اسلامي).موضوع (الاكراد قبل وبعد الاسلام) ص٩ـ١١.

579 مامۆستا حەسەن شێخ عەبدوڵا عەبابەیلێیی بۆی گێڕامەوە کە مەرحومی مامۆستا سەید نەجمەدینی مزگەوتی ئوسامەلە هەڵەبجە جارێك کتێبێکی نیشاندام کەباسی شەهید بونی ئەبوعوبەیدەی کردوە بەڵام لەبیرم نەماوە چ سەرچاوەیەکە.

580 لە دانیشتنێکدا مانگی ٥ ساڵی ٢٠٠٢ لە دوکانی حاجی محەمەد کۆکۆیی لە هەڵەبجە بۆی باس کردم.

خاوەنی نیە، کەواتە هەردەبێناوا بوبێت، پاشان وتی وابزانم لە کتێبی مجمع تەواریخدا دیومە. جگەلەوە نیوانی دێی عەبابەیلێ، بۆشوێنی جەنگی جسر لە خوار شاری کوفەوە، زیاد لە هەزار کیلۆمەتر دەبێت، جگە لەوە پاشای فارس ئەوهەموو شەڕو شکستیەیان بەسەر هاتوە، لاشەی کوژراوێکی بۆ چیەیە؟ جگە لەوە جەنگی نێوان پاشایانی فارس لە نێوخۆیاندا، ئاگایان لە شەڕی باشور نەمابوو، نەیان دەزانی سەرکردەکان چی دەگوزەرێنن، بەتایبەتتر کە ئەو کاتە بوران کچی کسرا بوبویە پادشاو، چەند ئافرەتی تر بونە پاشا ئافرەت بە تەبیعەتیحالێ خۆی لە لاشەی کوژراوو پیاو دەبوێرێ، جگە لەوە ئەو کاتە پایتەختی ساسانی مەدائن بووە نزیك بە خوار شاری بەغدادی ئەمڕۆ، پاشا لەوێ بوە نەك لە عەبابەیلێ، کە پێنجسەد کیلۆ مەتر نێوانیانە[581].

٧- جەمال بابان دەڵێ (ناوی دێیەکە وەك دەڵێن بەناوی سەرکردەی ئیسلامی ئەبی عوبەیدەی ئەنساری ناونراوە کە کاتی فتوحاتی ئیسلامی گەیشتە ئەو ناوەو لە دێیەکە مەزارێکی کۆنی هەیە، پارچە بەردێکی نوسراوی تیا دۆزراوەتەوە کە ناوی سەلیم پاشای بابانی بەسەرەوەیە کە ساڵی ١١٦٠ی کۆچی ئەو مەزارەی دروست کردوە.)[582].

٨- لە هەفتەنامەی ئەلئیتحاددا هاتوە (لە بەردەم دێی عەبابەیلێدا دوو گۆڕی سەحابەی - ئەبو عوبەیدەو ئیمام قاسمی - لێیە)، لە جێیەکی تردا دەڵێ(ئیمام قاسمی سەقەفی یەکێکە لە سەرکردە ئیسلامیەکانی فتوحاتی ئیسلامی)[583]، نازانم نوسەر ئەم زانیاریانەی لە کوێ هێناوە، بە مەرجێ لە ناو سەحابەکاندا کەسێك نیە ناوی ئیمام قاسمی سەقەفی، یان دەڵێ (شەڕی

---

581 وتووێژ لە گەڵ مامۆستا مەلا شێخ محەمەد سازانی لە ماڵی خۆیان مانگی ١٠ساڵی ٢٠٠١.

582 اسماء المدن والمواقع العراقية، المحامي جمال بابان، ج١ ط٢ص٩بغداد ١٩٨٩مطبعة الاجيال.

583 هەفتەنامەی(الاتحاد) ژمارە ٤٥٢ بەروار ٢١-١٢-٢٠٠١ لا ١٦ بابەتێك بەناوی ئەبوعبیدە.. نوسینی کاروان ئەنوەر.

قورس لەو ناوە قەوما) ئەوەش هەر ناسەلمێ و هیچ سەرچاوەیەکی مێژوی فتوحات نیە کە ناوی عەبابەیلێ ببات بڵێ لەوێ شەڕ بوە.

جێی خۆیەتی ئێمە بکۆڵینەوەو بزانین ئایا لە سەرچاوەی فتوحاتە ئیسلامیەکاندا لەسەحابەکان یان دوای ئەوان کەسێك بەناوی ئەبوعوبەیدە یان جۆرەکانی ئەوناوە هاتونەتە عێراق وفارس وهەرێمی چیا (کوردستان)و شەهید بون، ئەوەش ئاسانە چونکە سەرچاوەکانی مێژوی ئیسلام هەموی ڕێکخراوەو ئاسان دەدۆزرێتەوە بۆکەسێك مەبەستی بێت بگاتە ئەنجامێك..بە تایبەتتر کە ژیان ومردنی ئەبو عوبەیدەی جەڕاح وئەنساری سەقەفی لە هەموکەسی تر زیاتر ڕونەو سەرچاوەی زۆرەو هیچ گومان ناهێڵێتەوە.

کتێبی (الاصابە)و (الاستیعاب)و (اسد الغابە) لە باشترین کتێبەکانە کە زۆرترین ناوی سەحابەی تیایە، لەو سێ کتێبەدا ژیانی زیاتر لە ٢٠ هەزار سەحابە هەیە، لەو کتێبانەدا تەنها ئەم ئەبوعوبەیدانە هەیە.

١ـ ئەبو عبیدە کوڕی عامر کوڕی محسن، لە بنەڕی مەعونە شەهید بوە لە خاکی حیجاز، ئەوەبو پێغەمبەر لەگەڵ دەیان سەحابەدا ناردی خەڵکی ئەو ناوە فێری ئیسلام بکەن لە سەر داوای خۆیان، بەڵام بە غەدر هەمویان شەهید کردن، ئەمە لە سەردەمی پێغەمبەردابوە[584]

٢- ئەبوعبیدە کوڕی عەمارە کوڕی وەلیدی مەخزومی، لە فەتحی شام دا بەشدار بوو، لە جەنگی ئەجنادین دا شەهید بووە لە خاکی فەلەستین، نزیك بەخاکی حیجاز[585]

٣- ئەبو عبیدەی جەڕاح ناوی تەواوی ئەبوعوبەیدەی عامری کوڕی عەبدوڵای جەڕاحی قورەیشی فەهریە[586]، ساڵی ٥٨٤ ی زاینی واتە ٤٠ ساڵ

---

584 الاصابة في تميز الصحابة _ابن حجر العسقلاني _ج٤ ص١٣١ دار احياْ التراث العربي بيروت ط١ ١٣٤٨ﻫ.

585 هەمان سەرچاوە.

586 (طبقات ابن سعد ج٣ ص٤٠٩ ابن سعد دار بيروت ١٣٧٦ ﻫ).

پێش کۆچ لەدایك بوە، لە یەکەمین دە کەسەکەیە کە موسوڵمان بون، لە دەکەسەکەیە کەمژدەیان پێدرا بە بەهەشت، دوو ساڵ پێش کۆچ، کۆچی کرد بۆ حەبەشە، ساڵی یەکی کۆچی کۆچی کرد بۆ مەدینە، ساڵی دووی کۆچی لە جەنگی بەدردا بەشدار بوو، ساڵی سێی کۆچی لە جەنگی ئوحددا بەشدار بوو، ساڵی شەشی کۆچی سەرکردایەتی سریەی زێ قیسەی کرد[587]، ساڵی هەشتی کۆچی بەشداری جەنگی زات سەلاسیلی کرد، دوای گرتنی قودس کە خەلیفە عومەرچوو بۆ شام هەموو سەرکردەکان هاتنە پێشوازی، عومەر فەرموی کوا براکەم وتیان مەبەستت کێیە.؟ فەرموی: ئەبوعوبەیدە، وتیان ئێستە دێت، کەهات بەسەر حوشترێکی بێکورتان تەنها گوریسێکی پێوەبوو، سڵاوی کرد عومەر بە خەڵکی وت:لامان لاچن. وتی: بابچین بو ماڵی خۆتان، ئەبو عوبەیدە وتی ماڵی منت بۆ چیە یان دەتەوێت بەسەیری ماڵی من چاوت بگوشیت.؟ کە عومەر چوە ژورەوە هیچی نەدی جگە شمشێرو قەڵغان و لبادێك وقاپێکی‌شکاو، وتی کوا کەلوپەل وخواردنت؟ چوو زەمیلەیەکی هێنا چەند لەتە نانێکی تیا بوو، عومەر گریا، ئەبو عوبەیدە وتی: ئەمگوت هاتوی بە ماڵی من چاوت بگوشیت، هەر ئەوەندەمان زاد دەوێ تا دەمان گەیەنێتە مەنزڵ، عومەر فەرموی: دنیا هەمومانی گۆڕی جگە تۆ[588]، کاتی خۆی خەڵکی نەجران داوایان لە پێغەمبەر کرد کەسێکیان بۆ بنێرێت فێری ئیسلامیان بکات، ئەویش فەرموی کەسێکی بەهێزتان بۆدەنێرم، ئەبوعوبەیدەی بۆ ناردن و، فەرموی (لكل امه امين وامين امتیابو عبيده)، پاشتر خەڵکی یەمەنیش داوای شتێکی وایان کرد، هەر ئەبوعوبەیدەی بۆناردن[589]، مەعازی کوڕی جەبەل دەیگوت: ئەبو عوبەیدە چاکترین خەلقی خوایە لەسەر زەوی دا[590]، کە پێغەمبەر وەفاتی کرد خەڵکی هاتن بەیعەت بەو بدەن، ئەبوعوبەیدە وتی

---

587 الاصابة فی تمیز الصحابة، احمد بن علی العسقلانی، ج٤ص١١ مطبعة دار السعادة، مصر ١٣٢ ه.

588 (اسد الغابة، ابن اثیر، ج٣ ص٨٦ المطبعة الاسلامیة بطهران ١٣٧٧ ه).

589 (الاستیعاب ـ ج٢ ص٧٩٣).

590 (ابو عبیدة بن الجراح ص٧).

بەیعەت دەدەنە من کە(ثالث الثلاثة) تان تیایە مەبەستی ئەبوبەکر بوو لە ئایەتی (لاتحزن ان الله معنا)، پاش ئەویش بەیعەتی دا بە عومەر، عومەر کردیە سەرکردەی سوپای شام لەجێی خالید، جەنگی دیمەشق وفحل ومروجی رومی کرد، ئەنتاکیاو لازقیەو شارەکانی کەنار دەریای گرت و هەموو شامی لەدەست رۆم رزگارکرد، ساڵی ۱۸ی کۆچی نەخۆشی تاعون لە شام بڵاوبویەوە ۱۵ هەزار لەسەربازی ئیسلامی کوشت، هەر لە بنەماڵەی خالیدی کوڕی ولید ٤٠ کەس ولەبنەماڵەی حارسی کوڕی هیشام ۷۰ کەسی کوشت، لەسەرکردەکان مەعازی کوڕی جەبەل ویەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان وسەهل کوڕی عەمر وشەرحەبیل کوڕی حەسەنەو زۆری تری کوشت، خەلیفە عومەر ویستی بەجۆرێك ئەبوعوبەیدە بانگ بکاتەوە وتوشی ئەو پەتا نەگرسە نەبێت، نامەیەکی بۆ نارد بەم جۆرە: (سەلامت لێبێت کارێکی تۆیان پێ گوتوم، دەمەوێ بەدەمی خۆت بدوێنم، ویستم بێمە لات، بەلاّم هەر کەنامەکەت خوێندەوە، دایمەنێ هەتا دەگەیتە لام..) بەلاّم ئەبوعوبەیدە تێگەیشتبوو عومەر چی دەوێت، هەر بۆیە نامەیەکی بۆ نوسیەوە:(لەئیشەکەت بەمن حاڵی بوم، من لە گەڵ سەربازەکانی خۆمدام، دەرونم حەزناکات لێیان جوێبیمەوە، وازم لێبێنە بالایان بمێنمەوە..) ئەبوعوبەیدە لەوێ بەو نەخۆشیە لەتەمەنی ٥٨ سالیدا لە فەحلی عەمواس لەئەردەن مرد، لە گۆڕستانی بیسان ئەسپەردە کرا[591].

عومەر هەمیشە دەیگوت:خۆزگە پڕ ژورێك پیاوی وەك ئەبوعوبەیدەم دەبوو، گەر بمایە لە جێی خۆم دام دەنا، گەر پرسیارم لێبکرایە بۆچی؟ دەمگوت ،ئەمینی خواو پێغەمبەرم داناوە. ئەبو عوبەیدە دەیگوت خۆزگە مەڕێك بومایە و خزمان سەریان بڕیمایە، گۆشتەکەیان بخواردمایەو جگەرەکەیان سورکردمایەتەوە[592]. ئەوەبوو کورتەی ژیانی ئەبوعوبەیدە،

---

591 (اليرموك وتحرير الشام، اللواء الركن شاكر محمود، ط١ ص٢٠٦ السنة ١٩٨٦ بغداد).

592 (ابو عبيدة بن الجراح ، مشاهير قادة الاسلام ، بسام العلي، دار النفائس، الطبعة الرابعة ، بيروت،١٩٨٢).

بریامەرقەدی ئەو کەسایەتیە مەزنە بەهەڵوێست وپاك وخۆنەویستە لە خاکی کوردان دا بوایە، هەتا چیرۆك وداستان و ڕەوشتە جوانەکانی لە یادی خەڵکی کوردستاندا، لە باس وخواس وگێڕانەوەیاندا بوایە، بەڵام سەد مەخابن..

٤- ئەبو عبید کوڕی مەسعود کوڕی عەمر کوڕی عومێر کوڕی عەوفی سەقەفی ئەنساری[٥٩٣]، ئەم سەرکردەیە لە کتێبی ئەسحابەکاندا بە سەحابی تەواو نەهاتوە، بەڵکو لە ناو مندالەکاندا ناوی هەیە، لە سەردەمی پێغەمبەرو ئەبوبەکردا ناوی نیە، چونکە درەنگ موسوڵمان بوو، ئەو کاتەی کە پێغەمبەر لە دوا غەزایدا لە تەبوك دەگەڕایەوە بۆ مەدینە، لە مانگی ڕەمەزان لەساڵی نۆی کۆچی، لەوکاتەدا وەفدێك لەخێڵی سەقیف هاتن موسوڵمان بونی خۆیان ڕاگەیاند[٥٩٤]، شەرەفی سەحابی بەرکەوت بەڵام شەرەفی جیهادی بەرنەکەوت چونکە دوای تەبوك موسوڵمان بوو، وەتەبوك دوا غەزای پێغەمبەر بوو[٥٩٥]، بەڵام کەموسەننا پەلاماری فارسەکان دەداو، لە بابلەوە هەتا مەدائن ڕاویان دەنێ، لە داخدا شهریار پاشای ئەوکاتەی فارس سەکتە دەکاو دەمرێت، ناکۆکی دەکەوێتەوە ناو سەرکردایەتی فارس، موسەننا دەیەوێت سود لەو هەلە وەربگرێت، داوا لە ئەبوبەکر دەکات بۆ یارمەتی، بەڵام ئەبوبەکر دەمرێت، عومەر دەبێتە خەلیفە، موسەننا دەگاتە مەدینە وداوای سوپا دەکات، ئەو کاتە ئەرمیدخت کچی کیسرا دەبێتە پاشای فارس و، سابوری پادشای پێش خۆی دەکوژێت، فارسەکان هەندێ شوێن لە باشوری عیراق دەگرن، لە بەر ئەوە سەربازە موسوڵمانەکان حەزناکەن بچن بۆشەڕی فارس و، بەتایبەت تر کەخالید لەوێ نەماوە، خەلیفە عومەر موسوڵمانان کۆدەکاتەوە، هەرچی داوا دەکات نایەن بە دەمیەوە، بڕیار دەدات هەرکەس زوو وەڵام بداتەوە، دەیکاتە سەرکردەی سوپای عێراق، لەوێدا ئەبوعوبێد کوڕی مەسعودی سەقەفی، کە

---

593 (الاصابة، ج٤ص١٣١).

594 (عیون الاثر، ابن سید الناس، ج٢ ص٢٢٨، قاهرة ١٣٥٦ه)(طبقات الکبری، ابن سعد، ج١ص٣١٦، بیروت ١٣٧٦ه.

595 (التاریخ الطبری، الامام الطبری، ج٢ص٤٠٤).

کوڕێکی گەنجی ئازاو دیار بوو خۆی ناونووس کرد، عومەر پەیمانی بردە سەر، لە گەڵیدا هەزار کەسی نارد بۆ عیراق، بە ئەبوعوبیدەی وت: گوێ لە هاوڕێکانی پێغەمبەر بگرە، لەجەنگ وڕاگۆڕینەوەدا مشاوەرەو بەشداریان پێ بکە..هەتا لێت ڕون نەبێتەوە لەخۆتەوەخێرا بڕیار نەدەیت، ئەمە جەنگەو جەنگیش بۆ کەس باش نیە، بۆ یەکێك نەبێت کە لە بۆسەدابێت بۆ هەل وفرسەت قۆسینەوە، لە پەلەکردن لە جەنگ دا لە ناوچون نێزیکە. عومەر ڕەشبگیری ڕاگەیاند، ئەبوعوبیدەی کردە سەرکردەی سوپای عێراق و، موسەنناش فەرماندەیەکی بوو، ئەبوعوبێدە لەجەنگی ئەلنەماریق نزیك کوفەو جەنگی سقاتیە نزیك شاری واست سەرکەوتنی باشی بەدەست هێنا[596]، لەو کاتەدا بوران کچی کیسرا بوە پاشای فارس، ڕۆستەم وەزیری بەرگری فارس سوپایەکی بۆ جالینۆس ئامادە کردو، بەرەو خواروی عێراق ناردی، فیلێکی زۆری لەگەڵ نارد، هەردوو سوپا لە خواروی حیرەوە بەرامبەر یەکتر وەستان، تەنها ئاوی فورات لە نێوانیاندا بوو، فارسەکان نامەیان نارد: بێینە ئەوبەر یان دێنە ئەمبەر..سەرکردە موسوڵمانەکان وتیان بائەوان بپەڕنەوە، بەڵام ئەبو عوبیدە ڕازی نەبوو، گوێی لە ڕای سەحابەکان نەگرت، بەگوێی عومەری نەکرد، کە وتبووی: بەپرس و ڕا کاربکە، وتی: ئێوە لە مردن دەترسن، کەس لەئێمە ئازاتر نیە بۆ مردن، پردێکیان دروست کرد وهەمویان پەڕینەوە بۆ ئەوبەر، جەنگێکی قورس ڕوی دا سوارەکانی موسوڵمانان جەنگێکی ئازایانەیان کرد، بەڵام فیلەکان ترسناك بون و لەبەریان هەڵدەهاتن، فیلەکان دڕیان بە سوپای ئیسلامی داو هەرایان پێکردن، ئەبو عوبید هاواری کرد پەلاماری فیلەکان بدەن و، پاڵۆدەسرازەکانیان بپچڕن، فارسەکان بەسەر فیلەکانەوە سەنگەریان بەستبوو، تیریان لێوە هەڵدەدایە خوارەوە، ئەبوعوبێد پەلاماری فیلێکی داو بەشمشێر شفرەکەی قرتاندو پاڵوەکەی پچڕاند، سەنگەرەکان کەوتنە خوارەوە، بەڵام لەجارێ تردا، ئەبوعبیدی سەقەفی بوو

---

596 (قادة فتح العراق والجزيرة، اللوأ الركن محمود شيت خطاب، ص٢٤٣، دارالفتح بيروت ١٩٦٥م).

بەژێر فیلێکەوەو پلیشایەوەو مرد، یەک لەدوای یەک نۆ سەرکردەی سەقەفی شەهید بوون، هەتاگەیشتە سەرەی موسەننا، خەریک بووبیان پەڕێنێتەوە، بەڵام سەحابەیەک کەبینی هەموو سەرکردەکان شەهید بون، پەلاماری پردەکەی داو پچڕاندی و، وتی ئێوەش بکوژرێن لەپێناو ئەوەی ئەوانی لە پێناودا کوژران، بارەکە زۆر خراپ بوو زۆریان خۆیان هەڵدایە ناوئاوی فورات، موسەننا هاواری کرد وەدەیپاراستن دەیگوت: مەترسن و پەلەمەکەن، پردێکی هەروای بۆکردن و پەڕاندنیەوە. لەو جەنگەدا چوار هەزار موسوڵمان شەهید بوون، فارسەکان ویستیان بپەڕنەوە بۆیان، بەڵام ناکۆکی ناو مەدائنی پایتەخت وشۆڕش لە دژی ڕۆستەم نەیهێشت. خەلیفە عومەر نەیپێکا لەوەی کە هەربەوەندەی ئەبوعوبێدی هەڵبژاد، کە یەکەم کەس بووهاتە دەرەوەو ئامادەیی نیشاندا بۆ جەنگ، بەڵێ ئازابوو، بەڵام بەوە ئازانەبوو کە گوێی بە فەرمانی خەلیفە نەدا کە داوای لێکرد بە پرس وڕای سەحابەکان کار بکات..هەروەها عەبدوڵا بە پچڕانی پردەکە پەنێکی خراپی پیادان، هەڵەیەکی سەربازی گەورەی کرد نەخشەی موسەننای تێکدا، هەرچەند نمونەیەکی بەرزی فیداکاری تیا بوو.. خەلیفە عومەر بیستی دڵی تەنگ بوو، فەرموی: ڕەحمەت لە ئەبوعوبێد، ئەگەر خۆی بگرتایەو گوێی بۆ ئێمە شل بکردایە..لەجێیەکی تردا دەڵێ:خوایە من پاڵپشتی هەموو موسوڵمانێکم، هەمویان لەکۆمەڵی منن، خوا ڕەحم بە ئەبو عوبێد بکات، ئەگەر گوێی بۆ شل بکردمایە، دەبومە پشتگیری ئەویش..دواتر لە جەنگی قادسیەدا قەعقاع هاواری دەکرد: وەرن تۆڵەی ئەبو عبێدەو جەنگی سەلیت وسەحابەکانی جەنگی جسر بکەنەوە[597]، برۆکڵمان دەڵێت: عومەر بە سەرکردایەتی ئەبوعبیدی سەقەفی یارمەتی نارد بۆ عێراق دژی فارس و لە نزیک قەوسی ناتف نزیک حیرە گەیشتن بەیەک لەوێدا ئەبوعبید لە فورات پەڕیەوە بەسەر پردێک کە لە بەلەم دروست کرابوو، شەڕ قەوما و موسوڵمانان شکان و

---

597 قادة فتح العراق والجزيرة، ص٢٤٦.

ئەبوعبیدە کوژرا) ئەوەتە یەك وشە ناوی سەلمان پاکی نەبردوە[598].
ئەمەڕاستی ڕوداوەکەیە بەڵام هەفتەنامەی (ئیتیحاد) بە هەڵە باسێکی کارڵ بروکلمانی هیناوە کە کارڵ لە هیچ جێیەکدا شتی وای نەوتوە، ئیتیحاد دەڵێ (اما المستشرق الالمانی کارل بروکلمان فیقول فی کتابە ـتاریخ الشعوب الاسلامیة ـ:قتل القائد الاسلامیابو عبیدة الثقفی فی منطقة سلمان باك الحالیة)[599]، بڕۆکلمان نوسینی وای نیە.. لە باسی ئەبوعوبێدی سەقەفی لە جێیەکدا زیادەیە هەیە: (عبر الفرات الی نهروان فقطعوا الجسر خلفه فقتل)[600]، ڕەنگە باسەکەی مەرحومی مامۆستا مەلا عوسمان لەم حاشیەدا بوبێت، پێم سەیرە نەهرەوان ناوچەی بەعقوبە دەگرێتەوە، چونکە جەنگی جسر لە خوار شاری کوفە لە باشوری عێراقە ڕوی داوە، یان ڕەنگە لەوێش نەهرەوان هەبێت چونکە ناوچەکە یەك پارچە زەلکاوو لقە ڕوبارە..

٥ـ ئەبو عبیدە کوڕی عەبدوڵا کوڕی مەسعودی هەزلی، ئەم کەسە شەوی جەنگی دوجەیل[601]، شەهید بون پێکەوە لەگەڵ ئیبن ئەشعەس وعەبدوڵڵا کوڕی شەداد کوڕی هادی لیسی کە کوڕی خاڵی خالیدی کوڕی وەلید بوو[602].
لەدوجەیلی نزیك شاری کوت شەهید بوە[603].

598 تاریخ الشعوب الاسلامیة کارل بروکلمان.ترجمة نبیە تمین و منیر بعلبکیط٧ دار العلم للملاین بیروت ١٩٧٧ص٩٦.

599 اسبوعیة (الاتحاد)العدد ٤٥٢ المؤرخ ٢١ـ١٢ـ٢٠٠١ لا ١٦٧.

600 بڕوانە (الاستعاب) لە حاشیەی (الاصابة ج٤ ص١٣٤).

601 لقە *ڕوبارێکی بچوکە لەڕوباری دیجلە دەبێتەوە لە باشوری شاری کوت.*

602 (سیر اعلام النبلا ٔ، للزهبیج٤ص٣١٣)و (تقریب التهزیب، لابن الحجر ج٢ص٤٤٨)وە بڕوانە (شذرات الذهب فی اخبار من ذهب، لابن العماد الامام شهاب الدین ابی الفلاح عبد الحی بن احمد بن محمد العکری الحنبلی الدمشقی، اشرف علی تحقیقەو خرج احادیثة عبدالقادر الارناؤوط، حققة وعلق علیة محمود الارناؤوط، ج١ ص٣٣٢ ت١دار ابن کثیر دمشق بیروت ١٩٨٦.

603 *وەلە شارەزوریش نزیك هەڵەبجەو عەبابەیلێ ناحیەیەك هەیە ناوی دوجەیلەیەو(سیروان)یشی پرێیدەڵێن، بەڵام ناوی لەهیچ کتێبێکدا نەهاتوەو، نازانرێ ناوی لە چیەوە هاتوە، جگە لەوە لەشانی عەبابەیلێ شدا دێ یەك هەیە ناوی جلیلەیەو نازانرێ ناوی ئەویش لە چیەوە هاتوەو ناوی لە هیچ*

٦- ئەبو عبێدەی مەولای ئەبی ڕاشدی ئەزدی..ژیان ومردنی دیارنیە[٦٠٤].

٧- ئەبو عبێدەی دئلی.. ژیان ومردنی دیار نیە[٦٠٥].

بەم جۆرە ڕون بویەوە کە لە سەحابەکان کەسێك بە ناوی ئەبوعوبەیدە نەهاتوەتە کوردستان و شەهید نەبوە، ئەوەش کە لە دێی عەبابەیلێ وشوێنی ترە، یان دەبێت کەسێك بێت لە سەردەمی ئەمەوی وعەباسیەدا کوژرابێت لە شەڕی هەڵگەڕاوەو خەواریجەکان کە هەمیشە کە شکستیان دەخوارد، پەنایان دەبردە بەرکوردستان، کوردیش هەر لە خۆوەو بێئەوەی قازانجێك بکەن پەنایان دەدان وشەڕیان دەناڵاندە ماڵی خۆیان، من لەو بڕوایەدام زۆربەی گۆڕەکانی کوردستان بەم جۆرەیە، کە پێش کوژرانیان خۆیان بە نەوەی پێغەمبەرو ئیمام عەلی نیشان داوە، کوردیش عاتیفانە پشتیان گرتون.یان گۆڕی زانایانی زەردەشتین ولە ترسی لەناوچون ولەبیرچون هەوادارانیان ناویان گۆڕیون وکردونیان بە سەحابەو ناویان ناون بە ناوی گەورەو سەرکردەی ئیسلامی.

---

*کتێبێکی معجم البلدان و اسماءالمدن دا نەهاتوە، کەواتە دوجەیلەو جلیلەی شارەزور دوو ناوی نوێن وشوێنی تازە دروست بون.*

604 الاصابة فی تمیز الصحابة، احمد بن علی العسقلانی، ج٤ص١١ مطبعة دار السعادة، مصر، ١٣٢٣.

605 (الاستیعاب _ج٢ ص٧٩٢).

## گۆڕی ئەسحابە درێژ لە دێی دێلێژە لە شارەزوور

نێزیك بە كونە كۆتر، لەسەر ڕێگەی دێلێژە لە قەرە داغ، گۆڕێكی چوارده مەتری هەیە بە ناوی ئەسحابە درێژ، چومە سەر گۆڕەكە وبە مەتر پێوام، هەر لە دێر زەمانەوە بەوەناسراوە كە گۆڕی سەعدەو، لە سەر گۆڕەكەش بە عەرەبی نوسراوە (ئەمە گۆڕی تێكۆشەری ڕێی خوا سەعدی كوڕی ئەبی وەقاسە كە لە ساڵی ٥٠ كۆچی شەهید بووە)، لە بەر ئەوەی ناوەكەی ئاشكرایە، ئاسانە بەدواداچوون لە ژیانی بكرێت، بە تایبەت كە سەرچاوەكان پشتگیری شەهید بونی ناكەن لە كوردستاندا.

### ژیاننامەی سەعد

دوای شەڕێكی سەخت لە سەر كورسی لە نێوان پاشایانی مەدائندا، یەزگورد كرایە پاشای فارس، یەكەم كاری ئەوەبوو، سوپایەكی زۆری كۆكردەوە بۆ سەندنەوەی باشوری عێراق لە موسوڵمانەكان، ڕۆستەمی كردە سەرکردەی سوپاكەی وە ڕەوانەی باشوری عێراقی كرد، لەو كاتەدا موسەننا سەركردەی سوپای ئیسلامی بوو لە عێراق، بەڵام بریندارو نەخۆش بوو، لەبەر ئەوە خەلیفە عومەر، سەعدی كوڕی ئەبی وەقاس، خاڵی پێغەمبەری كردە سەركردە لە جێی موسەنناو، بەسوپایەكی زۆرەوە ڕەوانەی عێراقی كرد، موسەننا كۆمەڵێك وەسیەتی بۆ سەعد نوسی، پێش گەیشتنی سەعد موسەننا مرد، ساڵی ١٥ی كۆچی جەنگی قادسیە ڕوی داو ڕۆستەم كوژراو فارس شكا[٦٠٦]. پاشان سوپای سەعد پەلاماری مەدائنی پایتەختی ساسانیەكانیدا لە ڕۆژئاوای دجلەوە لە سەر ڕوباری شیر نزیك مەدائن[٦٠٧]، یەزدگوردی پاشا هەڵهات ومەدائن گیرا، ئەمە لە مانگی سەفەر ساڵی ١٦ی كۆچی بەرامبەر ئازاری ٦٣٧ی زایینیبوو، دوای ئەوە سەعد هێرشی كردە سەر جەلەولا وخانەقین وحەلوان _ لە خاكی كوردستان و _ لە فارسەكانی سەندەوەو

---

606 تاريخ ابى الفداء المسمى المختصر فى اخبار البشر. الملك المؤيد عماد الدين ابى الفداء.المتوفى سنة ٧٣٢مج١ص٢٢٤دار الكتب العلمية بيروت ١٩٩٧ محققة.

607 الكامل فى التاريخ. ابن اثير البوتانى الكردى ج٤ ص٣٥٦.بيروت.

لەوێش یەزگورد هەڵهات[٦٠٨]، فەتحی جەلەولا لە زیلقەعدەی ساڵی ١٦ك بوو، لە نێوان ئەوو مەدائن دا ٩مانگ بوو[٦٠٩]، عومەر ڕازی نەبوو زیاد لەوە سوپای ئیسلامی بچێتە ناو جەرگەی وڵاتی عەجەمەوە، هەر بۆیە داوای لە سەعد کرد لەوە زیاتر نەڕوات،و، فەرموی شارێك دروست بکە لە ڕۆژئاوای فوراتەوە، با لەنێوان من وئێوەدا ڕوبار نەبێت، من حەزناکەم سوپامان لەوە زیاتر بڕوات[٦١٠]، سەعد بەڕاوێژی فەرماندەکانی ساڵی ١٧ك نەخشەی کوفەیان داڕێژا، ناوچەی کوفەیان هەڵبژارد وکردیانە شارو بنکەی سەربازی ومەڵبەندی ویلایەتی عێراق، خانویەکیان بۆ سەعد دروست کرد لە دار دەرگایەکی لە سەر مزگەوت ودەرگاکەی تری لە سەر بازاڕبوو[٦١١]، پاشان خەڵکی عێراق ئاژاوەیەك بۆ سەعد دەتەنن، ئەوە یەکەم فیتنەی ناوخۆ دەبێت لە مێژووی ئیسلامدا، خەلیفە عومەر ناچار دەکەن بانگی کاتەوە بۆ شاری مەدینە، دەیکاتە ئەندامی ئەهلی حەل وعەقد، بۆ مشومڕەت وپرس وڕا لە پێشهاتە گرنگەکاندا، لەڕیزی عوسمان وعەلی وتەلحەو زوبەیرو عەبدوڵای کوڕی عومەردا، عومەر حەزی نەدەکرد گەورەکان وهاوڕێ زۆر نێزیکەکانی پیغەمبەرلە مەدینە وپایتەختی ئیسلامی دور بکەونەوە، لەو کاتەدا فارسەکان لەشاری نەهاوەند کۆبوبونەوە بۆ هێرش هێنانە سەر مەدائن، کاتەکە ناجۆر بو، بەڵام عومەرلە جێگەی سەعد، نیعمانی کوڕی موزنی کردە سەرکردەو ناردی بۆ نەهاوەند، فارسەکانیان شکاند، کە خەلیفە عومەر لە مەدینە شەهید دەبێت، عوسمان دەکرێتە خەلیفە، عوسمان ناچارە سەعد بنێرێتەوە بۆ سەرکردایەتی عێراق، چونکە لە کاروباری ناوچەکە شارەزایە، دوبارە

---

608 تاریخ ابن الوردی. زین الدین عمر بن مظفر الشهیر بابن الوردی. توفی سنة ٧٤٩ه ج١ص١٣٨ـ١٤٠.

609 تجارب الامم ابو علی مسکویة الرازی ج١ص٢١٥ـ٢٢٦ دار سروش للطباعة والنشر طهران ١٩٨٧ط١.

610 التارخ الطبری ج٥ص٢٤٧ الامام الطبری .بیروت.

611 تاریخ ابی محنف.لوط بن یحی بن سعیدالغامدی الازدی الکوفی. المتوفی سنة ١٥٦ ج١ص٥٧دار الرسول الکرم ط١بیروت ١٩٩٩محققة.

فیتنەچیان لە عێراق بوختتان بۆ سەعد دەنێنەوە وجارێ تر بانگی دەکەنەوە بۆ مەدینە، بەڵام عوسمان ناچار جارێتر دەینێرێتەوە بۆ عێراق بۆ بەرنگاری یەزدگورد کە هەر وازی نەدەهێنا، بەڵام خەلیفە عوسمان بەو فیتنەیەی کە لە عێراقیدا سەرچاوەی گرتبوو لە مەدینە شەهید دەبێت، ئیمامی عەلی دەکرێتە خەلیفەی موسوڵمانان، عەلی عەزم جەزم دەکات کە تۆڵە لە بکوژانی خەلیفە عوسمان بکاتەوە، دەچێتە عێراق و تیانیشتەجێ دەبێت، ئاژاوەو هەراو کوشتارێکی زۆر لە نێوان موسوڵمانەکاندا ڕودەدات، هەر دوای شەهید بونی خەلیفە عوسمان، سەعد خۆی لە فیتنە دەشارێتەوە، دەچێت لەشاری ئیبلە نیشتەجێ دەبێت، بەپێی ئەو فەرمودەی کەدەفەرموێ(ان تكون الفتنه، خير الناس فيها الخفى التقى)، پاشتر دەچێت بۆ دێی عقیق لە ١٠ میل دوری شاری مەدینەوە، لەو کاتەدا تەمەنی گەیشتبوە هەشتا ساڵەو، هەتا شەهید بونی ئیمامی عەلیش دە مێنێ؛ سەعد بەرگە جەنگیە خوێناویەکەی سەردەمی جیهادی شاردبویەوەو هەر مابوی، وەسیەتی بۆ کوڕەکانی کردبوو کە ئەگەر مرد ئەو بەرگە خوێناویە بکەنە کفن، سەعد لە عقیق مرد[٦١٢]، کوڕەکانی هێنایانەوە بۆ مەدینەو لە مزگەوتی پێغەمبەر- درودی خوای لەسەربێت - نوێژیان لە سەر کرد، خێزانەکانی پێغەمبەریش نوێژیان لە سەر کرد و، پاشان بردیان بۆ گۆڕستانی بەقیع لەشاری مەدینە لەناو هاوڕێکانیدا بەخاکیان سپارد[٦١٣]، سەعد دوا ئەندامی شورا بو کە وەفاتی کرد.

ئەمە جیهادو ژیانی سەعد بوو لە عێراق و پاشان گەڕایەوە بۆمەدینەو لەوێ مرد[٦١٤]، هەموو سەرچاوەکان لەدرێژەی ئەمە زیاتریان نەنوسیوە، ئیمە دەبێت ڕاستیەکانی مێژوو بنوسین، پێم سەیرە کە گۆڕێکی چواردە مەتری لە

---

612 بطل الفدأ والاخلاص سعد بن ابى وقاص.محمد عبد الجواد السكرى.ص٨٥ـــ١٢٧ الدار القومية للطباعة والنشر ١٩٦٤

613 رجال حول الرسول.خالد محمد خالد.ص١٢٥ دار الفكر.بيروت ،بغداد.مطبعة متين.١٩٨٥.

614 تاريخ اليعقوبى،احمد بن ابى يعقوب ،تحقيق عبد الامير مهنا،ج ٢،ص٣١ـــ٤٤ بيروت ١٩٩٣ مؤسسة الاعلمى، الطبعة الاولى.

کوردستاندا له ناوچەی قەرەداغ، ناوی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسی له سەر نوسرابێت و، خەڵکی بەناوی ئەو سەحابە پیرۆزەو خاڵی پێغەمبەرمانەوە زیارەتی بکەن[615]. بریا ئەوە گۆڕی ئەو بوایەو، گۆڕی چەند کەس لەو کەسایەتیە مێژووییانە لەخاکی کوردانذا هەبونایە، هەتا زۆرترمان لەسەر شارو شوێنەواری کوردیمان هەبایە، بەڵام مەخابن! بەڵێ سەعد هەتا نزیك جەلەولاو حەلوان له کوردستان دێت، ڕەنگە بە سوپاکەیەوە بەدوای فارسەکاندا هەتا نزیك قەرەداغ هاتبێ و ئەو جێیە له دێلێژە جێنزرگەی ئەو بێت، لەوێ ماوەیەك هەڵی دابێت پاشتر گەڕابیتەوە بۆ کوفە، هەرچەند سەرچاوەکان ئەو باسەیان نەکردوە، لەلایەکی ترەوە گۆڕێکی چوارده مەتری له مەزنەی عەقڵدا نیە، چونکە ئەوانیش مرۆڤێك بون له باڵاو لەش ولاردا له مرۆڤی ئەمڕۆ گەورەتر نەبون، ڕەنگە ئەوەش پەیوەندی بە ئاینەکانی پێش ئیسلامی کوردەوە هەبێت، له ترسی له ناوچون لەژێر ئەو پەردەیەدا شاردبێتیانەوە، بە تایبەت گۆڕی زانایان وپیرانی زەردەشتی هەمیشە له شوێنی بەرزو پەنا دابوە وەك پیرە مەگرون وپیر ئیلیاس وباوە نەوەزو پیری شەوکێڵ وپیر شالیارو زۆری تر.

---

615 کوردستان وئاینی ئیسلام.مەلا ڕەئوف سلیم حویزی، لا ٧٧ـ ١٣١ چاپخانەی جامعە ١٩٧٠بەغدا.

## گۆڕی ئەسحابە عەبدولاَ( عەبدولاَی کوڕی ئەبو ئەیوبی ئەنساری ) لە گوندی سەرچیا لە ڕانیە

نامەیەکم بۆ هاتوەپوختەکەی دەڵێ (لە بەرامبەر قەلاَدزە چیایەکی گەورەو بێرەزا هەیەپێی دەڵێن ئاسۆس، گوندێکی لە سەرە بەناوی (سەرچیا) قەبرێکی ایێیە بەناوی (ئەسحابەعەبدولاَ) بەبێ خیلاف ئیجماعی لەسەرە کە ئەمە هاوڕێی پێغەمبەرە (سەحابەیە) ناوی عەبدولاَی کوڕی ئەبوئەیوبی ئەنساریە، لە جەنگێکدا شەهید بوە لەسەر ئاوەکە، کە گۆڕەکەشی هەر لەوێدایە، سالاَنە دەیان کەس زیارەتی دەکەن و، خێرو مەولودی بۆ دەکەن، بە تایبەت ژنان داوای مندالَبونی لێدەکەن، زیاتر لە هەزار داری قەزوانی پیری هەیە، کەس ناوێرێ بە وشکیش بیان بڕێ، دەڵێن تەمەنیان سەدان ساڵ دەبێت، سالاَنە هەزاران دیناری قەزوان وبنێشتی لێ بەرهەم دەهێنرێت، هەر لەو ناوەدا، لە سەرشوێن ولوتکەبەرزەکان ڕەبایەی گەورە هەیە پێی دەڵێن (قوَنگر)، بە بەردی گەورە دروست کراوە، زۆریان قورسیان چەندین تەن دەبن، خەڵکی دەڵێن ئەمە سەنگەری سەردەمی کافرو موسوڵمانانە، ئەو ناوە هەتا ئیستەش سەیارەی بۆ ناچێت)[٦١٦].

بە پێی هەندێ سەرچاوەی لاواز باسی کوژرانی سێ عەبدولاَ لە دەوروبەری هەمان شوێندا کە نامەکە ناوی دەبات هاتوە، کە ئەمانەن:ـ عەبدولاَی کوڕی ئەبو ئەیوبی ئەنساری، عەبدولاَی کوڕی عومەر، عەبدولاَی کوڕی جەندەل.

---

[616] ئەمە تەواوی وتەی مامۆستا عەباس هەمزە خدرە، وردە کارانە باس وخواسی مەرقەدو شوێنەکەی کردوە، وەك کەسێك خۆی لەوێبێت..لە ژمارە ٢٥٩ی ڕۆژنامەی یەکگرتودا، لە بابەتی (ئەسحابە درێژ دەبێ کێبێت؟ )دا، داوام کردبوو، هەر کەس گۆڕی ئەسحابەیەك شك دەبات لە سەر خاکی کوردستان، با ناوو باس و شوێنی جوگرافیەی دیاری بکات و، ڕەوانەی ڕۆژنامەی یەکگرتوی بکات، هەتا من لە باتیان بەدوای ژیان و گوزەران و مردنیاندا بگەڕێم و، ڕوداوەکانی کوردستان بزانین..یەکەم کەس کە هات بەدەم داواکەمەوە، مامۆستا عەباس هەمزە خدربوو، خوا پاداشتی بداتەوە.

## عەبدولاّی کوڕی ئەبو ئەیوبی ئەنساری

نووسەری نامەکە دەڵێ: خەڵکی ناوچەکە بێ خیلاف وبە ئجماع دەڵێن وگومانیان وایە کە سەحابەیەو ناوی ئەسحابە عەبدولاّیەو گوڕی عەبدولاّی کوڕی ئەبو ئەیوبی ئەنساریەو لە شەڕی کافرو موسوڵماناندا لەناوچوە.

لە کتێبی (الاصابە ی ابن حجر العسقلانی بەرگی دووەم و سێیەم) تەنها ٧٤٣ ناوی عەبدوڵلاّی تیایە، زۆر هەوڵمدا ناوی عەبدوڵلاّی کوڕی ئەبوئەیوبی ئەنساری تیا نەبوو، کە ئەبو ئەیوب ناوی خالد کوڕی زەید کوڕی کلیب لەبەنی نەجارە، لەقەبی ئەبو ئەیوبە نیسبەتی بۆ ئەنسار دەگەڕێتەوە، لە سەحابە بەرزەکانە[617]، پێغەمبەر- درودی خوای لە سەر بێت - کە کۆچیکرد بۆ مەدینە، ماڵی ئەوی بۆ هەڵبژێررا تیا نیشتەجێ ببێت، حەوت مانگ تیا مایەوە، جارێك پێغەمبەر ئەبوبەکرو عومەری برد بۆ ماڵی ئەبوئەیوب لەبێستان تا برسێتیان بشکێ، لە سەردەمی پێغەمبەرەوە تا سەردەمی معاویە بەردەوام لە غەزادابوە[618]، کە ئیمامی عەلی چوو بۆ عێراق لە جێی خۆی لەسەر مەدینە داینا، کە پاشان ئەبوئەیوب دایە پاڵیو چوو بۆلای، لە گەڵیدا جەنگی خەوارجی کرد[619]، دوا غەزای، کە معاویە سوپای کۆکردەوە بۆ گرتنی قوستەنتەنیە، ئەو کاتە ئەبو ئەیوب پیر بوو هەشتا ساڵ دەبوو نەخۆش کەوت، یەزیدی سەرکردەی هات وتی کارت هەیە؟ وتی سەلاّوم بگەیەنە بە سەربازان، وە کە مردم تا دواخاڵتان لە خاکی دوژمن بمبەن، لە ژێر پێی سەربازەکانتدا لە نزیك شورای قوستەنتنیەوە ئەسپەردەم بکەن، لە نێوان ساڵانی ٥٠ـ٥١ـ٥٢ی کۆچی مرد، وایان بۆ کرد کە وتی، باسی ئەبائەیوب

---

617 (الاصابة فی تمیز الصحابة.ابن حجر العسقلانی. ج١، ٣دار احیا التراث العربي بیروت ط ١/ ١٣٤٨هـ).

618 (صور من حیاة الصحابة، د.عبدالرحمن رافت الباشا.جزْ الاول.ص١١٧_١٣٠ مطابع الوطن السعودیة ١٩٩١میلاد).

619 (الاصابة ج١ص٤٠٥).

زۆره، هەر لە زادلمیعادا (١٦) جار باسی هاتوه[620]، ئایا ئەبا ئەیوب کوڕی هەیە ناوی عەبدولاَ بێت؟ وە لە سەردەمی خەلیفە عومەردا لە فەتحی کوردستاندا بەشدار بوبێ وشەهید بوبێت؟ ئەوە هەڵەیەکی مێژوییە، دوای گەڕانی زۆر، بەو ئەنجامە گەیشتم کە ئەبو ئەیوب کوڕی نیە ناوی عەبدولاَبێت، تەنها ئیبن سەعد کاتبی واقیدی دەڵێ: ئەبو ئەیوب کوڕێکی هەبو بەناوی عەبدولرەحمان وەچەی نەماوە[621]، واتە ئەبوئەیوب تەنها کوڕێکی هەبوو ناوی عەبدولڕەحمان بووە نەك عەبدولاَ، وە لەناو سەحابەکاندا لەکونیەی ئەبو ئەیوبەکان وئەنسارەکان کەسیان کوڕیان بەناوی عەبدولاَ نیە ونەهاتوە..لەبەرگی دووەمی (الاصابەدا لە لاپەڕە (٢٧٣ـ ٣٨٦)وە لە ژمارە (٤٥١٨ـ٥٠٦٢) دا ناوی (٥٤٤) عەبدوڵڵای تیایە، کە بە گەورەیی پێغەمبەریان دیتوە، جیهاد و غەزایان لەگەڵکردووە، بەلاَم ئەو ناوەیان تیاَنیە، وە لەبەرگی سێیەمدا لەژمارە (٦١٦٠ـ٦١٩٧)دا ناوی(٣٧) سەحابەی بردووە و وە لەژمارە (٦٢٩٦ـ٦٣٦١) ناوی (٦٥) عەبدوڵڵای بردووە وە لەژمارە(٦٥٧٢ـ٦٦٦٩) ناوی(٩٧) سەحابەی بردووە، بەهەموویەوەلە بەرگی سێیەمدا دەکاتە (١٩٩) سەحابە و بەوەی بەرگی دووەمەوە کە ٥٤٤ سەحابەیە، هەمووی دەکاتە ٧٤٣ دانە ناوی عەبدوڵلاَ سەحابی، بەلاَم لەهەموویدا عەبدوڵڵای کوری ئەبو ئەیوبی ئەنساری تیاَنیە[622].

ناوی مەرقەدی ئەسحابە عەبدولاَ لەچیەوە هاتوە؟ لە ڕاستیدا ئەوەی ئەو باسەی دروست کردوە ئەو دەست نوسە هەڵبەستراوە بوە کە حوێزی وپاشتر واعیزی لێیان وەرگرتوە و تەرجەمەیان کردوە بۆ کوردی وفارسی وپاشانیش ڕۆژبەیانی هەنێ شتی لەسەر وتوە، هەرسێکیان بە کورتە بەم جۆرەیان باس

---

620 (زاد المعاد، ابن قیم الجوزیة، مؤسسة الرسالة، ط١٢ ج٣ـ٤ بیروت ١٩٨٦).

621 بڕوانە (ابن سعد کاتبی واقدی لە الطبقات الکبری دا ج٣ص٤٨٤).

622 الاصابة فی تمیز الصحابة.ابن حجر، بەرگی دوەم لەلاپەڕە (٢٧٣ـ ٣٨٦)وە لەژمارە(٤٥١٨ـ٥٠٦٢)دا ناوی(٥٤٤) عەبدوڵڵای تیایە، هەروەها بڕوانە بەرگی سێیەم ژمارە (٦١٦٠ـ٦١٩٧)ژمارە (٦٢٩٦ـ٦٣٦١) ژمارە(٦٥٧٢ـ٦٦٦٩).

کردوه کە فەتحی شام وئەرمەن وموسڵ تەواو بوو، ئەبو عوبەیدە نامەی بۆ خەلیفە عومەر نوسی: ئایا بەرەو ڕۆژهەلاَت بچین یاخود بەرەو ڕۆژئاوا؟ عومەر وەلاَمی دایەوە، چوار هەزار سەرباز تەسلیم بە خالید بکە بەرەو قەومی کوردان بیان بات، ئیسلام بگەیەنێتە کێوەکانی کوردان، کات پایز بوو، ڕۆژی پێنج شەمە بیستی جیمادی یەکەم ساڵی بیستی کۆچی، ئەبو عوبەیدە لە گەڵ خالیددا سوپایەك وئەم سەرکردانەی نارد: فەزلی کوڕی عەباس وزوبێری کوڕی عەوام ومقدادی ئەسوەد وعەبدولاَی عومەرو عەبدولرەحمانی کوڕی ئەبو بەکری سدیق وزراری ئەزوەر وئەبو دوجانەو عەبدولاَی کوڕی ئەبو ئەیوبی ئەنساری و گەلێکی تر، ڕۆیشتن تا گەیشتنە هەولێرو، فەتح کرا، لەوێوە عەبدولاَی جندلی بەرەو ئەرموتە نارد، بەلاَم عەبدولاَشەهید کرا[٦٢٣]، پاشان خالید عەبدولاَی کوڕی عەمەری نارد بۆ شیدەر (پشدەر)، خالید خۆی و سەحابەکان کە عەبدولاَی ئەبو ئەیوبی لەگەڵ بوو، چون بۆ مەرجێن (مەرگە)[٦٢٤]، پاشان چونە سەر پاشای دوگمان، وە عەبدولاَو مقداد چونە سەر کێوی دەربەندی پشدەر و، مقدادو عەبدولاَحەملەیان برد، پاشان ئەسوەدو عەبدولاَ عومەرو عەبدولاَ ئەبو ئەیوب وزراری ئەزوەر ومقداد پەلاماری مەلیك فەروخیان داو کوشتیان، سوپای کورد شکا[٦٢٥]، مالکی ئەشتەر زانی مەلیك فەروخ کوژراوە داوای یارمەتی لە کوردان کرد، پاشان منجوران پاشای سێویسنان کە سۆسەن پاشای ناوبوو، پاشای ڕەبت کەناوی قیروان بوو، پاشای پشتدەر و، پاشای دوگمان فەیروزی کوڕی نارد بۆ مەرگە[٦٢٦]، بۆ تۆڵەی مەلیك فروخ، گەیشتنە دێی ئەزمرە (بردەشان)، کەخالید زانی لەشکری پاشای دوگمان کە ١٥هەزار کەسە بۆ تۆڵەی فروخ هاتوە ترسا، خالید

---

623 (کوردستان وئایینی ئیسلام، مەلا ڕەئوف سلیم حوێزی، ل ٧٧ـ ١٠٤چاپخانەی جامعە، ١٩٧٠ بەغداد).

624 هەمان سەرچاوە، ل ٩٤.

625 هەمان سەرچاوە ، ل١٠٠.

626 هەمان سەرچاوە، ل١٠٢.

وتی:یارەبی زەلیلی دەستی کوردانمان نەکەی..شەڕی بێوێنە قەوما پاشای ڕەبت ومجوران و فیروز کوژران سوپاکەیان هەڵهاتن، سوپای ئیسلام دوایان کەوتن، تا ئاوایی قرە بانە (قەرەتەپە)ڕاویان نان، دێیەکی باخات وئاوداربوو، گەورەی دێ ناوی قرەبابا بوو کوژرا، خالید وتی من شەڕی زۆرم کردوە، لەم قەومە ئازاد ترو حیلە بازترم نەدیوە، یارەبی دڵی ئەم قەومە یەك نەگرێ..پاشان هێرشیان کردە سەر دێیەك عەبدولاّی ئەبو ئەیوب کوژرا، خالید گریا چونکە لە گەورانی ئەنساری بوو، سەحابەکان غەمناك بون.)[٦٢٧]

لە فتوح سواد عیراقی واعیزی دا بەفارسی دەڵێ: تیرێك هات دای لە سینەی عەبدولاّی ئەبوئەیوبی ئەنساری ومرد[٦٢٨]، بڕوانە پەراوێز کە نادری کریمیان بەفارسی بۆی نوسیوە[٦٢٩]، هەروەها بڕوانە ڕۆژبەیانی[٦٣٠] ئەمانەی کەمێنامەوە هەموی هەڵبەسراوەو هیچ لەو سەحابانە لەژیانیاندا نەهاتونەتە کوردستان، دوژمنانی کورد ئەودرۆیانەیان هەڵبەستوە، بەلاّم نەیان زانیوە داوەکان چۆن بتەنن، کەوتونەتە هەڵەی مێژوویی زۆرەوە.

## عەبدولاّی کوڕی عومەر

دوبارە ئەو سێ سەرچاوەیەی پێشوو هەڵبەستراوو درۆیان دروست کردوە کە زۆر لە باسی ئەو نامەیە دەچێت کە بۆم هاتووەو ناوچەکەشیان لێك نێزیکە، حوێزی دەڵێت :(دوای گرتنی سابلاّغ وئەسیر کردنی مەلیکە ئەرجانوس، چونە جەنگی خۆش قەدەم پاشای ڕەزائیەی ئەرمەنی لە ئازربایجان، ڕەزائیە گیراوخۆش قەدەم کوژرا و، پاشان خالید بۆ ولاّتی عەرەب گەڕایەوە لەڕێی بەدگومانەوە چون بۆ دێی ئیسماعیل قوڵی (سماقوڵیان) نزیك

---

627 هەمان سەرچاوە، ل١٠٤.

628 (فتوح سواد العراق، وەرگێرانی بۆ فارسی استاد عبدالعزیز واعظی سردشتی لاپەرە ٢٠٧ چاپ اول ١٣٧٤ تهران).

629 هەمان سەرچاوە، ل٢٦٠.

630 ولاّتگیری ڕەشەخاکی عێراق، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی (لاپەڕە ٢٣)چاپی یەکەم سلیمانی ١٩٩٧).

کۆیه، خەڵکی ئیسماعیل قولی پەلاماری کاروانی سەحابەکانیان دا و زۆربەیان کوشتن، خالید وعەبدوڵای کوڕی عومەر بەرەو شام گەڕانەوە، لە نێوان موسڵ و هەولێر توشی چەمێك بون، پیرەژنێك لە سەر ئاوەکە ڕتیان چیدەکەیت؟ وتی من موسوڵمانم ناتوانم بپەڕمەوە، هەرچی خالید وتی هەقت نەبێت، بەلام عبدوڵا کردیە کۆڵ وپەڕاندیەوە، لە ناوەڕاستی ئاوەکەدا پیرە ژن چەقۆیەکی دەرهێنا و دای لە سەردڵی عەبدوڵاو کوشتی، خالیدیش پیرەژنەکەی کوشت، خالید زۆر گریا، هەرلەویا جەنازەی عەبدوڵای لە نێزیك ئاوەکە تەسلیم بە خاك کرد، ئێستاش مەرقەدی عەبدوڵا مەشهورە بە سوڵتان عبدوڵای عەرەبی، خالید گەڕایەوە بۆ حومس)[631]. هەروەها واعیزی دەڵێ پیرەژن تۆزێکی ژەهراوی کرد بەلوتی عەبدوڵادا کە گەیشتە ئەو بەری ئاوەکە عەبدوڵا ڕەنگی زەرد بوو[632]، باسەکەی ڕۆژبەیانی و واعیزی لە گەڵ ئەوەی حوزنیدا کەمێك جیاوازی هەیە..

کوژرانی عەبدوڵای کوڕی عومەر لەو جێیەدا درۆیەکی ڕوت وشاخدارە، عەبدوڵا مردوە شەهید نەبوە، لە مەدینە ناشتویانە نەك لە قەرەچۆغی کوردستان، ساڵی ٦٤ی کۆچی نەك ساڵی ٢١ی کۆچی، لەسەردەمی ئەمەویەکاندا نەك لەسەردەمی عومەری باوکیدا، وەخەلیفە عومەر ساڵی ٢٣ی کۆچی شەهید بوە، نەك ساڵی ٢١ی کۆچی وەك حوزنیو واعیزی وڕۆژبەیانی باسیان کردوە، لە بڕگەیەکی ئەو سێ نوسەرەدا ئەم هەموو هەڵەیەکرابێت، دیارە ئەمە نوسینی کەسێکی ساکارو سادەیە، یان هی کەسێکی زۆرزانەو، ویستویەتیبۆ ماوەی سەدەیەکیش بوە بەو درۆو دەلەسانە خەڵکی بخەڵەتێنێ.

---

631 (کوردستان وئایینی ئیسلام، مەلا ڕەئوف سلیم حوزنی، چاپخانەی جامعە، ١٩٧٠ بەغداد).

632 (فتوح سواد العراق، وەرگێڕانی بۆ فارسی استاد عبدالعزیز واعظی سردشتی لاپەرە ٢٠٧ چاپ اول ١٣٧٤ تهران).

بەڵام با ئێستە ڕاستی ژیانی عەبدوڵای کوڕی عومەر باس بکەین. سەرەتا ویستی لەجەنگی بەدرو ئوحوددا بەشداربێت، بەڵام منداڵ بوو نەیانهێشت، لە فەتحی مەککەدا بەشدار بوو، موفەسیرو فەقیهێکی گەورە بوو، یەکێك بوو لەشورای شەش نەفەرە بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە، (٢٦٣٠)فەرمودەی گێڕاوەتەوە، لەکتێبەکەی حوێزی داو، ئەوەی واعیزی بە فارسی و ڕۆژیەیانیدا دەڵێن عەبدوڵا کوردستانی قڕکردو، ژن ومنداڵی کوشت وماڵیانی تالآن کرد، ئەو وتانە هیچ سەرچاوەیەك پاڵپشتی ناکات، بۆ مردنیشی کە مەبەستەکەی ئێمەیە لە تەعزیبدا دەڵێ عەبدوڵا ساڵی ٧٣ی کۆچی مرد[٦٣٣]، ئیبن خەلەکان دەڵێت وەفاتی عەبدوڵا ساڵی ٦٣ی کۆچی بوو، لە تەمەنی ٨٤ ساڵیدا مرد[٦٣٤]، ئیبن سعد دەڵێت وەفاتی عەبدوڵا ساڵی ٦٤ی کۆچی بوو، دوا یاری پێغەمبەر بوو لە مەککە مرد ساڵی ٧٣ی کۆچی[٦٣٥]، لەمردنی دا لە نیوەدورگە خیلاف نیە، خیلاف لە ساڵی مردنیدا هەیە، وەسیێتی کرد کە لە قەبرستانی (ئەلحەل) ئەسپەردەی بکەن، بەڵام نەیان توانی لەبەر شەڕی حەجاج، بەڵکو دفن کرا لە (زی تو ی) لە قەبرستانی موهاجرین! ![٦٣٦]

## عەبدوڵای کوڕی جەندەل

باسی ئەمیش بەپێی وتە هەڵبەسراوەکەی حوێزی زۆر نێزیکە لە ناوچەی قەلآدزەوە، گوایە هەواڵەکەی لە واقیدی وەرگرتوە، بەڵام ناڵێت لە کوێ ولە چ سەرچاوەیەکی وەرگرتوە، دەڵێن: لە ئەرموتە کوژرا[٦٣٧]، بەڵام هەموو

---

633 صاحب تهذیب الاسماء، ج١، ص٢٧٨.

634 ابن خلکان، ج١، ص٢٦٤. ئەو دەستنووسەی حوێزی ئەگەر لەسەردەمی ئیبن خەلەکاندا هەبوایە باسی دەکرد، کەواتە هەڵبەستراوە ناوچەی شەڕەکە نزیکی خەلەکانە.

635 (الطبقات الکبری، ابن سعد ج٤ص١٣٨).

636 بۆ زیاتر زانیاری بروانە ژیانی عەبدوڵا لە باسی دواتردا.

637 بروانە(لاپەڕە ٨٣) ی کوردستان و ئاینی ئیسلام ی حوێزی و، (لاپەڕە ١٥٦)ی واعزی لە فارسیەکەدا.

سەرچاوەکان گەڕام، کەسێکی بەو ناوە تیا نەنووسراوە سەحابە بێت یان موجاهد بێت یان هاتبێتە کوردستان وعێراق، بەڵام لە (تەبەری)دا یەك جار ناوی هاتوە بە ناونیشانی ڕاوی، نەك سەرکردە یان سەرباز[638].

خۆزگە خەڵکی تریش قسەی هەبوایە وبەهەموومانەوە بگەشتینایەتە ڕاستیەك، کە سود بە مێژووی کوردی بگەیەنیت، باش بوو ئەگەر دەلیلێکی تر هەبێ‌و لە سەرچاوەکاندابێ‌و من پێم نەزانیبێ، دژی ڕاکەی منیش بێت هەرباشە بنووسرێت، یان ئاگادار بکرێمەوە..من هیچ مەبەستێکم لەم بابەتانە نیە، جگە گەڕان بەدوای ڕاستی هەواڵ و ڕوداوەکانی مێژوی کوردا، پڕ بەدڵ پێم خۆش دەبوو ئەگەر گۆڕی چەندین لەو سەحابا پیرۆزانە لە خاکی کورداندا هەبونایە، وەك دورین لە گۆڕی پێغەمبەرەوە، یا گۆڕی چەند دانەیەك لە هاوڕێکانی ببوایە، چیرۆك و ڕوداوو ئەفسانەیان دنیای پڕبکردایە، لە تەبەری‌و ئیبن کەسیرو ئیبن ئەسیرو ئەو هەموو سەرچاوە عەرەبیانەی تر کە زۆری مێژووی کوردیمان لەوەوە دەست کەوتووە ناوی زیاتری کورد ببرایە، گەر گۆڕی دوو سەرکرەی ئیسلامی لەخاکی کوردا هەبوایە، ئەوا لە باسی ژیانی ئەو سەرکردەیە دا، ناوی کوردستان وشەڕەکان و تەرەفی شەڕکەر و، شوێنی شەڕەکە لەچەند شوێن وچەند سەرچاوەی جیاجیادا دەبراو دەوتراو دەوترایەوەو، ناوی کوردستان دەبراو لەو سەرەتای مێژوەوە لەو قۆناغە دورانەوە ڕوداوەکانی کوردستان باس وخواسی دەبوو، مێژوی کوردی پێ دەوڵەمەند دەبوو، تێکەڵ بەباس و خواسی دراوسێکان دەبوین، پەیوەندی زیاترمان دەزانی، ناوی سەرکردە کوردیەکان وجۆری شەڕو چەك و وباری کۆمەڵایەتیمان و داب ونەریتی پێشینانی خۆمان زۆرتر دەزانی، ئاسۆی مێژومان لە بەر چاو ڕونتر دەبوو. بەڵام مەخابن ئەگەر ئەو سەحابانە لە کوردستاندا بکوژرانایەو ئەو شەڕانە هەبووایەو ئەو باسەی حوێزی‌و ڕۆژبەیانی‌و دەستنووس هەبووایە، هەڵبەت لە کتێبخانەی ئیبن خەلەکاندا

---

638 تأريخ الطبري، الامام الطبري، ج٣، ص٢٤٢.

دەبوو ئەو باسی دەکرد، چونکە ناوچەی شەڕەکە لە خەڵەکانەوە نزیك بوو. بەڵام دیارە دوای سەردەمی ئیبن خەلەکان هەڵبەستراوە.

## گۆڕی عەبدوڵای کوڕی عومەر لە زۆرجێگە

هیچ سەحابەیەك نیە هێندەی عەبدوڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب دەنگ وباسی لە هەڵبەستراوی لە خاکی کوردا هەبێت، هەر لە بەشدارییەکانی جەنگ وجیهادو شەهید بونیەوە، کە دوو مەرقەدی لە کوردستاندا هەیە، هەتا دروست کردنی زیاتر لە دە مزگەوت بە ناوی ئەوەوە لە شارو دێهاتەکانی کوردوستاندا، دەڵێن گوایە عەبدوڵا خۆی دروستی کردون بە مەبەستی کۆبونەوەو نوێژکردن وفێرکردنی یاسا ئاینیەکان، یا پارەی ناردبێ وەك سەدەقەیەکی جاری بۆیان دروست کردبێ، یان ڕەنگە کوردەکان خۆیان لە خۆشی ئیمان وتەقواو نزیکی ئەوەوە لە خواوە دروستیان کردبێ، ڕەنگە زانایانی کورد ویستبێتیان مزگەوتەکانیان پیرۆزتر بکەن بۆ وەقف و مەسرەف بۆکردنی مزگەوت وحوجرەو مەلاو، ڕوتێکردنی زیاتری خەڵك وفەقێو زانایان و زیادە ڕێزلێگرتنی. بەڵام کە دەچیتە بنج وبنەوان وبەدوای باسەکەدا دەچیت، دەبینی هیچی وانیە، ئەو نەهاتوەتە کوردستان، کەسیکی دنیا نەویست بوە سامانی نەبووە تا مزگەوت بکاتەوە، ئەی دەبێ ئەو سەرچاوانە لەکوێوە هاتبن وکێ نوسیبێتی یان لە چیان وەرگرتبێ؟ ئەوەی ئەم باسانەی دروست کردوە ئەو دەست نوسە عەرەبیە بوە بە ناوی فتوح سەواد لعراق کە مەلا ڕەئوف کردویە بە کوردی.

١ـ گۆڕی عەبدوڵا کە گوایە لە نێوان هەولێرو موسڵدا شەهید بوە ونەسپەردە کراوە. مەلا واعزی بەم جۆرەی گێڕاوەتەوە: خالیدو عەبدوڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب بەم خەم وخەفەتەوە ـ واتە خەفەتی کوژرانی سەحابەکان لە سماقوڵیان ـ ڕویان کردە نەینەوا، لە نێوان هەولێرو موسڵدا توشی ڕوبارێك هاتن دەیانویست بپەڕنەوە، پیرە ژنێك لە کەناری ڕوبارەکە دامابوو، داوای لە عەبدوڵا کرد بیکاتە کۆڵ وبیپەڕێنێتەوە، عەبدوڵا سواری پشتی خۆی کرد، کە گەیشتە ناوە ڕاستی ڕوبارەکە پیرە ژنەکە تۆزێکی کرد

به لوتی عەبدولاّدا، کە گەیشتە ئەو بەری ئاوەکە، عەبدولاّ ڕەنگی زەردبوو مرد، خالید بەکارەساتەکەی زانی پیرە ژنەکەی دایە بەرشمشێرو لەت وپەتی کرد..ئەنجا یاران کۆبونەوە عەبدولاّیان نوێژکردو ناشتیان، پاشان چونەوە بەرەو شام، پاش ئەوە خالید لە شاری حومس مرد، ئەمە ساڵی ٢١ی کۆچی بوو، ئەو ساڵە کەئیمامی عومەریش کۆچی دوایی کرد[٦٣٩].

٢- گۆڕی عەبدولاّ لە قەرەچۆغە بە عەبدولاّی عارەبی بەناوبانگە کە مزگەوتەکەشی لەسەرە[٦٤٠]. کوڕانی عەبدولاّی کوڕی عومەر لەو جێیەدا درۆیەکی ڕوتە عەبدولاّ مردوە شەهیدنەبوە، لە مەدینە ناشتویانە (نێوان مەککەو مەدینە) نەك لە قەرەچۆغی کوردستان ساڵی ٦٤ی کۆچی نەك ساڵی٢١ یان ٢٣ یان ٢٥ی کۆچی، لە سەردەمی ئەمەویدا بوو نەك لە سەردەمی عومەری باوکیدا. لە دوای باوکی مردوە نەك لەپێش یەوە، خەلیفە عومەر لە ساڵی ٢٣ی کۆچیدا شەهید بوو نەك ٢١ی کۆچی، لە برگەیەکدا ئەم هەموو هەڵەیە چۆن دەکرێت دیارە ئەمە نوسینی کەسێکی سادەیە، یان زۆر زانە ویستویەتی گەر بۆ ماوە یەکیش بوە خەڵکی بەو درۆو دەلەسانە بخەڵەتێنێ.

بەشداری عەبدولاّ لە کتێبەکەی مەلا ڕەئوف حوێزی بخوێنەرەوە، ڕۆژ بەیانی و واعیزیش بەوجۆرەیان باسکردوە بە هەندێ جیاوازی کەمەوە[٦٤١].

---

639 (فتوح سواد العراق، وەرگێڕانی بۆ فارسی استاد عبدالعزیز واعیزی سرىشتی لاپەڕە ٢٠٥ چاپ اول ١٣٧٤ تهران).

640 وڵاتگیری ڕەشەخاکی عێراق، ڕۆژبەیانی، ل١٩.

641 کوردستانو ئایینی ئیسلام، مەلا ڕەوف حوێزی، ل٩٤– ١٣٢.

## مزگەوتەکانی عەبدوڵای کوڕی عومەر لە کوردستان لە نێوان ڕاستی و خەیاڵدا.!

کۆمەڵگای کوردەواری لە ژیانی خۆیدا گیرۆدەی کۆمەڵێك داب ونەریتی داهێنراوی نەشیاوی کوشندەبووە کە بەتەواوی کۆڵی کوتاوەو ناوکرۆکی خواردوە، دەستیگیراوە لەوەی بیرێکی نوێ بکاتەوەو خۆی لەو هەموو نەهامەتیە ڕزگاربکات کە تێیکەوتوە.. زۆر جارپەنا هێنانی کورد بۆ دروستکراوێکی ئەفسانە ئامێز بە زەینی خۆی بەمەبەستی داوای ڕزگاری بوە، هەتا ئاهێکی بە بەردا بێنێتەوەو دەرونی ئارام بێت بەرامبەر ئەو ئاگرە ڕەشەی بەبەردەوامی مێژوو لە ماڵی ئەودا کوژانەوەی نەبوە.. بەزۆری شەڕی ئیمپراتۆرو زلهێزان لە خاکی ئەوان هەڵ گیرساوە تەراتێنیان تیاکردوە، یان شەڕی ناومیرو میرنشینە کوردەکان لە خاکی خۆیان لەسەر دەسەڵات وشتی هیچ خۆکوژی وخۆخواردن بوە..کورد کە بەشی شەڕبوە، لەو بێ پشت وپەنایەدا ناچار بوە کۆمەڵە هێزیکی پەنهانی بۆ خۆی دروست بکات هەتا لە تەنگانەدا پەنای بۆ بەرێت، ئەوەیە ناوکرۆکی خواردوە، چوار پەلی بەستوە لە قاوغی خۆیدا تەك وجمی نەماوە، نەیهێشتوە وەك گەلانی دی دور لە هێزە پەنهان وئەفسانەییەکان پشت بە خۆی ببەستێ و گوڕێ بداو هەنگاو هەڵبنێ‌و بگاتە ئاستی خەڵکی و گەلان.

لەسەر خاکی کورد کۆمەڵێك گۆڕو شەخس ومەرقەدی پیران وسەحابان هەیە، کە کورد لەکاتی وەیشومەکانی ژیان وپێویستیەکانی زیارەتی کردوەو هانای بۆ بردوەو داوای لێ کردوە، پاشتر وای گومان بردوە دوعای جێبەجێبوە کە ئەوە ئەوپەڕی نەفامیە. بێئەوەی ئەو سەحابانە هاتبنە کوردوستان لێرە مردبن یان کوژرابن، ئەوە گۆڕی ئەوان نیە کورد بە خەیاڵ‌و نەزانین بۆ خۆی دروستکردوە، کاتی زیارەتی بەزۆری چوارشەموان وهەینیان داناوە، هەر شەخسە شتێکی لە خۆگرتوە لە کاتی زیارەت پێشکەش کراوە، زیارەت بەمەبەستی نەخۆشی وداوای منداڵ وشوکردن وباران وڕنق وڕۆزی و پاراستن لە شەڕ داواکانی ناوناخی بوە!

له کوردستاندا ژماره‌یه‌کی یه‌کجار زۆر مزگه‌وت به‌ناوی عه‌بدولاّی کوڕی خه‌لیفه عومه‌ره‌وه هه‌یه، گوایه ئه‌وسه‌حابه‌یه هاتوه‌ته کوردستان ودروستی کردون یا پاره‌ی ناردبیّ وه‌ك سه‌ده‌قه‌یه‌کی جاری بۆیان دروست کردبیّ، یان ڕه‌نگه کورده‌کان خۆیان له خۆشی ئیمان وته‌قواو نزیکی ئه‌وه‌وه له خوا، دروستیان کردبیّ.یان ڕه‌نگه زانایانی کورد ویستبیّتیان به‌و جۆره مزگه‌وته‌کانیان پیرۆزتر بکه‌ن بۆ وه‌قف ومه‌سره‌ف بۆکردنی مزگه‌وت وحوجره‌و مه‌لاو ڕوتێکردنی زیاتری خه‌ڵك وفه‌قێو زانایان و زیاده ڕێزلێگرتنی بێت.

هیچ سه‌حابه‌یه‌ك نیه هێنده‌ی عه‌بدولاّ ده‌نگ وباسی له کوردوستاندا هه‌بێت، هه‌رله به‌شداریه‌کانی جه‌نگ وجیهادو شه‌هید بونیه‌وه، هه‌تا دروست کردنی مزگه‌وته‌کانی، زیاتر له ده مزگه‌وت به ناوی ئه‌وه‌وه له شارو دێهاته‌کانی کوردوستاندا هه‌یه، دووگۆڕومه‌رقه‌د گومه‌زه‌داری بۆ دروستکراوه گوایه له کوردوستان کوژراوه‌و نێژراوه، ئه‌وه‌ی زیاتر ئه‌م باسانه‌ی دروستکردوه ئه‌و ده‌ستنوسه عه‌ره‌بیه بوه‌به‌ناوی فتوح سه‌واد عیراق که مه‌لا ڕه‌ئوف کردویه به کوردی وپاشتر مه‌لا عه‌بدولعه‌زیزی واعیزی کردویه به فارسی، پاش له‌وان مه‌لا جه‌میل ڕۆژبه‌یانی به کوردیه‌کی پاکتر به‌هه‌ندیّ په‌راوێزه‌وه بلاّوی کرده‌وه‌ته‌وه.جگه له‌و زانیاریه ناڕاستانه‌ی مه‌ردۆخی له کتێبه‌که‌ی دا داویه‌تی له باسی فه‌تحی کوردستاندا..

### ئه‌و مزگه‌وتانه ناوی عه‌بدولاّیان له‌سه‌ره

مه‌ردۆخی ده‌ڵیّ: ساڵی ۱۸ی کۆچی سوپای ئیسلام به فه‌رمانی خه‌لیفه‌ی دووه‌م و له ژێر فه‌رمانداری ئیمام حه‌سه‌ن و عه‌بدولاّی کوڕی عومه‌ر له عێراقه‌وه به‌ره‌و ئێران ده‌ڕۆن عه‌بدولاّی کوڕی عومه‌رو ئه‌بوعوبه‌یدولّلاّی ئه‌نساری له‌گه‌ڵ پێنج هه‌زار سواردا به‌ره‌و شاره‌زور ئه‌که‌ونه ڕیّ وچه‌ند شه‌ڕ ڕووده‌دات، ئه‌بوعوبه‌یدولاّ ده‌کوژریّ وله دێی عه‌بابه‌یلیّ ده‌نێژریّ. ئه‌وانه‌ی مانه‌وه بونه موسوڵمان و وازیان لیّ هێنان، عه‌بدولاّ مانگێك له‌و ناوچانه‌مایه‌وه، تاوه‌کو له جێگای په‌رستگاکان چه‌ند مزگه‌وتێکی دروستکرد

یاساو فەرمانەکانی ئیسلامی لە خەڵکەکە گەیاند، پاشان ڕوەو هەورامان کەوتنە ڕێ و لەنزیك پاوە شەڕو کوشتار ڕویدا، عەبدوڵای کوڕی عومەر لە شاری پاوە مزگەوتێکی دروستکرد، پاشماوەیەکی کەم توانی هەموو وڵاتی کورد بخاتە ژێر چاودێری ئیسلامەوە، لەبری ئاگرو پەرستگاکان مزگەوتی دروستکرد یاساو فەرمانی خوای بڵاو کردەوە[642]

هەروەها ڕێم لە دەستنوسێك کەوت[643]، بابەتێکی هێناوە ڕەنگە هەر لەو سەرچاوەی وەرگرتبێ کە مەردۆخی لێی وەرگرتوە، کەمێك جیاوازیان هەیە.بەڵام دیار نیە ئەو سەرچاوە چیە کە ئەوان لێیان وەرگرتوە. چونکە ناکرێ باسیك ئەو هەموو هەڵەیەی تیابێت کە دواتر باسی دەکەین، عەبدوڵا نەهاتوەتە کوردوستان، ئەبوعوبەیدەش لەشارەزور نەکوژراوە. چاك وایە بێینە سەرباسی مزگەوتەکان کە ناوی عەبدوڵایان لەسەرە.

١ـ مزگەوتی دێی گەرموککە لە ناوچەی کۆیە تایەر ئەحمەد حوێزی لە کتێبەکەیدا باسی کردوە کە عەبدوڵای کوڕی عومەردروستیکردوە.

٢ـ مزگەوتی کۆنە جومعە لە گەڕەکی هەواو لە کۆیسنجەق، لە هەموو مزگەوتەکانی کۆیەکۆنترە. دەڵێن ئەمەش وەکو مزگەوتی گەرموك دێرەبوە (کەنیسە)و کراوە بە مزگەوت، بە مزگەوتی ئیبن عومەر ناسراوە دەڵێن عەبدوڵای کوڕی ئیمام عومەر کردبێتیە مزگەوت، بە مزگەوتی عەبدوڵا عومرانیش ناسراوە، سەردەمێ مەلا ڕەئوف سەلیم ئاغا حوێزی ئیمامی، ئەم مزگەوتە بوە ساردواوێکی هەبوە هەتا کۆنە قەڵات چوە بە بەردی زۆر گەورە کراوە[644]

---

642 مێژوی کوردو کوردوستان. محمد مەردۆخی کوردوستانی، وەرگێر لە فارسیەوە عەبدولکەریم محمد سەعید. لا ١٨٦ بغداد ١٩٩١.

643 دەستنوسی بەڕێز عەبدوڵا تایەر بەناوی (القضیة الکردیة من منظور اسلامی).موضوع (الاکراد قبل وبعد الاسلام) ص٩ـ١١.

644 مێژوی کۆیە. بەرگی دوەم. بەشی یەکەم. طاهیر احمد حوێزی لا٢٨٣ مطبعة نمیر بغداد ١٩٨٤.

٣ـ مزگەوتی گەورەی ناحیەی خورماڵ لە دەشتی شارەزور لە بەردەم چیای هەورامان ناسراوە بە مزگەوتی عەبدوڵا هەر لە کۆنەوە وا باوە کە عەبدوڵا هاتوە و خۆی دروستی کردوە. مەلا عەبدولکەریمی مدرس دەڵێ وامەشهورە مزگەوتی خورماڵ لە سەردەمی هاوڕێیانی پێغەمبەر دروست کراوەکە کوردستانیان گرتوە[645]، ناحیەی خورماڵ سەر بەقەزای هەڵەبجە دەکەوێتە سەر سنوری ئێران. لە دیوانی پیرەمێردا هاتوە، لە خورماڵ هەندێ زەوی وزار هەیە کە وەقفی مزگەوتی خورماڵە و ئەبێ هەموو ساڵێك خێرو بێری ئەو زەویانە لە مزگەوتەکەدا خەرج بکرێ، پیرە مێرد لە ٣١ ی ئابی ١٩٤١دا چاوی بە مزگەوتەکە کەوتوە و بە چاوی خۆی دیویەتی کە مزگەوتەکەی عەبدوڵا چەند پەرپوت ولێی نەپرسراوەتەوە، بۆی دەرکەوتوە کە واریداتی ساڵانەی ئەو زەوی و زارانە هەموی دەچێتە گیرفانی شێخەکانی بیارەی ئەو سەردەمە و هیچی بۆ مزگەوت خەرج ناکرێ، پیرەمێرد خۆی پێنەگیراوەو بیزاری خۆی بەم هەڵبەستە دەربڕی:

چومە مزگەوتی خورماڵ بەگریان
ئاخ ڕۆژی ڕەش و وێران وعوریان
تەملیلە بوە بە چەکە و کەوان
ریزی بەستوە ئەسپەی مریدان
هەرماڵی خوایە ئەبرێ بە تاڵان
ئاساری کۆنی ئیسلام ڕوخاوە
بە جاڵجاڵۆکە مینبەر تەنراوە
زمانی میحراب کولەکەی ئاوە
پێخەفی کۆنی تیا هەڵچنراوە
خەڵك لەبەر بیگار هاتونە ئامان

---

645 یادی مەردان مەلا عەبدولکەریمی مدرس لا ٣٩٩بەرگی دوەم چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بغداد ١٩٨٣

**دەوری ئەسحابان سێ مزگەوت کران**

**یەکیك لە (نگڵ) دوەم لە (کرمان)**

**سێهەم لە(خورماڵ) سەرچاوەی کوردان**

**هەرسێ ئاساری (ئەولای هۆمەران)**

**ئاساری فەخرە بۆ دەوری ئەوان**

**سوڵتان سەلیم گۆی شاهی بردەوە**

**قوبە و منارەی تازەکردەوە**

**قەلایەکی کرد بەو سەر گردەوە**

**سەربەرزی خستە قەومی کوردەوە**

**شێخ بوو بەواریس بۆ موڵکی ئەوان**

**کە شێخان تۆبەی مرید دادەدەن**

**دەڵێن دەست زەنی ماڵی کەس مەکەن**

**بەلام کە خۆیان مرید ڕوت ئەکەن**

**مەکەیان بۆ نیە سواڵکەری مەکەن**

**موڵکی خواو سوڵتان کەوتە دەست ئەوان[٦٤٦]**

**٤. مزگەوتی عەبدولا لە دێی (نگڵ) نزیك بە مەریوان لە کوردستانی بندەستی ئێران، وەك پیرەمێردی نەمر لە شیعرێکی دا ناوی بردوە:**

**دەوری ئەسحابان سێ مزگەوت کران یەکیك لە نگڵ دوەم لەکرمان**

**سێهەم لە خورماڵ سەرچاوەی کوردان هەرسێ ئاساری ئەولای هۆمەران[٦٤٧].**

**٥. مزگەوتیگەورەی پاوە ناو نراوە مزگەوتی عەبدولا بەو قسەیەی کە گوایە عەبدولا لە کاتی فتوحاتدا گەیشتوەتە ئەو ناوەو بۆ بلاوکردنەوەی**

---

646 دیوانی پیرەمێردی نەمر، ل٢١٨ ــ٢٢٠ بەغداد ١٩٧٠ محمد ڕەسول هاوار چەکەو کەوان وادیارە مەلاج لە مزگەوت ئیشی کردوە لژکەی شیکردوەتەوە.

647 هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ئاینی ئیسلام وکۆبونەوەی موسوڵمانان دروستی کردوە. قەزای پاوە سەر بە پارێزگای کرماشانە لە کوردستانی بندەستی ئێران.

٦. مزگەوتی گەورەی تەوێڵە بەقسەی خەڵکی ئەو ناوە عەبدوڵای کوڕی عومەر گەیشتوەتە ئەوێ ودروستی کردوە. ناحیەی توێڵە سەر بە قەزای هەڵەبجەیە.

٧. مزگەوتی بیارە: مەلاعەبدولکەریمی مدرس دەڵێ مەتەواترە کە مزگەوتی ناودێی بیارە دەسکردی ئەو یارانی پێغەمبەرەیە کە لە ساڵی ١٨ی کۆچی شارەزوریان رزگارکردوە لە ناو کوردا بەوجۆرە مزگەوتانە دەڵێن عەبدوڵاهی واتە عەبدوڵای کوڕی عومەر دروستی کردون، لە مێژودا نەماندیوە عەبدوڵا فەرماندەی سوپا بوبێت، بەڵێ عەبدوڵا لەو سوپایەدا بوە کە هاتن ئەربیلیان گرت وبەرەو خۆشناوەتی وپشتدەر سەرکەوتن[٦٤٨]. مامۆستا مودەریس لێرەدا کەوتۆتە هەڵەوە، دیارە ئەویش بڕوای بە قسەکانی حوێزیو واعیزیە بۆ ناوچەی هەولێر. بەڵام پاشتر دەری دەخەین کە عەبدوڵا لەوسوپایەشدا نەبوە

٨ . مزگەوتی دێی پالانیا لە شارەزور سەربە هەڵەبجە، ئەویش واباوە کە عەبدوڵا گەیشتوەتە ناوچەکەو دروستی کردوە.

٩- مزگەوتی دێی ڕوان لە نێوان ئۆردوگای سەریاس وناحیەی باینگان سەر بە قەزای پاوە، لە بەشە کوردوستانی دیوی ئێران، مزگەوتێکی زۆرکۆنە گوایە عەبدوڵا گەیوەتە ئەوێ وئەوکارەی ئەنجام داوە[٦٤٩].

١٠. مزگەوتی عەبدوڵای عومران لە دێی هەڵاوێژە. چۆنیەتی دروست بونی بەم جۆرەیە: حوێزی لە باسی فەتحی کوردوستاندا لەکتێبەکەیدا دەڵێ (ئەنجا سوپای ئیسلام بە دەم زێی بچوکدا هاتنە خوارەوە تا گەیشتنە دەربەندی پشدەر، لە زێ پەڕینەوە وگەیشتنە دوگمان، بەرامبەر سوپای کورد وەستان، عەبدوڵای عومەر لای ڕۆژئاواوە دامەزرا، شەڕ قەوما پاشای کورد

---

648 بنەماڵەی زانیاران مەلا عەبدولکەریمی مدرس ل٤٢١ چاپی یەکەم چاپخانەی شەفیق بغداد ١٩٨٤.

649 دوای وتووێژ لە گەڵ هەندێ لە خەڵکی ناوچەکە بەم زانیارانە گەیشتم.

مالیکی ئەژدەر کوژرا، کوردان هەڵهاتن ودوگمان وناوچەکە گیرا، پاشان ڕویانکردە پشدەر کە قەلاّیەکی قایمی هەبوو پاشایەکی ئازای هەبوو بەناوی دانیکور دوای شەڕی قورس قەلاّگیرا وەەلیك دانیکور هەڵهات بەلاّم شەو لە دێیەك کوشتیان، چونە ناو قەلاّ وخەڵکی کوردموسوڵمان بون، مزگەوتێکیان لەو دێیەی کە دانیکوری تیا کوژرا دروست کرد، ئیستە دێیەکە ناوی هەلاّویژەیە، ئەو مزگەوتە ئێستا مەشهورە خەڵقی پێی دەڵێن مزگەوتی عەبدولاّی عومران گوایا عەبدولاّی ئیمامی عومەر دروستی کردوە[650].

١١. مزگەوتی عەبدولاّ لەدێی بیجورە. چۆنیەتی ئەفسانەی دروست بونی بەم جۆرەیە: حوێزی لە نوسراوەکەی دا دەڵێ (لە سنوری سیوسێنان وهیولان کە ئیستە پێی دەڵێن ئالانیان ئالان، لەدامێن ئەوکێوە دێیەکی بچوکی لێبوو ئەهالی دێیەکە ترسان، پیاوە گەورەکانیان نارد داوای موسوڵمان بونیان کرد وچەندکەسێك بێن فێری ئیسلامیان بکەن، خالید دوو سەحابەی لەگەڵ ناردن بەناوی بەشرو سەعد، خالید سوێندیدان کە خیانەتیان لەگەڵ نەکەن، چون بۆئاوایی بیجورە نەسیحەتیان کردن چوار ڕۆژ لەوێ بون شەوی پێنجەم ئەهالی بێجورە چونە سەریان وکوشتنیان ولە سەلوێنگاکەدا شاردنیانەوە، عەبدولاّی ئیمامی عومەر ئەو شەوە خەوی خراپی دیت، فەرموی خەڵکی بیجورە خیانەتیان لە سەحابان کردوە، خالید وتی ئەی کوڕی خەلیفە تۆ لە گەڵ پێنجسەد نەفەر بڕۆ، چون دەوری دێیاندا داوای سەحابەکانیان کرد، وتیان هەڵهاتون، عەباس سەیری سەلوێنکیکرد دیتی نور بەرز دەبێتەوە، بانگی عەبدولاّیکرد، هەڵیاندایەوە هەردوو لاشەکە دەرکەوتن، ئەنجا بەربونە خەڵکی دێکەو زۆریان لێکوشتن، ئەنجا لاشەی دوو سەحابەیان لەوێ بەخاك سپارد، عەبدولاّ لەسەرخاکی ئەوان مزگەوتێکی دروستکردکە ئێستاش

---

650 عەبدولاّی لە نزیك ئاوەکەوە تەسلیم بەخاك کرد، ئێستاش مرقدی عەبدولاّ مەشهورە بە سوڵتان عەبدولاّی عەرەبی (کوردستان وئاینی ئیسلام-مەلا ڕەئوف سلیم حوێزی، ل ١٠٧-١١٢ چاپخانەی جامعە ١٩٧٠بەغدا).

ئاساری قەبری ئەو دوو سەحابەیەماوە ئەکەونە ڕۆژهەڵاتی مزگەوتەکەوە.
ئەفسانەی لاشەی سەحابە لەسەلۆنێكو دروستکردنی مزگەوت لە سەر سەلۆنێك دروستکراوی دەستی دوژمن بە ئیسلامە پاشان روونی دەکەمەوە.

١٢. گۆڕی عەبدولڵای کوڕی عومەر کەبوەتە مزگەوت وگوایە لە نێوان هەولێرو موسڵدا شەهید بوە ولەوێدا ئەسپەردەکراوە.مەلا واعزی بە درێژی ئەوەی بەم جۆرە گێڕاوەتەوە: خالیدو عەبدولڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب بەم خەم وخەفەتەوە واتە خەفەتی کوژرانی سەحابەکان لە سماقوڵیان ـ ڕویان کردە ئەینەوا، لە نێوان هەولێرو موسڵدا توشی ڕوبارێك هاتن ودەیانویست بپەڕنەوە، لەم کاتەدا پیرە ژنێك لە کەناری ڕوبارەکە دامابوو، داوای لە عەبدولاّ کرد بیکاتە کۆڵ و بیپەڕێنێتەوە، عەبدولاّ سواری پشتی خۆی کرد، کە گەیشتە ناوە ڕاستی ڕوبارەکە پیرە ژنەکە تۆزێکی کرد بە لوتی عەبدولڵادا، کە گەیشتە ئەو بەری ئاوەکە، عەبدولاّ ڕەنگی زەردبوو مرد، خالید بەکارەساتەکەی زانی پیرە ژنەکەی دایە بەرشمشێرو لەت وپەتی کرد..ئەنجا یاران کۆبونەوە عەبدولڵایان نوێژکردو ناشتیان، پاشان چونەوە بەرەو شام، پاش ئەوە خالید لە شاری حومس مرد، ئەمە ساڵی ٢١ی کۆچی بوو، ئەو ساڵە کەئیمامی عومەریش کۆچی دوایی کرد.)[651]

١٣. ڕۆژبەیانی دەڵێت گۆڕی عەبدولاّ لە قەرەچۆغە بە عەبدولڵای عارەبی بەناوبانگە کە مزگەوتەکەشی لەسەرە[652]. لەوەی‌مەلا ڕەئوف حوێزی‌دا هەندێ جیاوازی هەیە، کوژرانی عەبدولڵای کوڕی عومەر لەو جێیەدا درۆیەکی ڕوتە عەبدولاّ مردوە شەهید نەبوە، لە مەدینە ناشتویانە نەك لە قەرەچۆغی کوردستان ساڵی ٦٤ی کۆچی نەك ساڵی٢١ یان ٢٣ یان ٢٥ی کۆچی، لە سەردەمی ئەمەویدا بوو نەك لە سەردەمی عومەری باوکیدا. لە دوای باوکی مردوە نەك لەپێش یەوە، خەلیفە عومەر لە ساڵی ٢٣ی کۆچی‌دا شەهید

---

651 هەمان سەرچاوە، ل١١٧– ١١٨.

652 ولات گیری رەشەخاکی عێراق. ڕۆژبەیانی. ل٦٧.

بوونەك ٢١ی كۆچی، لە بڕگەیەكدا ئەم هەموو هەڵەیە چییە؟ دیارە ئەمە نوسینی كەسێكی ساكارو سادەیە، یان هی كەسێكی زۆر زانی وەك مێجەرسۆن و حوزنی موكریانیو دكتۆر سەعیدخانی كوردستانیە كە پێكەوە شیعرەكەی هورمزگانیشان نووسیو فڕێیان دایە ناو كتێبخانەی كوردیو لەشێوەی دەستنووسێكی كۆندا بۆ سەرلێشێوانی خەڵكو ناشیرینكردنی فتوحاتی كوردستان، ویستویانە گەر بۆ ماوە یەكیش بوە خەڵكی بەو درۆو دەلەسانە بخەڵەتێنن[653].

لێرەدا كورتەی ئەوبەشداریانەی عەبدوڵای كوڕی عومەر دەگێڕینەوە كە لەكتێبەكەی مەلا ڕەئوفدا هاتوە، ڕۆژ بەیانی [654] و واعیزیش هەر بەوجۆرەیان باسكردوە بە جیاوازی كەمەوە[655]، هەتا بزانین ئەم مزگەوتانە بۆ بەناوی عەبدوڵاوە ناونراون و ئەو گۆڕو قەبرانە هی كێن وا ناوی عەبدوڵای عومەریان بە سەرەوەیە، حوێزی دەڵێ ( ڕاوی ئەڵێ وەختێك یارانی پێغەمبەر (د.خ) وڵاتی شام و ئەرمەن و تەرەفی موسڵ وهەرچی مابوو لە وڵاتی رۆم فەتحیان كرد، قائدی جەیشی مسوڵمانان ئەبوعوبەیدەی جەڕاح، هەموو سەحابەی كۆكردەوە وتی چۆنە بەرەو شەرق بڕۆین یان بەرەو غەرب، سەحابان فەرمویان پێویستە نامەیەك بۆ خەلیفەی موسوڵمانان عومەر بنوسین، ئەبوعوبەیدەی جەڕاح سەركردەی سوپای شام نوسیو داوا دەكات دوای ئەوە چی بكەن؟ خەلیفە وەڵامی دایەوە: لازمە چوار هەزار كەس تەسلیم بە خالید بكەی وبەرەو قەومی كوردان بەڕێیان بكەی، زوبێر وفەزڵ ومقدادوعەبدوڵای عومەرو. لەگەڵدا بنێریو ئەحكامی ئیسلام بە هەموو شار و دێهات و شاخی كوردەواریدا بڵاوبكەنەوە. سوپای خالید هەولێری گرت، دوای چەند شەڕی

---

653 فەتواكەی مەلای خەتێ، حسن محمود حەمەكەریم، ٢٠٠٦، ل٨٦.

[654] وڵات گیری ڕەشەخاكی عێراق. ڕۆژبەیانی. ل٤١.

655 فتوح سواد العراق. محمد بن عمر الواقدی.ترجمة الی الفارسیة ملا عبدالعزیز الواعظی ص٢٠٥-٢٠٧طهران ١٣٧٤ ایرانی).

قورس گەیشتنە دێی سنجان(سیناجیان)، لەدوایدا خالید بانگی عەبدوڵای عومەری کرد ئەمری کرد هەزار سوار هەڵگرەو برۆ بۆ سەر ڕێگای شیدەر(یەعنی پشدەر). خۆیان ڕۆیشتن بەرەو مەرجێن (مەرگە) (لا ٩٤) فەروخ شا ڕای کرد، عەبدولاّ بەسوارەکانەوە کوردەکانی شکاندو ماڵیانی تالاّنکرد، ئەنجا عەبدولاّو مقداد هێرشیان بردە سەر سوپای فەروخ شا. مقداد فەروخی کوشت و سوپای کوردان شکان وعەبدولاّی عومەر شوێنیان کەوت بەرەو ئەزمیر(ئەزمڕ). شکاندنی و غەنیمەتی زۆری لێگرتن، (لا ١٠١) خالید هەواڵی زانی کوردەکان لە دێیەك نزیك زێی بچوك بەرەو ڕوی پشدەر لەشکرێکی زۆریان کۆکردوەتەوە چوو بۆیان شەڕی قورس قەوما گەمارۆی سوپای ئیسلامیاندا. عەبدولاّی کوڕی عومەرکەبەوەی زانی هەواڵی بۆخالید نارد.هاتن وشەڕکراو نەجاتیان بوو.(لا ١٠٥) ئەنجا سوپای ئیسلام بە دەم زێی بچوکدا هاتنە خوارەوە تا گەیشتنە دەربەندی پشدەر. لە زێ پەڕینەوە وگەیشتنە دوگمان بەرامبەر سوپای کورد وەستان. عەبدولاّی عومەر لای ڕۆژئاواوە دامەزرا، شەڕ قەوما پاشای کورد مالیکی ئەژدەر کوژرا. کوردان هەڵهاتن و دوگمان وناوچەکە گیرا.(لا ١٠٧) پاشان ڕویان کردە پشدەرکە قەلاّیەکی قایمی هەبو پاشایەکی ئازای هەبو بەناوی دانیکور دوای شەڕی قورس قەلاّگیرا ومەلیك دانیکور هەڵهات. بەلاّم شەولە دێیەك کوشتیان وچونە ناو قەلاّ وخەلکی کورد موسوڵمان بون، مزگەوتێکیان لەو دێیە کە دانیکوری تیا کوژرا دروست کرد.ئیستە دێیەکە ناوی هەلاّویژەیە، ئەو مزگەوتە ئێستا مەشهورە خەڵقی پێی دەڵێن مزگەوتی عەبدولاّی عومران گۆیا عەبدولاّی ئیمامی عومەر دروستی کردوە. (لا ١١٣) ئەنجا خالید نامەی بۆخەلیفە عومەر نوسی فەرمووی ولاّتی مەرگەو پشدەر ودوگمانمان فەتح کردوە پادشاهانمان کوشتوە ولاّتەکە موسوڵمان بون.، ڕۆژی نوسینی ئەم کاغەزە ١٢ی زیلقەعدەی ساڵی ٢١ی کۆچی، لە سنوری سیوسێنان وهیولان کە ئیستە پێی دەڵێن ئالانیان ئالان دێیەکە والە دامێنی ئەو کێوە. دێیەکی بچوکی ئێبوو ئەهالی دێکە ترسان. پیاوە گەورەکانیان نارد داوای موسوڵمانبونیان کرد وچەند

کەسێك فێری ئیسلامیان بکەن، خالید دوو سەحابەی لەگەڵ ناردن بەناوی بەشرو سەعد، خالید سوێندی دان کە خیانەتیان لە گەڵ نەکەن، چون بۆناوایی بیجورە نەسیحەتیان کردن چوار ڕۆژ لەوێ بون شەوی پێنجەم ئەهالی بێجورە چونە سەریان وکوشتنیان ولە سەلوێنگاکەدا شاردنیانەوە، عەبدوڵای ئیمامی عومەر ئەو شەوە خەوی خراپی دیت، فەرموی خەڵکی بیجورە خیانەتیان لە سەحابان کردوە، خالید وتی ئەی کوڕی خەلیفە تۆ لە گەڵ پێنجسەد نەفەر بڕۆ، دەوری دێیان دا داوای سەحابەکانیان کرد، وتیان هەڵهاتون، عەباس سەیری سەلوێنکی کرد دیتی نور بەرز دەبێتەوە، بانگی عەبدوڵای کرد، هەڵیاندایەوە هەردولاشەکە دەرکەوتن، ئەنجا بەربونە خەڵکی دێکەو زۆریان لێکوشتن، لاشەی دوو سەحابەیان لەوێ بەخاك سپارد، عەبدولا لەسەرخاکی ئەوان مزگەوتێکی دروستکرد کە ئێستاش ئاساری قەبری ئەو دوو سەحابەیە ماوە ئەکەونە ڕۆژهەلاتی مزگەوتەکەوە (لا ١١٧-١١٨) ئەنجا چونە سەر شارەزورو قەلاچوالان، دێی شوریەو ڕەبتیان گرت، پاشان هێرشیان کردە سەر ساجبلاخ کە ژنێك پاشایان بوە بەناوی ئەرجانوس سەر بەدەوڵەتی ئازربایجان بوە شەڕی قورس قەوما پاشان عەبدوڵاو مقداد هێرشیان کرد ئەرجانوسیان ئەسیرکردو سوپاکەی هەڵهاتن تا سەر بەحری خوی ڕاویان نان، شاری سابلاخ گیراو ناوچەکە موسوڵمان بون وئەرجانوس موسوڵمان بوو شوی کرد بە قەعقاع (لا ١٢٢) ئەنجا ڕویانکردە ڕەزاییە(ئورمیە - ورمێ - ئەرمانی) کە پاشاکەیان ناوی خۆش قەدەم بوو، خالید هێرشی کرد عەبدوڵاش سەرکردەیەك بوو، ئەنەس خۆش قەدەمی کوشت سوپاکەی هەڵهات و ڕەزاییە گیرا چەند مزگەوتیان تیا دروست کرد، ئەنەس لە ڕەزاییە مردو لەوێ ئەسپەردەکراو ئیستە گۆڕەکەی لەوێیە.(لا ١٢٩)، ئەنجا چون بۆ گرتنی باینج (بانە) داوای بیست نەفەر سەحابەیان کرد تا ئیسلامیان فێر بکەن، کە هاتن هەموویان کوشتن، خالید هێرشی کردە سەریانە وعەبدوڵای عومەری لە گەڵ بوو خراپترین تۆڵەیان لێکردنەوە، کەفەتحی کوردوستان تەواوبوو، ئەنجا بەرەبتدا بەرەوعەرەبستان گەڕانەوە

بەرێی دوگماندا چون تاگەیشتنە دێی ئیسماعیل قولی کە ئیستا پێی دەڵێن سماقوڵیان لە نزیك کۆیە، ئەهلی ئیسماعیل قولی لەناو دارودەوەندا کەمینیان دانا چاوە ڕێی هاتنی ئیسلامانیان دەکرد، کەهاتن لە پڕێکا لەهەر چوارلاوە تیرەبارانیان کردن سەدوپەنجا لە ئەسحابە شەهید کرا کە ئەغلەبیان سپەهـ سالاربوو وەك مقدادو وائیلەو قەعقاع و زرارو زۆری تر، خالیدو عەبدولاّ زۆرگریان ودوعایان لە ئەهلی سماقوڵیان کرد، (لا ١٣٠) خالیدو عەبدولاّی عومەر بە غەموو حەسرەتەوە گەڕانەوە. لە بەینی موسڵ وهەولێر توشی چەمێك بون لەدەم ئەم چۆمە پیرەژنێکی لێبوو لێیان پرسی تۆ چی دەکەی لێرە؟ گوتی من موسوڵمانم ئەمەویّ لەم ئاوە بپەڕمەوە بەڵام ناوێرم، عەبدولاّ پیرە ژنی هاویشتە پاشکۆی خۆی خالید فەرموی لە مەکری پیرەژنان ئەمین مەبە، عەبدولاّ فەرموی قەیدی ناکات، وەناو ئاوەکە کەوتن هەتا گەیشتنە قولاّیی ئاوەکە، پیرە ژنی سەگ چەقۆیەکی زل لە باخەڵی دەرهێنا لە سەردڵی عەبدولاّی ڕاکێشا، عەبدولاّ ڕەنگی زەرد بوو وتی پیرە ژن کوشتمی خالید عەبدولاّی پەڕاندەوەو شیرێکی لە پیرەژن داوکوشتی، عەبدولاّ فەرموی بەخالید سەلامم بگەیەنە بە باوکم وهەموو ئەسحابان، خالید زۆری بۆگریا هەرلەویّ جەنازەی عەبدولاّی لە نزیك ئاوەکەوە تەسلیم بەخاك کرد، ئێستاش مەرقەدی عەبدولاّ مەشهورە بە سوڵتان عەبدولاّی عەرەبی[٦٥٦].

ئەمەش کورتەی ڕوداوەکانی عەبدولاّیە لە وەرگێڕاوە فارسیەکەی مەلا عەبدولعەزیزی واعیزیدا دەڵیّ (واقیدی لە زمانی خالیدەوە دەگێڕێتەوە کاتیّ تۆڵەمان لە خەڵکی باینج کردەوەو ولاّتی عەجەممان تەواو کرد، بە ولاّتی کوردا ژوروخواری زۆرمان کرد، ئێمە بەشیدەرو مەرجێندا نەچوین بەڵکو بە دوقمان و دێی سماقوایدا چوین (لە عەرەبیەکەدا دەڵیّ ئیسماعیل قویا)و سەرۆکی ئەم دێیەکە لە باکوری ڕۆژئاوای کۆیسنجەقەوەیە نزیك جێیەکە

---

656 (کوردستان وئاینی ئیسلام-مەلا رەئوف سلیم حوێزی، لا ٧٧ـ ١٣١ چاپخانەی جامعە ١٩٧٠بەغدا).

ناسراوه به ئەسحابانی ئیسماعیل قولی، ژنانیان تەواو ڕوت کردبویەوه تا سەحابەکان ڕوو وەربگێڕن و سەیریان نەکەن زۆریان شەهید بون، ئێستە بە کوردی بەو دوو دێیە دەڵێن سماقولی وسماقولیە وەگۆڕستانێکی فراوان لەویایە بەناوی دۆڵی ئەسحابان یان دۆڵی شەهیدان خەڵکی لە وەرزی بەهاراندا بۆ زیارەت بۆی دەچن شەو لەوێ دەمێننەوه، لە خوار ئەوانەوه دوو سەرچاوه هەیە کە مەترێك لە یەك دورن یەکیان زۆر گەرم ویەکیان زۆرساردە، شاخێکی لێیە ئاوێکی لێدێت گۆگردە.. نەمانزانی ڕێگرەکان بۆسەیان بۆ ناوینەوه لەو ئاودارو بەردانەدا، ئێمە بەرەو موسڵ دەچوین ژنان خۆیان ڕوتکردبویەوه بێ جل وبەرگ دەیانزانی عەرەب چاوی خۆی لەو حەرامانە دەگرێ، چوینە ناوەڕاستیانەوه لە پڕ ئێمەیان دایە بەرلێزەمەی تیروکەوان وزۆریان لیکوشتین لە ئەسپەکان هاتینە خوار و پەلامارماندان و ڕاومانان، بەلاّم زرارو قعقاع ومقدادو وائیلەو زۆریتر شەهید بون. خالید وعەبدولاّ بۆیان گریان ١٥٠ کەسمان لیکوژرا و لەکوردیش ٣٠٠مان کوشت، خالیدو عەبدولاّ دوعایان لە کورد کرد، خالید هەواڵی ئەو ڕوداوەی گەیاند بە ئەمیران، خالیدو عەبدولاّ زۆر غەم وخەفەتیان خواردو ڕۆیشتن بەرەو موسڵ گەیشتنە ڕوبارێك[657]. ویستیان بپەڕنەوه چاویان کەوت بە پیرە ژنێك هەواڵیان پرسی چی دەکەیت؟ پیرەژن وتی من موسوڵمانم دەمەوێ بپەڕمەوه توانام نیە، عەبدولاّ ئەوی خستە سەرپشتی خۆی وهەرچەند خالید وتی هەقت نەبێ، عەبدولاّ وتی باوکی سلیمان گرنگ نیە، گێڕەوەکە دەڵێ کە خالیدو عەبدولاّ گەیشتنە ناوەڕاستی ئاوەکە خالید گومانی لە پیرە ژن بوو، سەیرێکی عەبدولاّی کرددەبینێ ڕەنگی زەرد بوە، خالید بانگی کرد ئەبا فاروق (دەبو بیوتایە ئیبن فاروق یان یا عەبدوڵلاّ چونکە عەبدولاّ کوڕی نیە ناوی فاروق

---

657 ڕوباری غازر(زابی گەورە)نزیك موسڵە، واعزی باسی سەفەرێکی دەکات دەڵێ نزیك موسڵ بوینەوه نزیك ئاوەکە ئیستە گوڕێك هەیە دوای پرسیار وتیان گوڕی عەبدولاّیکوڕی عومەرە..لە نوسخەی دوەمدا نوسراوه نوسەردەڵێ من خۆم چوم بۆ موسڵ لە ڕوباری غازر پەڕیمەوه چاوم کەوت بە گومەزەیەك پرسیارم کرد وتیان گوڕی عەبدولاّی کوڕی عومەرە.

بێت بەڵكو عومەری باوكی نازناوی فاروقە) دەنگ وباس چیە؟ وتی ئەبا سلیمان پیرە ژن منی كوشت، تۆ ڕاستت كرد خالید چوە لای ودەستی گرت وپیرەژن لە دواوە بوو، ئەوی پەڕاندەوە ودایبەزاند، . پیرە ژنی لەتكرد وخستیە ئاوەكەوە، عەبدولاَ وتی سەلامی من بگەیەنە بە باوكم، خالید بۆی گریا و دوای ئەوەی ئەسپەردەی كرد، ڕۆشت تا چوە شاری حومس لەویَ مایەوەو لەویَ مرد، گۆڕی لە حومسەو بەناوبانگە[658].

عەبدولاَی كوڕی عومەر بە دەستی پیرەژن لە كوردوستان لە ساڵی٢١یان ٢٣ یان ٢٥ی كۆچی لە سەردەمی خەلیفەعومەردا شەهید نەبوە، بەڵكو لە سەردەمی یەزیدی كوڕی معاویەشدا زیندوبوە، ئەو نامانەش ڕاست نیەو هەڵبەسراوەكە گوایە لە نێوان خەلیفەو سەركردەكاندا ئاڵوگۆڕكراوە لە كوردوستانەوە، چونكە نامەی وا لە كتێبی نامەكانی خەلیفە عومەردا نەهاتوە[659]، كە هەموو نامەكانی خەلیفە عومەری تیایە، ناوی ساوجبلاغ كە لەو كتێبەدا چەد جار هاتوە سەد دەرسەد توركیە. لە سەرەتای ئیسلامدا شارێك نەبوە بەوناوە، تورك لە سەردەمە دواییەكاندا كە ئەو ناوچەیان داگیركرد ناویا نا وەك سەدەها ناوی تر كە لە كوردستاندا هەیە، پاشان باسی گۆگردو شوشەی موسڵ دەكات كە لەكاتی فتوحاتدا ئەم ناوانە بەم جۆرە نەبوون[660].

## ژیانی عەبدولاَی كوڕی عومەر

عەبدولاَ كوڕی عومەر كوڕی خەتاب كوڕی نوفەیل قوڕەیشی عدویە، ساڵی سێیەمی پێغەمبەرایەتی، واتە دە ساڵ پێش كۆچی پێغەمبەر(درودی خوای لە سەر بێت) بۆ مەدینە لەدایك بوو، لەگەڵ باوكی پێكەوە كۆچیان كردبۆ مەدینە، وە لە گەڵ باوكیدا چون بۆ غەزای بەدر كە ئەوكات ١٣ساڵ بوو، لە

---

[658] فتوح سواد العراق. محمد بن عمر الواقدي.ترجمة الى الفارسية ملا عبدالعزيز الواعظي ص٢٠٥_٢٠٧.

659 رسائل الفاروق عمر بن الخطاب. عبداللطيف اسماعيل الجبوري.بغداد ١٩٨٩

660 فتوح سواد العراق. ترجمة الى الفارسية ملا عبدالعزيز، مقدمة وتصحيح الاستاذ نادر كريميان ص١٢٣.

غەزای ئوحددا ١٤ساڵ بوو، بەڵام پێغەمبەر ڕازی نەبوو بەشدار بێت لە بەرکەمی تەمەنی، بەڵام لە جەنگی خەندەقدا ١٥ ساڵ بوو ڕێگەی بەشداری کردنی دا[661]، هەروەها لە فەتحی مەککەدا بەشدار بوو، لەفتوحاتەکانی پێش خەلافەتی باوکیدا بەشدار بوو[662]، لە کتێبی تەهزیبدا دەڵێ ئەو بۆ جیهاد گەیشتوەتە یەرموك ومیسرو ئەفەریقیا[663]، ٢٦٣٠ فەرمودەی لە پێغەمبەرەوە گێراوەتەوە، شەست ساڵ موفتی بووله ئیسلامدا، بە یەکێك لە موفەسیرو فەقیهە مەزنەکان دەژمێردرێت، لە شورای شەش نەفەرە بوو بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە، سەرپەرشتی هەڵبژاردنەکەی دەکرد، لە کۆتایی تەمەنیدا کە زیاد لە هەشتا ساڵ بوو وتی بەیعەتم بە پێغەمبەردا تا ئیستە نەم شکاندوەو نەم گۆڕیوە، بەیعەتم بە خاوەنانی فیتنە نەداوەو هیچ بڕواداڕێکم ڕانەچڵەکاندوە (لقد بايعت رسول الله صلى الله عليه وسلم فما نكثت ولا بدلت الى يوم هذا وما بايعت صاحب فتنة. ولا ايقظت مؤمنا فى مرقده) بەهاوڕێیەتی باوکی خێری زۆری توش بوو، وە بە هاوڕێیەتی باوکی لە خزمەتی پێغەمبەردا هەموو خێر فێر بوو، هەمیشە بە دوای جێبەجێکردنی سونەتەکانی پێغەمبەردا دەچوو، پێغەمبەر لە کوێدا نوێژی بکردایە، ئەویش دەچوە هەمان جێو وەك ئەوی دەکرد، پێغەمبەری دەدی بە پێوە یان دانیشتنەوە دوعای دەکرد ئەویش دەچوە هەمان جێو بەهەمان شێوەی ئەوی دەکرد، جارێك بە ڕێگادا پێغەمبەر لەوڵاغەکەی دادەبەزێ ودوو ڕکات نوێژ دەکات، هەموو جارعەبدوڵا لە سەفەریدا کە بەو جێیەدا دەچوو وای دەکرد، عائیشە دەیفەرموو کەس نیە هێندەی عەبدوڵا لاسایی پێغەمبەر بکاتەوەو جێ پێی هەڵبگرێ، وەزیفەی قازی بووکە بەرزترین پلە بوو لە دەوڵەت

---

661 قادة فتح الشام ومصر-اللواء الركن محمود شيت خطاب-ص٣٧ بيروت دارالفكر، قادة النبى-محمود شيت خطاب-بيروت الدار الشامية- ط٢ ١٩٩٩.

662 سير اعلام النبلاء ج٣ص١١٧.

663 تهذيب الاسماء واللغات، ج١، ص٢٧٩.

وکۆمەڵگەدا کە ماڵ و سامان ورێزو پیرۆزی بەخاوەنی دەدا، بەڵام عەبدولا هیچیانی نەدەویست، ڕۆژێك خەلیفە عوسمان بانگی کرد بیکاتە قازی، بەڵام نەیکرد، عوسمان زۆری لێکرد، ئەو هەر سور بوو لەسەر ڕاکەی، عوسمان وتی بێگوێیم دەکەیت؟ وتی نەخێر بیستومە قازی سیانن: ئەگەر بە نەفامی حوکم بدات لە ئاگردایە، بە هەوا حوکم بدات لەئاگردایە، ئەوەشی هەوڵبدات بە هەق بیکات هەر نەخێری دەستگیر دەبێو نە شەڕ، داوات لێدەکەم لەبەر خوا عەفوم بکە، عوسمان عەفوی کرد بەڵام سوێندی دا لای کەس نەیگێڕێتەوە، ترسا خەڵکی تریش وابکەن. چەند جار خەلافەتیان دایە نەیکرد، هەڕەشەیان لێکردگەر وەری نەگرێ دەیکوژن، ئەو زیاتر ڕەدی دەکردەوە[664]، ماڵەکەی بایی سەد درهەم نەدەبوو، دەیگوت دەترسم مخالەفەی هاوڕێکانم بکەم و پێیان نەگەم، .زۆر لە باوکی دەچوو، عومەر کاتێك بوو وێنەی زۆر بوو، بەڵام عەبدولا کاتێك هەبووکە وێنەی نەبوو، هەیە گلەیی دەکات بۆ خەلافەتی وەرنەگرت؟ بەڵام فیتنە گەورە بووبوو نەیدەتوانی چاری بکات، فیتنە لەوگەورە تر بوو، نا چار پەنای لێگرت، بەڵام دڵی لەگەڵ عەلی بوو، لە دوا ساڵانی تەمەنیدا وتی داخم ناچێ کە پشتی عەلیم نەگرت دژی فیئەی باغیە، تەمەنی درێژبوو، گەیشتە سەردەمی معاویەو یەزیدی کوڕی معاویە ومعاویەی دوەم کوڕی یەزید، ئەوکاتە تەواو پیر بووبوو، مەروان چوو بۆ لای وتی دەستت بێنە بەیعەتت بدەمێ، نەیکرد، ڕۆژێك وتی سەیرە شمشێریان هەڵکێشاوەو یەکتری دەکوژن و دەڵێن دەست بێنە بەیعەتت بدەینێ، هەرمایەوە لە نێوان پشتگیرانی عەلی ومعاویەدا پەنای لە فیتنە گرتبوو، کەوتنە بیانوو لێی ویستیان بیکوژن، حەجاج لە قەرەباڵغیدا وتی ئیبن زوبێر قورئانی تێك داوە، عەبدولا سێجار پێی وت درۆ دەکەیت، حەجاج هەڕەشەی لێکرد، عەبدولا وتی هەرچی بکەیت عەجایەب نیە چونکە

---

664 رجال حول الرسول، خالد محمد خالد، ص١٣٣ دار الكتاب العربي ط٢ بيروت ١٩٧٣.

تۆ خوێنڕێژی و خۆسەپێنی[٦٦٥]، لە فیتنەی دژی عوسماندا کە تێکدەرەکان دروستیان کرد، عەبدولا خێر خوایەك بوو[٦٦٦]، دوای شەهید بونی حەزرەتی عوسمان گەورەکان ڕازی بون لە بەر زوهدو خواپەرستی خەلافەت بەو بسپێرن، ڕازی نەبوو، ئەو چەند ساڵە لەو هەموو ناکۆکیە ناوخۆییەدا بەشداری هیچ تەرەفێکی نەکرد، دەستی خۆی بە خوێنی براکانی سور نەکرد، بوو. عەبدولا لە کەسانێك بوو کە لە دەوری خەلافەتی معاویەدا هاوڕێی ئیمام حوسەین وعەبدولای کوڕی زوبێر بوو، تەنانەت معاویە نامەی نوسی کە بەیعەتی دەداتێ ببێ بە خەلیفە، قبوڵی نەکرد، معاویە داوای لێکرد بەڵکو بەیعەت بداتە یەزیدی کوڕی، بەڵام ئەو بە ئاشکراو نهێنی بەرپەرچی دانەوەو بەکەم وبە زۆر مەیلی نەدانێ، معاویە لە وەسیەت نامەکەیدا بۆ یەزیدی کوڕی داوای لێدەکات عەبدولا زویر نەکات و نەیڕەنجێنێ، لە ئیمامی شەوکانی هەواڵی ڕاستی بەرامبەر عەبدولا وتووە[٦٦٧]، بەڵام لە (فتوح سەواد عیراق) وئەوانی تردا بۆ مردنەکەی هەواڵی هەڵەی تیایە گوایە بەدەستی پیرە ژنێك لە سەر ڕوباری خازر لە نێوان ئەربیل وموسڵدا کوژراوە یان دەرمانخوارد کراوە، کە وەك نادری کەریمیان بەدەقە فارسیەکە دەڵێ: قطعا دروغ است وشدیدا قابل تکذیب میباشد[٦٦٨]، لە تەهزیبدا دەڵێ ساڵی ٧٣ی کۆچیمرد، پێش سێ مانگ لە کوژرانی عەبدولای کوڕی زوبەیر(واتە دوای شەهید بونی خەلیفە عومەر وعوسمان وعەلی و تەواو بونی خەلافەتی ڕاشیدی وهاتنی دەوڵەتی ئەمەوی ولە هەموو سەردەمی معاویەو یەزیدی کوڕیدا مابوو)[٦٦٩]. ئیبن خەلەکان دەڵێ وەفاتی ئەو لە ساڵی ٦٤ی کۆچی دا بوو کە ئەوکات ٨٤ ساڵ

---

665 التنبة والا شراف. المسعودی ص٢٧٦.

666 الفتوح.ابن الاعثم الكوفی ج٢-٣ ص٣٦٣.

667 در السحابة، امام الشوكاني، ص٤٣٦.

668 فتوح سواد العراق.واقدی، ترجمة واعظی، تعليقات الاستاد نادر كريميان، ص٢٥٥.

669 تهذيب الاسماء واللغات، ج١، ص٢٧٩.

بوو. ئەو دواهەمین سەحابەی پێغەمبەر بووکە گەیشتەوە شاری مەککەو لەوێ مرد)[٦٧٠]. (لە ڕوداوەکانی ساڵی ٧٤ دا دەڵێ مالیك وتی کوڕی عومەر گەیشتە تەمەنی ٨٦ ساڵی پێش مردن وتی گەرمردم بە شەو بمنێژن با حەجاج نوێژم لە سەر نەکات پاشان ئەسپەردەکرا لە (زات ئەزاخر)، هەنێ تر دەڵێن ئەو لە سەر کێوێکە بە سەر بێستانێکدا دەڕوانێ لە دەرەوەی شاری مەککە بەرەو محسب)[٦٧١]. ساڵی ٧٤ی کۆچی لە خەلافەتی عەبدولمەلیکی کوڕی مەرواندا، لە تەمەنی ٨٤ ساڵیدا[٦٧٢]. (حەجاج لەکاتی حەجدا داوای لە پیاوێکی کرد کە دەمی خەنجەریکی ژەهراوی بکات بە قاچی عەبدولآدا، زۆر ڕقی لێی بوو، کاتێك لە عەرەفە گەڕایەوە پیاوە وای کرد دوای چەند ڕۆژ نەخۆش کەوت وحەجاجیش دەچێت بۆ سەردانی، عەبدولآ پێی وت تۆ بویتە هۆی ئەم نەخۆشیەم، لە سەرە مەرگدا وەسیەتی بۆ سالمی کوڕی کردکە لە دەرەوەی حەرەمی مەککە بینێژن)[٦٧٣]. (سالم وتی باوکم وەسیەتی بۆکردم کە ئەسپەردەی بکەم لە دەرەوەی حەرەمی مەککە، نەمانتوانی ناچار لەحەرەم لە فخ لە گۆڕستانی موهاجرین بەخاکمان سپارد[٦٧٤]. (هەندێ دەڵێن کوڕی عومەر

---

670 ئەنەسی کوڕی مالیك دوا سەحابە بوو، لە بەسرە مرد ساڵی٩١ی کۆچی یان هەندێك پێیان وایە ساڵی ٩٠ بوە.(الاصابة فی تمیز الصحابة ج٢ص٢٤٧، الاستیعاب.ابن عبدالبر القرطبی(هامش الاصابة ج٢ ص٤١)، الطبقات الکبیر.ابن سعدکاتب واقدی ج٤ص١٠٥. وفیات الاعیان. الاعلام الزرکلی ج٤ص١٠٨)(معجم الصحابة ج٣ ص٤٦٨ـ٤٨١ ابی القاسم عبدولڵآ بن محمد بن عبدالعزیزالبغوی.توفی سنة ٣١٧هـ دراسة وتحقیق محمد الامین بن محمود احمد الجکنی.دولة الکویت ط١ مکتبة البیان ٢٠٠٠.

671 شذرات الذهب.للمؤرخ الفقیه الادیب ابی الفلاح عبدالحی ابن العماد الحنبلی المتوفی سنة ١٠٨٩ ج١ص٨١ دار احیاء التراث العربی.بیروت.

672 رواة ابن سعد.الطبقات ج٤ص١٨٧.

673 عەبدولآی کوڕی عومەر.زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر ژمارە ٣٢ حبیب محمد سعید چاپخانەی ژین.لا ٧٨ ساڵی ٢٠٠٠.

674 رواة ابن سعد الطبقات ج٤ص١٨٨ عن محمد بن عمر بسندة ونصة..والذهبی.السیر ج٣ص٢٣١، وفخ واد بمکة یقال هو واد الزاهر.

مرد سالی ۷۳ی کۆچی له فخ نێژرا، له تەمەنی ٨٤ ساڵیدامرد،[675] (کوڕی عومەر دوای وەفاتی پێغەمبەر بە شەست ساڵ کۆچی دوایی کرد تەمەنی٨٧ ساڵ بوو.. لە بابەتی هەواڵی ڕوداوەکانی ساڵی حەفتاو چواری کۆچیدا دەڵێ: لەو ساڵەدا پیاوی مەزن وگەورەو زاهیدو عارف ئەبو عەبدولڕەحمان عەبدولاّ کوڕی عومەرکوڕی خەتابی عەدوی مرد، پیاوێك بوو دیاری کرا بۆ خەلافەت ڕۆژی تەحکیمەکەی دوای مردنی باوکی. کە ئەوکات گەورە سەحابی وەکو عوسمان وعەلی و ئەوانی تری تیابوو. پێغەمبەر لەبارەیەوە فەرموی عەبدولاّ پیاوێکی ساڵح وچاکە[676]. دفن کرا لە زات ئەزاجر نزیك مەککە لەنێوان مەککەو مەدینەدا. ئەسپەردەکرا لە سەروی دێی عابیدەوە لە سەر شاخێك نزیك بە بێستانێك لای ڕاستی مەککەوە لە نێوان مەککە ومینا، ناوچەکە هەر چەوو لمە بەو ناوچە دەڵێن محسب[677]

بەم جۆرە هەموو سەرچاوەکان لەسەر ئەوەن کەعەبدولاّ دوای ئەو ژیانە دورو درێژە کە ڕایبواردوە نەهاتوەتە کوردستان، کە فیتنەش کەوتەوە خۆی لێ پەنا دەگرێ ولەشاری مەککە وەفات دەکات وهەر لەوێ بە خاك دەسپێررێت. ئەوەی پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاترە ئەوەیەکە ئەو کتێبەی مەلا حوێزی و واعیزی چۆن دروست کرا، چۆن ئەو هەموو زانیاریە هەڵەیە خرایە ناو حوجرەکان و بەردەم زاناو شارەزایانی کوردوستانەوە؟ ئەو دەست نوسە دەبێ کێ نوسیبێتی وخستبێتیە ناو کتێبخانەو دیوەخانی مەلا سەمەدی مەرگەییەوە؟ ئەی ئەوگۆڕو مەرقەدانە بەناوی عەبدولاّوە دەبێ هی کێبێت؟ ئەو مزگەوتانە بۆ ناونراون بەناوی عەبدولاّوە، نەك مزگەوتێك، بەڵکو

---

675 اخرجة ابن عساكر ص١١٠عن البغوي.

676 الطبراني عن يحى بن بكير.المعجم الكبير ج١٢ص٢٥٨ ونقلة الحافظ عن البخاري. الاصابة ج٢ ص٣٤٩). (شذرات الذهب فى اخبارمن ذهب.لابن العماد الامام شهاب الدين ابى الفلاح عبد الحى بن احمد بن محمد العكرى الحنبلى الدمشقى.ج٣ ص٣١٠_٣١١ط١ دار ابن كثير تحقيق وخرج احاديثه عبدالقادر الارناؤط، حققه وعلق عليه محمود الارناؤط، دمشق.١٩٨٦.

677 (معجم مااستعجم للكبرى ج١ص١٢٨)و(القاموس المحيط ج٢ص٣٥) (تاج العروس ج١١ ص٣٦٤).

چەندین مزگەوت وله چەندین شوێنی دورلەیەك جێی لێکۆڵینەوەیە. وە بۆ ئەوەش کەگوایە چوەتە عێراق وشام ومیسر بۆ جیهاد جێی گومانە بەم جۆرە: له کتێبی (قاده فتح العراق والجزیره)و (قاده فتح الشام ومصر)و (قاده فتح بلاد فارس)کە ناوی هەموو سەرکردەکان بە ژیان وجیهادو چۆنیەتی مردنیانەوە بە پشت بەستن بە سەدان سەرچاوەی زۆر گرنگ، باسی هێرشەکان و سەرکردەکان. سەرکردەی گشتی وسەرکردەی بەشەکان وسەرکردەی لای چەپ وراست ودواوەو ناوەڕاست ویەدەك و زۆر وردەکاری تری کردوە، بە هیچ جۆرێك عەبدوڵای کوڕی عومەری تیا نیە، خۆ ناکرێ ئەو سەربازیکی سادە و ون بێت ناوی نەبێ وکەس نەیناسێ، ئەو کوڕی خەلیفەیەو یەکێکە لە سەحابە مەزنەکان وفەقیە وموفەسیرو زانایەکی گەورەی ئیسلام بوو، شەست ساڵ قازی وموفتی بوو، یەکێك بوو لە ئەهلی حەل وعەقد، کە عوسمان شەهید بوو ئەو دانرا بە خەلیفەو نەیکرد، پاشان معاویەش داوای لێکرد ببێتە خەلیفەی ئەمەوی ونەیکرد، گەر چوبێت بۆ عێراق و شام ومیسرو فارس بۆ جیهاد، چۆن دەبێت ون بێت باسی نەبێت؟ ئەوە هەڵەیەکی مێژویی گەورەیە بۆ هەرکەس بڵێ دەرچوەبۆ جیهاد بۆ ئەو شوێنانە! بۆ نمونە لە (الفهارس الاعلام)دا لاپەڕە ٣٧٨ لە (قادة فتح الشام ومصر )دا لە حەوت جێدا ناوی عەبدوڵا هاتوە بەم جۆرە.لاپەڕە ٣٧، ٤٤، ١٥١، ١٨٦، ٢١١، ٢١٤، ٣٠٦، لە یەکەمیادا دەڵێ پێغەمبەر نەیهێشت عەبدوڵاو چەند کەسی تر بەشداری جەنگی بەدرو ئوحد بکەن لەبەر تەمەن کەمیان، ئیتر لەباقی لاپەڕەکانی تردا تەنها باسی خۆلادانی عەبدوڵایە لەو فیتنەیەی کە کەوتە نێوان موسوڵمانەکانەوە دوای عوسمان، هەر بەو جۆرەش لە دوو کتێبەکەی شیت دا کە ناوم بردن باسی دەکات[٦٧٨]. هەروەها لەکتێبی(قاده النبی)دا ناوی ٣١ سەحابە براوە کە سەرکردەی سوپاو سریەو

---

678 قادة فتح الشام ومصر.اللواء الركن محمود شيت خطاب.دار الفكر.بيروت ــ قادة فتح العراق والجزيرة.دار الفكر ط٣ بيروت ١٩٧٧ــ قادة فتح بلاد فارس ايران.دار الفتح. ط١بيروت.١٩٦٥.

مەفاریز بون و کاری پێغەمبەریان بەجێهێناوە، بەڵام ناوی عەبدوڵای عومەری تیانیە، دەبێ هۆی چی بێت کە پێغەمبەر ئەوی ڕانەسپاردوە ببێتە سەرکردە، ڕەنگە حیکمەتەکەی ئەوەبێت زانیویەتی ئەو خۆی بۆ فەرمودەو زانستی قورئان وقازیەتی وموفتیەتی یەکلا بکاتەوە بۆ ئەو تەمەنە درێژە، ئەوخەریکی شەڕو هەرا نەبێت، گەر تێبینی بکەیت لە بەدرو ئوحددا نەیانهێشت بەشدار بێت، لە خەندەقدا ناچار بوو چونکە هەموو شار بە ژن ومنداڵ وهەموو شتێکەوە گەمارۆ درابون ناچارن بەرگری بکەن، هەرچەند هیچ چالاکیەکی سەربازی ئەوی تیا دیارنیە، لە فەتحی مەککەدا ئەو بەشدار بوو چونکە هەرهەموو موسوڵمانان چون بۆ عومرە کردن نەك شەڕ، لەوانی تریشدا ڕۆڵ وچالاکی دیار نیە، کەواتە ئەو دانراوە بۆ ئەوەی کەدوایی دیار بوو، ڕۆڵی گەورەی تیا دیت، هەر بۆیە ناوی نەهاتوە[679]. کەواتە ئەو نەهاتوەتە کوردوستان.ئەی ئەو هەموو مزگەوتە بۆ بەناوی ئەوەوە لە کوردوستان ناونراوە؟ ئەوەش جێی گومانە، چونکە دەرکەوت عەبدوڵا نەهاتوەتە کوردوستان تامزگەوت دروست بکات، سەرچاوەکان دەڵێن هەموو ماڵەکەی بایی سەد دڕهەم نەبوە وەك باس کرا، چونکە دەیوت گەر لە هاوڕێکانم لابدەم لە دونیادا ناگەمەوە بەوان لە قیامەتدا، کەواتە پارەشی نەبوە تا بینێری بۆ کوردوستان مزگەوتی بۆ بکەنەوە. وە مزگەوت کردنەوە مافی بەیتولماڵ بوە نەك خەڵکی، کەواتە ئەو ناوانە خەڵکی کوردوستان خۆیان بۆیان داناوە بۆ پیرۆزی وهیچی تر!

---

679 قادة النبي.اللواء الركن محمود شيت خطاب.الدار الشامية ـ بيروت.دار القلم ـ دمشق.ط٢ سنة ١٩٩٩.

# سەرچاوەکان

## سەرچاوە عەرەبییەکان


١.	القرآن الكريم

٢.	ابن حجر: شهاب الدين ابوالفضل احمد بن علي بن محمد بن محمد بن الكناني العسقلاني.

فتح الباري بشرح البخاري: القاهرة، ١٣٥١هـ

٣.	ابن اعثم ، ابي محمد بن احمد بن اعثم الكوفي المتوفي سنة ٣١٤هـ

كتاب الفتوح: دارالندوة الجديدة، بيروت ١٩٦٨. الطبعة الاولى

٤.	الطبري ، ابو جعفر محمد بن جرير الطبري

تأريخ الامم والملوك: دار تراث، بيروت، تحقيق محمد ابوالفضل ابراهيم

تأريخ الامم والملوك:منشورات مؤسسة الاعلمي للمطبوعات،بيروت١٩٨٩.الطبعة الخامسة

٥.	ابن اثير ، ابوالحسن علي بن ابي الكرم محمد بن محمد بن الاثير الجزري الملقب بعزالدين.

الكامل في التأريخ: بيروت١٩٨٩، حققه علي شيري.

٦.	ابن كثير ، عمادالدين ابوالفدا اسماعيل بن عمر بن كثير القرشي الدمشقي.

البداية والنهاية: دار احياء التراث الاسلامي، حققه علي شيري ١٩٨٨.

٧. بگ ، محمد خضري بگ، المفتش بوزارة المعارف

تأريخ الامم الاسلامية: مصر ١٩٦٩ المكتبة التجارية الكبرى.

٨. كارل بروكلمان

تأريخ الشعوب الاسلامية: بيروت ١٩٤٨ط١،دارالعلم للملايين، ترجمة الدكتور نبيه – منير بعلبكي

تأريخ الشعوب الاسلامية: بيروت ١٩٧٧ ط٧، دارالعلم للملايين

٩. حسن ابراهيم حسن (الدكتور)

تأريخ الاسلام السياسي والديني والثقافي والاجتماعي: القاهرة ١٩٥٧.

١٠. الواقدي: ابي عبدالله محمد بن عمر الواقدي المتوفى سنة ٢٠٧هـ
فتوح الشام: الطبعة الثالثة ١٩٥٤ شركة مكتبة و مطبعة مصطفى البابي الحلبي واولاده بمصر.
١١. ابن جوزي: جمال الدين ابوالفرج ابن الجوزي
تأريخ عمر بن الخطاب، القاهرة.
١٢. ابن جبير ، محمد بن احمد جبير
رحلة ابن جبير، القاهرة ١٣٥٦هـ.
١٣. ابو يوسف ، القاضي ابويوسف يعقوب بن ابراهيم صاحب الامام ابي حنيفة.
كتاب الخراج، القاهرة ١٣٤٦هـ.
١٤. البلاذري ، احمد بن يحى جابر البلاذري
فتوح البلدان، القاهرة ١٩٥٩.
١٥. المسعودي ، ابوالحسن علي بن الحسن بن علي المسعودي
مروج الذهب و معادن الجوهر: تحقيق محمد محيالدين، القاهرة ١٩٦٤، الطبعة الرابعة.
١٦. ابن عبدالبر ، ابوعمر يوسف بن عبدالله بن محمد بن عبدالبر القرطبي
الاستيعاب في معرفة الاصحاب، بيروت ١٩٩٥.
١٧. ابن حجر، شهاب الدين ابوالفضل احمد بن علي بن محمد بن محمد علي الكناني العسقلاني.
الاصابة في تميز الصحابة: القاهرة. ١٣٢٥هـ
١٨. الحنبلي، المؤرخ الاديب ابي الفلاح عبدالحي ابن العماد الحنبلي.
شذرات الذهب في اخبار من الذهب: بيروت، داراحياء التراث العربي.
١٩. السحار، عبدالحميد جودة السحار.
صلح الحديبية: فتح مكة، القاهرة ١٩٧٧، دارمصر للطباعة.
٢٠. ارثـر كرستنسن.
ايران في عهد الساسانيين: ترجمة يحى خشاب، بيروت ١٩٨٢.
٢١. فاروق عمر (الدكتور).
تأريخ ايران: بغداد ١٩٨٩.
٢٢. السيوطي ، عبدالرحمن بن ابي بكر جمال الدين السيوطي.

تاريخ الخلفاء: القاهرة ١٣٥١هـ، المطبعة المنيرية.
٢٣. ياقوت بن عبدالله الحموي.
معجم البلدان: القاهرة ١٣٢٣هـ.
٢٤. ابن مسكوية ، ابن علي مسكوية الرازي.
تجارب الامم: طهران ١٩٨٧.
٢٥. شاكر محمود راضي (اللواء الركن المتقاعد).
يرموك و تحرير ديار الشام: بغداد ١٩٨٦.
٢٦. الخطاب – محمود شيت (اللواء الركن).
– قادة فتح العراق والجزيرة: دارالفكر، ط٣، بيروت ١٩٧٧.
– قادة فتح بلاد فارس (ايران)، دارالفتح، بيروت١٩٦٥، ط١.
– الرسول القائد: بغداد ١٩٧٢.
٢٧. خطيب البغدادي: احمد بن علي خطيب.
تاريخ بغداد: قاهرة، مطبعة السعادة.
٢٨. ول وايرل ديورانت.
قصة الحضارة: ترجمة محمد بدران، الادارة الثقافة في جامعة الدول العربية.
٢٩. القضاة ، د امين القضاة.
الخلفاء الراشدون: اعمال واحداث، مكتبة المنار، اردن ١٩٨٩، ط٢
٣٠. يوسف العش (الدكتور).
الدولة الاموية: مطبعة الجامعة. دمشق.
٣١. مصطفى السباعي (الدكتور).
نظام السلم والحرب في الاسلام: دمشق.
٣٢. سير توماس ارنولد.
الدعوة الى الاسلام: ترجمة الدكتور حسن ابراهيم حسن. بيروت.
٣٣. اليعقوبي ، احمد بن يعقوب.
تاريخ يعقوبي. نجف ١٣٥٨هـ. و تاريخ اليعقوبي . مؤسسة الاعلمي للمطبوعات .
تحقيق عبدالأمير مهنا . بيروت ١٩٩٩.
٣٤. ابن سعد ، ابن سعد البصري الزهري.
طبقات الكبرى. بيروت ١٣٧٦هـ.

٣٥. جوزي ، جمال الدين ابو الفرج عبدالرحمن بن علي الجوزي.
- صفة الصفوة: حيدر ئاباد الدكن، بتحقيق الفاخوري، ١٣٥٥هـ.
- تأريخ عمر بن الخطاب: القاهرة.
٣٦. رفيق بگ العظم.
- اشهر مشاهير الاسلام والسياسة: الطبعة الهندية،ط٤.
٣٧. احمد امين.
- فجر الاسلام: دارالكتاب العربي. بيروت ١٩٦٩ ط١٠.
٣٨. الجبوري ، عبداللطيف اسماعيل الجبوري.
- رسائل الفاروق عمر بن الخطاب. بغداد ١٩٨٩.
٣٩. مجلة المجمع العلمي العراقي.
- فاروق عمر: طبيعة الدعوة الاسلامية. بيروت ١٩٧٠.
٤٠. هيكل: محمد حسنين هيكل (الدكتور).
- الفاروق عمر: مطبعة مصر. القاهرة.
٤١. خصباك ، شاكر خصباك (الدكتور).
- الكرد والمسألة الكردية. بغداد ١٩٥٩.
٤٢. طالباني ، نوري طالباني (الدكتور).
-منطقة كركوك و محاولات تغير واقعها القومي. لندن ١٩٩٥.
٤٣. الواقدي ، محمد بن عمر واقدي.
- فتوح سواد العراق (فارسي) ترجمة ملا عبدالعزيز واعظي. تهران ١٣٧٤ ايراني.
٤٤. ژان سواژه.
-مدخل تأريخ شرق اسلامي ، ترجمة وتحقيق نوش آفرين انصاري.
٤٥. فؤاد سنزگين.
- تأريخ التراث العربي: ترجمة محمود فهمي حجازي.
٤٦. النجار ، محمد الطيب النجار (الدكتور).
- عمر: نظرة عصرية جديدة.
٤٧. العقاد ، عباس محمود العقاد.
- عبقرية عمر: دارالفكر للطباعة والنشر بغداد. بيروت.
- عبقرية خالد: دار الهلال. قاهرة ١٩٥٢.

٤٨. المودودي: ابو الاعلى المودودي.
-مفاهيم اسلامية حول الدين والدولة. الكويت١٩٧٧.
٤٩. ربيع: محمد محمود ربيع (الدكتور).
- الثقافة الاسلامية. كويت١٩٨٩ ط١.
٥٠. السباعي: مصطفى السباعي(الدكتور).
- نظام السلم والحرب في الاسلام. بيروت.

## سەرچاوە کوردییەکان

٥١. بدليسي ، شەرەفخان کوڕی شمس الدين بدليسي.
- شرفنامە: مامۆستا هەژار کردویە بە کوردی. چاپخانەی نعمان، نەجەف ١٩٧٢.
٥٢. زکی: محمد امین زکی.
- کوردوکوردستان: چاپخانەی دارالسلام. انتشارات سیدیان، مهابات.
٥٣. مردۆخی ، محمد مردۆخی کوردستانی.
- مێژووی کوردوکوردستان: وەرگێڕ عەبدول کریم محمد سعید، مطبعة اسعد. بغداد١٩٩١.
٥٤. خەلیقی: حوسینی خەلیقی (دکتور)
- کۆمەڵناسی کوردەواری: چاپخانەی (حوادث). بغداد ١٩٩٢.
٥٥. قفطان ، صالح قفطان.
- مێژووی نەتەوەی کورد: مطبعة سلمان الاعظمي. بغداد١٩٦٩.
٥٦. نەوشیروان مصطفی.
- پەنجەکان یەکتری دەشکێنن: سلێمانی ١٩٩٨.
٥٧. رۆژبەیانی ، مەلا جمیل رۆژبەیانی.
- وڵات گیری رەشەخاکی عێراق: چاپی یەکەم، سلێمانی ١٩٩٧.
- مێژووی حەسەنوەیهی و عەیاری: دارالحرية. بغداد ١٩٩٦.
٥٨. پلوتارك.
- شەڕەکانی ئەسکەندەری مکدونی: و. جلال تەقی. سلێمانی ١٩٧٣ راپەڕین.
٥٩. حوێزی، مەلا رۆوف سلیم حوێزی.
- کوردستان و ئاینی ئیسلام: چاپخانەی جامعە ١٩٧٠.

٦٠. حمه كريم ، حسن محمود حمه كريم.
- له مەدینەوە بۆ مدائن: سلێمانی ١٩٩٧.
- ئاینی کورد: چاپی سێیەم ١٩٩٨.
- کابانی کوردی: چاپی دووەم ١٩٩٨.
٦١. صاحب: محمد بهاوالدین صاحب.
- پیرشالیاری زەردەشتی: مطبعة شفیق ١٩٦٨.
٦٢. ئەمرۆ: جواهر لال ئەمرۆ.
- چاوپیاخشانێك بە مێژووی جیهاندا: وەرگێڕ رؤوف محمد زوهدی.

## گۆڤار و رۆژنامه

٦٣. مجلة العربي، العدد(٢٦٤)، ١٩٨٠.
٦٤. گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ژماره ١٨-١٩، بغداد، خانەقین لە مێژوودا، رۆژبەیانی.
٦٥. گۆڤاری هەزارمێرد، ژ/٣، سلێمانی١٩٩٨.
٦٦. المورد. العدد/١٩٩٧،٢، الجهاد في خطابة صدر الاسلام: ناهي ابراهيم العبيدي.العراق.
٦٧. گۆڤاری (رامـان)، ژ/٢.
٦٨. گۆڤاری روناکبیری (سوید)، ژ/٢.
٦٩. گۆڤاری ئاوێنه، ژ/(٢٤-٢٥) سالی١٣٧٥ئێرانی.
٧٠. کوردستانی نوێ، ژ/١٦١٩، ١٩٩٨/٥/٢٥.
٧١. مجلة المستقبل الاسلامي: العدد/٧٦، زيد محمد الرماني.
٧٢. گۆڤاری رۆشنبیری نوێ: ژ/ ()، د. محسن محمد حسين.
٧٣. کۆمەڵێ سەرچاوەی تر کە لەبەشی دەهەمدا هەیەو لێرەدا ناوەکانمان نەهێناوە.
٧٤. التاريخ الإسلامي . محمود شاكر. المكتب الإسلامي . بيروت . ١٩٩١ الطبعة السابعة
٧٥. ژیانی پێغەمبەری مەزن . عەزیز ئەمین پاڕەزانی . چاپخانەی کامەرانی . سلێمانی ١٩٧٣.

٧٦. اسد الغابة . عزالدين ابن الأثير . تهران . ١٣٧٧.
٧٧. كتاب المغازي . محمد بن عمر الواقدي . تحقيق الدكتور مارسون جونس . اوكسفورد ١٩٦٦.
٧٨. الدرر في اختصار المغازي والسير . ابو عمر يوسف ابن عبدالبر . تحقيق الدكتور شوقي ضيف . القاهرة ١٣٨٦.
٧٩. العبر وديوان المبتدا والخبر . عبدالرحمان ابن خلدون . القاهرة ١٣٨٤.
٨٠. المحبر . ابو جعفر محمد بن ابن حبيب البغدادي . تحقيق الدكتورة ايلزة ليختن شتيتر . بيروت ١٣٦١.
٨١. مذكرات مامون بيگ . ترجمة روژبياني وشكور مصطفى . مطبعة المجمع العلمي العراق
٨٢. رحلة المنشئ البغدادي . محمد اسيد احمد الحسيني . شركة التجارة والطباعة . بغداد ١٩٤٨.
٨٣. العراق الشمالي . محمد هادي الدفتر وعبدالله حسن . بغداد ١٩٥٥ مطبعة شفيق.
٨٤. اصول اسماء المدن والمواقع العراقية . المحامي جمال بابان . بغداد ١٩٨٩. مطبعة الاجيال.
٨٥. رۆژنامەی دەنگی میللەت . ژمارە ١١٥. (شارەبان لە نیو سەدەدا) . عباس سلێمان سمایل
٨٦. الفصول الفخرية . جمال الدين احمد بن عتبة . تهران شركت انتشارات علمى ١٣٦٨.
٨٧. دلائل النبوة . ابوبكر احمد بن حسين البيهقي . تهران . انتشارات علمي ١٣٦٤.
٨٨. در السحابة في مناقب القرابة والصحابة . الامام الشوكاني . دمشق . دار الفكر ١٩٨٤.
٨٩. حلية الاولياء وطبقات الاصفياء . ابي نعيم الاصفهاني . مصر ١٣٥٧ قمري . مطبعة السعادة.
٩٠. القضية الكردية في منظور الإسلامي . عبدالله طاهر . دەستنووس.
٩١. مێژووی كۆیە . بەرگی دووەم . مطبعة نمير . بغداد ١٩٨٤.
٩٢. یادی مەردان . مەلا عەبدولكەریمی مودەڕیس . بەرگی دووەم . چاپخانەی كۆڕی زانیاری كورد.

٩٣. ديوانی پیرەمێردی نەمر. بەغداد ١٩٧٠.
٩٤. بنەماڵەی زانیاران. مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس. چاپی یەکەم. چاپخانەی شەفیق ١٩٨٤.
٩٥. فەتواکەی مەلای خەتێ. حەسەن مەحمود حەمەکەریم. سلێمانی. ٢٠٠٦. لە بڵاوکراوەکانی پرۆژەی تیشک.
٩٦. رجال حول الرسول. خالد محمد خالد. دار الكتاب العربي. بيروت. ١٩٧٣.
٩٧. نامەی مافناس عەباس هەمزە خدرکە بۆی ناردوم لەسەر گۆڕی ئەسحابە عەبدوڵلا.
٩٨. نامەی کاک ئیبراهیم ئەحمەد بەرزنجی لە (٢٠٠٢/١/٨) لەسەر گۆڕی سەحابە.
٩٩. صور من حياة الصحابة. عبدالرحمان رافت الباشا. مطابع الوطن السعودية. ١٩٩١.
١٠٠. زاد المعاد. ابن قيم الجوزية. مؤسسة الرسالة. بيروت ١٩٨٦.
١٠١. وتەیەکی بەڕێز حەسەن شێخ عەبدوڵلا عەبابەیلێی کە لە مامۆستا سید نجم الدین تەهای وەرگرتبوو.
١٠٢. وتوێژ لەگەڵ حاجی موحەممەد کۆکۆیی لە هەڵەبجە مانگی پێنجی ٢٠٠٢.
١٠٣. وتوێژ لەگەڵ مامۆستا شێخ موحەممەد سازانی لە ماڵی خۆیان مانگی دەی ٢٠٠١.
١٠٤. هەفتەنامەی الاتحاد. ژمارە ٤٥٢ لە ٢٠٠١/١٢/٢١ بابەتێکی کاروان ئەنوەر.
١٠٥. ابوعبيدة بن جراح. مشاهير قادة الإسلام. بسام العسلي. دار النفائس. الطبعة الرابعة. بيروت ١٩٨٢.
١٠٦. تأريخ ابي الفداء (المختصر من اخبار البشر). الملك الؤيد عمادالدين ابي الفداء. دار الكتب العلمية. يروت ١٩٩٧.
١٠٧. بط الفداء والاخلاص سعد بن ابي وقاص. محمد عبدالجواد السكري. دار القومية للطباعة والنشر ١٩٦٤.

# نەخشەکان




نەخشەی کوردستان لەزەمانی شەرەفخاندا

## نەخشەی ژمارە (١)




## نەخشەی ژمارە (٢)

# وێنەکان




مەرقەدی پیرمەنصور و مەرقەدی ئەسحابە سپی لەشاری سلێمانی

# نــــــــــاوەرۆك

## پرۆفایل:

ناو: حەسەن مەحموود حمە کەریم



ساڵی ١٩٥٥ لە شاری هەڵەبجەی شەهید لە دایکبووە. سەرەتاکانی خوێندنی لە هەڵەبجە تەواوکردووە، بەکالۆریۆسی لە مێژوودا هەیە، ئێستا مامۆستایە لە ناوەندی مەستورە لە شاری سلیمانی. ئەندامی کارایە لە یەکیەتی ڕۆژنامەنووسانی کوردستان. ئەندامە لە کۆمەڵەی کەلەپوورو فۆلکلۆری کوردی. ئەندامە لە یانەی قەڵەم. سەرەتا کۆمەڵێک چیرۆک و بابەتی بواری ئەدەبی بڵاوکردوەتەوە. ئێستا بە مێژووی کوردەوە خەریکە.

## بەرهەمەکانی:

- کوردستان لەبەردەم فتوحاتی کوردستاندا.
- کابانی کوردی.
- ئایینی کورد لە تۆفانی نوحەوە تا هاتنی ئیسلام .
- کاوەو نەورۆز لە نێوان ئەفسانەو ئاییندا.
- لە مادەوە بۆ مەدینە.
- لە مەدینەوە بۆ مەدائن.
- سوپای ئیسلام دەگاتە سنووری کوردستان
- مەلای خەتێ ئەفسانەی مێژوو نووسێک
- ڕۆڵی مەلا ئیدریسی بدلیسی لە یەکگرتنی میرنشینە کوردیەکاندا
- محەممەد ناسراوترین کەسایەتی مێژوو
- دیموکراتی بەبێ حیجاب. وەرگێڕراو لە عەرەبییەوە.
- هەنگاو کورتترین ڕێیە. چیرۆک.
- شایەکەی شەلەمچە. چیرۆک
- دووپشکۆی یەکتاگر. چیرۆک.
- فەتحی ناوچە کوردیەکان بە ئاشتی بوە یان بەشەڕ؟
- ئاینی کورد

لەگەڵ کۆمەڵێک بابەتی مێژوویی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی دەرەوەو کوردستاندا.



بنکەی سەرەکی دابەشکردنی - کتێبخانەی تیشک